هەموو ئەو شەرکەرانەی یان چەکدارانەی سـەر بـە
دەوڵەتێك یان فەرماندەیەکن.
بەو شەوە دەتوانی بە نێو هۆردوویەکدا بڕوا.
(حەمەدۆك-٢-ل٤٤٨)
قۆشـەن دێ ڕێ بەڕێیـە دەڵـێ خـانی مـوکری لـە
کوێیە.
(تحفه-١-ل٢٠٦)
چـەند لەشـکرێکی ئەنگامەیـە بـە قۆشـەن و
زەمزەمەیە.
(حفه-١- ل٢٠٦)
هۆردوویـەکی گـەورەی تێـك شـکاندووە و
گەڕاوەتەوە.
(حەمەدۆك-٢-ل٣٧٥)
- ئۆردی: سەربازگە.
- ئۆگر: هۆگر: متوو.
- ئوجاغ: وجاغ: ١-نەوەی کەسێك.
٢-شوێنی چالێنان لە چایەخانەدا.
- ئوجـاغ زادە: وجـاغ زادە: خانـەدان: سـاحێب
قۆناغ.
- ئوجاغ کۆر: وجاغ کۆر.
پیاوی ژندار مندالّی نەبێ و زگ و زا نەکات.
- ئۆخژن: ئۆخەی: هەست بە خۆشی کردن.
- ئودە: ئـۆدە: ژۆر: ژوور: چـاوە: وەتـاغ: ئۆتـاغ:
ئۆتاخ: ئۆدێ: هۆدە.
دێ باڤی وی ئەو کربوون: ئۆتاخەکە تاعری.
(کۆمەڵە- ل١٥٥)
ئوتاخێکی بۆ دروستدەکەم
چیمەنتۆ و باڵاخانە لەولێوانە لەو چـاوانە کامیـان
ماچ کەم زۆر جوانە.
(گۆرانی حەسەن زیرەك)
- ئودەڤان: سەرکاری دیوەخان.
- ئۆساژی: هەروەها.
- ئوشی: ١-هووشی: وشی: بۆلە: هێشوو:
هەموو ئەو دنکە ترێیانەی کە بەدارێکی ناوەڕاستە
وەوەن.
٢-باقــە گــەنمی درواو: کۆکردنــەوەی ئــەو
گوڵەگەنمانەی لە پەرێز جێ دەمێنن.
- ئولفەت: خدوو: خوو: هۆگر: ئالوودەیی:
پەیوەندی و دۆستایەتی دەگەڵ کەسێ یان حـەز بـە
شتێك یا کارێك کردن.
- ئونداکرن: ونکردن: بزرکردن: گومکردن.
- ئۆرتە: ئورتە: ناوەند: ناوەڕاست.
- ئـۆدا: ئـۆدە: ئـۆدێ: دایکـە: دایــە: وشــەی
بانگکردنی دایك.
دایە دایەی شیرینم
- ئۆغر: وەغر: سەفەر.
- ئۆغربی: واتە بۆ کوێی دەچی.
- ئۆغرکردن: وەغرکردن.
- ئۆغرەت خێر: سەفەرت بەخێر.
دوعا بۆ ئەوکەسەی کەنیازی سەفەری هەیە
- ئۆقرە گرتن: ئارام گرتن.
- ئۆڵم: خەراپ: تورە:
(مێری ئۆڵم: واتە مرۆڤی خەراپ)
- ئۆگر: هۆگر: متوو.





- ئۆمەر:١- سووکەلە ناوی عومەر.
٢- ئەحە: بەمەجاز بەو کەسە دەگـوترێ کـە لـە
ژنی بترسێ:
- ئۆمەرخوچان: ١- ناوی خوشك و برایەك بووە لە
شاری کۆیە لەسەر گردێك نێژراون.
٢-بووەتە ناوی ئەو گردەی کـە ئۆمەرخوچـانی لێ
نێژراوە بە ناوی گردی ئومەرخوچانی بە ناوبانگە.
٣- بووە ناوی ڕەزێکێش لە نزیك گردەکـە بـەناوی
ڕەزی ئۆمەرخوچانی لە کۆیە.
- ئۆمەرمەندان: ١- پیاوچاکێکە لە نزیك تەقتەق
مەزاری لەوێیە.
٢-بووە ناوی ئەو گردەی کە چاکەکەی لێ نێژراوە.
٣- ناوی گردێکە لەشاری کۆیە، ئەو گـردە جـێ
نەزەرگەی ئۆمەرمەندان بووە کـە هاتۆتـە کـۆیێ
لەسـەر ئـەو گـردە دانیـشتووە و دەروێـشەکانی
چوونەتە لای.
(یەکێ شـێت بێـت دەچـێتە سـەر ئۆمەرمەنـدان،
ئەگەر ئۆمەرمەندان شێت بێت دەچێتە کوێ)
- ئۆمەرگونبـەت:١- پیاوچـاکێکە لەگونـد
ئۆمەرگونبەت لەوراتی کۆیی.
٢-بووەتـە نـاوی گوندەکـە بـەناوی گونـدی
ئۆمەرگونبەت.
- ئووخەی: ئۆخەی: ئووخەیش.
١-وشەی خۆشی و بەختیاری
(ئۆۆۆخەی: ئۆۆۆخەی: زینـدوو بوومـەوە، ڕەحمـەت
لەگۆڕی مردیت ئۆۆۆخەی تێرم خوارد.)
(حەمەدۆك -٢- ل ٢٩٨)
١- وشەی هاندانی منالّی بچووك.
٢- ناوی کچانی کوردییە.
- ئووی: ئۆی: وشەی سەرسوڕمان.
- ئە: دەنگی گۆرکی دەکات لەگەڵ ئـەم پیتانـەی
خوارەوە:
- ئە: ئا
١- شەهر: شاهر:
کەهنی: کانی: کەهر: کار:
پەهن: پان:
٢- بە (ێ) جێگۆرکێ دەکا
هەژیر: هێژیر، پەچ: پێچە.
- ئەبوبـەکر: بـابکر: عەبابـەکر: بـاوەکر: بـەکر:
بەکرۆك: بەکۆ: ناوی کوڕانە ( توکانی بـەکۆ و دوو
قالب سابوون) پەند.
- ئەئۆ: وشەی ئاژۆتنی ئاژەل.
- ئەبرۆ: برۆ: برو: ئـەبرو: بـرێ: هەردووکەوانـەی
مووداری سەرچاوان.
شیرین پەیوەندەن، شیرین پەیوەندەن
دوو ئەبرۆی، سیات، وەهمەم پەیوەندەن
(هەلبەست ل٩٦ سەیدە هەورامی)
چەعڤید ڕەش بەلەك تـژی حـوب ئـاگر، ئـەبرۆیێ
قەیتان. (کەشکول- ل١٨٣)
بەشمشێری (برۆ)ی جـەرگی لـەت و پـەت کـردم و
فەرمووی:
هەتا قەوسـی (بـرۆ)ی مـن بـێ چ ئیـشت هـەس
لەمینەبەردا.
(قانع هەلبەست- ل٩٧)

(ئەبرۆ)ی کەوانت شۆخی نازەنین
شیری عاشق و پەیکەری زێڕین
(هەڵبەست- ل١٠٠ لەتیف)

- ئەبلە: گێل: گەمشۆ: چەپنگ: دیلانە: گەوج: لازودان: لاژك: بێ مێشك: نەهێشین: هەپلە گون: بێ هۆش: هێڕ: حۆل: سەرچل: دەبەنگ: هۆڕ: کەودەن: وڵحی:

کەسێك لەنزمترین پلەی زیرەکییە کەلە (٢٥) پلە کەمترە تەمەنی هۆشی لە ٣ساڵان تێپەڕی ناکات توانای فێربوون و مەشق کردنی نییە تاڕادەیەك بیرکردنەوەی نییە و زمانیشی شێواوە ناتوانێ خۆی بگونجێنی لەگەڵ کۆمەڵدا، تەمەنیشی کورتە لەژیاندا.

"لاوە، وەرە لاوە! ئەبلەی، شێتی، ئاقڵ ناتەواوە!
(تحفە -١- ل ٢٣٠)

زاهیدە بە تەکەببور بەلەدی عیشقی دەکردم
کەودەن ئەوە زاهیدە کە نەزانی خەبەرم بوو
(ساڵە- ل١١١)

- ئەبڵەق: بازگ: باز: بازیی: کەژ: شل: کاسەڵە: بەلەك: سوورسن: دووڕەنگ: پڵپکی: بازوو: ئەبلەك.

١- هەرشتێکی دووڕەنگ.

٢- هەرشتێکی ڕەنگی ڕەش و سپی بێ.

٣- ئەسپ یا ماین کە ڕەنگیان ڕەش و سپی.

- ئەبەستم: ئەوەسم: دەبەستم:

یان وەوخنجێرە خۆم ئەدەمەکوشت یان هەیاسەکەت ئەوەسم لەپشت. (فۆلکلۆر)

- ئەبێم: ئەڵێم: دەڵێم: بێژم: واڕێم: یەژم: دەرێم:

(ئەمن دەڵێم نێرە و ئەو دەڵێ بیدۆشە.) (پەند)

- ئەپری: تەمەزی: پۆشی:

پارچە قوماشێکە ژن لەسەری دەپێچن.

ئەپێچە: زۆرچاك: ئەپەیجە: ئەپەیجە گەڕییا.
(کۆمەڵە- ل٤٧)

- ئەتابەگ: واتە باوکی بەگ:

ناوێکە پێنج بنەماڵەی فەرمانڕەوا ئەو ناوەیان پێوەبووە لە کوردستاندا.

- ئەترەش: هەترەش: زەندەق: زیلك: زەهلە: زراو: روح: ئازایی مەعنەوی مرۆڤ: (ئەترەشی چوو: زیلکی رژا: زەندەقی چوو: روحی چوو).

- ئەترێمێ: پێت ئەڵێم: پێت دەڵێم.

- ئەتۆ: ئەتو: تو: تە: تی: تێ:

راناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی دووەمی تاك.

ئەوەی قسەی دەگەڵ دەکرێ، جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی دووەمی تاك.

کچ: هەتیم کەچەر بگرە نانی
تۆ بە جێمای لەکاروانی (هونراوە ل١١٦)
کوڕ: ئەتوو کۆتری من کۆلارە
پەڕوبارم شێست و چارە
(هۆنراوە ل١١٧)
ئەتۆ هەرزگ ماك وەها جوانی
(تاریك و روون ل٦٣)
(تەگا گرۆت کلك ما) (کانی- ل٣٢)
(تەگرت بەرنەدە، تەبەردا لدویڤ نەچە)
(کانی ل ٣٢)

- ئەتۆ بلێی: تۆبلێی: تۆبێی.





ئەتۆ بڵێی حەمەد لەگەدابی.

- ئەجەل: عەجەل: هەجەل: ئەنجەل: مەرگ: ئاکام: دواگیان: وادە: وەعدەی مردن، ئەو دەمەی ژیانی کەسێك تێیدا تەواودەبێ.

(بزن عەجەلی بێ نانی شوانی دەخوات).

(پەند)

بای ئەجەل هات لەناکاو دەفتەری ژینی دڕیم
تاکو دوێنێ خونچە گوڵ بووم ئەمڕۆ بە ناحەق هەڵوەریم.

- ئەجەل هاتن: مردن: هەجەل هاتن.

- ئەچمۆ: دەچمەوە: ئەڕۆمەوە: دەڕۆمەوە.

- ئەچییۆ: دەچیەوە: ئەڕۆیتەوە: دەڕۆیەوە.

- ئەحمەد: ئەحمەو: ئەحمۆ: ئەحە: ئەحمێ.

ناوی کوڕانە.

- ئەحکردن: لێدان بە زمانی منالان.

- ئەحمەد ئەمین: حەمەدئەمین: حەمەمین: مینە.

- ئەختەر: ١-ئەستێرە.

٢-ناوی کچانی کوردییە.

٣-نازناوی شاعیرێکی کوردە.

- ئەختیار: ئیختیار: ختیار: کاڵ: بەساڵاچوو.

١-پیرەمێرد: پیرەمێر

٢-پیرەژن: پیرێژن

- ئەختاچی: یەختەچی:

ناوچەیەکە لە کوردستانی ئێران.

- ئەدی: ئەیی: ئەرێ پا: پاما:

١-بۆ مەبەستی تەعەجوب و تێگەیاندن لەشێوەی پرسیاردا دەردەبڕدرێت.

ئەدی نەتبیست زارا مێردی کرد

٢-بۆ دەربڕینی ناڕەزامەندی بەکاردێ

(کەبەم خانووە رازی نەبوویت، ئەدی بۆ دەتکڕی.)

- ئەخلاق: خوو: ڕەوشت: ئەدا: تووزم: جو: پیشە: ڕەفتار.

ڕەوەش: شێوە: نەریت: نەریەت: ڕەویەت: هۆ: مەشرەف: کەنشت: گەشکە: هیم: هی: یانەك: کردار: توورە: سچینە: سینجی.

کۆی وەڵامدانەوە گشتییەکانە لەسەر ئاستی جووڵانەوەیی و لوویی کە لە گیاندارەکە ئەبێ و داوای لێ ئەکات کی بداتەوە ڕەوشت بەهەموو ئەو کردەوانە ئەوترێ گیاندار و زیندەوەر پێی هەل شاراوە تابە کردارە فیزیولۆجییەکان و چالاکییە هۆشییەکان و عاتفییەکانیش ئەگا!

ئەخۆن: دخۆن: دەخۆن.

- ئەدەب: ١- شێواز :٢- وێژە.

- ئەدەب سز: بێ ئەدەب: کانج: چاونز: بێ ئەخلاق: بێ شێواز: بێ تۆرە: لاقردی: بترك: چارقاب.

- ئەدیب:١- وێژەوان: ٢- ناوێکی کوڕانەیە.

- ئەرا: بۆ: لۆ.

ئامرازێکی پەیوەستە لە لەهجەی لوڕ و کەلهور بەرامبەر بە ئامرازی (بۆ) لە لەهجەی سۆرانی

بزن ئەرایە و شەو، جێ خوەی خوەش کێگ: بزن بۆیەك شەو جێ خۆی خۆش دەکات.

(پەند)

- ئەرانە: لووتەوانە: خەزێم:

دەرزییەکی زێڕی بچووکە پارچە زێڕێکی
پانی نەخشینی پێوەیە و ژنـان لـە کونـە کـەپووی چەپەی نەکەن.

مەگری مەگری بەوچاوانە
بۆت ئەسێنم لووتەوانە
(گولاڵە)

خەزێم و خەزێم  خەزێم پوولەکە
خەزێمی یارێم سەد زێڕی هەقە
(سێ سەد- ل٩٤)

- ئەڕانی: لێی ئەخورێ: داژوا.

- ئەربائیلو: اربیل: هەولێر:
دوو بـیر و بۆچـوون بەرامبـەر نـاوی (اربیـل- هەولێر) هەیە.
١-اربیل: ناوێکی کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ (٤٠٠٠) لەمەوپێش چوار خواوەندی ئاشورییەکانی تیا بووە ناوی ( اربیل)یش لەوەوە هاتووە واتا (ارپا-ئیلو).
٢- اروبل: اولیر: هەولیر: هەولێر.
بیروڕای دووەم دەڵێ کە ناوی (هەولێر) لە (اروبـل) اولیر- هەولیر) هاتووە کەواتـە هـەولێر نـاوی ئـەم شارە خۆشەویستە.

- ئەرتەخـشیری پاپـەکان: نـاوی شـای یەکـەمی ساسانییەکان بوو.

- ئەرجائی: نـاوی گوڵێکـە پـەڕەی گـەورە و وردی هەیە لاسکەکەی نەرمە دڕکاوی نییە: ماڵییە، بـەتۆ زیاد ئەکرێ بۆ جوانی لەکوردەواری بەکاردەهێنرێ.

- ئەرخوت: لۆلەپ: لۆرەلەپ: دەسەخورد:
دوودانە داری خۆشکراوە یەکیان
لەهەردوو دەستی مەشکە و ئەوی
تریان لەهەردوو پێی مەشکە دەبەسترێ.
هەردووداری (دۆژەنگیان) لێ دەبەسترێ بەسـێپاوە دەکرێـت، مەشـکەژەن دەسـتی بـە (لۆلەبـەوە) دەگرێت بۆ هەژاندن!

مەشکە مەشکەی (مامز)ی
لۆلەپ داری نێرگزی
شەقەی لە مەشکەی دەدا
دەنگی گەییە رواندزی
(هۆنراوە ل٢٥)

- ئەرخەدە: لەپاشان: لەدوایی:
"نـا" حۆرییێـد دەلال ئـەزی ئەرخـەدە هـەریم...
(کۆمەڵە ل١٥٩)

- ئەرخەیان: دڵنیا: دڵتەخت: تەریقەت: باوەڕکـار: دنج: ئەولـە: قیمـە: ئاسـوودە: پـشتڕاست: دڵارام: ئارخـاین: خاترجـەم: دوور لـەڕارایی و دوودڵـی و ترسـان (لـەولاتی تێروتەسـەل ئاسـوودە و دڵنیـا ئەحەسێتەوە...) (گەدا ل ٩٥)

- ئەرد: کاد: زەوی: عارد: عەرد.

- ئەردەشـــێر:١- دامەزرێنـــەری بناغـــەی ئیمپراتۆرییـەتی ساسـانی بـووە بەنەتـەوە کـورد بـووە، بـاوکی نـاوی (بابـك) بـووە لـەتیرەی شوانکارییە دەڵێن (٨٨) سـاڵ ژیـاوە(٢٥) سـاڵ پادشایەتی کردووە:
٢-ناوی کوڕانی کوردییە:

- ئەرز نوێبوونـەوە: لـەکۆتایی زسـتان کـە بـاران ئەباری نابێ بەقوڕ.





- ئەرۆ: ئامرازی بانگ کردنـە بـۆ (نێـر) لەشـێوە کرمانجی سەروو:

- ئەرێ:١- ئامرازی بانگ کردنـە بـۆ (مـێ) لـە شێوە کرمانجی سەروو.
٢- بەڵێ
ئەتۆ حەمەدۆکی ئەرێ؟ (حەمەدۆك-٢-ل٢١)

- ئـەرزان: هـەرزان: کـەم بـایی: کـەم قیمـەت: بێقیمەت: کێم بها: (ئەرزان کرۆ هەمبان دڕۆ).
(مشتاخ- ل١٣)

- ئەرعادمەوتا: ئەرمۆتا: هەرمۆتە:
واپـێ دەچـێ کـە وشـەیەکی ئـارامی بـێ و لـە (ئەرعامەتا)وە هاتبێ واتە خاکی مەرگ، چـونکە مەڵبەندەکە لەکاتی فتوحاتی ئـایینی ئیـسلامیدا کوشتارێکی زۆری لێ کراوە بووەتـە گۆڕسـتانێکی گەورە، واپێ دەچێ لەبەر ئەوە ئەو ناوەی لێ نراوە، لە دوایدا لەسەرزاران سواوە بووەتە (ئەرمۆتە) یـان هەرمۆتە، گوندێکی بچکۆلانەیە بەسـێ کیلومـەتر کەوتۆتە رۆژئاوای شاری کۆیە زۆربەی دانیـشتوانی گوندەکە دیانن.

- ئـەز: مـن: ئـەمن: م: وەز: مـۆ: جێنـاوی سەربەخۆیە بۆ یەکەم کەسی تاك
(من گۆتەتە: ئەمن بەتۆم گووت)
من لە زنجیر و تـەناف و دار و بەنـد بـاکم نییـە.
(تاریك و روون- ل٤٩)
ئەمن و عەلی برابووین لەورکەی بەردەشانی
(سێ سەد ل٧٥ )
وەز کۆترەکی بە شۆرابم
وەز کێویمە و کەوی نابم    (هۆنراوە- ل٥٢)
گەر نێچیرڤان ژنێچیری برەڤیت چبکەم ئەز
زارۆك لەبـەر سـنگی دایـێ نـەنڤیت چـبکەم ئـەز
(شیعری بەدرخان سندی کەشکۆل ـ ل٢٦)
دووپاتی کردەوە "ئەمن، ئەمن، من من من  مـن هەرچیم پێ خۆش بێ دەتـوانم لەگـەڵیان بکـەم...
(حەمەدۆك-٢- ل٤٨١)

- ئەزرەت: حەسرەت ئارەزوو حەزلێ بوون.
رۆڵە دەزانی لەو ماوەیەدا بە ئەزرەت چییەوە بـووم
(حەمەدۆك-٢- ل٤٢)

- ئەزەل: هەمیشە
بەختی لە ئەزەل سیا چارەبێ ، دەستی لێ مـەدەن بە هاوار نابێ.

- ئەزەلی: هەمیشەیی
حـوکمی ئـەزەلی، چـونکە نییـە قـابیلی تـەغیر.
(دیوانی-ئەحمەد-ل٦٣)

- ئەزو: ئەمنتان: منتان
ئەزو ببم قوربانە

- ئەزیـەت: جـەزرەوە: عـازاو: عـەزاب: ئـازار: نارەحەتی: چەرمەسەری

- ئەژمار: هەژمار: ژمارە
بـە ئـەژمار کـەلاکی شـەش هـەزار ژن و منـداڵم شاردەوە.    (تحفە-١- ل١٢)

- ئـەژدیها: ئـەژدەها: ئـەژدەر: ئـەژدەهار: ئەژدەرها: ئەژدیها: زیا: زەها: هەژدیها: هـەڤی: ئاژدەهـار: ڤـشاب: هـەزیا: حـەزیا: هـەژدیا: ئەژدەهاك: هـەژدەها: هـەفی: حـەڤی: حـەفیان:

زەها: شامار: ئەژدا: ئیختووپگو: ئیشتوویگو:
ئەژدەهەك: ئاژدیها.

١- ماری زۆر گەورە:

مارێکمان کوشت ئەژدیهایەك بوو بۆ خۆی.

ئەو باغە هەژدیهایێکی تێدایە: هەرچی بچێتە ئەو باغەی هەژدیها دەیخوا...

(تحفە-٢-ل٣٢٢)

٢-بوونەوەرێکی خەیاڵییە لە چیرۆکە کوردیەکاندا زۆر باسی دەکرێ وەکو مارێکی یەکجار گەورە وایە، شاخی هەیە کە دەم دەکاتەوە گڕی لێ دێتە دەر، لە دوورەوە پیاو هەڵدەلوشی گۆیا پاسەوانی خەزێنە و گەنجینەی شاراوەیە.

وتم تاکەی رەفیقی عەقرەبی جەرراڕ و ئەژدەر کەم.

(دیوانی ئەحمەد-ل٨٣)

شەربەتی دەستی ئەسمەر بێ
ژەهری ئەژدیهای حەوسەر بێ
دەیخۆمەوە قەستە سەر بێ.

( گۆرانی حەسەن زیرك)

وتی بۆ پاسەوانی گەنجیدا هەر ئەژدەها چاکە.

(دیوان-ئەحمەد-ل١٢٤)

- ئەژنۆ: وژنگ: زرانی: چۆك: چوگ: زەنگۆڵ: کاب: ژنۆ: چونك: زرانۆ: زەنگول: زانوك: کابوك: وژینگ: هەژنوو: هژنوو:

ئەندامێکی لەشی هەندی گیاندارانە ئەوجومگەیە کەران و لاق پێکەوە دەبەستێ:

ئەرۆمونارۆم ئەژنۆم ئەلەرزی

(فۆلکلۆر)

دەستی لەسەر شانی میوانەکە دانا و بەچۆکەوە دانیشت.

(حەمەدۆك -٢- ل٢)

پیشانیم هەوەس زانووش جازمەن ئیرەن

(ڤاچ- ل١٦٠)

- ئەژنیم: بیستم: گێم لێبوو: گوێ بیست بووم.

- ئەسپ: هەسپ: حەسپ: بۆر: ئەستۆر:

گیاندارێکی چوار پێی بەرزی، یەکسمی کلك و باڵ درێژی، شۆخ و شەنگی ژیرە لەزۆر کۆنەوە کەوی کراوە، بۆ سواری و بار هەڵگرتن و غارەئەسپ و گۆیێن بەکاردێت (٢٥-٣٠) ساڵ دەژی هەرپاش کەوی کردن هاتۆتە ریزی ئامرازی شەڕی نێوان خێڵ و عەشیرەتەکان:

١-جۆری ئەسپ: لەڕووی جۆرەوە ئەسپ چەند جۆرێکی هەیە وەك:

١-ئەسپی رەسەن: کەخەڵکی رەشۆکی کە بە (جسن) ناویان دەبەن واتە بەوەچە رەسەن بووە.

٢-ئەسپە ئاسییەکان: نارەسەن کەشێوە گشتییەکە وەردەگرێ.

٢-ناوی ئەسپ کە لە ناو کۆمەڵدا باوە ئەم جۆرە ئەسپانە زۆر رەسەنن.

١-ئەسپی سەگڵاوی: سەگڵاوی ناوی ئەسپەکە کە خاسیەت و نیشانەی تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش قاچی خرە خێرا ئەڕوات هار و تورەیە پێیەکانی توانای خۆراگرتنی نییە.

٢-ئەسپی نەجدی: زۆر خێرا دەڕوات لووتێکی گەورەی هەیە هیلاك نابێت یەکێك لەو خاسیەتانەی





لەم جۆرە ئەسپانە دایە ئەگەر سوارێك لەسەری کەوتە خوارێ ناڕوات هەتا سوارەکە جارێکی تر سوارنەبێتەوە و قاچی نەخاتە ناو ئاوزەنگی.

٣-ئەسپی کەحێل: گوێچکە و قاچی بچووکن ملێکی باریك و سمتی بەرزە رۆیشتنی شەپۆلییە هیلاك نابێت.

٤-ئەسپی موعەنەگ

٥-ئەسپی حوبێدجان

٦-ئەسپی کەحێلی کوردی

٧-ئەسپی باوبۆران: ئەسپێکی خەیاڵی و ئەفسوناوی

٣-بەرەنگ و شێوە و خاسیەت بەگەلێ جۆری تر ناویان دێت وەك:

١-ئەسپی تاتاری

٢-ئەسپی شەهریاری

٣-ئەسپی بۆرە

٤-ئەسپی شێ

٥-ئەسپی لەیل و پەر

٦-ئەسپی باڵەبان

٧-ئەسپی بۆرەی خاڵ خاڵ

٨-ئەسپی شینکی قەزوانی

٩-ئەسپی شێی موتڵەق

١٠-ئەسپی شێی ئاڵ

١١-ئەسپی رەش

١٢-ئەسپی کەوێتی قاپ رەش

١٣-ئەسپی سور

١٤-ئەسپی سپی

١٥-ئەسپی بەحری

١٦-ئەسپی شینکاشێ

١٧-ئەسپی بەش ( ئەسپی نێوچەوان سپی)

١٨-ئەسپی خورت: ئەسپی تێر ئالیك و تێر جۆ.

٤-پەسندی ئەسپ: بۆ پەسندی ئەسپی زۆرباش و چاك دەبێ ئەم سیفاتانەی خوارەوەی هەبێ: (سم کۆدك، جومگە پەیت، لەسەرلنگ، ناودەست بلاو، سینە تەخت، قەدباریك، دو ئەستوور، گوێ سەگڵاوی، هەینە رەق، لاجانگ لەڕ، دم و چاو و لموز شوش، بەژن رێك، کلك گڕ، باڵابەرز، دیەن تەرز، زیت و نێسکە و لەنجە کەر، شۆخ و شەنگ، بەراپەڕ، ڕەوت مەڕ، ئاسکە باز، نازەنین، بێ مانگری، جووتە و گاز و سەروەشێنی، هۆگر و رام، لەدەستەمۆو جڵەو خۆش، شایی بەخۆ، لە رامبازیدا رەوان، پشوودار و بێ هەژان سووکی و نرکە و سەرسم دان).

٥-ناوی ئەسپ: مەبەست لەناوی ئەسپ لێرەدا ئەوەیە لەبەرئەوەی میللەتی کورد لە زۆر کۆنەوە ئەسپی بۆ شەڕ و ململانێ بەکارهێناوە سەرکەوتنی پێ بەدەستهێناوە لەمەیدانی شەڕدا، بۆیە هەر (ئەسپێك) خاوەنەکەی ناوێکی بۆ خۆشەویستی لێناوە وەك:

ئەسپی چەتوی کوڕی فەرعۆی ناوی ( تێل عەیشان بوو) هی حەسەنی والیکی ناوی ( قەلەبالداری بەحری) بوو.

٦- رۆیشتنی ئەسپ: ئەسپ شەش جۆر رۆیشتنی هەیە:

١- جلەو شل کردن

٢- لۆقە: گورگە لۆقە

٣- نەرمەغار

٤- چوار ناڵە: چوار پەلە

٥- ڕەوت

٦- ئاوزەنگی تەقین

- ئەسپ زینکردن: زین خستنە سەرپـشتی ئەسـپ بەتەنگە توندکردنی.

- ئەسپ لغاوکردن: لغاو خستنە ناو دەمی ئەسپ.

- ئەسپ لینگدان: ئەسپ لێخوڕین: ئەسپ هاژوان:

... دووبارە ئەسپی لینگدا.

(حەمەدۆك -٢- ل٥٧٤)

- ئەسپی لەڕ: دژی ئەسپی خورت.

- ئەسپی چاپار: ولاغی پۆستە.

- ئەسپاردی: سپاردن:

بەخوام ئەسپاردی:

- ئەسپون: قەران چۆغان: ناوی گوڵێکە

جـۆری پەڕەکـەی پـڕو وردە، لاسـکەکەی نەرمــەو دڕکاوی نیە، بۆنی نییە کێویە، بە تۆو زیـاد دەبێـت متوربە ناکرێ، بۆ جل شتن لە جیاتی سابوون لەکوردەواری بەکاردێ:

- ئەسپەك: ئەسپەنەك: ژانە سەر: سەرئێشە:

- ئەسپێ: سپە: سپی: زندی:

زیندەوەرێکـە لـە پیـسی پەیـدادەبێ و لەســەر خوێن دەژی

(ئەسپێ بکەویتــە دەسـت کـۆرەی: کـارێ یاشـتێ بکەوێتە دەست مرۆڤی ڕەزیل)

- ئەستاندن: لێ ستاندن: لێ سەندن:

- ئەستراوە: سڕایەوە: سڕاوە:

- ئەستوون: ستوون: ئەستوین: سـتوین: کوولەکـە: کۆلەکە: کۆلەگە: هەستون:

دارێکی ڕاست و ئەستوورە وەبەر میچی خانوو دەدرێ وەیان دەدرێتە بەر تاولی

- ئەستوور: ستوور: ئەستووبر: ستوبر: کانە: یانج: کولۆفت: هەڤەتی: تیە: لکفت: هۆڵ: توند

هەر تەنێك ڕەهەندی سێیەمی هەبێ

ئەم چنارە هێندە ئەستوورە باوەشی تێوەنابێ

- ئەسـتۆ: سـۆکر: سـتۆ: گـەردەن: مـل: گـەردن: ئەسکورد: ئەسگورد: ستوو: ستووکور: ئوستی:

ئەندامێکی لەشی ئادەمیزادە و گیاندارانی چوارپێ و باڵندانە نێوان سەلك و لەشیان

(ملە کز و پڕ چرچ و لۆچەکەی درێژتر و خوارتربوو)

(حەمەدۆك -٢- ل٢٩٦)

جوانی بەملی من جوانی

بەملیۆنێ هەرزانی

(گۆرانی حەسەن زیرەك)

گەردن بلور دیارە لەدوور

لەهەر دە و باسکی شارەزوور

(گۆرانی عەلی مەردان)

دەستیان دەستۆی یەك دەکرد

(تحفە -١- ل٢٣٧)

- ئەستێور: ئەستەوێر: قسر: ئەستەویر

١- بەبزن و مەر دەگوترێت کە نەزێت.

٢- دارێ کە سالێ پێشوو بنیشتی لێ نەگیرابێ،





دارە بەنــەکان ئەســتێور بــوون و بنێــشتێکی زۆریان دەردەدا...

(گەدا- ل٥٨)

٣- زەوییەك بۆ چەند ساڵێك تۆنەکرابێ.

- ئەســتیو: ئاســنێکی ســەرپانی دەســك بــە ئەڵقەیە (٢٣)سم درێـژە، ئـافرەت هـەویری پـێ لەتەشت دەکەنەوە.

- ئەســتێر: گوڵێکـــە پەڕەکـــەی ئەســـتێرەییە لاسکەکەی نەرمــە و دڕکـاوی نییــە بـۆنی هەیـە، ماڵییە بە تۆو زۆردەکرێ، متوربە ناکرێ بۆ جوانی لەکوردەواری بەکار دەهێنرێ.

- ئەستێرك: ئەستێر: گۆم: ئەستێل: هەسێل: گۆل گولاوێکە لە بـەر کـانی و کـارێزان دەکـرێ ئـاوی تێدا کۆ دەبێتەوە بۆ ئاودانی کشتوکاڵی.

- ئەستێرە: ئاسارە.

مانگ لە عاسمان راوەستایە

چەند ئەستێران دەوری دایە

(هۆنراوە- ل٦٤)

- ئەستەرك: شوێنی نوێن لەسەردانانە لە لادێ.

- ئەســرین: نــەموراو: هێــستر: هێــسر: رۆنــدوك: ئەســر: رۆن: رۆنــك: فرمێــسك: رۆنــدك: حێــستر: رۆنتك. رندك: هەڵسی: هورمیس: ئەشك: هەسـێر: ئەس: ستر: هورمێس: رووندك: ئەسـروو: روونتـك: فرمێــسك: ئێــستر: رۆنــد: گلــۆرك: ئاڤاهێــستر: ئەسرەڤ: سرشك: ئەزرەڤ: سروشك.

ئاوێکی سوێرە لـەژێر پێڵـووی چـاوان دەزێتــەوە و کاتی گریان دێتە خوار.

بۆ ولاتێکی بە فرمێسك و خوێن دێرابێ

من کەسەیرانی دەرودەشت دەکەم خوێن دەگریم.

(تاریك و روون- ل١٦٤)

بەسەرۆنتکا بە سەر رۆکێ زەوی و زەری و ئەسمەری سیناندا مەبارینە. (لاوك- ل٥٣)

مەگری مەنال حێستران ژروێ خۆ بمال

(ئێزدیاتی- ل٩٦)

خابیرێ هار ژخەمان رووندکابرێژت... چ بکەم ئەز

(کەشکۆل- ل٢٧)

بە خاکا پێ بنێ بەدیدەی ئەشکبارمدا

(دیوان احمد- ل٦٧)

دیدەی پڕ ئەسرم، خاوجەلاش دوورەن

(سەیدا هەورامی ئێرەیەن ڤاچ دا)

ئەشکی چاوم بادەیە ناڵەی دڵم عەینی نەیە

(دیوان ئەحمەد- ل٦٩)

بەڵام (مەعدووم) هەرس دیدەش جۆش وەردەن

(مەولەوی ئێریەن ڤاچ- ل٣٤)

نەهری ئەشك ئەمشەو لە دیـدەم بـەخور دەڕژێتــە روو (سالم- ل٣٤)

دەمم تاڵ و سرشکم شۆرە دائم

ترشڕووم و قسەم شیرینە بێ تۆ

(سالم- ل١١٣)

لێشاوی بەستووە بە ڕووا (مەحویا) سروشك

(مەحوی- ل٣٠٤)

- ئەسکل: تیراو: بۆل: پۆکی: سکەڵ: پۆلوو: سکڵ: پشکۆ: پەرەنگ: پەنگر: کۆز: تراد: گوزمە: پۆلك: پەل: پۆل. ئەزگە: کەڵە: چلۆسکە: چەلاسك

دار یان خەڵووزی گەشاوە که نەبوو‌بێت بە خۆڵەمێش. پاشان پۆلوویەکی لە ئاگرەکە دەرهێنا و قەلنەکەی پێ داگیرساند. (حەمەدۆك -٢- ل٣٩)

...گڕ و بڵێسە نیشتنەوە. تەنیا هەر سکڵ و پشکۆ مابوون...

(کاریتە ل٤٥)

لە پاشان سکڵ و پشکۆش بوون بە ژیلەمۆ.

(کاریتە- ل٤٥)

- ئەسکوو: ئەسکووی: هەسکوی: هەسکۆ: هەسکە: هەسك:

کەوچکێکی گەورەیە لە دار دروستدەکرێ دەسکی درێژە تەنیا بۆ چێشت لێنان دەبێ.

چ لە مەنجەلێ بێ ئەو دێتە ئەسکووی

(پەندی کوردی)

شازێ بێ دۆینەی لێنێ قادۆبێ هەسکوی تێنێ: بەکارەك دەڵێن دووکەسی خەراپ بەڕێوەی بەن.

(پەندی کوردی)

چ لە دیزەی بێ ئەو دێتە ئەسکووی. (پەند)

- ئەسەح: ئەسەحی: راستی: دروستی: تەواو: کار و کردارێك دوور بێ لە درۆ.

کووشتنی حەمەدی ئەسەحی هەیە؟

- ئەسەر:١- سووسە: دەوس: نیشانە و بەڵگەیەکی بوونی شتێك لەوەختێکا لە شوێنێك پیشانبدات

٢-شوێن: شون: یافت: کەرخ: تەزوو: پرتووك: پێوشووین: شۆپ:

جێ پێی ئینسان و گیانداری

شوێنی حەمەدی هەڵگرتبوو بەدوایدا دەڕۆیشت.

(حەمەدۆك -٢- ل٢٦٢)

- ئەشکەوت: ئەشکەفت: غار: دڕنال: شکەفت: هەشکەفت.

دەنگی کاروانەکێ لە دەرێ شکەفتێ سەحکێ...

(مشتاخ- ل٢٦)

- ئەشکەڵە: دارێکی پەنچەیەك پان و نەختێ درێژە لەکاتی جەلەکردنی ولاغ بۆ گێرە سەری ولاغەکانی پێ لێك دەبەسترێتەوە.

- ئەشب: باشتر: چاتر: چاکتر: چێتر: قەنجتر: جوانتر: خاستر.

- ئەشرەفی: ناوی گوڵێکە، پەڕەکەی پڕە هەندێکیان یەك ریزە، لاسکەکەی رەقە و دڕکاوییە بۆنداره، کێویماڵییە لەکوردەواری بۆ گوڵاو بەکاردەهێنرێ.

- ئەشی: زمانی کۆنی کوردە کە میدییەکان پێی دەدوان.

- ئەعیان: ١- پیران: گەورە پیاوان: کەیخودایان: ئەشراف: پایەبەرز: براگەورە: نەجیب زادە: گەورە پیاو: (کەیخودا و کار بەدەستان و گەورەپیاوانی کوردستان...) (شەرەف ل٣٣٥)

٢- چینی دەوڵەمەند.

ئەشرافەکان دایەرەی قایمقامیان کردبوو بە یانەی دووەم..

(تەنەکە ل١٢٨)

- ئەغلەب: ئاغلەب: زۆرتر: زیاتر: فرەتر: ئەغلەبە: ئەکسەر.





- ئەفسوس: پەژارە: داخ: خەم: خەفەت: بەپەرۆش

... ئەفسوس بۆ مەریوانی رەوشت خاوێن...

(ئاشتی- ل١١٨)

- ئەفسون: دەمە: جادوو: مەکر: فڕ: تەلسم: تەلیسم: چاچول: ئەو قسانەی جادووباز لە بن لێوەوە دەیکا.

٢- قسە یا ئەدا و ئەتوارێك کە پیاو لەخشتە دەبا و هەڵی دەخەڵەتێنێ

... ئەسپی خەنەیی بەشێوەیەکی ئەفسووناوی ون ببوو. (حەمەدۆك-٢- ل٣٥٦)

مەچەکی پۆلایینی بە ئەفسون و جادووی خوای شەڕ و زێڕگەڕاوە باسکی گەنم رەنگ زەرد هەڵگەڕاوە.

(شەرەف- ل٢٣٩)

- ئەفشار: هەوشار

بەپارچەیەك لە کوردستانی ئێران دەڵێن کە لە ناوچەی (فەیزوڵڵابەگی) و (تیلەکۆ) و (بیمار)دا هەڵکەوتووە. خەڵکەکەی کوردن، بەڵام دەرەبەگەکان تورکی (ئەفشار) بوون تورکی ئەفشار ئێلێك بوون لە رۆژهەلاتی ئێران لای شیراز و دراوسێ ئێلی تورکی قاجاربوون (نادرشای ئەفشار) شای پێش زەندییەکان لە ئێران سەرۆکی ئێلی ئەفشار بووە، وادیارە باپیرە گەورەی دەرەبەگەکانی (هەوشار) لەوئێلە و نۆکەر و کار بەدەستی نادرشا بووە و ئەو ئەمی ناردووتە سەر ئەو ناوچەیە، پاشان ئەم کابرایە وەچەی لێ کەوتۆتەوە بوونەتە خاوەن موڵکی ئەو ناوە و ناوچەکە بەناوی ئەوانەوە ناونراوە، دەمینێتەوە ئەمە کە (ئەفشار) چۆن بووەتە (هەوشار).

بەپێی دەستووری پیتە گۆرکێ (الابدال) لەزمانە ئێرانییەکاندا هەر لە ئاوێستاییەوە بگرەتا پەهلەوی و دەریی کۆن و کوردی (ئە) بووتە(هە) وەکو:

(ئەنار) بووتە (هەنار)(ف) بووەتە (و) وەکو لە (بەفر)دا کە لە ئەردەڵان و جافایەتی و شارەزووردابووەتە (بەور) ئاخرەکەش ئەفشار بووەتە (هەوشار)

- ئەفەنم: ئەفەندم: وشەی رێزلێنانی پیاوی دەوڵەت

- ئەفەندی: ١- نازناوی پیاوی دەوڵەت بە تایبەتی مامۆستا:

٢- وشەی رێز و ئیحتیرام لە زمانی تورکەکان بە هەموو کاربەدەستی تورکیان وتووە، قەتارقوماندان (مکارە) بینباشی رەشید ئەفەندی (مێژووی کۆیە-٢- ل٤٦)

- ئەقرەبە: عەقرەبە: ئامرازێکی جووت کردنە ئاسنێکی چەماوەی وەکو چەنگاڵە لە ناوەڕاستی دار ئەقرەبەیە کلکی مژانە ئەڵقەیەکی ئاسنی پێوەیە ئەڵقەکە دەسەر ئەم ئەقرەبەیە دادێ لە ئامرازی جووتکردندا.

- ئەقڵ: عەقل: ئاقل: ئاوەز.

- ئەقڵ بردن: شێت کردن.

ئەقڵت بردم شێتت کردم.

- ئەقڵ بڕ کردن: ئەقڵ پێداشکان

گوندنشین ئاوە زو ئەقڵیان بەمەدا ناشکێ

(تەنەکە- ل٤٦)

- ئەقڵ تێکچوون: ئەقڵ گۆڕان: ئەقڵ کەم بوون لەدەست چوونی هەستی تێگەیشتن و سەر وەدەر نەکردن لە کاران، لێك نەکردنەوەی چاکە و خراپە،

- ئەقڵ گرتن:- بڕوا کردن: چوونە ئەقڵەوە.

بەڵام هیچی وایان بەبیردا نەدەهات تۆزێ بەڕێوجێ بێ ئەقڵ بیگرێ. (تەنەکە- ل٩١)

- ئەقڵ نەگرتن:- بڕوا نەکردن: نەچوونە ئەقڵەوە

- ئەقڵ نەبوون: دەبەنگ: ئەو کەسەی زۆر بە درەنگی تێدەگا.

- ئەقڵ مەند: ئەقل دار: بەئەقڵ: بەعەقڵ

ئەقڵ هەبوون: ئەقڵ بوون: تێگەیشتن

- ئەگەر: ١- ئامرازی عەتفە: ئەم ڕواڵەتانەشی هەیە (ئەر، ئەگەر کوو، ئەگەر کوونی، ئەگەرەکینی، هەکو، هەکە، هەکی، هەرکی، هەرکو، هەرکە، وەگە).

(ئەگەر گوڵ نیت، درکیش مەبە)

وەگە تو دۆستا من بی نیشانی خۆ وەمن دە. (فۆلکلۆر)

ئەگەر من چووم، تۆش وەرە.

هەکو هەتا ئێڤاری ئەز نەهاتم ئەو ئەز شەڤێژی ناهێم.

ئەگەر بەبێ تۆ ببینم خۆشی (مەلۆ- ل٤٥)

٢-هو: هۆ: سەبەب:

ئەگەرا نەهاتنا تە چییە

- ئەلاجەوی: سەیر و سەمەرە: عەنتیکە.

- ئەلالەت: ١- کۆمەڵە:- جفات: هەنگ: کۆمەگ: پەلاتەمان: سلسات: هوومین: بتۆم: زێوە: پالووتە: پوورە

٢- لیژنە ٣- حیزب: پارت

- ئەڵپەرگە: هەڵپەرکێ.

- ئەڵترازیاك:- ترازاو: ترازای.

- ئەڵتەکیاگ:- هەڵتەکاو: هەڵتەکای.

- ئەڵدان:- هەڵدان: هاویشتن.

دەرزی ئەڵدەی لە زەوی نییە کەفی

- ئەڵدڕین: هەڵدڕین

- ئەڵقە:- ئاڵقە: عەڵقە: هەلقە

- ئەڵقە لە پەنجە کردن: دوای مارە کردنی کچ و شەکراو خواردنەوە دوو ئەڵقەی زێڕ یا هەر کانزایەکی گران بەها بێ دەکرێتە پەنجەی بووك و زاوا ( کە پێویستە زاوا و بووك ئەم ئەلقانە بکەنە پەنجەی یەکتری).

موبارەك بێت موبارەك بێت

ئەڵقەی پەنجەت موبارەك بێت

- ئەڵلاوەیسی: مەقامێکە، یەکێکە لە هەوا کۆنەکانی گۆرانی کوردی، ناوەکەی ئاوازێکی فۆلکلۆرییە یەکێکە لە مەقامە تایبەتییەکانی لەمەڕ کورد، مەقامێکی ئاوازەیە و لە ئاوازی کوردی هۆنراوەی بە شێوەی گۆران و سۆرانی پێوە دەگوترێ و بە شێوەکانی تریش دەتوانرێ بگوترێ بە مەرجێ هۆنراوەکانی ئەو هەوایە: لە سەرکێشی هۆنراوەی کوردی بێ کە لە سەرکێشی نیو دێڕ دە بڕگەیی ( دەکا سێلابی) هۆنراوەی (دانراو) یا فۆلکلۆری پێوە دەگوترێ ئەم مەقامە لە سەرەتاوە بە نزمی بە وشەی ( ئازیز- ئایی- ئایی) (ئازیزئایی- ئایی) دەست پێ دەکرێت کە ئەم





(بەشە نەغمە) چینە دەنگی یەکەمە و لەو (هەوا) یەدا لە ڕەگەز و ڕیشەی نەغمەی مەقامی (نەهاوەندە) ئەمجا (هەوا) کە بە دێڕە (هۆنراوەیەك)ەوە دەگوترێ و لە سەر ئەم (پلەیە) گۆرانیبێژ دەتوانێ چەند ( دێڕێك) پێوە بڵێ دوایی ئەم پلەیە دەگۆڕێ و نەغمەی دەنگەکان بڵند دەکرێنەوە بە وشەی ( ئەرێ ئای ئازیزم دوایی لەم چینە دەنگەی دووەمەوە تێپەڕ دەکرێ بۆ چینی سێیەم کە مەقامەکە دەگاتە ترۆپکی هەرەبەرزی نەغمە و نەواڵەی خۆی.

- ئەللاه:- ئۆهنای: ئامرازی خۆشی.

ئەللاه! ئەو باغە چەند خۆشە!

ئۆهنای! ئەڤ باغە چەند خۆشە.

- ئەڵلای: واتە بنوو بە زمانی مناڵان.

- ئەلند: ئەلەز: ١- بەرەبەیان: ٢- ناوی کوڕانە

- ئەڵێ: دەڵێ: وارێ: یەژی: بێژی: ئویشی: دبە: دبێژە: دبێ: کەسی سێیەمی غایب کە قسان دەکات

کێ دبە چاڤێ من کۆربە

(پەند کۆمەلە)

- ئەڵێی: دەڵێی: دەمنی: هەروەك (دەڵێ مەیمونە هەلوژەی دەخوا).

" دەمنی" گوری ناو باغانی

(هۆنراوە- ل٥٩)

- ئەلهەق: ئەلحەق: بەڕاستی: دوور لە درۆ.

- ئەموار: هەموار: ڕێك: ساف: تەخت: ڕاست: بێ گرێ

لەو دەشتە هەموارەدا دەریایەکی ئاگرین شەپۆڵی دەدا. (حەمەدۆك-٢- ل٣٦٢)

- ئەمەوێ: دەمەوێ: مەڤێ.

- ئەمین: ١- مەند: هێدی: هێمن: دنج: ئاسوودە: بێ ترس: سەقامگیر.

حاڵی ڕێگا و بان کە ترسی دز و جەردە و خراپەی تری لێ نەکرێ و حاڵی شوێنێکە پیاو ترسی ئەوەی نەبێ لەوێ شتێکی بەسەربێ یا تووشی بەڵایەك بێ.

ئەمین: ٢- دروست کار: دڵپاك: ڕاست: دەست پاك: باوەڕپێکراو: پشت ڕاست: ڕاست کردار: سەرڕاست: ڕاست و دروست: ئامبۆز:

هەتتا ئێستا ئەمینی ماڵی من بووی، ئێستا بە خوار و غەیان دەرهاتی (تحفە-١- ل٣٧٥)

کەسێ کاروباری بەڕێوەبردنی شوێنێکی مامەڵەی لەبەر دەست بێت و دزی لێ نەکات.

کوڕەکی ئەمینە: واتە دەست پاکە.

٣-ناوی کوڕانە

(ئەمین: مینە)

- ئەمین سندووق:- گەنجینەدار: سندووق مەند: سنوقدار: خەزنەدار: خەزێنەدار.

- ئەناردن: هەناردن: ناردن.

- ئەنبار: ئەمبار: کۆگا: مەسنا: عەنبار: عەمبار.

- ئەنجا: ئامرازی عەتفە ئەم ئامرازە ئەم ڕواڵەتانەشی هەیە.

ئەنجا: ئینجا: ئینجاکۆنی: ئنجاکو: ئەوجا: ئەمجا: ئەمجار: ئیمجا: ئیمجاکۆنی: ئەوجاکونێ: ئەوجار: ئەوجارەکێنێ: ئەوجاکو: ڤێجا: وێجا: هیجا: جا:

ئەوجاوەکی: ئەوجاوەکو: ئەوجە: هیجـائی: ئمجـا:
ڤێجار: وێجار: ئەوجاوەکونیٚ: ئەوجاوەکوینی.

جا دەلێم مەمکۆلانم مەگرە بەدکارمان زۆرە
ڤێجا هەما حیجەتۆکەك بێخێر لیٚ پەیدا ببت...
(مشتاخ- ل۲٤۷)

باشی تێبگە و ئینجا بینووسەرەوە (ڕێزمان)
ئەمجا لە بنەوە دەستی کرد بە ڕێوی بازی
( شەرەف- ل۳۱۳)

(دەرسەکەت بخوێنە ئینجا بنوو)
(ئەوجە هەنگینێکە وەکـی ئـەو قـسەی بـە شـێخ حوسێنی بە دەوی گۆ) (لاوك- ل۲۱)

- ئەنجگ ئەنجگ: هـەنجن هـەنجن: پارچـە پارچـە: کوت کوت:

- ئەنجوومـەنی پـیران: ئەنجوومـەنی پیاومـاقولان: کۆمەڵەی پیران: دیوانی برا گەورەکان: ئەنجوومەنی برا گەوران: دەزگایەکی هەمیشەییە کـە لـە چـەند کـەس پێکهـاتووە، بـۆ هەڵـسوڕاندنی کاروبـار و ناوبەناو کۆ دەبێتەوە بۆ تەکبیر کردن.

- ئەنجەت: ئینجـەت: هەجـەت: بیـانوو: بیانگـە: هەنجەت.

هەجەتا نەهێژ کەری پێلاڤە
(کانی ل۱۳٦)

- ئەندازە: قەدەر

- ئەندازە گرتن: قەدەر گرتن

- ئەندەك: هەندەك: هەندێك

- ئەنگاوتن: پێکـان: خرچـاندن: بەرکەوانـدان: لـە نیشانەدان: نیشان شکاندن: لەئارمانج دان

- ئەنگوتك: هەنگوتك: گوتـك: گونـدك: گـشتك: گلۆر: گرنکی: گونتك: پەپك: پەپکە: گشك
هەویری تۆپەڵ کراوی بەشی نانێك .

ژنێك هەویری دەشێلا و یەکێك ئەنگوتکی دەگرتن
(حەمەدۆك-۱- ل٦٦)

- ئەنگوتك بڕ: ئەوکەسەی لەنانەواخانەی هەویر دەشێلیٚ و ئەنگوتك دەبڕیٚ.

- ئەنگوتك بژێر: بریتییە لەزۆر ڕەزیل و قرچۆك:

- ئەنگوچـك: کـلا نگوچـك: فەقیانـە: لەوەنـدی: کەلانگوچك: سۆرانی

۰,۲٤م لـەقۆڵ درێژدەبێتـەوە هـەمووی (۱,۱۵)م درێژە و شۆڕ دبێتەوە وەکو فەقیانەی کراسی ژنان و وەکو تیرێژی کراسی وایە. پیاویش وەکـو ئافرەتـان ئەم فەقیانەیە لە ژێر بەرگی سەرەوە دێننـەدەرەوە، وەکو تیمە پەرۆکی سپی و دەق کراوە لەسەرەوە لە باسـکی و خۆیـانی دەپێـچن. فەقیانـە پارچـە بەرگێکی کوردانەی زۆر ڕەسەنە.

وا دەبـیٚ فەقیانـە جـودا و سـەربەخۆ دەبـیٚ لـە ئارموش یان نایلون دروستی دەکەن.

فەقیانە سپی، سەڵتە بابردوو دوژمنت بۆ چیـە لـە برسا مردوو:
(پەند خا-ل۳۰۷)

فەقیانە چەرموو فریشتەی شەویٚ
شەویٚ وەك ئێمەش قەت هەڵناکەویٚ
(گولاڵە- ل۱۱۸)

- ئەنگوسـت: قامـك: هەنگوسـت: پەنجـە: تلـی: تیلك: تیپڵ: پل: تلهد: تلیك: گوسـت: تـل: بـەتك:





پتـوی: ئـەنگوس: بیـسیلك: تبـل: تپلـك: گلـك: ئەموست: کللك: تلم: گوت:

هەریەك لە پێنج ئەندامی ئاخری دەسـت و قاچـی بە ئینسانەوە بەندن.

پەنجەم لەنێو پەنجەی نیٚ بڕۆین لە بۆ گەرمێنیٚ
ئێشاتلیٚ ئێشا هەمیٚ (مشتاخ- ل۱۳)

تلێن دەستا وەك ئێکن (مشتاخ- ل٦۳)

بەرۆکی بۆ دەرزیلە
قامکی بۆ ئەنگوستیلە
ئەنگوستت دەرزی زولفت ئاوریشم

هەر پەنجەیەك ناوی تایبـەتی خـۆی هەیـە لەهـەر ناوچەیەکی کوردستان جۆرێك ناوی پەنجەکان هەیە. لەناوچەی بادینان و لە ناوچەی سۆران ناوەکان وەك یەك نین بۆ جیاکردنەوە ژمارەم داناوە:

۱-(۱- پەنجەی تووتە: تووتەڵە: تووتە)
(۲- براتووتە: براتووتەڵە: براقچ)
(۳- بالابەرزە: ناوگین: ناوەڕاست: زەرنە قوتە)
(٤- دۆشاومژ)
(۵- ئەسپێکوژە: کەڵەنگوست: تلیابەرانی)

۲- لەپەنجەی بچووکەوە بۆ پەنجەی گەورە
(۱-بچین بچین)
(۲- بچینەکیٚ)
(۳- بچینە دزی)
(٤- خواهەڵناگریٚ)
(۵- سە دەمان گریٚ)

۳- لەپەنجەی بچووکەوە بۆ پەنجەی گەورە
(۱- قولینجکە)
(۲- مامە لینچکە)
(۳- دۆرە درێژە)
(٤- شادە نوێژە)
(۵- ئەسپیٚ کوژە)

٤- لەناوچەی سۆران ناوەکان بەم شێوەیە
(۱-تووتە: ۲- برای تووتە: براقیچ: ۳- بالابـەرزە: ٤- شادە نوێژە: ۵- پەنجەکەڵە: ئەسپی کوژە)

۵- لەناوچەی بادینان بەم شێوەیە
(۱-تپلا قچیلك: ۲- تپلا زۆمی: ۳- تپلا ناوەند: ٤- تپلا شادی: ۵- تپلابەرانی: تپلابەرانکی)

۱- تلیابەر کلیچك.
۲- تلیا بابیجك.
۳- تلیا ناڤین.
٤- تلیا دالاستۆکی: تلیا هلا ڤیشکی.
۵- تلیا بەرانی.

٦- لە ناوچەی کوردستانی ئێران ناوەکان بەم شێوەیە:
۱- قامکە تووتەڵە.
۲- قامکە برای تووتە
۳- قامکە هەلمە قووتە.
٤- قامکە دووشاو مژە.
۵- قامکە گەورە: کلکەڵە:کلکە گەورە)

٦- پەنجەی بچووك ئەم ناوانەی هەیە واتە ئەمانـە هەموویان ناون بۆ پەنجەی بچووك.

پەنجە تووتـە: قامکـە تووڵـە: تلیاقـە ڕەقوچـکی: کلکە پووتـە: قلـیچ: کلکـە تووتەڵـە: قـەلینجك: تووتیـــە: مـــچیلك: قلینجگـــرە: بابلیـــچك: تلیابەرکیچك: تووێتە: قەلینجەك: قولیچك.

- ئەنگوستیلە: گوستیل: ئەموستیلە: ئەموستەویلە: ئەنگوستەویلە: نگوستەویلە: نگوستیلە: کلکەوانە: گوستیلك:

جۆرە خشڵێکی بەزۆری ژنانەیە پیاویش لە پەنجەی دەکەن لە زێڕ و زیو دروستدەکرێت.

بووك نییەتی شیوی شەوێ ئەموستیلەی لێمان ئەوێ

(پەند)

جارەکا گوستیلکا ژنا پاشێ وندابی

(مشتاخ) ل٢٥٢

ئەنگوستیلەی یارێی من زێڕ و دڕ و گەوهەرە

(سێسەد ل٤٦)

ئەموستیلەی نقێمی ئالە

(مەلۆ- ل٣١)

کلکەوانە زێڕە گەورە گەورەکانی لە قامکانی کرد

(حەمەدۆك ل٤٩٦)

- ئەنگێز: هەڵایسێن: هەڵگیرسێن

- ئەنووشێروان: ١- یەکێکە لە پادشایانی بنەماڵەی ساسانی لە ساڵی (٥٣٠ز) حوکمی کردووە.

٢- ناوی کوڕانی کوردییە

- ئەنیشك: ئانیشك: هانیشك: هەنیشك: عەنیشك: بەلەمرك: قونانیشك: ئەنیزك.

ئەو جمگەیە کە باسك و قۆڵی ئادەمیزاد تێکدەکاتەوە.

دەستی تا ئەنیشکی خویناوی.

(حەمەدۆك-٢- ل٣٧٦)

- ئەنیشك کردنەوە: پێچ کردنەوە: ڕێگای کە پێچ بکاتەوە دەڵێن ئەنیشك دەکاتەوە.

- ئەو: ١- ئەوێ: ئەوی: وێ: وی: ڕاناوی کەسی جودا بۆ کەسی سێیەمی تاك.

من دەڵێم: شاری دڵم باغ و گوڵستانە دەچم

ئەو دەڵێ: نا قەسەبە شۆڕشی مەستانە دەچم

(گورانییەکانی ماملێ- ل١٢)

٢- ئەو: ئیم: هەو: ئی:

ئەو شەو: ئیم شەو: هەوشۆ: ئی شەڤ.

- ئەوا: ئەڤا: ئەوە: وا: ئەڤە:

ئەڤە ئەزێ خۆم

ئەوا رویشتم: ئەوە ڕۆیشتم

ئەوا تۆ ئەڕۆی دڵەکەم ڕووناك کە

(مەلۆ- ل٢٥)

ئەوە مانگ هەڵات دەیدات لە هۆبە، ماچکردن خۆشە نۆبە بە نۆبە

- ئەوان: وان: وا: ئەو: ئانە: ڕاناوی کەسی جودایە بۆ کەسی سێیەمی کۆ:

ئەوان لایان وابوو وایە. جاتۆ هەر بڵی وابوو..واچوو.. بەچی ئەچێت؟!

(گەدا- ل١٠٣)

- ئەودال: ١- عەودال: عەبدال: ئاودەل: ناوی کوڕانە و سووکە لە ناوی عەبدوڵڵایە.

٢-پەرێشان

- ئەوراق : ١- هاوڕێ: برادەر: ٢- کۆی کاغەز

- ئەورە: ئوورە: ئەوێ: وێ: زەمیری ئیشارەیە بۆ شوێنێکی دوور، وەرە وێ: وەرە ئەوێ:

- ئەوك: ١- ئاوك: ئیوەر: یاروو: ئەوەکە: ئەوکی: ئەوە: ئەوکۆ: ئەوکێ: هەرامە: وانەك:





وانێك: واك: یارۆ: کابرا: فیسارە: فیسکە: جایی: ئەوی: فلانی: هین:

لە شێوەزاری بادینی (ئەوکۆ: چیکۆ) بۆ ڕەگەزی نێر بەکار دێ.

ئەوکێ: چیکێ: بۆ ڕەگەزی مێ بەکار دێ لە شێوەزاری بادینان.

ئەمرۆ هەرامەت دی

(حەمەدۆك-٢- ل٥٢٧)

(لە پشتی چاوی یارۆ جێگەیی سەد زولفەقار ئەگرم)

ئەوەتانێ دەخۆنەوە قاوە لەگەڵ هەرامەی شەربەتا..

(گۆرانی تایەر تۆفیق)

ئێوە پێتان وایە هینەکەی ئێوەیە بۆیە کەم بڕشتە

(تەنەکە- ل١٣٠)

واکەکم دیت لەسەر واکەکی

واکەکم لێدا هەرواکە واکی بوو

ئەم چیرۆکە بەم شێوەیە

وشەی (واك) لە جیاتی هەرشتێ ناوی نەبەی لە ناوچەی ڕواندز بەکاردێ.

کوڕێ چۆلەکەیەکی دیبو لەسەردارێك

بەردێکی لێدابوو چۆڵەکەکەش دەستی بە جەکە جووکی کردبوو.

٢- گەرو: هەوك

- ئەویش: ئەویج

ئەویش وەك وان سوارچاك و تفەنکچی یەکی

(حەمەدۆك -٢- ل١٥٩)

- ئەوەندە: ئەڤقاس: هێندی: ئەوقاس: چقاس: ئیندە: ئەوەنە: هەندە: ئەهەندە: ئەوهەندە: ئەمەندە: ئەمەنە.

بەشێوەیەکی نامەحدود میقدارێك پێشاندەدات

... ئەوەندە بەکەیف بوو کە ئۆقرەی لێ هەڵگیرا

(حەمەدۆك)

ئەوەنەم خواردووە خەفەتی دووری

مەگەر خواوەند بدا سەبووری

(گوڵاڵە- ل٣٧)

کوڕەکە دڵێکی هەیە بەقەد دەزگایەکی ئاسنگەری ئەمەندە گەورە

(حەمەدۆك -٢-ل٣٧٥)

- ئەوەها: ئاوا: ئاهوا: ئەهوا: هوسا: هوو: وەها: وەتۆ: وەها: ولۆ: ئیوهە: وا: ئەوهالە: ڤەهوە: ئاوەها: ئووسا: ئەئاوا: ئاوها: هۆتۆ: ئیوها: ئاوقا.

١- بەم جۆرە: بەم شێوەیە: بەم تەرزە.

٢- بۆ دەربڕینی هەستی: بە دڵ نەبوونی قسە یاکارێك، بەراوێژی سەرسووڕمانەوە دەکاردەکرێ

کە واتا ئاوهایە ڕەسووڵە فەتی؟

(تەنەکە- ل٦٨)

ئاوەهایە گەورەم

... خەلیفەی ئیسلام ئاوای ئیحترامی سوێند و قورعان دەگرت...

(تحفە-٢- ل١٢٦)

ئەمنیش بۆیە ئەو عالەمەی والێ دەکەم

(تحفە-٢- ١٦٣)

ئاگادار و پاسەوانی شوێنەواری کەونەرامان
ئاوەهامان لۆباس دەکەن.
(شەرەف- ل٤٢٨)

- ئەوی: وی: ئەو
ئامرازی ئاماژەی (ئەوی) (وی) بۆ دوور بەکاردێت لە شێوەی باکوور بۆ (نێر) بەکار دێت بەرامبەر بە ئامرازی ئاماژەی (ئەو) بۆ دوور لە شێوەزاری سۆرانی.
وی قەلەمی نەفرۆشە

- ئەویٰ: ویٰ: وێنەری: وەردیٰ: وێندەری: وێریٰ: ئاگە: لاهیٰ: لەوڕ: لەینە: ئەوێندەریٰ: ئێراهیٰ: ئێرایهیٰ: ئەو: ئەورە: راناوی نیشانەیە بۆ شوێنی دوور

- ئەه: ئەه: وشەی بانگ کردنی باز لەلایەن قوشچییەوە بۆ ئەوەی بازەکە بێتە سەردەستی.

- ئەهریمەن: رمووزن
سەرچاوەی کاری خەراپ لە ئایینی زەردەشت.

- ئەهۆ... وەه: وشەی سەرسووڕمان

- ئەی: ١-ئەم: ئەو:
راناوی (ئەی) لە شێوەزاری لوڕی و کەڵهوڕی بەرامبەر بە راناوی (ئەم) لە شێوەزاری سلێمانی و (ئەو) لە شێوەزاری هەولێر.
ئەمجا بەو ئەی خەرە لەو قوڕاوە دەربکە: ئەمجاوەرە ئەو کەرە لەو قوڕاوە دەربکە.
٢-ئەدی
٣- ئامرازی کەسەرە
ئەی بۆلای ئێمە ئەوەندە کوڕ و کرێن و خاپوورە.
(گەدا- ل٩٦)

- ئەیاغ: بێ نرخ: قرپۆك: قرپۆل
شتی خەراپ و گەندە (کاڵا، میوە، ئاژەل)

- ئەیالەت: ناوچە: مەڵبەند:
یەکێتییەکی بەرێوەبەرایەتی بوو لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی هەموو وڵاتی عوسمانی لە (٢٦) لیوا پێکهاتبوو.

- ئەی چە: ئەی چی: ئەدی چ:
ئەی چەء بێژم ئەوەرەحمان و بمگرن؟ (گەدا)

- ئەیرۆ: هەی رۆ: ئەیەرۆ: وەیرۆ: ئۆرۆ:
هەی رۆ... هەی پیرەی سەرەشێن ئەوە چییە.
(ئاشتی- ل١٤٠)
ئەیرۆ خانم گیان توخوا بۆ دوعای شەڕ لە هاومالەکان دەکەی. (گەدا- ل٣٨)
بۆ دەربڕینی داخ و کەسەری تێکەڵ بە سەرسووڕمانەوە.

- ئەیوت: دەیگۆ: مواتش
قسەی کەسی سێیەمی غایبی تاك.

- ئەیوان: هەیوان: هێوان: بەرسفك: بێرایی:
ژوورێکە سێلای دیوارە و دیواری چوارەمی نییە دەکەوێتە نێوان دوو ژوور یابەرەوەتر یا نهۆمی سەرەوە.
کردت بەعادەت هەیوان دانیشتن
چاوان دەگێڕی بۆ جاحێل کوشتن
(فولکلور)
کەزیێ مۆمنی هەشتن
لە هەیوانێم دەشوشتن
(هۆنراوە- ل٣٧)





- ئەیە: ئەمە: ئەوە:
راناوی ئاماژەیە( ئەیە) لە شێوەزاری لور و کەڵهوڕی بەرامبەر بە (ئەمە) لە شێوەزاری سلێمانی و بەرامبەر بەڕاناوی (ئەوە)یە لە شێوەزاری هەولێر
ئەیەمنم وەی ئەسپەوە
وەتویرەکەی پڕ قەسپەوە
ئەمەمنم بەم ئەسپەوە
بەم توورەکەی پڕ لە قەسپەوە

- ئەییەی: بۆ سەرسووڕمان بەکاردیٰ لەکارێك یاشتێك
ئەییەی لەو درۆیەی!

- ئی: هی: هینی
... رەنگە ئەوانەش هینی چارەڕەشێکی
وەك من بن ...
(گەدا- ل٨٦)

- ئیبراهیم: ئیبۆ: برایم: بلە: بلۆ: برایۆك: ئیبراهیمۆك: ئیباو
ناوی کوڕانە
لە پاشنیش کە برایم پاشای نەگریس
و بێ فەرِدژی دەوڵەت راپەڕی و
(شەرەف- ل٢٥٢)

- ئیپراغ: یاپراغ: ئاپراغ
ورتکە برنج دەپێچن بە گەلامێو و پەلکە پیوازی

- ئیپەك: ئاوریشم

- ئحم: گەرو پاك کردنەوە
بە ئحم، ئحم رووی قسەی تێ کردن و
(غەوراره- ل٨٧)

- ئیجازە: دەستوور: ودم: ورمێ

- ئیجازە وەرگرتن: ١-فەقێ کە خوێندنی تەواو دەکرد و ئەبوو بەمەلا و ئیجازەی وەرئەگرت واتە خوێندنی مەلایەتی تەواو دەکردەوە.
٢- ئیزن خواستن:

- ئیختوویگو: ئیشتوویگو: ئەژدەها

- ئیجباری: زۆرەکی: زۆربایی

- ئیچ: هیچ
ئیچ باب و برام نەماون
(تحفە-١- ل٣٣٢)

- یەدە: یەدەگ: دەژ: نوستوو:

- ئیچ قەلعە: ئیچ قەڵا: ئووچ قەڵا: ئیس قەڵا: ئیش قەڵا: وشەیەکی تورکییە: ( ئیچ قەلعە: واتە قەڵاتی ناوەوە لەسەر زاران سواوە بووەتە ئووچ قەڵا... هتد لە کوردستان زۆرە.

- ئیحتکار: تالگرتن: یەکپەڵی: نۆتە نۆتەگرتن: قۆرخ: کشف.
بۆچی مردووش کالا کوتاڵە پەساو ئیحتیکار بکرێ

- ئیحتیاج: پێویستی
فەرخ خۆی پیس ناکا خاوێنە ئیحتیاج بەلانکی ناکا.
(تحفە- ل ٢٤)

- سەرپێی

- ئیدکە: هیتر: ئیدیکە: بێدی: ئیتر: ئیدی: ئێدی: ئیٰ نەدی.
دیتمان ئێدی چارەمان نییە...(حەمەدۆك- ل٤٧٨)

- ئیزراب: مانگرتن: هۆك

- دەستوور: ڕێ: ئانەهی: ورمێ: هێـژتن: هێـشتن: هێڵان: خولْك: دەسوور: ودم: بار: ئیجازە

لەئێمەوە ئیزن بە، لەمەوە ئیزنە
بەبێ ئیزن مەڕۆ
ئیزنت وەرگرت

- كەڵەكە: قەرەبالغ: كەرەسیسە: چـرە: جـەنجالی: پاڵەپەسـت: تێكـچڕژان: حەشـامەت: مرێنكـە: ژلووڤیان: مرۆشیان: ئاپۆرە:

كۆمەل و جەماوەری خەلك
دەوریان لە شتێك دابێ

- داخووت گرتنەوە: نەخشە لێدان نووخشە لێـدان: داخووت: باشترین ویست:

قورئان گرتنەوە بەو مایـەی بەتـەمایی پێـشبینی كردن كەلی خۆ فلانە كار چاكە یان خراپە.

- ئیستلاح:

زاراوە: راوێژ

- ئیسماعیل: سمە: سمۆ: عییلـە: سمكـۆ: ئیـسۆ: ناوی كوڕانە.

- ئیش: كار: پیشە: شۆل: شوول: فـەرمان: كـردە: كردار: كردەوە: شوخول

ئەم ئێزدی شوخول ئوسادبە (ستران-ل١٨)

- ئیشارەت: هێما: كێشاك: ریزانی:

- ئیـشاللا: شـاللا: خودابیـەوی: بـەئیزنی خـودا: بەیاری خوا.

- ئشتیا: مـەگیرانی: مـەگرانی: مێگـز: كـەووژ: هۆك: بێز: مزێچ: تاسە: قیـل: دلّـبردن: دلّبۆچـوون ئارەزووی خواردەمەنی.

- ئیشق:١- ڕۆناكی: رووناهی: رووناكی

٢-عەشق:

- ئیشك: هیشك: هشك: وشك: حـشك: ئـشك: زوا: یشك: ویـشك: رقڕقـۆك: هەوشـان: زوهـا: دێم: تەرسی:

١-شتێك یان جێگایەك ئاوی نـەبێ، شـەنە بـێ نمی نەبێ.

٢-حاڵی شـتێكی لەپێـشدا تـەڕایی تێـدا بووبـێ پاشان نەمابێ.

- ئیعلام: راگەیاندن: راگەهاندن: خەبەر: خەوەر.

- ئیبیع: وشەی قیز و بیزلێ بوونەوە.

- ئیسالّ: ئەوسالّ: ئەم سالّ: هەوسار.

- ئیشی شوان: ئەوەیە شوان لـە هـەردوو شـەرتان ڕۆژ تا ئێوارە دەچێتە بەر مەڕی لە وەرزی هاویندا لەبەر گەرمی لە سەعات (١١) بەیانی دەهێنایەوە تا چواری ئێوارێ، بەیانیش لەگـەلّ مـەلا بانگـدان لێی دەخورێت دەچێتە لەوەڕگا.

- ئیفترا: تۆمەت: بۆختان: بوختان.

- ئیفلیج: شەپلە: شەپڕە.

- ئیفلیج بوون: شەپلە لێدان.

- ئیقلیم: ناوچە: هەرێم: ولّات: دەڤەر: مەحال

- ئیقلیم گیر: باران سەرانسەری ولّات بگرێتەوە.

- ئیلاهی: ١- خودایە:

٢- بەتایبەت:

- ئیلحـاح: ركـە: پێـداگرتن: ركـۆ: بنـاركردن: پێگیری: پێدانووسان: هەرتەگرتن: لەسەر رۆیشتن





- ئیمتیحـــان: ئـــازموون: ئـــەزموون: تاقیكردنەوە: زمینی:

- ئیملا: نژوە: نووسیار: نووسەوەری.

- ئیمزا: واژۆ: مۆر: دێخنوس:

نیشانەیەكە لە كۆتایی نامە دادەندرێ.

نووسینی ناوی نووسەری نامەیە بەشێوەیەكی تایبەتی لەپای كاغەزان بۆ ئەوەی بزانن كێ نووسیویە.

- ئینان: هینان: هێنان: هاوردن.

- ئینتەلا: گرفت: هەرس نەبوونی خواردن لـە نـاو مەعدەدا ئەبێتە زگ تووندبوون.

- ئینجەت: هەنجەت: حێجـەت: ئەنجـەت: پـەلپ: بیانو: بەهانە: مهانە: بیانگە: بیانكە: پاپە: بیانك: رك: ویانە.

١- وشەی پاكانەكردن.

٢- گـەڕان بـە دوای هـۆیكی وا بـۆ تێكـدان و نەكردنی كارێك.

مەلا حەسەن پاپەی لە من گرتییە...
(تحفە-٢- ل١٣٩)

چاوەڕەشەكەت پڕكـە لـە دەرمـان بێـرە ماڵەكـەم
بەبیانكەی هەرمان (گولاّلە)

هەنجەتی تڕی نانی جۆیە (پەندی كوردی)

پەلپی بەم دەگرت و بەهانەی بەو دەگرت.
(شەرەف- ل ٧٤)

شۆڵەش پەی یانە وەبێ و یانە
(چەپكی گۆل ل١١٢)

- ئینكار: مل نەدان: مل پیانەكردن:

- ئینگۆ: ١- هی ئێوە: ٢- ئەنگۆ: ئێوە:

- ئـێ: یـێ: جێنـاوی خـۆیی بـۆ نێـر لەگۆڤـەری شەنگالی و ئامێدی.

واتا (ئی): هی: دەبەخشێ لە شێوەزاری سۆرانی.

- ئێ میە: یێ منە: هی منە: ئی منە.

- ئیهتمـام: مـشور: بۆتـەدان: خـەم لێ خـواردن: بەتەنگـــەوە بـــوون: دەربەنـــدی: دەربەســـتی: مشورداری: نەخستنە پـشت گـوێی: خـەم خـۆری كردن: بایەخ پێـدان: لێ خـەفتان: لەخـەم دابـوون: دەخەم دابوون.

- ئێـچك: دارێكـی لووسـی كەوانەیـە بەسـەر كەژیەوەیە بۆ بەستان بەكاردێ.

- ئێخـسیر: ئەخـسیری: یێخـسیر: دیـل: ئەسـیر: یەخسیر: هەسیر:

سەرباز یا هەر شەڕكەرێك یا چـەكدارێكی تـر كـە لەشەڕا بەزیندوویی دەكەوێتە دەست دوژمن.

ئەی نەفام چۆن شێر ئەسیری پەنجەی رێوی ئەبێ
(دیوان ئەحمەد ل١٥٧)

بوومە یەخسیری مەككەی كەتم لە بن دیواران
(هۆنراوە ل١٤٧)

ئەگەر تەماشای كـرد: دوو كەسـان ئێخـسیرێكیان هێناخوارە.
(تحفە-٢-ل٢٤)

تاكەی رەنجی شان و پیلم
بۆ دوژمن بێ، بۆ من دیلم
(تاریك و روون ل١٨٧)

٢-بریتییە لە گیرۆدەبوون
دیل و ئەسیری دووچاوی كالّم

حەقم بەدەستە بۆ تۆش بنالّم.

(فۆلکلۆر)

- ئێد: ئەمە: ئەوە: ئەڤ: ئەڤا: ئەڤە: ناوی ئیشارەیە بۆ نزیك.

- ئێدەن: ئەمەیە.

- ئێدی: هی تر: ئەویدیکە.

- ئێر: ئاگر.

- ئێرش: هێرش: هۆمەن: شالاو: هەلّمەت: پەلاماردان: بەسەرردادان.

لەپڕ بەسەری دادان و...

(شەرەف- ل٣٧٧)

دوای هێرشەکەی ئەفغان و هاتنی تورك...

(شەرەف- ل٢٢٨)

- ئێرە: هرە: ڤرە: ڤرا: ئێرەکانە: ئێرانە: ئێروکانە:

ئەمرۆ دووبارە دێتەوە فێری

ئێرە بووە. ئێرەی پێ خۆشە.

(حەمەدۆك)

ئێستاش هاتوویەوە ئێرە، هاتوویەوە ئێرە، دەگەڕێی: دەلێی و دەلێی ئەمن حەمەدۆکم

(حەمەدۆك-٢-ل١٩٥)

- ئێریاییێ: سەلامەت:

- ئێزدان: یەزدان: خودا: خولا:

- ئێزدخان: زاراوەیەکە بۆ وێ دەڤەرێ بکارتێت کو ئێزدی تێدادەژین:

- ئێزدی:١- بەو مانایەی ملەتی ل پێ ئێزی و طاوس مەلەك دچت دێت:

٢-نازناوی خەلّکی ئێزدی

مەحموود ئێزدی

- ئێزدییاتی: واتە ئەو کار و خوورەوشتەی دان و ستاندانەی میللەتی ئێزدی هەلّسوکەوتی پێ دەکەن.

- ئێزنگ: زەنگە: چێو: چێلك: چولّسك: هێزم: چۆ: برك: بێ ولك: داری براو: قەتا: کرزە: ئەبخێنە:

داری سووتەمەنی بۆ سۆبە و تەندوور: گزرە.

سوتەمەنی گەرماوانیش هەر ئێزنگە.

(شەرەف- ل٨٦٠)

- ئێزی: گەلێك را بیر و بۆچوون بەرامبەر بە وشەی (ئێزی) هەیە و ئایا ئەم وشەیە کەینێ هاتۆتە نووسین تا ئێستا بەتەواوی روون نەبوویتەوە یەکێك لەم را و بۆچونانە دەلّێ مەبەست لە وشەی (ئێزد) (خوایە) چونکە وشەی (ئێزد) لە وشەی یەزدانی فارسی نزیکە یان (باژێری یەزد) نزیکە ئەم پەیوەندییەش ئەوە روون دەکاتەوە کە (ئێزدی) پاشماوەی دینێکی کەونی ئێرانییە.

- ئێسالّ: ئەمسالّ: ئەوسالّ.

- ئێستا: وێستا: هەرئێستا:

نەهۆ: ئەلعان: نوها: هەنگاڤی: ئێستاکە: هەنگاوی:
گوڤ: نوکە: هەرئێستە: وێسا: وێستی: ڤێگاڤێ:
هەنووکە: هێمانە: هەوکە: هەکە: ئیسا: ئێستاکە:
نووھ: ئیساکە: ئیساکی: ئیستاکانێ: ئیستاکانی:
ئیستەکوونی: ئیستە: ئێستە: نۆکە: نووکە: نها:
نهە: نهۆ: هەنکوە: هەنکە: ئیساکوونێ: ئێستاکە:
نهوو: ئەلعان: ئیسە: ئەوێستا: ئیستاکانە:

ئەوەدەمەی تۆ تیایت.





بابە هەنووکە کووم دەبینیت... (غەوارە- ل٩١)

ئەوا ئیسە گشتی بووگە وە هیچ

(گەدا- ل٦٦)

دەیانگوت هەنووکە نا هەنووکە سۆرە دێت

ئەو بەلایەمان لەکۆلّ دەکاتەوە

(بۆرە-ل ٨٣)

یەکێك سەرگەرمی شێوە ئێستەکانی

یەك خەریکی وەردە

(تاریك و روون- ل٦٠)

... هەر لە هەنکوە دەست بە کوشتنەوەی بکەی هەتا سارەکیدیکە... (لاوك- ل١١٧)

ئەوێستاش گۆر خەریب زۆرن وەکو تۆ

ئەوئێستاش بێ نەسیب زۆرن وەکو تۆ

(تاریك و روون- ل٢١٦)

ئیستە کە کوردە هەمووبێ هەم و بێ دەرد و خەمە.

ئەلعانەکەش بزانم لۆ چ هاتی بەخێر بێی...(لاوك- ل٢١)

- ئێسك: هێسك: هێستك: سخان: سووقان: یێسك: سوقان: پیشە: سوخان: ئێسقان: هێستی: هەستوو: هێسوو: سقان: پێشە: پەلان: ئێستك: پلان: هەستێ: هێستە: ئێسخوان: هەستی: یەسك: یەسقان:

ئەو شتە رەق و سەختەیە کە هەیکەلی لەشی ئادەمیزاد و گیاندارانی تر خاوەن تیغەرە پشتی لێ پێکهاتووە و نەرمایی لەش بەوەوە راوەستاون لە (فوسفات) و کاربۆناتی کالیسۆم دروستبووە دەرەوەی ئیشك و سەختە و لەناوەوە بەشێکی تەڕ و نەرمتر(مۆخ) هەیە.

دەستی هەر ئێسقانی رووت بوو

(گەدا- ل٢٢)

دار و بەرد و ئاسن و پۆلاینم گۆشت و ئێسقانم، پەکم کەوتووە (گەدا- ل٩٩)

یەك یەك ئێسکەکانی دەکرووسییەوە

(حەمەدۆك -٢- ل٢٩٨)

- ئێسك سووك: خوێن شرین: خێن شرین: هێسك سووك: رووح سووك: قشت: رەزاشرین: رەزا سووك: ئینسانی لە بەردلان، کەسێکی شکل و شێوە یاجوولانەوە و ئاکاری لەبەر چاوی نەخا.

- ئێسك گران: ناشرین: بێ رەزا: ناحەز: رەزاتالّ: رەزا قورس: خوێن تالّ: خینتالّ: نازەریف.

مرقن: گوشتالّ: ناپەسند: ئیسك قورس: سایە شووم: کریت: دزێو: کرێت: بەدفەسال: بەدسایە: فەسال گران.

کەسێکی لەبەر شکل و شێوە یاجۆری هەلّسان و دانیشتنی نەچێتە دلانەوە.

پیرە گورگێکی بۆری سەر زل و فەسال گرانی لە دوایە. (بۆرە- ل٢٢)

رووناکی خوشکی بەو منالّی و جوانییە بدرێت

بەو ئاغا پیرە بێ رەزایە کە ئەلّێی مۆتەکەیە

(ئاشتی- ل١٢٣)

- ئێستر: هێستر: هێسر: قاتر: قانتر: هەسر:

١- دایکی ماینە باوکی کەرە پاش چاکردنی دوانزە مانگ دەبات دەزێ بێچوەکەی سالّی دووەم پێ دەلّێن (کۆرەبژ) سالّی سێیەم ئێستری تەواوە.

٢-فرمێسك: رۆنتك

٣- بریتییە لە مرۆی کەتەی بێ عەقل.

٤-جاشەکەی واتە بێچووەکەی بەناوی خۆیەوە دەناسرێ و دەڵێن جاش ئێستر.

- ئێستر سوار: جاندار: جەنگدار: زەفتییە: قاترسوار: پۆلیسی زەمانی عوسمانی بوون پێیان دەگوتن (زەفتییە) کە بە رۆژ یارمەتی (ادارە و محکمە) یان دەدا و بەسواری ئێستر بۆ گوندەکان دەچوون.

- ئێستری ماچە: کورەبژی ساڵی سێیەمی تەواو کردبێ و مێیە بێ.

- ئێستری نێرەکی: کورەبژی ساڵی سێیەمی تەواو کردبێ و نێرەبێ.

- ئێك: ییێك: یەك: هێك:

ژمارەی پێش ژمارە دوو.

- ئێکجار: ییێکجار ئێجگار: یەکجار: هێجگار: هێگجار.

پێش خواردنەوەی بێ ژمارە هێجگاری مەنگی کردبوو. (ئاشتی- ل١١٠)

... دارستانەکە هێجگار پڕبوو...

(گەدا- ل٨٥)

- ئێکدی: یەکتر: ییێکدی.

- ئێکدین: یەکترمان: ییێکدیمان: ئێکدیمان.

هەموو دنیا تێگەیی ئەمن و توو ئێکدیمان خۆشدەوێ (فۆلکلۆر)

ئەمە دەگەربابت حەفت رۆژان ییێکدیمان هێناو بردییە. (لاوك- ل٢١)

- ئێگە: ئێرە: ئەو شوێنەی ئێستا تێدای.

- ئێل بەگی: سەرۆکی عێل: سەرەکی هۆز

- ئێل: عێل: خێڵ: لەچەند تیرەیەك پێکدێت.

پیاوێك چو بۆ جەلەبی، چو بۆ نێو عێلی مامۆدیان...

(تحفە-١- ل٣٣٥)

- ئێلتمور: یەلتەمەر: ناوچەیەکە لە کوردستانی ئێران.

- ئێمش: میوە: مێوە: فیقی: فێقی:

بەری داری هەنار و هەرمێو ترێ و قازمانە و مێوژ و قەیسی و ... هتد.

- ئێمە: ١- ئیمە: ئەمە: مە: ئەم:

راناوی سەربەخۆی کەسی یەکەمی کەسی کۆیە ئەوانەی قسە دەکەن.

لۆخۆت پیاوەکی باش بە

تورگ مریشکی مەنابە

(هونراوە- ل١٧٦)

بەشی ئێمەی نەدا لەو خەست و خۆلە

(تاریك و روون- ل١٤٨)

٢-واتە هی ئێمەیە

- ئێوە: ئەوە: هوین: هنگۆ: ئەنگۆ: ئینگۆ: وە: ون: هن: هەنگۆ: هوونگ: ڤەهێوە: هوون: ئەنگو: شمە: هەوە: هێوە: ڤە: هنگ: ئەنگوە: نگوە:

راناوی سەربەخۆی کەسی دووەم کۆیە.

ئەوانەی قسەیان دەگەل دەکرێ

هوون مە خەلاس کەن ژ قەدایی ژ

بەلایی غەلایێ.

(ئیزدیاتی- ل٣٠)





ئەنگو میوانن، بەخێربێن، سەرچاوەکانم

(تحفە-١- ل٢٧٠)

هوون نایێن: هنك ناهێن: ئێوە نایێن: ئەنگۆ نایێن: شمە ساناتا: واتە ئێوە سەندتان

... براینە ئێوە لێمان ببورن...

(حەمەدۆك-٢- ل٤٧٨)

- ئێوار: هێوار: ییێوار: هێڤار: ئێڤار: ئەنگور: هنگۆرڤ: بەربانگ: سەرشەو:

کۆتایی رۆژ و سەرەتای شەو.

بی ئێڤار چاخێ شیڤێ شیڤ ئانین

(مشتاخ- ل١٣٣)

ئێوارێ تەکبیر، سبحەینێ باران

دەدا لە گۆنای ناسك و نازداران

(گۆرانی حەسەن زیرەك)

دانی ئێواران و بەدرێژایی شەوگاران لەبەرنوێژان نەسرەوتن.. (شەرەف- ل٤٠١)

هێواران لە دەلینگان سێ رێزەت لە کلاوی

(پەندی کوردی)

ئێوارە بوو دیم هاتەوە لەکانی

(مەلۆ- ل٤٤)

# ب

١-پیتی -ب- دەنگ گۆڕكێ دەكات لەگەڵ "پ"
وەكو ئەمانەی خوارەوە:
بچووك: پچووك
بچۆ: پچۆ
٢-بە پیتی -گ- دەنگ گۆڕكی دەكات
نۆبە: نۆگە
٣-بەپیتی -ڤ- دەنگ گۆڕكی دەكات
باب: باڤ
دبێژن: دڤێژن
٤-هەندێ جار پیتی -ب- بە پیتی -و- دەنگ گۆڕكێ دەكات
باران: واران
بابان: باوان
بارۆك: وارك
خەبەر: خەوەر
بیر: ویر
بێشە: وێشە
باب: باو
٥- دەبێتە (بە)
بویك ب دلێ گورگی زاڤایە.
(كانی — ل٣٠)

- با: ١-تڕ: ٢-وا: بەدرێژایی ساڵ و لەهەموو وەرز و ڕۆژێكدا هەڵدەكا.
(بایەكی لێبەربوو: واتە تڕێكی كرد.)
ڕۆژێكی زۆر تۆف بوو، بە باوەكرێوەی دەكرد...(گەدا- ل٢٦)
٣- بدا
خوا مرادم با، باخم بەربێنی
بۆ خۆم پێ خەسووكوڕم ژن بێنێ
٤-دەبا
بابێ: دەبابێ
٥- دا
بابچین: دابچین
٦-بایە: بووایە
لەجێی من با چی دەكرد.

- باب: باوگ: باوك: باو: باڤ: بوە:
پیاوی ژن بێنێ و منالّی ببێ پیاوەكە دەبێتە (باب)ی منالّەكان.
لەپاش كوژرانی بابەكەی ... (شەرەف- ل٣٢٢)
حاجی ڕۆستەم بەگ لە عیراق بیستیەوە كە بابی كوژراوە ... (شەرەف- ل٣٤٧)

- بابا: نازناوی پیاوی ئایینییە.
وەك: باباتاهیر، بابە ئەسكندەر.

- بابانە:
چۆلەكەی نێر، تەیری نێرە.

- بابایەتی: بابێتی: باڤێتی: باوكایەتی.





- بابت:١- ولاّیەتی ولاتی (لۆلۆ) بووە كە ئێستا (بازیان)ی پێ دەڵێن: ٢- باوكت
- بابچاك: پیاوی چاك شێخ و پیاوی بەدین و خواپەرستی ناو یەزیدییەكان.
- باب عالی: لە چاخی عوسمانییەكان بەكۆشكی شاهانەی عوسمانییەكان ئەوترا.
- بابن: بابمان: باوكمان: واتە باوكی ئێمە.
- بابو: باوكتان: بابتان: بابی ئێوە
- بابۆ: بابە: باوكە: باوە: بابا:
١-وشەی بانگ كردنی باوك
"بابە منداڵ بوم، بوم بەفەقێ (تحفە -١-ل٢٤٢)
- بابۆلە: نەوالە: مچۆڵە: ملۆچە: تیكەی گەورە.
- بابۆك: ١- باب+ئۆك: ٢- ناوی كوڕانە
- باڤۆ: باڤە: بابە: بابۆ:
- باوكە: ١- بابە: ٢- ناوی كوڕانە.
- بابەكەم: وشەی ڕێزلێنان.
دایكی خاتوون ئەستی هاتەكنی، گوتی "بابەكەم، دەبیە شوان (تحفە-٢- ل٧٠)
- بابی بابم: ١- واتە باپیرم.
٢-وشەی ڕێزلێنان بۆ لە خۆ كچكەتر.
٣-بابێ بابم: وشەی ڕێزلێنان بۆ لەخۆ گەورەتریش.
- بابێ بابم شێخ مەحموود لەگەر دەزگای دانا بەخۆی لەداری كەلی خێوەتی لێ هەڵدایە
(سێ سەد- ل٤٠)
- بابێ: بابی: باوكی
بابێ وی: بابی وی: باوكی ئەو.
- بابێ تە: باوكی تۆ: بابی تو.
- بابێ شێخ: یەكەم پلەیە لە ئایینی یەزیدییەكان كە وەك نازناوێكی ئایینی دەدرێتە پیاوە ئایینییەكانی یەزیدی لەگەڵ دا بابێ شێخ (٧) حەوت پلەی هەیە وەك نازناوێكی ئایینی دەدرێتە پیاوە ئایینییەكانی ئێزدی وەك ئەمەی خوارەوە:
١-بابێ شێخ.
٢-بابێ گاڤان.
٣-پێشیمام.
٤-بابێ چاویش.
٥-نەقیب.
٦-میر حەج.
٧-قەوال.
- باپیر: ١- باپیرە: كالۆ: باوكی باوك:
٢- ناوی كوڕانە.
- باپیرە گەورە: باوە گەورە: باوا:
باپیری دایك یان باپیری باوك.
- باپیرە: ١- وشەی بانگ كردنی باپیر.
- باپیرم: ١-واتە باپیری من.
٢-وشەی ڕێز لێنان
حەمە باپیرم چۆنی؟
- باجانەسور: تەماتە
سەوزیە بە تۆ دەچێنری بەرەكەی شێوە خرەو پانە لەگەڵ زۆر شت دەخورێ.
- باجگر: باجگێر: باج ئەستێن باجەوان: رادار: قۆڵچی.
ئەو كەسەی بەفەرمانی دەوڵەت دەسەڵاتی وەرگرتنی باجی هەبێ.

خۆزیا بە خۆزیاداران باجگر و باج ئەستێنی
ماچان بام لەسەر پردی رواندزێ
(گۆرانی حەیران)

- باخ: باغ: دەهل: سەرجەم
پارچە ئەرزێکە داری میوەی لێ نێژرابێ
سینگت باغی جەنەتە
جووتێ نارنجی تێدا.
(فۆلکلۆر)
باخێکم ناوە لە عەبابەیلێ
شەمامە بگرێ بۆ دەستی لەیلێ
(مەلۆ ل٧٩)

- باد: قەد
دووباد: واتە دووقەد

- بادگلان: باجەلان: بەشێکە لە هۆزی گۆران وشەی (باجەلان) لە وشەی (بادگلان) ەوە هاتووە، واتە ئەوانەی خانوو لە قوڕ دروستدەکەن وەیا نیشتەجێی خانووە قوڕەکان.

- بادە: مەی: عارەق: عەرەق.
بەخوا شیشەی دڵم دایم لەبادەی عەشقی تۆ کەیلە
(دیوان ئەحمەد- ل١١٦)

- بادە خۆرەوە: بادە خۆر: عەرەق خۆر: ئارەق خۆر.

- بادی: دەفر: جام: تاس: ترار:
لەدار یان لە فافۆن دروستدەکرێ
بۆ ئاوخواردنەوە و هەرکارێکی تر بێ

- بادیلە: بادی بچووك: جامی بچووك

- بادینان: بەهدینان
١-فەرمانڕەوایانی (عمادیە) ئامێد، کە بەبادینانی بە ناوبانگن لەرۆژی خۆیدا لە وڵاتی شەمزینانەوە بەرەو ئامێدی هاتوون بەر لەوەش کە ئەو کۆچوبارەبکەن قەڵای (تارون) یان بەدەستەوە بوو کە سەربەشەمزینانە ئەو کەسەش کە دەیپێشدا ماڵە خۆی لەشەمزینانەوە هێناوەتە ئەو ناوە، ناوی (بەهاء الدین) بووە، بەو هۆیەوە ئەو بنەماڵەیەی کەلەو کەوتوتەوە بە (بادینان) ناویان ڕۆیشتوە).
٢- فەرمانڕەوایەك بووە بەناوی فەرمانڕەوای بادینان.
٣-سەردەمی میرنیشینی بادینان بووە ناوی عەشیرەتی میرنیشینەکە.
٤-بووەتە ناوی جوگرافی بۆ ناوچەیەکی کوردستان بەناوی ناوچەی بادینان.
٥-شێوەزاری لە زاری کرمانجی سەروو لە زمانی کوردی بە ناوی (شێوەزاری بادینان).
٦-بووەتە نازناوی هەموو خەڵکی بادینان.
عەزیز بادینی، خەلیل بادینی

- باراش: ١- بار ئاش: بەو دەغڵە خاوێن کراوە دەڵێن کە بۆ لێکردن و نانی ساڵی داندرایە.
٢-پێوەرێکە بۆ کات بەکاردێ : بادوو باراشی لەگەڵ بخۆم ئەو جا تێی دەگەم.

- باران: ١- هاتنە خوارەوەی ئاو لە ئاسماندا
باران ئەبارێ نم نم دای داوە
(مەلۆ- ل٧٩)
٢-بووەتە ناوی کوردی.
٣- ئاوازی چەند گورانییەکە لە زمانی کوردی وەك
١-بارانە و بارانە      ئەی هەوای بارانی خۆشی





٢-باران باران      نم نم تەڕمی کرد

- باراناو: باران ئاو: ئاوی بارانی: کۆبووەوەی شوێنی نەورایی وەرزی زستان
باراناوی گەلی "عەرەب کوژا" و ئەملا و ئەولای دەڕژێتە کەندێك...      (غەوارە- ل٥)

- بارانی ورد: بارانی زۆر ورد لە سەرخۆ.
- بارانی بەهاری: بارانێکی زۆر بە ئاو کەم خایەن
- بارانی پەڵەی: بارانێکی نەرمە چەند شەو و چەند رۆژ لەسەر یەك خۆشی ناکاتەوە تا ئەرز تێر ئاو دەبێ.
- بارانی زستانی: بارانێکی زۆر دەباری لەوەرزی زستان زۆر جار چەند رۆژێك دەخایەنێ.
- باران لێ کردنەوە: باران راوەستان: باران کڕکردنەوە.
- بارانی نەرم: بارانی هێدی: بارانی ورد.

- بار بوو: باروبوو: پیتاك: پۆیلانە: پارووبو: تروانە: پۆیلە: یاریکردن: یاریدەدان: داشن: بەراری: پارە بوو: ئاوڕلێ دانەوە: یارمەتیدان: لاکۆش: کۆمەککردن: کۆمەگکردن:
دۆستیان خۆش بوێ و کۆمەگ و یارمەتی بدەن و باروبووی لێ وەرگرن.
(دم دم- ل١٠)
پێشکێش کردنی شتومەك، کەل و پەلی ناو ماڵ، پارە، یا هەر شتێکی دیکە لەلایەن چەند کەسێکەوە بەیەکێك بۆ هەڵسوڕاندنی کارێکی وەکو ژن هێنان مل پێکەوە نان و خانوو دروستکردن.
ئەمن و خەڵکی باربۆشت دەکەین
(غەوارە- ل٨٥)
بەلام سولتان مستەفا ب کۆمەگی (بەهاء الدین) بەگی حەزۆ کە خاڵۆی بوو ڕووی کردەوە ئەستانە
(شەرەف- ل٢٠٦)

- باربۆکەر: یارمەتی دەر: هاریکار
- بارتەقا: شان بەشان: هاوزا، هێندە.
لەدەوڵەمەندی هەنگرابوو، نەك لە گوندی بەڵکو لەناوچەکەداکەس بارتەقای ئەوی نەبوو...
(غەوارە- ل٥٦)

- بارزان: ١-بەرزان: بەندین: راسەرین: زورگ و هەڵات و بەرزایی.
٢-ناوی گوندێکە لە کوردستان کە شێخەکانی بارزانی لێ دادەنیشن.
٣-بووەتە ناوی جوگرافیای ناوچەیەکی بەرفراوان.
٤-بووەتە نازناوی بنەماڵەی شێخەکانی بارزان.

بارکووڵە: ئەندازەی ئەو بارەی کەسێ بە کۆڵ هەڵیدەگرێ.

- بارگیر: ١- بارگین: ماینی رەسەنەکەی باش نەبێت بۆ سواری دەیکەنە هی بار ئەوبارگیری پێ دەڵێن.
... کۆنە بەگێگی بارگین تۆپیو... (گەدا- ل١٤)
٢-بریتییە لەمرۆڤی چوار شانەی بێ عەقڵ.

- باروبنە: بارگەوبنە.
- بارودان: جەژنێکی وەرزییە مەڕدارەکان ئەیگێڕن کاتێك ئەچن بۆ لە وەرگەکانی هاوین.
- بارۆ: ١-بێنی: بینی: ٢-سووکەڵە ناوی بەهرام
- بارۆتۆ: بتهێنێتەوە:
- بارۆش: بهێنی: بینی واتە ئەو بێنیت.
- بارە: بێنە: بینە:

بێنە ئەما ناوی مەبە.
(گەدا)
- بارەما: بمانهێنە: بما نهینە.
- باری: ١-بێنی: ٢-کاری رابردووەی بارین
- بار: پیوەرێکە بۆ تەمەنی هەندێ پەلەوەر و باڵندە بەکار دێ وەك:
- بارە کەو، بارە مریشك
جەمیلە: کەوی یان کەوبارێ.
- بارۆکە: بارەکە: وارد:
لە جوجکە گەورەتر.
- باریك: زراڤ: زاڤ: دژی ئەستووری
ئەگەر خۆت باریك بکەیتەوە بە درزێك لەو درزانە دابرۆی...
(گەدا- ل٥٥)
- باریکە: باریکەڵە: کەڵەگەت:
مورتەزای باریکەلەی لاوازی جل و بەرگ شڕ و شپریو لەدواوە گوتی (کاریتە- ل٣٠)
- باریکەرێ: تولی رێگا: بزنەرێ
گەرەی باکوور بەهۆی توولە رێگایەکەوە بووەتە دووبەرە... (غەوارە- ل٦)
- باز: ١-کراوە: کرایەوە
٢-لەخۆ هەڵدان لەکاتی راکردندا.
٣-جۆرە مەلێکی گۆشت خۆرە.
بازی کوێستانان وەرە کەوی نساری.
- بازار: باژێر: سووك: سیك: بەژەر: شار
هەروادەڕوا لۆ (باژێرێ)
(هۆنراوە- ل٥٣)

بەرۆژیش دەرۆیشت لە ناو بازاڕ بووایە .
(گەدا- ل٢١)
بەو حاڵەوە دەچووە ناو بازاڕ داوای کاری دەکرد...
(گەدا- ل١٩)
- بازاڕباشی: حەس حەس ناو بازاڕ: حەرەسی ناو بازاڕ.
- بازاڕی دەشتەکی و گشتی: ئەم جۆرە بازارە لە کۆنەوە هەر بووە ئێستاش کەم تا کورتێك ماوە خەڵك لەدەشتەکی پان و بەرین کۆ دەبێتەوە هەرکەسێ شتی خۆی بۆ فرۆشتن رادەنێ وەك بازاڕی (قەباغکەند ی، خورگە، مەمەلیاش) لە موکریان.
- بازرگان: کوتاڵ فرۆش.
- بازبردن: بازدان: پازدان.
- بە خۆش بەزیو خێرایی بازی دەبرد...
(گەدا- ل٥٢)
- بازن: جۆرێکە لە خشڵی ژنان زۆر جۆری هەیە وەك ئەمانەی خوارەوە:
١-بازنی شووشە: بەتایبەتی شووشەی شین.
٢-بازنی زیو
٣-بازنی شاخ
٤-بازنی مەرزنگی: لەزیو دروستدەکرێت پانە.
- بازنە: چەماوەی داخراو.
- بازنەی گاسن: ئەو پارچە تۆقە ئاسنە بازنەیە کەزمانەی هەوجاڕو گاسن بەیەکەوە بەند دەکات.
- بازوو: ١-باسك: باهوو: قۆڵ: پیل: باڵ: دەست: بازی:





٢-ئەو گیاندارەی کەڕەنگی پەلەکانی سپی بێت، یا دووڕەنگ بێت.
٣- رەشانێك پەلەکانی سپی بێت یا دووڕەنگ بێت.
٤-جۆرێکە لە زکری دەروێشان.
- باس: بەعس: بەحس:
- باسکردن: گێڕانەوە
بەسەر هاتی ئەحمەدو محەمەدی خدربەگیش لەوە دوا باس دەکەین...
(شەرەف- ل٣٨٤)
- باسەفا: باهەوا: خۆش و دڵگیر
- باسك:
١-شانی گرد: نەورایی کە لە گرد دێتەخوار.
٢-قۆڵ: لەپەنجەکانی دەستەو تا شانی مرۆڤ.
٣-کلك: دارێ دەچێتە ناوخاکەناس و قازمە.
- باش:١- چاك: قەنج: قنج: خاس: رەند: کۆك
سروشتی چاکە لە شتێ یا کەسێکدا.
٢-وەك پاش گرێك واتە
١-حەمبالی زیرەك و ئازا لە بارکردن و داگرتندا
باش حەمبال
٢-توجاری دەوڵەمەند
باش توجار
- بافرە: تەزوو
بافرەیەکی خۆش هاتی و... (بۆرە- ل٣٠)
- باف: رێس
- باشارکردن: دەرقەت هاتن: دەرۆست: هاتن: پێ ویران: پێ وەستان.
- باشوور: راژێر: ژێروو: ژێرۆ: خواروو:

یەکێکە لە چوارلای شوێنی جوگرافی پێ دیاری دەکرێت دژی باکوورە بەم شێوەیە: رۆژهەڵات بەرامبەر رۆژئاوا و باشوور دژی باکوور.
- باقۆ: ١- بەو کار و بەرخە دەڵێن کە
بەساوایی تێر شیر نەبێ کاتی هەراش
دەبن نارسکێن و پووت و ورگن
دەبن لوولو مووەکانیان گڤ رادەوەستن
و بە تەمەن گەورە و بەلەش بچووکن.
٢-مێوەی بەدارەوە وشك بوو.
- باعاندن: قاڕاندن: باڕاندن: باقانن
دەنگی خۆ دەرخستنی ئاژەڵ.
- باعەباع: باڕەباڕ: باقەباق: قاڕەقار: باڵەباڵ
دەنگی یەك لەدوای یەکی ئاژەڵ.
- باغ: باخ
تۆ باغی من پەرژینم لە ناو هێلانەی ژینم.
- باغەر: باخەڵ: باغەل: باخل: بەرۆك.
١- لەسەر کەمەرەوە ئافرەت کراسەکەی شۆڕ دەکاتەوە ئەوە دەبێتە باغەڵ.
٢- گیرفان: بەرك:
- باغەوان:
باغڤان: بەخچەڤان: باخچەوان:
١-ئەو کەسەی خزمەتی باغ دەکا.
٢-خاوەن باغ کە خۆی خزمەتی باغ دەکات.
بولبلی باغەوانی سەد ماشەڵا چەند جوانی
حەیفم لە بۆ باغەوان چۆن قەدری گوڵ نازانی
(فۆلکلۆر)
- باقە نەزمە: میل: پێ: پا: ئامرازی فیشەك تفەنگ هاویشتنە بەر پەلاپێکەی.

- باقەنۆت: پارەی کاغەز.
- باقلك: پاقلە.
- باقلم: بە ئەقڵم.

ئاغا باقلم ڕۆژی سێ شەممە بوو (رشتە-ل٨)

- باقی مەند: ئەوەتر:
- باکوور: سەروو: ژۆر: بەرامبەر بە باشوور.
- باکو زیرك: گەرداو: رەشەبا.
- باگا: واگا: بەئاگا: بەخەبەر:

١-نەنووستوو: نەنووستی: نەخەوتوو:

مێلە دەنگی تۆقان بێتە.

نەوەك گولە واگابێتە. (هونراوە- ل٦٣)

٢-زیرەك: وریا: لەسەر هەست: وشیار.

- باگابوون: بەخەبەربوون: بەئاگابوون: نەنوستبوون.
- باگانەبوون: بەخەبەر نەبوون.
- باگردان: بانگۆر: بانتلێن.

باتلیز: بانگۆدەر: شەولەبان: بانگلێن: باگوردان: گردەڵ: باگردێن: بان گلێر: بان گێرك: بان گلێنك:بۆگلوو: بانگەڕ.

بەرد یاکۆتەرە دارێکە لە شکلی ئوستوانە، لێك و لووس و بێ گرێ و گۆڵ، لەنیوە راستەوە بەبایی درێژیدا سەرانسەر کونە دیوکراوە یا ئەو سەرەو سەرەکەی دوو قولفی ئاسنی تێدەخرێ و گوریسێك دەکونەکە یا قولفەکان هەڵدەکێشن بۆ کوتانەوەی دەرز برین سەر بان.

بانەك و باگردانەکە (کانی- ل٢٦)

- بالاّ: بەژن: قەدوقەلاّفەت:

بالاّت ببینم لەو بالاّخانە

مەرگت نەبینم تا دێر زەمانە

(مەلۆ- ل٧٩)

- بالاّبەرز: بەژن درێژ

بالاّکەت بەرزە وێنەی شۆڕەبی

ڕەحمێکمان پێ بکە واین لە غەریبی

(مەلۆ- ل٧٩)

- بالاّ پیاوێك: بەژنە زەلامێك

پێوەرێکە بۆ درێژی و بڵندی بەکاردێ

... بالاّ پیاوێك بەعەرزی داچونەخوار

(حەمەدۆك ل٥٨)

- بالاّرەفە: رەفکە: رەفەی سەرەوەی هەموو رەفەکانی مالان کە کاسەی فەخفوری ئەخەنەسەر:
- بالتەچی: شیر بەدەست: کەسێ شیری لە دەستی دابێ: پێنج سەری وانا، بالتە چینە.

(کۆمەل- ل٢٠٥)

- بالدار: پەلەوەر: پەلەوەر: بەرِوەل: پەلەور: بالندە: مەل: تەیر: بالۆنە: پەڕدار: بالنە:

وەك پۆڵە پەڕەووڵی بەجریو، جریو دەکرێتەوە و دادەخرێ

کاریتە ل١٩

ئەو گیاندارانەی بالیان هەیە

هاتن تەیری گەرمێنی

دیتم سەف بە سەف دوو بەدوونە

ببیتە سۆنە بچیتە ناومەل

ئەبم بە شمقاردات ئەبرِم لەگەل

(گولاّلە- ل٤٣)

پۆلی بالدار لەڕۆژ هەلاّتەوە بەو دیوە جریوە بەسەر





سێرە بارین (کاریتە- ل٤٥)

باز و تەیر و شەهێنی

مەل لەئاسمان ئەخوێنی

(گولالە- ل٤٣)

- بالۆ: بانگ: قراسە: سەرە: بالغ: خۆناسین: ئاودەگوناندا گەڕان: شەیتان پێ کەنیو.

حالی کوڕێکی یا کچێکی شەیتانی پێکەنینی، کوڕێکی هەوەسی ژن بکا، کچێکی هەوای شووی کەوتبێتە سەر.

- بالورە: بالۆرێ: بالۆرە:

گۆرانییەکی کوردییە، کاتی کچان دەچوون بۆ داران تاکو داربێنن بۆ سووتەمەنی زستان و سەرما و سۆڵ لەرێگادا بالۆرەیان دوودوو دەگوت و بە تەلانی دەهاتنە خوارێ. ئەوەی بالۆرەی دەگوت پەنجەی لەقورگی خۆی دەدا تاکو دەنگی بلەرێتەوە دەیان گوت:

بالۆری بالۆری بالۆری

بالۆری لە گردەشینی

- بالەبان: ١- جۆرە ئێسترێکی قەبارە گەورە و بەرزە زەنگولی قەریتەی ملی هێستری بالاّبانی پێشەنگی قەتار چی یان بوو. (غەوارە-ل٩)

٢-جۆرێکە لە بالندە گۆشت خۆرە درندە راوییەکان گەر بەداو بگیرێت پێی دەڵێن (بالەبان)راوی قولنگ، قاز، شینە شاهۆی پێ دەگوترێت.

٣-نەرمەنای: دۆردك: نەی: ئامێرێکی مۆسیقای فووتێکردنە دەنگێکی مەیلەو ئەستوور و قەبەی هەیە و ئامێرەکە هەموو چەشنە چینێکی دەنگی پێ لێ نادرێ وشەی بالەبان چۆن بووە ناوی ئەم ئامێرە؟ لەم بەشانە پێکدێت.

١-قەمیشی باڵ بان: بەشی یەکەمی بالەبانە و ئەم بەشە دەچێتە ناودەمی بالەبان ژەن درێژی (١٢)سم پانی سەرە پانکراوە کەش (٢,٥)سم.

٢-داری بالەبان: درێژی (٣١,٧)سم حەفت کون لەلای سەرەوەی دارەکە هەیە و ماوەی میانی هەرکونێك و ئەوی تەنیشتی نزیکەی (١,٥)سم، کونێکیش لەڕووی بنەوەی ئەوداره هەیە و دەکەوێتە میانی کونی یەکەم و دووەمی ئەم کونانە.

٣-چەلەمە: چۆلەمە: بەشێکە لە ئامێری بالەبان پانی نزیکەی (٣)سم وەك ئەنگوستیلە چۆن دەکرێتە پەنجە ئەوها دەکرێتە سەر (قەمیش) بالەبان. هاتوچۆشی پێ دەکرێت بە مەبەستی (کۆك- نصب) کردنی دەنگی ئامێرەکە تارادەیەك.

٤-دەم بەست: چۆلەمە: هەندێ بالەبان ژەن چۆلەمەی پێ دەڵێن ئەمەیان وەك لەواشەوایە دەکرێتە دەمی قامیشی بالەبان لەکاتی هەڵگرتندا بۆ پاراستنی دەمی قەمیشەکە.

٥-دەبێتە نازناوی ئەو هونەرمەندە مللییانەی بالەبان دەژەنن.

کانەبی بالەبان ژەن، حەسەن نەی

- بالەبان ژەن: بەو کەسە دەڵێن کە بالەبان دەژەنێت دەبێ هەموو جۆرە نزمێك بزانێت، ئەگەر ئەو گۆرانییە گۆرانیبێژ دەیڵێ گوێشی لێ نەبوو بێ یەکسەر بێتە سەر ئاهەنگ هەواکەی لێ بدات، دەبێ بزانێ چۆن بالەبان بگرێت لەکاتی لێدانی.

- باڵەبەژن: جۆرە نووشتەیەکی چوار گۆشەیە ژنـان بەخۆیانەوە دەکەن.
- بـالیف: بـالگوە: سـەرنیا: بـالگۆك: بالیفـك: سەرنگین: شلّتە بالگی: گـۆژگرە: پالگـە: سـەنیری پشت: پالپشت: بەعلگی: سەرینگ: سـەرین: ژێـر سەرە: بالووفك: پشتو: پالگوە: بەعلیف: پالـشت: پشتی: بالگە: بالگیە: بالگەە:

کیسەیەکی خامەپڕ دەکرێ لە لۆکە
پەڕیا وردەخوری و دەخرێتە ناو بەرگێکی قوماشی جوانەوە، بۆ پـاڵ وێـدان و ئانیـشك لەسـەر دانـان بەکاردێت لەوەختی نووستن سەری وێدەکرێ

سەری لەسەر بالیف دادەنا لەگەڵیدا دەنووست...
(کاریتە- ل٣٧٢)

بـە ئاسـوودەیی سـەر ئەنێتـە سـەر سـەرین...
(ئاشتی- ل١٧٠)

سەرینێك تووکی گەورەی چڵکن کە بەرگەکـەی لـە دووسێ جێ دڕابوو. (گەدا- ل٣٦)

هۆدەیەکی گەورەی رووناك و خاوێن
قالیی لێ راخرابوو، پاڵ و پشتیی لێ دانرابوو
(گەدا- ل٥٠)

هەر بەئومێدی ویسالت سەر لەسەر بالین ئەکا...
(دیوان ئەحمەد- ل٥٨)

لێفاجینن بالگیها بدەن بەرباڵ... (لاوك- ل٥٤)

بەخوا باڵگە هەك تنێ تێرا کەلەخی تەنالە
(مجێور- ل٤٢٩)

باسکت بۆم بکە بەسەرین
بەجووت خەومان لێ بکەوێ

- باما: بوایەم: بامایە: بایام
کەو باڕی بوایەم لە جاڕەجۆدا
خۆزگە من ببام گۆزەی سەرشانی

- بان: ١- بانوو: تەختایی لەبەرزی
٢- بن: ژێر: ٣-سەر: سەربان: سەرخانی: بان خانوو
- باناندنـەوە: بێـچوی بـێ دایـك خـستنە بـەر دایکێکی تر ئەویش بـەم شـێوەیە کـابرای بـانۆك چەند جار لەسەر یەك دایکە حەیەکەی دەسوڕێنێت و تاتەواو گێژ دەبێت لەو کاتـە دانابێـت بێـچوەکە لەبەرچاوی دایکەکە بێـت. جـا باتۆکەکـە پەنجـەی خۆی رەوانی ناوزێی دەکات و تۆزێك ئازاری دەدات ئاژەڵەکە واهەستدەکات کە سەر لەنێوی دەزێتـەوە ئەو کاتە بانۆکەکە لەشی بێـچوەکە بـە خوێـاوەك تـەڕ دەکـات و لەبـەردەمی دایکـی دادەنـێ دایکەکەش هێدی هێدی خوێاوەکەکە دەلێسێتەوە و رەحمی دەکەوێتە سەر.
- بان چاو: سەرچاو: وشەی رێزلێنان بۆ کەسێ کـە قسەت دەگەڵ دەکات.
- بانگ: گاز.
- بانگکردن: گازکردن.
- بانگدەر: موئەزین.
- بانۆك: بەو کەسە دەڵێن کەوا دەکات مەڕ یا بزنی نەبان لەسەر بێچوی خۆیان، یا لاییدە بباتەوە.
- بانگ.. بانگ: جـۆرە گیانەوەرێکـە لـە ناوچـە شاخاوییەکاندا زۆرن لە هەندێ ماڵـە قورینەکانـدا دەبینرێن و لە شێوەی (سمۆرەیە) درێژی باریکۆڵەیە چوار پێـی چـڕنوکاوی هەیـە و تـەنها کلکـی وەك





سمورە ئەوەندە کـولّکن نییـە و بـونی زۆر بـەهێزە ئێـسقنی لـە لەشـدا نییـە و هـەموو لەشـی ماسوولکەیە و دەتـوانێ بـچێتە کـونی مـشکەوە بەڵام ناتوانێ بچێتە ناوئاو.
- بانە: ١- شارێکە لە کوردسـتان، ناوەکـەی لـە شوێنەکەی وەرگیراوە، چونکە دەکەوێتە ئـاوداوێنی چیای ئەرباباوە بۆیە بانە یان ناوناوە

بانە و مەریوان ئەو دیو ئەو دیوە
کێ تۆی لە من کرد بۆ دڵت گۆڕیوە
شەدەلار مرۆ مەزدەر
جوانی لای بانە
گۆرانی زیرەك

٢-سەربان: بانی خانوو.
٣-ئـــامرازی نەهێـــشتنە وەك بانـــەڕوا، بانەنووسێ، بانەخوات.
٤-ناوی کچانی کوردییە.
- بانەمەڕ: ١-مانگی نیسان: ٢- مۆڵگەی مـەڕ:
٣- کوێستان.
- بانهەڵبان: ئولی: کۆشك
نهۆمی سەرەوەی خانوو.
- بانەیی: ١- خەڵکی شاری بانە:
٢-نازناوی خەڵکی بانە
- باو: ١-باوك: ٢-رەواج: برەو:
- باوابێ: باوەبێ: باوەهابێ: بائەوهابێ

باوابێ باوابێ من دەستم لە مەمکان دابێ
ئەگەر مەمکانەم کردبێ سەرپەنجەم کولەواربێ
(گۆرانی زیرەك)

- باوبژ: غازاتی ناوزگ: ئەوبایـەی لـە زگ پەیـدا دەبێ دەبێتە هۆی زگ هێشان.
- باوژان: بێوژان: پوژان: رووەکێکـە لـەناو چـیادا شین دەبێ بۆ هەندێ دەرمان بەکاردێ.
- باوك: باب: باڤ: باو.
- باوك سەگ: ١- سەگباب: سەباب:
جنێوە بەکەسێ دەدرێت.
٢-بۆ خۆشەویستی بە منالّی بچووك دەڵێن.
- باوە:١-بابە: باوکە:
٢-ناوی کوڕانە
٣-پیر: چاك
(باوە حەیران باوەشاسوار)
- باوەخوند: پێ کردنەوە: یەکەم جـار هاتنـەوەی بـووك بـۆ مـالّی بـاوکی پـاش حەفتەیـەك دوای بەبووك چوونی.
- باوەڕ: بڕوا: بەقا: ئیینان:
گۆڕ: بـاوەڕی: یـەقین: ئاقیـدە: عەقیـدە: بەڕاسـت زانین: باوەڕ.

ئەگەر باوەڕم پێ ناکەی
(هۆنراوە- ل٨٣)

ئەمن چۆن بەقایە بە تو بکەم
(تحفە-٢- ل١٥٨)

هەرمەبینە چەندیان بڕواپێ هێناو.
(شەرەف -ل٤٣٩)

- باوەڕ پێکردن: بڕواپێکردن.
- باوەڕ پێکراو: پشتڕاست: تێڕادیتوو:
تێڕادیتراو: مرۆڤی جێگای باوەڕ.

- باوەڕنەکە: باوەڕ مەکە: بڕوامەکە.
- باوەڕۆت: بتهێنیّ: بتهینیّ.
- باوەڕووت: بهێنم: بێنم.
- باوەژن: زڕدایك: زڕداك: داماری.
- بـــاوەژێن: باوەشـــێن: بـــاوە شـــینە: باوەڕێـــشە: بارۆشە: باپەیداکەر.
- باوەش: ١- باوش: ئامێز:

٢-شارا: گەلە باوەش: لەخڕکردنەوەی چەند مەلۆیەکی لە (١) تا(٤) مەلۆیێك دێت بـۆ پێکهێنانی گیشە  یا گەلاوێژ.
- باهۆر: باهۆس: باهۆل: هورە: ورە: گڕە بای گەرمی هاوین.
- باوی: بادەم: بادام: بایام: بەری داری داربادەم.
- باوێـشك: باوێــشك: باوەشــك: ژاژك: باووشــك: بایشك: باێیشك:

داپچرانی دەمی ئادەمیزاد لەخۆیـەوە لەبـەر حـەز لەخـەوکردن، و خـەوالوێی یـا خۆمـاری بەسـەر ئینساندا دێت دەمی لە خۆیەوە دەبێتەوە

وەك لەخــــەوابووبیّ... باوێـــــشکێکی داوخــــۆی کێشایەوە. (ئاشتی- ل٥٧)
- باویّ: بهاویّ: هەڵدە: هەڵێدە

چاوت وەکی چاوی ماری
خۆت لۆم باویّ سەردیواری      (هونراوە- ل٦٠)
- باویلکە: پشلۆکە: گیایـەکی تـووك سـپییە لـە پایزپەیدا دەبیّ بابلاوی دەکاتەوە.
- باوێتی: بەو نەخۆشییە دەگوترێ کە وەك باداریی وایە. بە زۆری تووشی کاروبەرخ دەبێت ئەگـەر لـە پەلی بێچووکە بدات شەلی دەکات، هێنـدەك جـار لە پـەلی دەیـەخێت تـا چـاك دەبێتـەوە زۆر لاواز دەبێت ئەگەر لە هەناوی دابێت دەیکوژێت.
- باهۆل: جانتا: هەگبە.
- بای شەماڵ: باکوری: لەلای سەرەوە هەڵدەکا

فێنك و نەرمە لە هاوین هەڵدەکات
برێنە بایێ شەماری
دەمەك دیّ دەمەك نایێ
- بای خەزان: لەکۆتایی پایز هەڵئەکا

گەلای زەردی درەخت هەڵئەوەریّ
- بای داروس: لەکۆتای زستاندا هەڵئەکاو

دار و درەخت گۆپکە و چرۆئەکا
- بارەش: رەشەبا: لەلای خوارەوە هەڵـدەکا تونـدە لە هاویندا گەرمەو دوای نیوەڕۆیان ئـەبیّ بـەگڕەو شەڕاو لە زستاندا سارد ئەبیّ بەکزە.
- بایی دار: بەنرخ: بەقیمەت: بەهادار: گران بایی.
- بایر: باهێر: بایێر: چۆل: بۆرە.
- باینجان: بایجان: باجان.

سەوزەیە بەتۆ دەچێنریّ لەوەرزی هـاوین پێـدەگات بۆ چێشت بەکاردێت.
- باییخ: بایەخ:
- بایەزید: ١-ناوچەیەکە لە کوردستان: ٢- نـاوی کوڕانە: گۆڤەرێکە لە زمانی کوردی بە ناوی گۆڤەر بایەزید.
- بایێ زیپیا: کاتی هاتنی سـەرمای پـیرەژن لـە کوردەواریدا بەپێی ئاو و هەوای کوردستان پاش سەرمای زستان هەمـوو ساڵێك لـەم سـەروەختدا





بایێکی بەهێز و سـارد بۆمـاوەی چـەند رۆژێـك هەڵدەکات کـە بـە کرمـانجی بـاکوور پـیّدەڵێن (بایێ زیپیا).
- بایس: دەربەست.
- ببڕای ببڕ: ببڕای ببڕای: بەهیچ جۆرێك ببڕای ببڕ نەهاتەوە.
- ببم: بیم:

سۆفی نامیق: بیم وەقوروانەکەت.  (گەدا- ل٦٨)
- ببە: بەرە.
- ببەم: بەرم.
- ببەن: بەرن: بەرا.
- ببیّ: ١-بلّیّ: ٢-بیە: گوییّ بگرە.
- ببیّ و نەبیّ: هەبی و نەبی: هەبیّ و نەبیّ.
- بت: بووت: سەلەم.
- بتانن: بتوانن.
- بتانم: بتوانم.
- بتبەم: بوبەم.
- بتـۆم: ١-تیـپ: ٢-وەفـد: ٣-حیـزب: پـارت: ٤- سوپا: ٥-هەیئەت.
- بتلـیس: ١- نـاوی چـیای (بتلـیس)ە قەڵایـەك لەلای راستی چیاکانی (بتلیس) دروستدەکرێت بـە فەرمانی (ئەسکەندەری) زول قەرنێن ئـەو کەسـەی بە دروستکردنی هەڵستا خزمەتکارێکی خۆی بـوو بەناوی (بدلیس) لەدوایدا هەرخۆی واتـە (بـدلیس) بووە فەرمانڕەوای.

٢-ناوی  شارێکە لە کوردستانی تورکیا.

٣-ناوی ناوچەی ولایەتێکە بەناوی خۆیەوە.
- بتوون: تەواو.
- بەبتوونی: بەتەواوی.
- بتەسەلی: بەتەسەلی: بەتێری.
- بتەمامی: بەتەواوی: بەتەمامی.
- بتەو: پتەو: دژی ناو هڵۆل.
- بچووك: پچوك: چووك: کچکە: بـچیك: بـچویك: گچکە  بـچکۆڵە: گـچکەڵە: کـچکۆڵە: گـچکۆکە: کچکەڵە: چکۆڵە: پچکۆڵە: کـچکەلانە: بیـچکۆڵە: بووچکەڵە: بچکۆلانە.

حاڵی شتێکی لەهەر بابەتێکەوە (ئەندازە) قەدەر و قیمەت و تەمـەن...) گەورەنـەبیّ ئـەو گـچکەیە، زەلامەکی کچکەلە.
- بچینۆ: بچینەوە: بڕۆینەوە.

هەی گەردوگەردوگەردەوە
هەولێر خۆشە بابڕۆینەوە
- بحەسێوە: بسێوە: ئارام بگرە: پشوودە: پشووبە.
- بخازە: بخوازە: داوابکە: دەعوابکە:

واتە تۆ چت دەویّ بلّیّ.
- بخۆوە: بیخۆرەوە

چایەکەت بخۆوە.
- بدا خوازا: بەوواتای:

بدا خوازەکیّ بین: واتەیەك واتان.
- بدە: وەدە: کاری داخوازیە.
- بدەڤ: بەزار: شەفەوی.
- بدلیس: ١- بەو جێگایە دەڵێن کە ئاو و هەوای سازگار بێ.

(شەرەفنامە- ل٦٣٥)

٢-دروستکەری قەڵای بەدلیس.
- بدو: پدو: گۆشتی بەردوان.
- بدۆ: بدا.
- بدیە: بڕوانە: بڕۆنە: سەیرکە.
- برا: ١-برێ: ٢- وشەی دواندنی پیاو.
- براباب: براباڤ: باب برا.
- برابەش: شەریك: هاوپیشك: هەڤالکار.
لەسەرماڵ مابوونەوە بە برابەشی ڕایان دەبوارد...
(گەدا- ل٨٠)
برادەر: هاوەڵ.
- براخاس: ١-برای باش: ٢-ناوی کوڕانە
- برادەراتی: هاواڵەتی
- برازا: برازگ: مناڵی برا
دەرباساغە برازایەك هەبوو...
(لاوك- ل٥٧)
- برازاوا: بەو دۆست و هاوتەمەنانەی زاوا دەڵێن کە ڕۆژی بووك گواستنەوە لەگەڵ زاوان و دەچن بۆ ماڵی بووك: بووك سواری وڵاغ ئەکەن و دێنەوە ماڵی زاوا.
- برازێ: کوڕی برا: لەشێوەی کرمانجی سەروو.
- برازێ: کچی برا: لەشێوەی کرمانجی سەروو.
- براژك: براشتی: گۆشتی برژاو.
- بڕاست: بەڕاست: دوورلە درۆ ئیمانەکە بڕاست و ئیقین...
(ئێزدیاتی- ل٢٣)
- براسەیار: بەمریدەکانی بزووتنەوەی حەقە ئەوترا کە هەردوو مرید بەدێهاتی کوردستان ئەگەران بۆ بڵاوکردنەوەی سۆفیەتی و هەق پەرستی و تەریقەت بڵاوکردنەوە.
- براشا: ناوی بێچوی دووەمی بازە.
- براگوڵ: دەستە گوڵ: لەیاری گۆرەویدا گۆرەویەك بەرز ئەکاتەوە ئەگەر لەژێریانەبوو، یەکێکی تر بەرز دەکاتەوە بەو نیازەی کەلە ژێر یابێ و ئەڵێ (برا گوڵ).
- براگەورەی: ١-نیسبەتی کوڕی هەرە گەورەی ژن و مێردێك دەگەڵ منداڵەکانی تریان.
٢-لادێ کە لە نوێ لەسەر شێوەی کۆن و عەشیرەتی. چەند ماڵێك بەیەکەوە دابمەزرابان، یەکێکیان لەبەینی خۆیان هەڵدەبژارد هەرە ئیختیار و پتیۆڵ و زانا خاوەن کوڕ و برازۆر، حاڵ خۆش ئازا و ڕەشید و بەدەرەوە ئەمەیان دەکرد (برا گەورە) لەهیچ کاروبارێك لەقسەی دەرنەدەچوون هەبوو (کێخوا) وەیا (موختاری) یشی پێ دەگوترا.
ئەو برا گەورەیەیان بەرانبەر بە عەشیرەتی تر یا حکومەت دەبووە دەمڕاست.
- براماك: داك برا: دووکەس یەك دایك دووبابیان هەبێ.
- برای حەق: برای لەدایك و بابی.
- برای شیری: کچ و کوڕی یان دووکوڕ مەمکی ژنێك بخۆن و دایکیان جیاواز بێت.
- برایم: ئیبراهیم: برایمۆك.
٢-برایمۆك (برایمی مەلا زێندینان).
١-چیرۆکێکی کۆنی کوردەوارییە کە بە بەیت نووسراوەتەوە بە ناوی (برایم) نۆکەری ئاغای خۆی





بووە حەزی لە خاتون پەریخانی کرد کە خوشکی ئاغای بووە، پێی زاینەوە برایمی بە چلەی زستانێ دەرکردووە.
٢- ناو بەیتەکەیە بە ناوی برایمۆك.
٣- بریتییە لە ڕۆژە هەرە ساردەکەی حەوتە ساردەکەی بەند و بەندەرفە.
٤- بۆ دەرکردنی کەسێ بەکاردێ لەکوردەواری ئەگەر یەکێك دەرکرا دەڵێن بەدەردی برایم چوو.
٥- بۆ هەڕەشەبەکاردێ ئەگەر ئاغایەك هەڕەشەی لەمسکێنێکی دەکا دەڵێ وەك برایمۆکی بەچلووان دەرت دەکەم.
- برایەتی ڕاگرتن: واتە تەبایی و خۆش ڕابواردنی نێوان برایان.
- برایەکەم: ١-براکەم: برای من:
٢-وشەی ڕێزلێنان.
- بڕان: بڕیان: ١-تەواوبوون.
٢-پەیدابوونی برین لەهەر شوێنێکی لەش.
- بردت: تەبر: بەردت: تۆ بەکاری بردنەکەی هەستای.
- بردیی: وی بر: بەردش.
- برژانگ: بژانگ: مژە: مژۆل: موژگان: برژۆڵ: برژان: بژۆل: موژە: مژگان مژانگ: مژیلانك: بەرکێ چاڤا: بشکۆل:
دووریزە مووی کە لە کەنارەکانی دووپێڵوی چاوان دەبیندرێن.
بەنەشتەری مژۆلیت
تو بۆچ دڵم دەردێنی (فولکلور)
موسە للەح بوو بەبرژانگی سیاهو تیغی دوو ئەبرۆ
ئەحمەد موختار جاف
دڵی پڕوەحشتەم جانا لەبەر موژگانی وەك تێرت
(سالم ل٤٧)
بە زوڵف و ئەبرۆ و موژگان، بە خەت و پەرچەم و باڵا.
(ئەدەب فەرهەنگ- ل٦٣)
بەو زوڵف و موژەت مەمکوژە هەردەم بەجەفایی
(تاهیر بەگ فەرهەنگ- ل٦٤)
- برژان: برژیان: ورژان:
١- گۆڕانی حاڵەتی خاوی لەسەر ئاگر.
٢- بریتییە لەزۆر گەرمابوون.
- بروسك: ١- هەورەتریشقە.
٢-ناوی کوڕانە
- برۆ: ئەبرۆ
- بروسکە: تەلەگراف: تێل:
(لە تێلێدا: واتە بروسکەی کرد)
کارگێڕی پۆستە و تەلگرافیش هەموو ئێوارەیەك ورد و باریك کۆپی برووسکەکانی بۆ قائیمقام دەهێنا.
(تەنەکە- ل٩٢)
- برك: بوخ: برگ: بوغ: هەڵمی گەرمای زۆر، شتێك زۆر بکوڵێ.
- برکردن: هەڵم گەرمای زۆری هاوین
- برکۆکەك: برۆکەك: تۆزۆکەك: تۆزێك
پێوەرێکە بۆ زۆر کەمی.
- برن: بردن
- برن و ئانین: هێنان و بردن.
- بروبزگوڕ: سڕوسیپاڵ: شڕوسیپاڵ: جلە شڕە
دەبێ ئەمساڵی ئێمە بۆ جەهەنم بەن سروسیپاڵ.

- برەو: ڕەواج: ڕمێن: هەرمێن
کەل و پەلی خۆ فرۆش لە بازاڕدا.
- بریتییە: لەباتی: مەجاز: خوازە.
- بریکار: وەکیل: نایب: جێگر
ڕەسووڵە فەنی کاتبی تەحریرات
بەبریکاری ئەو لە جێی قایمقام بوو (تەنەکە- ل٣)
- برین: زام: ریش: کۆڤان: قەسفوس: زەخم: قەشفوس: بەروبووی کاری بڕانی ئەندامێکی لەشی گیاندارانە بەداروتێلا بەئامرازێکی برندە (چەقو، خەنجەر، شیر) یابە گوللە و لەوبابەتە.
شیرین وامەکە زام دەکولێتەوە
... بریندارم برینم کەوتە بەدەنێ... (فۆلکلۆر)
- برین دار: زامدار: زامار: بووردار: زینیری: کول کۆڤاندار: زەخمدار: کەلەلا:
حاڵی ئەو کەسەی بەجۆرێك لە جۆران
ئەندامێکی لەشی (برین)ی لێ پەیدا بووبێ
تۆ دەرمانی زەخمەکەمکە ماهی تابانم وەرە
بریندارم بریندارم برینم کەوتە بەدەنێ
(گۆرانی تەنیا عارەب)
پیروکە نەفت و کەلەلا
هەمووڵەشم هەلاهەلا
(نالەی جودایی هیمن)
بریندار ئێشا برینا خۆ دزانیت (کانی- ل٢٤)
بریندارم بریندارم بریندارم بەخەنجەرێ
سەرێ خۆم هەردەگرم لەگوندی دەچمە دەرێ
(سێ سەد- ل٣٣)
- برین هێنان: بریندار‌بوون: زامداربوون
پەیدا بوونی برین لە لەشی ئادەمیزاد.
لەئەنجامی شەڕەکەدا دووکەسی بریندار‌بوون.
- برینگ: جەو: جەوبڕ قەلەخ: هورینگ: هەڤرنگ برنگ: دوێرد: دووکارد: هەورینگ جەور: جەهری: قەڵەخ:
ئامرازێکە وەکو مەقەستە، بەڵام گەورەترە، دەمەکانی لەباتی ئەوەی وەك هی مەقەس لەناوە راستابە بزمارێك لێکدا کوترابن لێك جودان و کاتی ئیش پێکردن وەکو نێرە و مێیە دەخرێتە سەریەك ئەم ئامرازە بۆ خوری و مووی بڕینەوەی مەڕ و بزن بەکاردێ.
- برنیگ چی: ئەوکەسەی خوری دەپشکنێ.
- برینگ هینانەوە: بەهاران کە سپیان تێر شینکەی خوارد، قەلەو دەبێت لەژێرەوە خورییەکەش زێدە دەکات خورییە نوێیەکە ڕەنگی وەك کۆنەکە نییە، خاوێن دیارە ئەو کاتە دەگوترێ سپیانەکە برینگی هێناوەتەوە.
- بڕ: بوار: تەنکاوی رووبار و زێ بۆ پەڕینەوە
(بێ بوار لەزێی مەدە) پەند.
- بڕبڕە: ١- کەمکەم: ٢-بڕبڕەی پشت: بڕبڕاگە
- بڕبڕەی پشت: تیرەقەی پشت: تریقەی پشت: کاریتەی پشت: گاڕگاڕە.
ئەو ئێسکە پانەی لە پشت ملەوە
تاسەر کلێجە دەچێت پەراسووەکانی بە تەنیشتەوە بەندە.
- بڕبەن: بڕبەند: شووشە: مەورەد:
پۆلایەکی درێژی گرنج گرنج پاش ناڵ کردن





ناڵبەند سمی وڵاغی پێ ئەکرێنری.
- بڕشکان: بڕداکەوتن
- بڕوانن: بنۆڕن: بنێرن: بنواڕن:
سەیرکەن: تەماشکەن: دیقەتدەنێ: زەین دەنێ: تێڕامینێن: بڕۆنن.
- بڕۆ: بچۆ: بچو: هەرە: بچە: پشۆ: بلۆ: پچۆ: هەڕوو: کاری داخوازییە.
ئەوا گوتم: راکە پچۆ بۆکان تەنەکەیك نەوت بێنە
بۆ ماڵی ئاغا (گەدا- ل٦١)
بڕۆ بەڕێی خۆتەوە، کابرا خانم لەماڵ نییە....
(گەدا- ل٢٣)
دەبڕۆ تۆ دەبڕۆ نابی بەیارم
جابەدرۆ دەرچۆ ئەزیزم قەولوقەرارت
(فۆلکلۆر)
١- تالان:
بڕۆ لای: ١- لاکەوە: بڕۆئەولای.
٢- بڕۆکنی:
- بڕۆنێ: بنۆڕێ: بنەڕێ: بڕوانێ: سەیرکە: زەیندەیی: دیقەتدەیی: تەماشاکە: بڕوانە:
- بڕۆنە: ١- سەیرکە: ٢- بچنە
بڕۆنێ لەژین و سەر ئەنجامەکەی
سەرەوژێری کردن جەم و جامەکەی
(شەرەف- ل٣٨٦)
- بڕە: ١-بڕەك: بڕەگەنمەکم کڕی.
٢-دوو ددانی درێژی دەمی نێرەی بەرازە.
- بڕەسۆرە: جۆرە روەکێکە لەبەهارا دەڕوێت: هەڵچونەکەی سورمێ و ئەوانی دیکە وەك ئاگری
"بڕە سۆرە" بووە گڕو فرێك دەم و دەست دامرکاوە
(غەوارە- ل١٩٢)
- بڕەك: بڕە: نەختەك: تۆزەك: قیچەك: پیچەك: کەمەك: کەمێك: نەختێك:
پێوەرێکە بۆ کەمی شت بەکاردێ.
- بڕینەوە: ١- لێ کردنەوە و دووپارچە کردن.
٢-کۆتایی پێ هێنان.
٣-خوری یان موولێ کردنەوە.
- بزان: زانا: دانا :زیرەك و تێگەیشتوو.
- بزد: ترس.
- بزداندن: ترساندن.
- بزدونك: ترسنۆك.
- بزدیا: ترسیا: ترسا.
- بزیام: ترسام.
- بزدیای: تۆقاوی: ترسای.
- بزر: ون: وێنار: نادیار: بەزرە: گوم: نەدیو: وندا: پێوار: نەبانووك:.
حاڵی کەسێکی لەبەر چاوان نەبێ.
- بزربوون: وەندابوون: ون بوون: گوم بوون:
- بزگوڕ: شڕوشالات: شڕوشیتاڵ: کۆنەپەڕۆ.
١-پارچە قوماشی بێ کەڵك.
٢-بریتییە لەهەر پارچەیەکی جلك.
- بزمار: ١- مێخەك: گرێیەکە لە پێست پەیدا دەبێ لە ئەنجامی گۆڕانی پێست پەیدادەبێ.
٢-نەخۆشییەکە تووشی کاڵەك و شفتی دەبێ.

٣-شتێکی پۆلای بچکۆلەیە سەرێکی تـوژێ پـان کراوەتەوە و نووکەکەی تیژکراوە تەختە و ئەو جۆرە شتانەی پێ لێك قایم دەکرێ لە دیوار... هتد.

- بزماردار: شوتیوگندۆرە مێخەکی هەبێت.
- بزمـارکوت: ١-بـەترێ گزرەیـی دەڵـێن کـە هێشوەکەی زۆرپڕە: ٢-بزمار رێژ.
- بزمار رێژ: بزماری زۆر لە تەختەدار بدرێت:
- بزمووك: بزمك: بلامك:

پەلە دارێکی بچووکە، هەر دووسـەری بـەنی پێـوە دەبەسترێت وەك لغاو لەدەمی (کار) دەکرێـت، بـۆ ئەوەی دایکەکەی نەمژێت.

- بـزن: ١-چـتێری کـە پێـی نایـە چـواردم سـاڵ: دووجۆرە بزنە مەرەز و بزنە رەش.

٢-ئاسکی مێ:

- بزنانی: جۆرێکە لە برینەوەی (واتە خـوری لێ کردنـەوە) پێـشەوە و بـن زگـی دەبرێتـەوە و دامێنی سەر پشتی دەهێڵدرێتەوە ئەمە تایبەتە بە بزنەزا).

بزنە بەربوارد: رەشانی مێی دوو ساڵ و نیو تا سێ ساڵ و نیو.

- بزنەوان: شوانی بزنان.
- بزنە شامی: جۆرێکـە لـە ئاسـکی مێیـەی کـە قۆچی بچووکی وەك پەنجەی مرۆڤی هەیە.
- بزنی سێکاری: رەشانی تەمەنی سێ ساڵ و نیـو تا چوار ساڵ و نیو.
- بزووتنەوە: بزاڤ: جڤینك.

١-جووڵانەوەی بێ ئەوەی جـێ گـۆرکێی تێـدابێ، هەرەکەت کردنی شتێ هەر لەشوێنی خۆی.

٢-حەرەکەی سیاسی

بزوتنەوەی کوردایەتی

- بزووت: بزۆت: داری نیوە سوتاو.
- بزۆتی بدی: واتە ئـاگری خۆشـی کـە: ئـاژاوەی گەورەکە (ئیدیۆم).
- بزوێنە: بزوێن: سەروبۆر و ژێر و زەنە.
- بـزە: زەردە: دەڤکـەن: زەردەخەنـە: لێوخـەن:

بەزەردەخەنەوە گوتی.

(بۆرە- ل١٠)

کەروێشکە، کە بەبەزەییەکەوە گوتی.

(بۆرە- ل١٠)

- بزە گرتن: زەردەهاتن

بزەی هومێد و هیوا ئەیگرت

(گەدا- ل٩٦)

- بزەی تاڵ: بزەی سارد:

زەردەخەنەی پرقین و پرتاڵی و ئازار و پڕ داخ و تەوس.

- بزەی شادی: زەردەخەنەی خۆش

سورتك کە ئەوەی بیست بزەیەکی شادی هاتێ...

(بۆرە- ل٣٥)

- بزێو: چەتوون: خوز: زرینگ: شەیتان: بـێ عـار: نارەحەت: بزۆز:

ئەوکەسەی زۆر دەجوولێ و نارەحەتی

بۆ دەوروبەری خۆی سازدەکا.

- بژ: ١-داوەگیای باریکی سەرگوڵە دەغل.

٢-ماعەدا: جگەلە.





- بژار: ١-بژارە: ٢-ناوی کورانە.
- بـژارکردن: هەڵبـژاردن: پـاك و پـیس لێکجیاواز کردنەوە.

٢-چاك و خراپ لێك جیاوازکردن.

- بژاربڕ: بژارچن

ئامرازی پاك کردنەوەی گژ و گیا.

- بژاردن: ژماردن.
- بژە: بەش: پش.
- بژانك: ١-چەك و خشڵی ژنان

٢-برژانگ

- بژوون: ١-تەندروست. ٢-پوخت. ٣-پاك.
- بژێر: موحاسب: ژمێریار.
- بژیان: ئارەزوو.
- بژێو: قوت: بژێو: مایەی ژیان:

ئەم بژیوێکی باشی دەسـت ئەکـەوت گـوزەرانێکی چاکی ئەکرد. (گەدا- ل١٠٣)

- بژیر: زیرەك.
- بساڤ: چالاك.
- بست: بۆست: بوست: بنست: بهۆست: بنگوس:

پێوەرێکە بۆ پێوان بەکاردی نێوان پەنجەی گـەورە و پەنجەی بچووك بەکراوەیی.

- بستام: مەرجان: جۆر بەردێکی گران بەهایە
- بستە: ١- شیشی سەرتەنورکە مەنجەڵی لەسـەر دادەنێری.

٢-مەغرور، روح گەورە.

٣-ئامرازی ئاسنە لە ئاشی ئاو.

- بستوو: بستی: زینوو: زیندوو: تەپۆڵکە.

بسك: ئەوپرچەی بەسەر رووەمەتی ژن دێنەخوار.

چاوت هەرنایێ لەبەربسك و شابسکان

ناوەڵلا چەتیم لەبەر هوردەپەرچەمان

- بسکان: ١- بوسکان: ناوی ژنانە:

٢- کۆی بسك.

- بسکێ: ناوی ژنانە.
- بسکە: جۆرێکە لە خشڵی ژنـان، لـە لێـوارێکی کلاوەکە دەدرا و بەسـەر هـەردوو بـسکان دەهاتـە خوارێ نزیکی گوارەبوو.
- بسیلان: قومەلان.
- بشۆ: ١-برۆ: ٢-فەرمان دان بەشوشتن.
- بشێت: بکارێت: بتوانێت: بتانێت.
- بشێربشێر: بەبەردەوامی: بێنێوبڕ.
- بشوێنە: قەلەق: رارا.
- بشلوێن: بشێون: بشلەژێن.
- بـڤ: ١- وشـەی ئاگادارکردنـەوەی منـاڵ لەشتی خەتەردا.

٢-زەردەواڵە:

- بڤە: خەتەر: ترسناك:

کەس ناتوانێ واگیان لەسەردەستی دانـێ و دەسـت بۆ بڤەی وازل بەرێ. (شەرەف- ل٤١٩)

- بڤەشیین: توانەوە.
- بقەبق: بغەبغ: لوغەلوغ: کەسێ بە چاکی قـسەی بۆ نەکرێت.
- بکرد: بەکار: چالاك.
- بکەرب: ترسناك: بەترس.
- بکوت: لێدەر.

- بکوژ: قاتل: ئەو کەسەی مرۆڤ دەکوژێ.
- بگەڕ: گەڕۆك: سەیاح.
- بگرە: ١- فەرماندان بە گرتن: ٢- دابنێ.
- بگێڕ: مدیر: بەڕێوەبەر.
- بل: جگەلە: بێجگە لە.
- بڵ: گووانی بەروبووم.
- بلاڤ: بلاو: بلاوە.
- بلام: بەلام: بەلان: بەلێ: وەلێ.
- بلبال: سەوزە: سەوزیی: سەوزەوات.
- بلبل: بولبول: شالور: شالوول:

باڵندەیـەکی پـچکۆلانەیە ئەنـدازەی چـۆلەکەیەك رەنگی پشتی کەوەیـەکی ئامـاڵ سـۆر و بـەرزگی زەردە، دندوکی پچووك و خۆی بەتێکڕایی جـوان و ژیکەلەیە دەنگی زۆر خۆشە، هەربۆیـە دەیگـرن و دەیکەنە قەفەزەوە.

ئەمن بلبل ئەو رەیحانە تێپەڕبوو لەو باخچانە.

(گۆرانی زیرەك)

بولبولانی ئاواز خوانی سەرپەلانی لك پۆپی دەدەن.

(شەرەف- ل٤٣٨)

- بلبلـــە: ١- دووپارچـــەیە لەخـــشڵی ژنـــان لەهەردوولای کلاو دەسۆکی سەری ژنان دەدرا.

٢-زۆر وەر.

- بڵح: ١-درۆزن: ٢- بەدرەوشت: ٣- تەمبەڵ:
- بڵمان: فێڵ: حیلە.
- بڵق: پۆقـژە: بەقپـەقۆك: بـەقیلۆك: بکلیقـۆك؟: پلخ: بڵقاو: بەقیژۆك: پۆرگی بچکوڵەیە

١- بەزەبری قورسایی تنۆکی باران لەسەر ئـاوێکی لە شوێنێکا کۆبێتەوە دروستی دەبێ.

٢- لە ئـەنجامی کـوڵینی ئاویـا هـەر تراوێکـی دیکـە بـەزەبری هاتنـەدەرێ هەوایـەکی لـەناو تراوەکەدایە بەدی دێت.

- بڵقە دەرە: شەوگەرد:

لە شێوەی مارمیلوقە کلکی نییە نزیك کلکی خرە لە دوورەوە ئاوی داوێ بەکێ بکەوێت دەیکوژێت.

- بلمە بلم: پرتەپرت: پرتەوبۆڵە.
- بڵند: ١- بەرز: ٢-ناوی کوڕانە.
- بلوێر: بلوور: بلوێرشامی: بلوێر کەتە: بلوول: فیق: ئـامێرێکی مۆسـیقای فووتێکردنـە، لـەقامیش دروستدەکرێت، (حەفت) کـون لـەڕووی سـەرەوە و کونیکێش لەڕووی بنەوەیەتی ئـەم ئـامێرە لـەدوو بەش پێکدێت.

یەکەم: قامیشە کلۆرەکەیە و ئەوی دیکەش پارچـە لوورێکی گچکەیە دەخرێتە نـاوکونی قامیـشەکە. لەو سەرەی کە دەکەوێتە بەرامبەر دەمی بلـوێرژەن ئەم دارە (لورکەش) بۆ ئەمەیە ئامێرەکە یەکـسەر دەنگی لێوە دەرچێت.

شوانە لەسەر بەردە بێر
تێی تۆراندووە لەبلوێر.

(تاریك و روون- ل١٢٦)

- بلوێر ئەنگیۆ: بلوێرژەن.

(بلوێر بۆگایە: بەیەکێك ئەوترێ کە لەشتی نەگا)

(چەند خا- ل٨٧)

- بلێ: بێژە: برێ: ببێ.





- بڵێسە: ١- گوڕ:

٢- ناو گۆڤارێکی کۆنی کوردییە.

٣-ناوی کوڕانە.

- بلێك: کلوە بەفر بەیەکەوە.
- بلێنە بێژ: مایکرۆفۆن.
- بلێت: بیتاقە.
- بلیل بیژ: بلیل وان: بلوێرژەن.
- بن: ژێر.
- بناچە: بنەچە: بنەچەك: ئەسل: بناغـە: بناخـە: بن ئاخ.

ئەساسی خانوو و دام و دەزگا.

- بناخە دانەر: دامەزرێنەر:
- بنار: ١-شەڕ: ٢-داوێنی شاخ

لەشەڕ و بناران دەگەڕێ.

١- ناوی کچانە

- بناڤێ: ململانی.
- بنانی: قۆرایی: قۆلایی.
- بناو: ١-بن ئاو: ژێر ئاو: ٢- ناوی دارێکە.

٣-ناوی گوندێکە لە دۆڵی بالیسان.

- بنباخەڵ: بن هەنگەل: بن قولنج:
- بن بڕ: بنەبڕ: ١- لە ژێرەوەی بڕین:

٢- بریتییـە لـەو کەسـەی لـە ژێـرەوە کـاری خەراپە دەکات.

- بن بڕبوون: ١- بنەبڕبوون: لەئەساسەوە نەمان
- بن بنەوە: ژێرژێرەوە.
- بن بیڤ: ژێرزەمینێکی بـچووکە زۆری لـەخانووی شارە خاوییەکان هەیە، ئازووقەی تێ هەڵدەگیرێ.

بن بێژینك: بنژیل: ئەو وردەیەیەی لە کاتی گێشکە کردنی دەغڵ و دان پەیدادەبێ.

- بن پەلك: گـەلاکانی بنـەوەی: تـووتن: لـەجاری یەکەم دەشکێنرێتەوە (واتە لێ دەکرێتەوە).
- بن ترنە: ئەو داوەیەکە رایەلی لەبنـەتانی تـەون پێ قایم دەکرێ.
- بنچون: هەژاربوون.
- بن داتێ: بمان داتێ: پێمان بدات.
- بندان: ئاردەساوار.
- بـــن دیـــان: ١- بـــن فەلـــە: موســـڵمانی لەئەسـلادیان، کــە لەدەشــتی هــەولێر بــلاو بوونەتەوە، برا گەورەیان لە گونـدی ئـازی کەنـد دادەنیـــشێ لەئەســـڵدا دیـــانی هەرمۆتـــەن لەســەردەمی، ســەفەوییەکاندا بــاپیرە گــەورەیان دەڵێن ناوی (یەڵدۆ) بووە رووی کردۆتە ئەو ناوە لەوێ بووەتە موسـڵمان و ژنـی هێنـاوە و چـوار کوڕی لێبووە، ئێستاش ئـەو بنەماڵەیـە پـەرەی سەندووە و عەشیرەتێکی گەورەی لێ پەیدابووە.

٢-نازناوی هەموو بن دیانەکان

زاهیر بن دیان، خدر بن دیان

- بن ڕاو: پێچەوانەی سەڕاو، ئەم دەستەیەی لە داوێنی گرد بلاوەی لێ دەکەن بۆ کەروێشك هەڵساندن.
- بن ساپیتە: ساپیتە: سەقف: میچ: بنمیچ: سەراپیتە.

لە بنمیچ سیسرە دەیان خوێند (گەدا- ل٣٢)

- بن سێڤاند: سواندە: گوێسوانە.
- بنکە: ١- شوێنی دەسـت پـێ کـردن لـەیاری قەلە مرداریێ.

٢-بارەگا: مەقەڕ.

- بنکەوێ: جۆرێکە لە جل و بەرگی ژنان لەجیاتی سوخمە بوو ئەو بن کەوییە پەروازەکەی بەسوورمە دەنەخشێنرا چەن دانەیەك لە سمل و مێخەك (سۆلکە و قەنفل) دەهۆنرانەوە بە لێواری ئەو بن کەوییە دە دڕوا بۆ بۆن خۆشی.

... بە کەوا بن کەواو سەرکەوانی خامەك...

(غەوارە- ل١٩٣)

جۆتە و کراشمەکەم دەوێ

(بن کەوێ)م لۆ خێزانێ

(هونراوە- ل١٦)

- بن گوێی: بناگوێی

لێوەچرچەکانی تالآی بناگوێی لێك رەوینەوە.

(گەدا- ل٢٣)

- بنگەڕ: بن کەندەڵان

ئەو کانییەکەی لە " بن گەڕ"ی

بە خۆم لێ دابەپێمەوە

(هۆنراوە- ل٦١)

- بن عام: بنام: بن ئامۆزا

دووکەس یان زیاتر باپیریان برابێ.

- بن لەهجە: لکەشێوە: گۆڤەر: بێچوە شێوە هەرزمانێك دەبێتە چەند لەهجەیەك و هەر لەهجەیەکیش دەبێتە چەند شێوەزارێکیش چەند گۆڤەرێك .

- گۆڤەری کۆیی: بەشێکە لە شێوەزاری سۆرانی زۆر کۆنە زۆر تایبەتیشە، پێویست دەکا کتێبێکی لەسەر دابندرێ وتێکەڵاوە لە شێوەی (بابانی) بادینی، کوردی، جافەرەشەکە، بلباسی لەهەموویان شێوەی کوردی، سۆرانی ناوچەیی کە کەوتۆتە نێوان دووزێ زێی گەورە و زێی گچکە.. هتد، دوایی گەرەکێکی کۆیە لەگەڵ گەرەکی تر هەر لەشارەکە لە هەندێ زاراوە و رەوشت جیاوازی هەیە چ جای گوند مەڵبەندەکان (مێژووی کۆیە، تاهیر احمد- ل٢٧)

- شێوەزاری سلێمانی: شێوەیەکە لە لەهجەی ناوەڕاست. ١-سەرەتا دروستبوون و پەیدا بوونی لکە شێوەی سلێمانی بەم شێوەیەی خوارەوە بووە. شاری سلێمانی لەسەرزەمینێکدا (دەشتی سەرچنار لە دۆلی تانجەڕۆدا لە شارەزوور) کە بنکەی زمانی مەردوومەکەی کرمانجی ئەردەلانی بوو (بە نزیکە شێوەی سنەی ئێستا) زۆری پێنەچوو شێوەیی ئەردەلانی شارەزوور بەرەبەرە دەستی کرد بەتێکەڵاو بوون لەگەڵ شێوەی قەلاّ چۆالانی بابانـدا لە سلێمانی. بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم تێکەڵاوییە هەر لە مەیدانی فۆنەتیکو مۆرفۆلۆژی و وشە وەرگرتندا روویدا، هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو بە سەرگەردانی فیعل دروستکردنی رستەی قەڵاچۆلاندا. فراژی بوونی شێوە تایبەتییەکەی سلێمانی ئەنجامێکی پەرە سەندنی شارەکە بوو کە بووبوو بە میرنشین و ناوچەی گشتی ئیدارە وبووبوو بە بازاڕی گشت شارەزوور و کوێستانەکانی سوری مرۆڤێکی زۆر، بەتایبەتی شارەزوورییەکان رویان کردە سلێمانی بۆ دۆزینەوەی فەرمانی نۆکەری و سوپایی، بۆ خوێندن، بۆ توجاری و بازرگانی، بۆ پیشەسازی و خزمەت





کاری. ئەمانە لەوێ خانوویان دروستکرد بۆ خۆیان و بوون بە خەڵکی سلێمانی

کۆڕ- بەرگی یەکەم بەشی یەکەم تۆفیق وەهبی- چاوخشاندنێك بەشێوەی سلێمانیدا.

- شێوەزاری گەرمەسێر: لکە شێوەیەکە لە لەهجەی خواروو کە ئاخاوتنی خانەقین و مەندەلی دەگرێتەوە کە هەندێ لە دەنگی پیتەکان دەگۆڕن یا دەقرتێن یان گۆن ناکەن وەکو:

أ- (دەنگی (د) دەبێ بە (ی) : کادان: کایان.

ب- دەنگی (ت) لەدوای (س) بێت قەت گۆناکرێ وەکو:

مەست دەکەنە مەس

ماست دەکەنە (ماس)

ج- دەنگی (گ) هەندێ جار گۆناکرێ و دەقرتێنرێ خەمگین ، خەمین.

د- دەنگی (ھ) دەگۆڕێ دەبێتە (خ)

هەویر دەبێتە خەویر.

- شێوەزاری هەولێر: بن لەهجەیەکی زۆر فرەوانە، کە خۆشناوەتیو دەشت و هەولێر و زراری دەگرێتەوە. زۆربەی وشەی بادینی (تێدایە) و بووە بە دانەی قسەی بن لەهجەی هەولێر وەکو (هەنکە، گازی کە، ...هتد) وشەی تایبەتی خۆشی هەیە و کە لە بن لەهجەکانی تر نییە وەکو (هۆپەکم لە خۆمزانی) پیتی (ل) ناسك دەکرێتەوەو دەبێتە (رێی ناسك) پیت گۆڕکێ تێدا زۆرە وەکو (خورشید) دەبێتە (قورشید) باشترین بن لەهجیە وەك بنەمایەك بکرێتە بناغەی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو، چونکە زۆر وشەی بادینی تێدا بەکار دەهێنرێ و خۆی لە ئەسڵەوە بن لەهجەیەکی نزیکە لە بن لەهجەی سلێمانی.

- بن مل: بەشێکە لە ئامرازی جووتکردن گۆتنەکەی بن مللە، بەڵام لەسەر ملی وڵاغی جووتکردن دادەنرێ لەکۆنەوە لبادوفایش دروست دەکرێت.

- بن لە یلوکان: بن لە بلوگان: یاریگایەك بوو بۆ منالآن لەڕۆژانی جەژنەکانی قوربان و رەمەزاندا کۆدەبوونەوە سواری لەلیوك دەبوون.

- بنۆرە: کوندەکە دڕالای ڕزیوەکەی لێ دەکەنەوە و دەکەنەوە کوندە کەواتە (بنۆرە) واتە کوندەی بچووك کراوەیە شوان ئاوی خواردنەوەی تێدەکات.

- بنۆك: چلکێکە لەسەر پێستەی مەڕ و بزن کۆدەبێتەوە خوریەکەی یا مووەکەی لێك دەئالێنێت ئەم جۆرە خوری یامووە رستنیان خۆش نییە.

- بنویت: بنڤت: بخەوێت.

- بنهەنگل: بنکەوش: بنکەلێنە: بن چەنگ: بن دەست: بن باخەڵ: بن کلێشە: گەبەر: بن قولتخ: بن باڵ: بن پیل:

ئەو شوێنەی کە لەژێر شانی ئادەمیزادەوە دەکەوێتە نێوان باسك و تەنیشت

بن پیلی وەسمانە زلەی گرت و گوتی.

(حەمەدۆك-٢- ل٣١٤)

چوو لە بن باڵی خەلیلە پیرنەوی...

(کاریتە- ل٥٢)

- بن هاتن: خەلاس بوون.

- بن هێلین: دوابەرە: پاشە بەرە.

- بنە: ١- ژێره: ٢- ئەو ولاغـەی کـە دەکەوێتـە لای ناوەوەی جۆخین لە کاتی جەنجەر بەکار هێنان و گێره کردندا جا ئەگەر ولاغەکەی لای ناوەوەی جۆخین یان گێره (گابوو) پێی دەگوترێ (گای بنـه) ئەگەر (کەر بوو) پێی دەگوترێ (کەری بنه).
ئەگـەر ولاغەکـە ئێـستر بـوو پێـی دەگـوترێ (ئێستری بنه).
- بنەبان: لای سەروو لە ژووردا:
چوار چمکی لە بنەبانی لایەك لێی دادەنیشت .
(غەواره- ل١٢)
- بنەبڕ: کۆتایی.
- بنەتا: کۆتایی هاتن.
- بنەتار: ئەژداد.
- بنەتان: ژێردار: ئامرازی تەونە.
- بنەجوو: بن جوو.
- بنەتۆ: ١- نیوە تۆ: جۆرێکە لە تۆو کـردن زەوی هی یەکێکە ناتوانێ بیچێنێ لەگـەڵ ئـەو کەسـەدا رێـك دەکـەوێت کـەبێ زەوییەکـە بـچێنێ بـەپێی رێکەوتنی نێوانیان حاسلاتیان بەشدەکرد.
٢- ئەو پارەیەی کە لە جیاتی کچی رەدووکەوتوو دەیدەن.
- بنەماڵە: لە چەند بەرەبابێك پێکدێت.
بنەماڵەی قزلچی وەك بێچوە مراوی...(گەدا-ل٨)
- بنـە خرنـوك: رووەکێکـە زۆر بـەرز نابێتـەوە درکاوییە بەبەرەکەی دەڵێن خرنۆك بەبەرەکەیـەوە دەناسرێت.
- بنەمێرد : بن مێرد: ١- واتە بنکەی مێردان.
٢- ناوی گوندێکـە دەکەوێتـە دۆڵـی ئاکۆیـان لـە ناوچەی رەواندز.
چۆن ناوی ئەم گونـدە بـووە ( بـن مێـرد) شـەڕێك روویداوە لە نێوان خەڵکی ئـەم گونـدە و لەشـکری میری سۆران، خەڵکی ئەم گونـدە ئازایانـە خۆیـان نەداوەتە دەست میر و لە چیای زێڕین یـاخی بـوون بەڵام پاش ماوەیەك میر لەگـەڵ دانیـشتوانی ئـەم گوندە ئاشت دەبێتەوە لەسـەر ئازایـەتی گوندەکـە خەڵاتی کردوون و ناوی گوندەکەش ناو دەنێت (بنە مێرد) واتە بنکەی مێردان لە کاتی وتنـەوە بۆتـە (بن مێرد).
- بنێـشت: بەنیـشت: جاچـك: وێـژەن: جاجـك: بەنوشت: بنیشت: وێژەن: قاچك: داچـکە: جاچـکە: چاچـك: جەوییـەکی زەرد بـاوە کـە لـە دارەبـەن دەتکێتەوە و بۆ خۆش کردنی تامی دەم دەیجوون.
- بنێـشت کـردن: دارەبـەن برینـدار دەکـرێ و کۆچـەلەی وەبـەردەنێن بنێـشتەکە دەچـێتە نـاو کۆچەلەکە.
- بنێشتە تاڵ: پـێش ئـەوەی بنێـشت بکوڵێنرێـت پێی دەڵێن بنێشتە تاڵ.
- بنیشتی کوردی: ئەو بنێشتەی لە کوردستان لـە دارەبەن کۆ دەکرێتەوە.
- بو: بۆ: لۆ:
بو مری پار ئەڤساله دکەنه گری ...(کانی- ل٢٦)
- بوت: پوت: مرۆڤی لە بەردی.
- بواچە: بڵێ: بێژە: بواچ.
- بواچە: دەڵێم: ئەلێم.





- بوانە: بخوێنە: بخینە.
- بوانۆ: بخوێنێ: بخینی.
- بـوختی: بـۆتی: بـۆت: هـۆزێکی گەورەیـە لـە مەڵبەندی بۆتان لە سەرەتادا ئەم وشەیە (بـوختی) بووە و بووەتە ( بۆتی) لە دوایدا بووە بە (بۆت).
- بۆتان: ١- مەڵبەندی هۆزی بۆتان.
٢- میرنشینەك بوو کە شاری جزیره پایتەختییەتی بەناوی میرنشینی بۆتان.
٢- لە (بۆت) وەرگیراوە.
٣- بووەتە ناوی جزیره بە ناوی جزیرەی بۆتان.
٤- ناوی کوڕانە.
٥- بوویتە نازناوی خەڵکی جزیرەی.
- بۆتە: ١- لە عەشیرەتی بۆتە.
٢-بویتە: بۆتە پاش ماوە خۆری ئاغا.
(گەدا- ل١٣٤)
- بوغە: بۆغە: لە کوردستاندا بە جۆرە گایـەکی زلی شان بەرزی مل هوڕ دەوترێ ئـەم نـاوە هـی کاتێکـە لـە هەنـدێ لـەکوردەکان (گـا) یـان پەرسـتووە، لەبـەر بـەهێزی و پیـت و پڕئیـشی لەکاری کشتوکاڵیدا.
- بۆ چاڵ: بۆن چاڵ: بۆنێکـە لـەو دەغـل و دانـە دێت کە زۆر لە چاڵدا بمێنتەوە.
- بۆچك: سامان: ماڵ.
- بۆ چووم: ١- هێڵ: خەت:
٢- لۆچووم.
- بۆدڕن: بۆن دڕن: بـۆنی نـاخۆش لـە جەسـتەی پیس دێت.
- بودونەبوو: دارونەدار: دەوڵەمەند و هەژار.
- بوغز: قین: رق: رك.
- بوغزاوی: قیناوی: بەرك.
- بۆدل: ئەحمەق.
- بـۆر: ١- رەنگـی خـاکی: ٢- رەشـە گـەوور: گەووڕ: خاکی.
- بۆز: گەورك.
- بۆران: باوباران بەیەکەوە.
- بۆرژان: خەواڵوو: نیوەنوستوو.
- بۆرە: ١- واتە رەنگی خاکییە. ٢-بـەزۆری ئـەو ناوە لە سەگ دەنێن بەتایبەت رەنگی بۆر بێت.
٣-دەبێتە نازناوی ئەو پیاوەش کە رەنگـی ئەسمـەر بێت جا یا بە تەنیا دەڵێن (بۆرە) یا لەگەڵ نـاوەك بەیەکەوە دەڵێن حمە بۆر، کاکە بۆر.
٤-وێرگۆل: فاریزە.
- بۆرەبا: واتە تۆزێك هەوەست و زەوق جوولانەوە.
- بۆرە باس: باسێکی کورت.
- بۆرە پیاو: بۆرە پیاك: رەمەکی.
- بۆرەخزم: خزمی دوور:
بـۆرە خزمێکـی شـەمس الـدین کـەدخودای حەزوەیش بوو...،
(شەرەف- ل٤٤٢)
- بۆرەخزمایەتی: خزمایتییەکی دوور.
- بۆرە گلەیی: گلەیی بچووك.
- بۆرە کار: کاری سووك.
- بۆرەی قەپلانی: ناونیشان و
قارەمانی رۆمانەکەی عەزیزی مەلای رەشە

- بۆرێوە: وەرەوە: بێرەوە:
بێرەوە گوڵە وگیان ئارامی دڵ و گیان.
- بۆڕ: دژی تەنك.
- بۆڕ خواردن: واتە بەزین.
- بۆڕدان: بەزاندن: کۆڵ پێدان: قردان: قڕکردن.
- بۆڕیی: ١-بۆڕییێك: ٢-کەڕەنا: ٣-بەلوعە.
- بۆڕی زەن: شەیپوورژەن.
- بۆز: ڕەنگی کاڵ.
- بۆزبوونەوە: ڕەنگی لەسەر ڕەنگی خۆی نەمێنی
- بوغاز: گـرانگ: ١- شـوێنی بەیـەك گەیـشتنی هەردوو لقی ئامورەکە لەکاتی جووتدا خۆڵ بـەملا و بەولای خۆی پەرت دەکات.
٢- دەرکە:
- بوغازی گەلی: دەرکی گەلی: زارگەلی.
- بۆسە: ١- هەشارگە: حەشارگە:
مکۆ: کـەلێن: کوزگـە: کـولێن: کەلـەن: قۆختـە: کەمین: مارغە: پەیجور: سیپە: شاردنگە:
شـوێنێکی نـەدیوە خـۆی لێ حەشـاردەدەن تـا نەبیندرێن بۆ هەر مەبەستێك بێت، بەڵام (سـیپیە، حەشارگە: هەشارگە) بۆ خۆتێدا شاردنەوەیە تـەنیا بۆ ڕاوەدگوترێت:
بنەڕووخان و (سیپە) چۆل و هۆڵن بـلاوە ڕاوکـەر و باڵندە پۆلن. (تاریك و روون- ل١٤٢)
٢-وێژانبەر: دارێکە لە شێوەی ئاڵقەیە بە نـیرەوەی دەکەن و سەری مژانەی دێتەناو.
- بۆق: ١- قۆرماق: قـۆرواق: قورماقـە: قۆربـاق: بەق: قوڕ واق:
گیاندارێکە لە وشـکانی و ئـاودا دەژی پێـستێکی لینجی هەیە، پنۆکی ڕەش و قاوەیی تێدایە لە ئاوا گەرادادەنێ بەگەراکەی دەڵێن (سەرەمێکوتە)
قۆرواق بگەزی، وێنەی مارنییە.
(پەندی شارەزوور- ل١٣٨)
بۆق، پێوەبدا نـەوعی مارنییـە: واتـە سـتەمکاری بچووك گەلێ لەستەمی ستەمکاری گەورە قورسـتر و گران ترە.
(پەند- ل٩٠)
قورواق وە قیرە گەورە نابێ:
(پەندی شارەزوور- ل١٣٨)
٢-هالاَوی گەرمی ناو کشتوکاڵ:
بۆقەتەی مل: مێرابی مل:
- بۆقـێ: ١-واتەیـەك بـۆق: ٢- نازنـاوی ئـەو کەسەی ڕووخساری وەکو بۆق دەرپەڕیوە.
هۆشیار بۆقی
- بۆگەنی: گەنیو: گەنیك: بۆکردوو: خرابوون: تێك چوون: پۆگەند: بووگەنی:
بۆی ناخۆشی کەلە:
١-باوبژی ناو زگی گیانداران، لەئاودەست دێت.
٢-ئاوێ کە ماوەیەك لە شوێنێکدا مابێتەوە.
٣-خواردن مابێتەوە چەند ڕۆژێك بۆنی گرتبێ.
٤- میوە و هەربابـەتێکی تێکـچوو بێـت و بـۆنی گرتبێ.
- بۆگەنی بوون: بۆنکردن:
تەرمەکان لە نێـو مـەزاری عـارف: صـائم بەگـدا بۆنیان کردبوو.





(حەمەدۆك -٢- ل٤٣٣)
- بۆل: ١-زۆر: ٢-برین گەورەبوون.
- بۆڵە: ١-دەنکی ترێ: ٢- بۆڵە بۆل: پرتەپرت.
- بۆڵە مر: مشکی سەرسکڵ.
- بۆڵك: لوتکە: دوند: ترۆپك: تۆقەڵەی چیا.
- بۆلگە: هەرێم: ناوچە: دەڤەر: مەڵبەند.
- بۆن: بۆ: بێهن: بێن: بۆوە:
لەباخچەی ڕەنگاوڕەنگی پڕ بۆن و بەرامە.
(شەرەف- ل٤٥١)
ڕحان و بەیبونا هەندەك واژی تێ بێناوی خۆشە
(لاوك- ل٧٤)
- بـۆن بـڕ: ١-حـەکیم، لـە کـوردەواری چـەند دەرمانێك تێکەڵ یەك دەکات دەداتە ئەو منداڵـەی کە تووشی (بۆن) بووە.
٢-دەستی ئەو منداڵـە نەخۆشـە بـوو دەکـات کـە بوونی گرتووە دەزانێ تووش بووە یان نە.
- بۆن خۆش: بۆندار: بۆنی سووك.
لەموسلێم قفل دابوو لێرانە بۆنی خۆش دێ
- بۆن کز: بۆن سۆ.
- بۆنی سووك: دژی بۆنی گران.
- بۆنی گران: بۆنی قورس: بۆنی ناخۆش.
بەچەرخیم لۆپێ مەکە
شقاتەی موومم پێیە
بۆنی بەنزین گرانە.
(هونراوە-ل٣٢٤)
- بـۆوا: ١- پارچـەی بـچووکی دەسـتەکی عـاردی تووتن.
٢-لۆئەوها: بۆ ئاوا
- بۆنگ: دەباغ:
- بۆنگکردن: ١- دەبغ کردن: ٢-هەندان:
- بۆنگـچی: دەباغـچی: ئەوکەسـەی پێـستەی حەیوان خۆشدەکات.
- بوو: پاش گرە واتە ئەنجام درا (کارەکەبوو).
- بووتە: بۆتە: ١-ئەو ئامرازەیە کە زێـڕ و زیـوی تیا دەتوێننەوە:
٢-سەنەمە
- بووار: ١- بڕ: ٢- بەهار:
مەلەوانی سەر ڕووباری دوورەبواری کەف چڕینی.
(شەرەف- ل٤٢)
- بوارە: ١- دەرەتان: مەجال: ٢- بەهارە.
- بوودەڵە: بێ شەخسیەت.
- بووچە: لەبەرچی.
- بوورا: بیرا: ژن برا: برای ژن: کوری خەزووری مێرد.
بوورایێ من: واتە کوڕی خەزوورم.
- بوورانەوە: لە خۆچوون.
- بوورج: ١- قولخ: ٢-کەلوو.
- بـوورجی بەلـەك: نـاوی کوشـکێك و تـەلاری کاکە(مەم) بیە لە ناوچەی جزیرە.
- بورجی دەوڵەتان: قەڵات
- بووران: باوتۆزی بەهێز.
- بووراندن: بووردن: عەفوکردن: بوورین.
- بوور دوو: فیدایی: پیش مەرگە.
- بوورە: بەوزەویە کێڵدراوە دەڵێن کە دوو گاسـنی لێدرابێ شۆ برایـێ و وەرد درابێتـەوە، بـەڵام تـۆو

نەکرابێ لە کۆی خۆی ماوە بۆ ساڵی داهاتووی تر کە دەکا دووساڵ.

- بووری: رابردوو: رابردی: دەمێ بووری: کاتی رابردوو.

- بوورییە: بڕۆ: بچە: هەڕە.

- بووز: بەفر: سەهۆڵ.

- بووژە: بڵێ: بێژە.

- بووژما: بووژمان: بێ بەخت.

- بووك: بیك: بویك: وەوی: وەیی: بۆك: سوور: بویی: بوەیوە.

١-کچێکی بەشوو درابێ، لەو رۆژە را کە دەست بەساز کردنی دەکرێ بۆ چوونە ماڵە مێرد و پاشانیش تاماوەیەك.

٢-نسبەتی ژنێ دەگەڵ هەموو خێزانی مێردەکەی.

٣-بریتییە لە زۆر جوان

بویك ب دلێ زاڤایە. (کانی- ل٢٠)

بویکێ دگەل تەمە، خەسیی تە گو هولێ بێت

(کانی- ل٢١)

٤-ئاوازی زۆر گۆرانی کوردییە.

١- زاوا لە بووکێ مەدە.

٢-مەدرنگە داکێ بووکێ مەدرنگە.

٣-ئۆخەی ئۆخەی بووك زێنی.

بووکۆکە: بووکلە: لەێستۆك: وەوی مناڵانە: بووك.

- بووك و خەسوو: بریتییە لەدوو دژ.

- بوکینی: بەربوودی، لەشکری بوکێ:

هەموو ئەو کەسانەی دەچنە دووبووك:

- بووگە: بووە.

... ئەوا ئیسەگشتی بوو گە وەهیچ...

(گەدا- ل٦٦)

- بوولەرزە: بووە لەرزە: لەرزەك: عارد لەرزین: بوومەلەرزە.

هەژان و لەرینەوەی توند و تیژی یاسووکی هێندی شوێنی گۆی زەوی.

- بوون: زان: منداڵ بوون.

- بوهار: بەهار: بوار.

- بووهێك: رابردوو.

- بوێژ: شاعیر: هۆزانڤان.

- بە: ١-خاوەن: بەهێز:

٢-بۆ سوێند خواردن

بەخودای، بەخولای

٣-لەگەڵ: بەتۆدانداردم

٤-وە:

وەجار: بەجارێ

قەسیە وەجارێ ریشەم دەربێنێ

(گولاڵە- ل٣٥)

وەبێ: بەبێ

ئەگەر وەبێ تۆ بچمە زەماوەن

(گولاڵە )

وەعاباوە: بەعەباوە

بە قوربانت بم وە عاباوە (گولاڵە- ل٥٤)

- بەئۆك: ئێسك گران: رەزاگران: رەزاقورس.

- بەئەم: بەم.

بەئەم شوێنەدا مەچو: بەم شوێنەدا مەچوو.

- بەئەمە: بەمە.





- بەئەمانە: بەمانە.

- بەئەو: بەو.

- بە ئەوخوایە: بەو خودایە.

- بەئەوە: بەوە.

- بەئەوانە: بەوانە.

- بەئەنگۆ: بەنگۆ: بەئێوە.

... بەنگۆم هەیە کارە..

(تحفە -٢- ل٢١١)

- بەئەمەك: حەڵاڵزادە: لاوچاك: شیر حەڵاڵ: شیرپاك.

- بەئەوێ: بەوێ:

هەی شەڕەشەڕە بەوێ سیانێ

سمایل پاشا بوو لەدەشتی دیانێ.

(سێ سەد- ل٢٩)

- بەبادان: ١- هۆنداکردن: دۆڕاندن: چواندن: بەفیڕۆدان: بەلاش چواندن: لەئاوکردن: لەدەست دەچواندن: بەباچوون: زایەکردنی شتێ: بەهیچی شتێك: لەدەست خۆ دەرکردن

بەبا چوو عومری شیرینم

٢-دانەبا: بەباکردن.

- بەبڕشت: بەپێز: بەبەرەکەت: بەبەرهەم.

- بەبۆن: واتە بوونی هەیە.

- بەبە: بابان.

(لەتاریخی سولەیمانی- لاپەڕە ٤٥)

دا (محمد ئەمین) لە بابەت ناوی (بەبە) وە ئەڵێت: ئەگێڕنەوە کە ( سلێمان بەگ) چووە بۆ ئەستەمبول لەوێ سوڵتان لەپێش دیدەنیا ئەویش بەجل و بەرگی کوردانەوە بچێتە لای بۆ دیدەنی سوڵتان کە سوڵتان چاوی پێ کەوتووە سەری سوڕماوە و حەپەساوە لەبەرخۆیەوە وتوویەتی (وەی بەبەم) بەم بۆنەیەوە لەو رۆژەوە سلێمان بەگ ناونراوە (سلێمان بەبە) واتا بابانەکانی سولەیمانی لە بابا سلێمانی کوردی فەقێ ئەحمەدەوە دەستپێدەکات.

٢-واتا (بابان) لە (بەبەوە) وەرگیراوە.

٣- بووە نازناوی هەموو نەوە و تیرەی سلێمان بەگ.

٤-بابان: ناوی فەرمانڕەوایەك بووە بەناوی فەرمانڕەوای بابان.

٥-ناوی کوڕانی کوردییە.

- بەبەرەوە چون: بەپانایی داگرتن.

- بەبۆن کەوتن: جۆرێکە لە نەخۆشی کەتووشی مناڵان ئەبێت.

- بەپڕپڕ: زۆر بەزەحمەت.

بەپڕەپڕ رزگارمان بوو.

- بەپەنگ بی: بەپەندچی.

- بەپەنهانی: بەدزی: بەنهێنی: لەژێرەوە.

- بەپشتەك: جۆرێکە لە بڕینەوەی خوری مەڕ.

بەقەدەر دووسێ ناو لەپ لەکاتی مەڕ بڕینەوە خوری وەك قاقۆل لەسەر پشتی مەڕەساوازێ و بەران و بەرخەمێ و ئەو بەرخە نێرەی کە بۆ بەران رادەگیرێت واتە بەرخ بەران دەهێڵدرێتەوە تاکو گەرما ژۆنەبن.

- بەت: حەباری.

- بەتار: ١- بەتاڵ: خاڵی:

٢-بێ بەخت.

- بەتاقی تەنێ: بەتەنیا: بەتەنێ: بتنێ.

- بەتر: بەتل: بار
بەترێك لەشەو: بەشێك لە شەو.
- بەترپیری: بەسترپیری:
- بەترپێرار: بەسترپێرار
- بەتیە: وەکو عەبایە لە مەرەز دروستدەکرێت و تەنکە لەسەر جل و بەرگ گەورە پیاوان لەبەریان دەکرد:
- بەجارەك: بەجارێ
مرێموك هەر بەجارێ هاروشێت بوو
(کاریتە- ل٥٣)
- بەجرەجر: زۆربەزەحمەت.
- بەجواب هاتن: وەجواب هاتن: وەڵام دانەوە.
- بەجەم: ئەستۆر.
نانەکان بەجەمن: واتە تەنك نین.
- بەجێ هێشتن: جێ هێشتن:
- بەچاوەوەبوون: بەچاو چوون: لەچاوەوەبوون.
لەچاوی پیسەوە توشی نارەحەتی بوون.
- بەچبارێك: بەچجورێك: بەچنەوعێك.
- بەچکە: منداڵ: مناڵ: مندار: زارۆك: بەچە.
- بەچەباز: منداڵ باز: نێرباز.
-بەچەدان: رەحم: زێ.
-بەحەق: بەهەق.
- بەحەقی خودا: سوێند خواردنە.
- بەخت: چارە: ناوچاو: بەش: ئیقبال: ئیخبار: یەغبار: شانس
شانسی سمایل گوێ براوی ئاشەوان هەستابوو.
(حەمەدۆك -١- ل٦٦)

- بەخت نامە: کتێبێکە کە فاڵچی بەختی پێ دەگرنەوە.
- بەختەك: ١-خرت: جاپ: قەیرە:
بەرایی تەمەن تاسێ ساڵ و نیو.
٢-بەختێ:
بەختەك لە ئەزەل سیاچارەبێ
دەستی لێ مەدەن بەهاوار نابێ
(گۆرانی زیرەك)
- بەختەوەر: ١-بەهرەمەند: بەختیار: کامەران: خواپێداو: خودا پێداو: بەهرەوەر: خۆش بەخت: بەناوچاو:
کە رۆژگاری بەختیاری ئەیوبی یان بەرەو باری نالەباری چەرخی.
(شەرەف- ل٤٢٨)
٢-ناوی کورانی کوردییە.
- بەخت هێنان: چاك بۆ هاتن.
- بەخت هەستان: کچی داخوازی هاتبێ بۆ شووکردن.
- بەخورتی: بەزۆری: بەتۆبزی.
- بەخولامت بم: واتە ببم بەخزمەت کارت بۆ پارانەوە و تکاکردن بەکاردێ.
- بەخۆداشکانەوە: تەریق بوونەوە.
- بەخۆدێنۆ: بەخۆدێنەوە: هۆشیان دێتەوەبەر.
- بەخشیش: خەلات: شاباش: چێشتانە: پاداش: پێمزك
- بەخۆکەوتن: ئامادەبوون: سازبوون: وەخۆکەوتن.
- بەخۆم: خۆم:





- بەخۆیان: خۆیان.
- بەخێربێن: بەخێر ێن.
- بەخێربێی: بەخێرێی.
- بەخێربچی: بەخێرچی.
- بەد: خراپ: نالەبار: خراو.
- بەداروبار: ١-مرۆڤی تێر و قەڵەو.
٢-شوێنی درەختی زۆربێ
- بەداوبگرن: واتە بەداوێ بتانگرن
رەبی شەوارەو لێ دانێن و بەداوبوگرن
(تحفە -٢- ل١٣٦)
- بەدبەخت: بی ئیغبار: بێ ئیقبال: بێولەت: بێ یەغبار: بێ شەنس: بێ تالح: چارەڕەش: سیاچارە: ناوچاوڕەش: مەینەت بار: کلۆڵ: بێ یەغبال
میللەتەکەبێ یەغبالە ئەفەنم... (تەنەکە- ل٤٠)
زۆر ئامینە خانی بێ بەش و چارەڕەش ماون...
(گەدا- ل١٥)
هەزار هێندە سیاچارە بژیم هێشتا
- بەدعەمەل: بەدکار: مزیر: قەڵپ:
بەدکار لێرە هەردووانە یەکیان پیرە یەکیان جوانە
(هۆنراوە- ل٥٤)
- بەدفعل: بەدکردار.
- بەد قەدەم: پێ رەش: پێبێ خێر.
- بەدگۆ: بەدگوو.
- بەدووکەوتن: ١- رادووکەوتن: رەدووکەوتن:
ئەنجامی سەرگرتنی حەزو ئارەزووی خۆشەویستی نهێنی دوودڵداری کوڕ و کچە. بە زۆری لەنێوان کوڕێکی هەژار و کچی دەوڵەمەندا یان کوڕە جووتیار و کچە ئاغادا رووئەدات.
٢-بریتییە لە پەیڕەوکردنی کاروبیر و باوەڕی کەسێ ئەگەر زیان بەخشیش بێت.
٣-شوێن کەوتن:
-بەدەن: قەلب: گیان: لەش: جەستە: جەسە: رێژە: قالب بەندەن: لەخت: بەشەن: چەك: تەن: لاش: قالب: مر: گان:
لە سەرەوەی تاکو هەردوو پای ئادەمیزاد و بوونەوەر.
لەشی کەوتبووە لەرزین... (ئاشتی- ل١٤٠)
تاقەتم لەبەدەندا نەماوە (بۆرە- ل٣٨)
هەموو قالبم دێشێ.
جەستەی دەوێت داروباری پێ لەبارێك نەچێت...
(غەوارە- ل٨)
رۆڵە دڵم سۆتاوە، میرمەم ئاورم بەربووە لە بەدەنێ... (تحفە -١- ل٢٤٢)
- بەدناو: سووك: بێ ئابرو: ناوزڕاو: ناوپیس: ترۆ: ریسوا: کەسێك کە کاری گەند ئەنجامبدات.
- بەدین: دیندار: خواپەرست: ئیماندار: بە ئیمان
- بەدیوم: بەدێوم: شووم: بەدفەر: نیگبەت: بەدووم
پەپووی شووم و بەدووم کوری بەدووم مەیە
(کاریتە- ل٥٤)
- بەدی کردن: دیتن.
... باش رێی یەدی نەکرد... (گەدا- ل٨٣)
- بەر: ١-بەرد: ٢-پێش: بەرلە ئێستا ٣-بەرهەم: ٤- فرەهەیی: پانی.
٥-ناو:

(بەری دەست: ناودەست).
٦-روو: بەرم تێکە.
٧-بن: بەری پێ: بن پێی.
٨-پانایی دەغل لەکاتی دروێنەدا.
کەسەرپالە دیاری دەکات بۆ دورینەوە.
٩-ئەوپارچە تەونەیـە کـە بەیـەکجار دەیـچنن و پاشان جێی دەگوازنەوە دەست بەبەرێکی تر دەکەن: (بەرنزیکـەی مـەترێك دەبـێ. مـافوور سـێ چواربەرە).
- بەرات: ئەومیقدارە گەنمـەی جووتیـار دەیداتـە مەلای گوند
بـەراتی کوێخـا: (٥٠-١٦٠)کیلـۆ گـەنم بـوو لـە جووتیار دەستێنرا دەدرا بە کوێخا.
- بەراز: وەراز:
- بـەراز کـوژ: ١-جـۆرە گوللەیەکـە کـە بـەراز دەکوژێ گوللەیەکی بەرازکوژ یان لێ خەسارکرد.
٢-سەگی کەلەش گەورە کە بەرازدەکوژێ.
- بەران:١- نێری سپیانی تەمەنی لەساڵ و نیو تـا دوو سال و نیو تەواو بکـات پێـی دەڵـێن (شـەك) دوای شەك دەبێتە بەران.
٢-بەڵام: بەلان.
- بەرانبەر: بەرامبەر: بەرابـەر: ئاڤـار: بەربەهـەڤ: راست: حاست: هەناس: ڤەراڤبـەر: تـەراز: بـەبۆز: هەمبەر: جووتەنی: لەبەرانبەری خۆی بیرِوانییایـە تەبەقی رۆژ.
(گەدا- ل١٦)

١- حاڵی دووکەس یـان دوو کۆمەڵـە خـەڵك یـان دووشـت کـە هێنـدەی یـەك دووربـن و روویـان دەیەکتری بێ (بەرامبەرم رامە بورە کـزەی جـەرگم وەك تەنورە).
٢-حاڵی دووشتی بەتەنیشت یەکەوەی لێك جیاواز کە بڵند یان وەك یەك بێ.
لەبەرامبەر یەکیان راگرتن: هەندێ یەك بوون.
٣- مقابل: لەراستی.
لەراستە من قسەی مەکە.
- بـەرانك: بـەرانکێ: ئەسـپێ کـوژە: پەنجـەی گەورەی دەست .
- بەرانگرتن: جووتبونی مەرِ لەگەڵ بەران.
- بەرانی دوو قەیرە: واتە بەرانی تەمـەن پێـنج ساڵ و نیو.
- بەرانی یەك قەیرە: بەرانی تەمەن چوار ساڵ و نیو.
- بەراوەژوو: بەرەوژێ: بەراوپشت.
- بەراویشتە: بەراویتە: ئەو مـەرِ و بزنـە یـە کـە بەریان لەبەر چوویێت.
- بەراو: وەراو: بەرئاو: ئـاوی: زەوییـەك بـە ئـاو رووبار و کانی و ئەستێرەك کشتوکاڵی لێ بکرێت.
- بەرئەمر: ملکەچ: گویرایەڵ:
- بەربانگ: رۆژی شکاندن: رۆژی کردنەوە.
- بەربـەر: سـەرتاش: سـەرتراش: سـەرتەراش: دەلاك: حەلاق.
- بـەربازن: کۆمەڵـە مووروویەکـە قـل گەورەیـە بەداوێکییەوە دەکەن و وەکو بازن لەزەنـدی دەکـەن بۆ ئەوەی بازنەکان بگێرِێتەوە و نەیەتە سەردەستی





دەستت برندنابێ لە بەربازن و بەربازنان. (حەیران)
- بەربۆسە: پەلەدارێکە بەقەدەر دوو پەنجە پانـە و لەناو راستی بۆ سـەدراوە گاینجـە راگـیر دەکـات لەئامرازی جووت.
- بەربـەخت: گـەورەکچ: بـانگ: کـچێکی وادەی مێرکردنی هاتبێ.
- بەربە رۆشك: بەررۆچك:
دانیشتنی بن دیـواران لـە کـاتی زسـتان کـە رۆژ بەدەرەوە بێ.
... لەبەر بەرِۆچکێك هەلترووشکابوو...:
(گەدا- ل١٦)
بەربەرۆ: بەربەرۆژە: گوڵەبەرِۆژە.
- بەربەسێل: قوراو: گۆشتی بەکەرەی سـوورکراوی ناو سێل.
- بەربیر: پێشەوەی بیری ئاوێ ئەو شوێنەی بۆ ئـاو هەلکێشان لێی راوەدەستێ:
یـەکێ گـەورە بپێتـەوە بـەربیر و منـداڵێکیش دۆلابچی... (غەوارە- ل١١)
- بەرپرس: لێپرسراو: مەسئوول.
- بەرخ: وەرە: ئـەملك: مازمـاز: بـەرە: وەرِگ: برە: وەرك:
نێر و مێی سپیان لەو رۆژی لەدایك
دەبن تاتەمەن شەش مانگ.
- بەرخی مێ: بەرخە مێ.
- بـەرخی نێـر: بـۆ ئـەوەی ببێتـە بـەران بەخێودەکرێت و خزمـەت دەکرێـت کـە مـەرجی تایبەتی خـۆی هەیـە وەك پاشـەڵ بـەرین بێـت،

کاپێلك راست بێت نەك خـوار سـینگ بـەرزبێت بەناوسك بێت. کەلەشی درێژبێت لمووزی مەرِانی نەبێت خوری زۆر تیـسکن و درێـژبێت. رەسـەنی دایك و باوکی بزاندرێت، دەم سەنەبێت.
- بەرخ برِ: جەژنێکە مەردارەکان لەکاتی برِینەوەی کاورِ ئەیگێرِن.
- بەرخوردار: کامەران: دەمان: سەرفراز: سەربەرز:
- بەرخەبەبـەك: بەرغەبابـە: بەرغەبەبـە: غـەب غەب: گۆشتی زیادی بن گەرو.
- بـەرتیل: ریـشوەت: رشـفەت: دەم چـەورکردن: دەوچەورکردن.
بـۆ ئەسـتاندنی بـەرتیل و سـازکردنی پـەلپ و بیانوو... (گەدا- ل١٢)
- بەرخە کۆرپە: ١- بێچوی مەرِ کە لە جـۆزەردان زابێ لەماڵ بەجێ ماوی دەگەل مێگـەل ناکـەوێ و لەماڵەوە دەمێنێتەوە.
٢-بریتییە لە مرۆڤی بێ دەسەڵات.
- بەرد: تەونی: کەڤر: کوچك: کەمەر: پەڵ: کەور: کۆش: تەڤەنی: تەوەنی: مەنگ: کوچکە: تاوێر:
- بەر: بێر: خرِکە: گاشە: خرِك:
جسمێکی رِەق و سەختە، لەسەرزەوی و ناو کـان و شاخ و چیاکان زۆرە گەورە و بچوك و کۆمای زۆرە، شـکلێکی سـابتی نییـە و گـەلێ رەنگـی تێـدا دەبیندرێ لە توخمی جیاجیای کیمیایی پێکهـاتووە جۆری زۆرە وەك:
١- بەردە زووگ: ٢- بەردە زەرد: ٣-بەرەئەسـتی: ٤- بەردە خاڵدار: ٥- بەردی شاخی: ٦-پەلەبەرد:

دەك كوچكت لێ واری بەیانی چی؟ (گەدا- ل٢٣)
... لێژایەكی ركە، بەردی دڕوساغە...
(غەوارە- ل٦)
بەردەكان سەریان لە سوخەكان دەرهێنابوو.
(گەدا- ل٩٤)

- بەردە بەنرخەكان: بریتین لەو بەردانەی كە خشلی ژنانی پێ دەرازێتەوە وەك
١-دوڕ، ٢-مرواری، ٣-گەوهەر، ٤-مەرجان، ٥-لەعل، ٦-یاقوت، ٧-زیو، ٨-یەشم، ٩-زمروود،

- بەرداش: بەرئاش: هارە: هارە ئاسیاو: بەرداسیاوان: هاراسیاو: بەراش: بەرێ ئاشی.
تاتە بەردێكی سەختە خڕە دەتاشرێ بۆ نانەوەی ئاش، هەرئاشێك دوو بەرداشی هەیە و لەسەریەك دادەندرێن، ئی ژێرەوەیان دادەمەزرێ و ئی سەرەوەیان دەگەڕێ و دانەوێڵە دەهاڕێ.

- بەردتاش: بەردتراش: نەقار:
كەڤرتاش: كوچك تاش: بەرد تەش: سنگ تاش:
كەسێكە بەردان لێك و لووس دەكا تاوای لێبێ بۆ ئەوە دەستبدا لە خانووبەرەدا بەكاربێت.

- بەرداو: بەردرای: ئازاد: بەڕەڵا: سەربەست.

- بەرد كێش: ساوەڵ.
ئامێرێكە لەدار دروستدەكرێ و لە ولاغی دەكەن و بەردی پێ دەكێشنەوە.

- بەردلك: بەروانكە.

- بەردەباز: پێ پەلووك: نەردەوان: دەرجە: دەرەنجە: بەردی ناو ئاوی رووبار بۆ پەڕینەوە.

- بەردەبێر: ئەو بەردە تایبەتەیە كە لە دەرەوەی گوند شوان لەسەری دادەنیشێ لەكاتی بێركردندا.

- بەردەپلووكە: بەردی بچووكی بە ئەنگوست بهاوێژرێ.

- بەردە خەڵووز: رەژووی بەردی.

- بەردەرێژ: رێزكردنی بەرد لە تەنیشت یەك لەسەر شەقام و رێگا یا نێوژوور.

- بەردەقانی: قۆچەقانی: بەردەوانی: هەڤچار: كانك: كانیك: كوچكانی: سەپان: كەهن: بەرزەقانی: بەرەڤانی: گەڤك: قەوكانی: قەڵماسنك: قەفكانی: قەفكانۆك: قەڵا سنگ: كەڤركانی:
ئامرازێكە لە( بەن) دەچندرێ ناوەڕاستەكەی پانە و بەرەبەرە باریك دەبێتەوە، پاشان لەهەردوولایەوە نزیكەی (٢٠-٣٠)سم وەكو گوریسێكی باریك دەهۆندرێتەوە لەڕابردۆیكی كۆنا وەكو (چەك) ێك لەناو لەشكراندا باوبووە و دەگەڵ دوژمن شەڕیان پێكردووە.
ئێستا بۆ شەڕە گەڕەك و چۆلەكە كوشتن بەكاردێ.

- بەردەقانی ناگاتێ: بریتییە لەو كەسەی لەڕاكردن خێرابێت.

- بەردەق بەردەق: قڕەقڕ: مشتومڕ.

- بەردەقسل: سەمەبەرد.

- بەردەقەبر: ئەوبەردەی بۆ قەبر بەكاردێ.

- بەردەگڕوو: بەو بەردە دەڵێن كە لە چەو و بەردپێك هاتووە.





- بەردەڵان: هەردە: زبران: كەرە: گەڕگەڕ: كڕێن: چەقین: بكەڤر: تێركەڤر.
زەوییەك بەردی زۆر بێت.

- بەردیل: بەردێر: بەلەندێر: شەكەمێ: مێی سپیان كە ساڵ و نیوی تەواو كردبێ و بڕاوە ئەو ساڵە لەهاویندا بۆ یەكەم جار بەران دەخوات و لە پاییز دەزێت.

- بەردیل زا: شەكە مەڕ: مێی تەمەنی دووساڵە

- بەردیل زەكات: لەدوای بڕینەوە پێش ئەوەی دووساڵ تەواو بكات و بەران بخوات بەزەكات دەدرایە مەلای گوند.

- بەردێ: ١- پێش گوند:٢- بەردەك.

- (بەردێ بێرێ چەند ركە).
(هونراوە- ل٧٠)

- بەرزنجە: ١- بەر واتە بن+ زنج (كوخ) واتە بن كوخەكە.
چیرۆكی وشەی (بەرزنجە) وادەگێڕنەوە دوای كوژرانی حەسەن و حوسەێن (سەیدا) قڕان پەیدا بوو دووبرا لەو سەیدانە بە ناوی (عیسا و موسا) پەریوەی مەڵبەندی سلێمانی بوون خاوەن كەرامەت بوون لەنزیك سلێمانی یەكێ لە گەورە پیاوانی سلێمانی كچی خۆی دەدات بەیەكێكیان هەر ئەو وەخت ئەو شوێنە بەجێ دێلن روولە ناوچەیەك دەكەن ئێستا پێ دەڵێن بەرزنجە لەسەر گردێك كوخێك دروستدەكەن بەو كوخە دەڵێن (زنج) لە خوارەوەی گردیش كانییەك دەبێ بەو كانییە دەڵێن (بەرزنج) واتە (بن زنج) دەوروپشتی كانی دەبێتە گوند و پێیان وتووە (بەرزنجە) ئەم ناوە ئاوا دروستبووە.
٢-ناوی گوندێكە.
٣-نازناوی شێخەكانی بەرزنجەیە.

- بەرسینچكە: هەناوكوتان: نزگرە.
كەهێوریش بووەوە تاماوەیەك بەرسینچكە و نزگرەیەكی وا بەرۆكیان بەرنەدا... (غەوارە- ل٩)

- بەرف: ١-بەفر: ٢-بەرەو.

- بەرڤ ببوون: كۆبونەوە:

- بەرڤ كردن: كۆكردنەوە.

- بەرقڵیان: قاوەلتی: قاوەلتون: قاوەتی:
سووكەژەمی خواردنی كاتی چێشتنگاو

- بەرك: هێز

- بەرۆش: قازان: مەنجەڵ: قەزان
مەیخەر: قابلەمە: ترگال: دیزە: ڤوچخانە
ئەلبەكی: مەنجوك: پادی: سووكرە:
مەنجەڵ گەڕا قەباغی دیتەوە: دووكەسی ئاو قوفی یەك بن لەكرداروكارا.

- بەرۆك: ژی: یەقە: یەخە: یێخە: ئێخە: یێقە: یاخە: زی: حەواس: زریشك: ملیوان: پێسیر
پێشەوەی كەوا یا كراس لە حاستی مل ڕا
تادەگاتە نیوەی سینگ ئەوەندەی لەكراسی
كوردیدا بە یەقە دادەندرێ
بەكەوای درێژ و بێ یەخەیان ڕا دیاربوو
(حەمەدۆك -١- ل٨٦)
بەرۆك و سنگ تەنانەت لاق و لەتەریشی تەڕكرد... (حەمەدۆك-١- ل٥٧)

سلێمان لەناکاو راوەستا و یەخەی حەمەدی گرت.
(حەمەدۆك-١-ل١٤٥)
- بەرك: گیرفان: بەرۆك: قوولك: کوورك: بێرووك:
بەریە: باشیل: بەخەڵ: باغەل: بەریك: بەری:
بێرۆك: گیفان: بەروك.
دەستی لەگیرفانی شەلوارە فش و فۆلەکەی راکرد..
(حەمەدۆك-١- ل)
دەستێن خوە برن بەرۆکا خوە
هەشت زێڕ دەرانین...
(مشتاخ- ل٥٢)
- بەرکوت: ساڵی نەهات و نەبوونی وەرزێر باراشی
نامێنێ چەند شەغرەیەك گەنم یان جۆ یان مزاش
پێش جۆخین
دانان دەکوتێی و دەیکاتە ئارد
- بەرکۆ: کەلبەزێن: کەلپووس: قولێووز
بەشی پێشەوەی قەرپۆزی زین.
- بەرەباب: لەچەند خێزانێك پێکدێت.
تا ئەوسایەکە بەرەبابی حاکمانی خێزانی: سەلیك
خەلیل و میر محمد و برایانی خۆ بەخۆیوە شەرپیان
(شەرەف-ل٤٣٢)
- بەرەزا: بارێزە: خەزەرۆك: خاڵەڕەش
گیایەکی ئاوییە وەکو کەرەوز رەگ و دەماری رەش
و باریکن.
وەك دوورو عەقیق نەقشە دەندان و لە بی ئالەت
مثلی بەرەزا پەخشە ئەگریجە دەسەرخالەت
(سالم- ل٥١)
- بەرەو: رەوەو:
بەرەو دیاربەکر ملی رێگەی گرت.
(شەرەف- ل٤٣١)
- بەرەکەت: خێر: زیادەبەش: خوداداو: پیت: برشت.
نەمئەزانی کوردستان ئاوایە، جێگای بەپیت و
بەرەکەتی وەك ئێرەی تێدایە. (گەدا- ل٩٦)
- بەرەکەتدا: بێری لەکاتی مەرومالات دۆشین
بەکاردێنێ کاتێك لە دۆشینی مەرێك دەبێتەوە
دەڵێ: بەرەکەتدا، ئەو کاتە شوانەکە ئاژەڵەکە
بەردەدات.
- بەرگ: جل: جلك:
هەمیشە جلیشی سەرتاپاشین بووە.
- بەرگن: لوا: بەرگە: تیسکی بەرخ:
بەرەوانی کردن: ناوبژی کردن.
- بەرگولەکەوی: دوعای خەراپ لە کەسێ بکەی.
- بەرگێلە: هەیوانی بەردەم ئەشکەوت و رەوەز و شاخ
- بەرم: ١- بەڵم: قرشەی نیمچە کوتراو.
٢-ببەم: ٣-دەریاچە.
- بەرەمەشکە: بەرەمەشکە: ئەوەندە رۆنەیە کەلە
ژەندنی یەك مەشکە دەردەهێنرێ.
- بەرماڵ: ١-دوگرد: جانماز: مافوورە:
رووخست: مازلۆخ.
لەموو دروستدەکرێت، شێوەی لاکێشەیە قەبارەی
(١,٦٠*١,٦)سم لەڕیبی بۆرو قاوەیی (بێ ئەوەی
رەنگ بکرێ) دەیچنن و نەخش کەشکولی لێ
دەکەن، بۆ نوێژ لەسەر کردن بەکاردێ.
دانشتیە لەسەر بەردی
نەخشی دەکا لە دوو گردی (هونراوە- ل٥٩)





بەرماڵی لەسەر ئاوێ دەگەڕێ: واتە زۆر خوا
پەرست و بەدینە. (پەند)
وەزیر لەسەر بەرماڵێ بوو، دەیگوت یا خولای
کەرەم دارە (تحفە-٢- ل٢٤)
٢-پێش ماڵ:
کانییەکەی بەرماڵ ئاوەکەی لێڵە
عەیبێکی هەیە چاوێکی خێلە (گولالە- ل١٢٤)
- بەرمل: پارچە قایشەکە لەپێشەوەی کورتان
دەدرویێت بۆ ئەوەی کورتان بەرەو پاشەوە نەڕوات.
- بەرمووره: مێخەك: بەنتکی بۆندار
جۆرێکە لە خشڵی ژنان زۆربەی جەوهەر داشەو
لەناوەڕاستەوە بالابەژنی پێدا شۆڕبۆتەوە.
- بەرنەگر: قسر: زڕ: دارێك بەروبوومی نەبێ
بەرەنگار بوون: بەگژداچوون.
- بەرنووت: برنووتی: توتنی ورد
کەلە کەپوو دەکرێ بۆ پژمین
- بەروار: خار: خوار: نەراست: لار:
ئەڤ رێگەیە بەروار دچیت هەتا دگەهیتە گوندی.
- بەرۆژی: بەرۆژوو: رۆژوەوان: رۆژگیر: رۆژی
گر: رۆژگ گیر: رۆژگەوان: نان و ئاو نەخواردن
لە کاتی رەمەزان.
- بەرو:
١- دانەی بەرو درێژکۆلە و رەنگی قاوەیی تیرە
لەناو ژیلەمۆدا برژاندوویانە یا پیشاندوویانە و
خواردوویانە لەقات و قریدا هاریویانە بۆ خواردن
(خەپلە) یان دروستکردووە.
٢- کلاوێکی پراوپڕی لەسەردایە پێی ئەڵێن
(جەوت) پێشیان وتووە (خوا کلاوی بۆ بەڕو
دروستکردوە) وجەوت بۆ خۆشکردنی کوندە،
مەشکە هیزە بەکارهێناوە.
٣- دارەکەی بە بەرەکەی ئەناسرێتەوە (دار بەڕو).
٤- بەڕوبەکالی بەڕوبەکولاوی، بەڕو بەبرژاوی/
پەندی کوردییە بۆ دەر برینی بێزاری لەخواردنێك
زۆر دووبارەبێتەوە.
- بەڕووله: تیژکردنەوەی نووکی گاسنی خوراو
لە کوورە.
- بەرە:
١-تیرە: لەچەند: بەرەبابێك پێکدێ.
٢-ببە:
- بەرەبەرە: بڕەبڕە: کەم کەم.
- بەرەجۆت: کالۆ: بەرجۆت:
١- بەپارچە زەوییەك دەڵێن کە بە جووتە ولاغێك
بەرهەم بێت.
٢- پێوەرێك بوو بۆ هەبوونی دەگوترا: (حاجی
عەزیز دەولەمەندە جێ دووبەرە جۆتی دەگەڕێ).
هەرماڵێك لەپێ دەشت، چ لەهەڵەت
خاوەنی قۆچانی رەشی (لاین)ی بەرەجوتێکە
(غەوارە- ل٧)
- بەرەو ژوور: بۆ سەرەوە،
بەرەو ژوور هەڵکشا ...
(گەدا- ل٨٥)
- بەرەڵدا کردن: بەرەلاکردن.

- بەرەش: تۆوی پیوازە، کە دەچێنرێ دەبێتە پیوازی ورد پێی دەڵێن (خیچکە).
- بەرەم: ژووری ئازووقە: ژۆری زەخیرە
- بەرەواژی: بەروڤاژی:
- بەرەلبێنە: ١- بەرهەلبێنە: بەرامپیل: قوماشێکە ئافرەت لە کاتی ئیش کردندا بەبەرخۆی هەڵدێنێ لە پشتێنەوە بەرەوخوار لای پێشەوەی دەگرێ و دەسووڕێتەوە دواوەش.
٢- ئاوازێکی کۆنی گۆرانی کوردییە.
بەرهەلبێنە و بەرهەلبێنە بەرهەلبێنەی خام هەراوە.
- بەڕەنیا: پارچە ئاسنێکی تیژ لەسەر نووکی گاسنی هەوجار تێکەڵدەکرا و سۆر دەکرایەوە.
- بەرەو: ڕەوەو: رووەو
بەرەو قیامەت کۆچی کرد... (گەدا- ل١٠٣)
- بەڕەی کلکە: بەو بەڕە دەڵێن (تاناکەی) دەزووە و پۆیەکەی بەنە.
- بەرهنگار: بەرنگار.
- بەرهەڵدا: بەڕەلا: ئازاد.
- بەرهێنان: بەرهینان: بەرانین: هاتنە بەر: بەردان: وەبەرهاتن.
- بەری: ١-بێ بەش
لە هەردوو چاوان بەری
٢-ببەی:
- بەریان هەڵدا: بەریان دا:
- بەرین: فرە: گوشاد: هەوار: دژی تەسك.
- بەرینە: راستکردنەوەی و بەرین کردنەوەی پەرکانی گاسن.
- بەڕێ چون: بەڕێوەچوون: گوزەراندن.
- بەرێز: بەقەدر: قەدرگران: ئوودە: رێزدار: بەروو
بەڕێوجێ: ١-بێ کەم و کورت: زۆرتەواو
قسەکان بەڕێوجێ باس دەکا
٢-رێك وپێك:
کوڕەکی بەرێوجێیە:
- بەز: دۆهن: دۆن:
(بەزی بەکتکی بسپێرە) پەند.
- بەزاخ: جوامێر.
- بەزات: جەسور: ئازا.
- بەزار: بەزمان.
- بەزاندن: کۆل پێ دان.
- بەزاوابوون: دژی بەزاوانەبوون.
- بەزاوانەبوون: بەستان: گرێدان:
هەوەست نەبزوانی زاوا لەگەڵ بووك لە یەکەم شەودا.
- بەزر: تۆو: توخم.
نابێ لەبەزری مەجید بێت (غەوارە- ل٢١)
- بەزە:١- بەزەیی: ٢- هەڵە: ٣-تاوان
گەورە و گچکە لە چاکە و بەزەیی بەهرەوەرین.
- بەزەیی: زگ پێ سووتان: بەزە:
یارمەتی زاکیردەدەم بەزەییم بەو دادێتەوە.
(گەدا- ل٢٩)
- بەزەیی دار: بەرەحم.
- بەزدار: بەبەز: بەزی زۆر ببێت.
- بەزم: بەزم و رەزم.
- بەزمگا: بەزمگە:
شوێنی ئاهەنگگێران.





- بەزۆك: ١- خێرارۆیشتن:٢-سەیارە: ئوتومبیل
- بەزین: هەڵاتن: رەڤین: لەشەڕدا هەڵاتن، زۆر خۆماندوکردن لە ژیان.
- بەزیو: هەڵاتوو.
- بەژ: ١-زەوی وشکانی: ٢-بورج.
- بەژك: جیاواز: جودا.
- بەژمێر: شایان: لاق.
- بەژن: ١-باڵا: ٢-خاوەژن.
بەژن و باڵای نەونەمامان. (شەرەف- ل٣٣٥)
- بەژن باریك: بەژن زراف: بەژن زراو.
بەژنێ باریك رادەروا چاوڕەش کوشتمی بەودەردە.
- بەژن شووش: بەژنڕێك: بەژن شیرین.
- بەژن کردن: بەژن درێژبوون.
- بەژن کورت: کورتە باڵا: قووت: بەژن هووت.
- بەژندان: ١-خوشك بۆ برای شووبکات: ٢- کچ بۆ باوك شووبکات.
- بەژۆك: زۆروەر: چەنەباز: بەسبێژ.
- بەژیی: زەوی دێمی: زەوی وشك.
- بەس: وەس:
بەس و گۆتن بۆ مامێ خۆ کۆ.
(لاوك- ل٥٨)
بەساقەت بم: بەسەدەقەت بم: واتە بە قوربانت بم: دوعایە بۆ پاداشت دانەوە بەکاردێ.
- بەست: ١- بەستێن: کەند: شیو. ٢-مانع.
٣-جەنازە.
٤-بەو بازە دەڵێن کە لەسەر دەستی قوشیمچی بە وشەی (ئەھ) ئاگادار ئەکرێتەوە بۆ پۆڕگرتن
بەبەستینی چۆمی تە تەهودا
(گەدا- ل٦)
- بەستی شەرغە: بەستێکە لە دەشتی هەولێر.
- بەستان: ١- رچان: رچیان: ئاو بوونە شەختە
٢-گرێدان.
- بەستە: بەهەموو گۆرانییە سووکەکانی دڵداری ئەووترێ بەتایبەتی کەلەپاش مەقامەکان دێن، بەو گفتە لەبرە دەگوترێ کە هاوئاهەنگی یەکێك بێ لەمەقامەکانی و هۆنراوەی چوارتاکی پێوە دەگوترێت گۆرانییەکە لە دوای مەقامێکەوەیە کە گۆیندەکانی ئەندامی چالغی دەیانڵێن وەك بەستە دەبێتە چەند جۆرێك وەك ئەمانەی خوارەوە:
١-بەستەی خێرا: (گورج) ئەو گۆرانیانەن کە هەواکانیان (شادی هێن و دڵ بزوێن و خەمڕەوێن)و بەزم خۆش و رەزم خێران ئاواز و ئیقاعەکانیان لەگەڵ ئاهەنگ دەست ئەدەن ئاواز و ئیقاعەکانیان لەگەڵ (سەما، سوڕ و لەرزین هەڵپەرکێ دادەگونجێ) (وەك لۆرکێ) (بێ لەنگێنە) (بەلەرزانە)( زاوا لەبووکێ مەدە).
٢-بەستەی نێوەند: بەو بەستە و گۆرانییانە دەگوترێ کە نە خێران و نەخاوەن وەك راستەی خەیابان، خۆم بە خولاسی.
٣-بەستە خاوەکان: ئەو گۆرانییانەن کە خاوەنی (رەزم) یێکی (سست و) سۆنی وەکو گۆرانییەکانی) خاڵەی رێبوار، ئامینێ تاقانەی دایێ.
- بەستەزمان: بەسەرزمان:
١-واتە بێ زمان: ٢-فەقیر: کلۆڵ.

- بەستەڵەك: حاڵەتی بەستان لەسەرمان شەختە:
کۆ زستان و وشکە بەند و بەستەڵەکێك بوو.
(شەرەف- ل٤٣١)
- بەستۆرە: ١-شوێنی پێدارۆیشتنی ئاو لە زستان و بەهاردا.
٢-سەیرانگای بەهارانی خەڵکی هەولێرە لە دۆڵی هەنارە.
- بەسەرچاو: وشەی بەڵێن و جێبەجێکردنی کارێکە کە کەسێ پێت رادەگەینێ.
لێرەدا (بەسەرچاو) هاوتای وشەی
بان چاو، بەسەرسەر، بەسەر روحم، دەبەخشێ.
- بەسەردا سووڕانی سەپان: سەپانێکی ئازا لە دوورنەکردندا بەسەر سەپانێکی نا ئازا دەسووڕایەوە و پێشی دەگرێ ئەویش شەرمەزاردەبێت دێتە سەری.
- بەسەرکردنەوە: ١-لێپێچینەوە: ٢-تاقیکردنەوە
- بەسەروبەر: بەرێوجێ: زۆربەتەواوی.
- بەسەرهات: سەرهاتی: واریقات: سەربهۆرد
بەسەر هاتی خۆی و خانەدانەکەی بۆ مەمای بەگ گێڕایەوە. (شەرەف- ل٣٤٨)
- بەسەویەت: باش و لەسەرخۆ.
- بەش: پەش: دابەش: پڤك: پش: قسن:
وەرگرتنی بەش و پرکردنی گیرفانی .
(شەرەف- ل٣٩٥)
- بەشان و شەوکەوت: کەڵەگەت.
- بەشقی: بەعەشقی.
خاتوون بەشقی خولای. (تحفە- ل٢٧٥)
- بەشك: بەگوومان.

- بەشکو: بەشکوم: بەشکم: بەشکە: بەشکینێ:
بەشکونێ: بەشقەم: دەشقەم.
١-ئامرازی عەتفە: واتە تێك بەستن:
٢-شیمانە: احتمال: بەکاردێ:
٣- بۆئاوات بەکاردێ.
خوایە هەڵکەنی ئەو کێوە لە بن
بەشکو دەرکەوێ نوری دیدەی من
ئەچم بۆ ئەوێ بەشکو چاوێکم پێی بکەوێ
پێی بڵێن بەشکو بەقسەتتان بکات
- بەشوو: بەمێرد: شوودار: ژنی خاوەن مێرد.
- بەعام: تێکڕا: هەموویان.
هاتن تەیری گەرمێنی بەعام دەچنە کوێستانێ
- بەعەجەلە: بەپەلە.
- بەعەشقی: بەشقی: بەخۆشەویستی
بەشقی ئەو خولایەی لە ژوری سەری.
(تحفە-١-ل٢٣٧)
- بەغ: گاڵتە پێکردن خۆ بەزل زانینە بەرامبەر بەیەکێك کە تووشی نسکۆیان هاتبێ.
(بەغ مەکە، وەبەغ زەبوونی) (پەندی کوردی)
- بەفر: وەفر: ڤەور: وەروە: ڤەرڤە: وەرب: وەرڤە:
بەرف: وەرو: تەرك.
... خەتێکی رەشی لەسەر لاپەڕەی بەفری
سەرزەوییەکە دەکێشا...
(گەدا- ل٧٢٢)
کلووی شەشپەڕی سووکە بەدیمەن وەك لۆکە وایە زستان کاتێك پلەی گەرما دادەبەزێتە خوار(.)





هەڵمی ئاو کە لەئاسمان وەستاوە دەبێتە ئاو ودێتە خوارو لەسەرمای نزیك زەویدا دەیبەستێ.
بەفر هەموو شتێکی داپۆشیبوو...
(گەدا- ل٢٢)
بەفر بەمەجاز واتە زۆرسپی (سەری دەلێ بەفرە) ، هەروەها شتی زۆر ساردبێ.
بەفر لە جۆری بارینوکاتی بارینوکەم بارینو زۆر بارین ناوی تایبەتی خۆی هەیە وەك ئەمانەی خوارەوە:
١-نوابەفر: یەکجار بەفربارین.
٢-ڕنوو: بەفری کەلەکە کردوو کە باو شتی وا هێنابی. (تاریك و روون- ل٢٢٣)
٣-رەشانگە: شوێنی بەفری لێ نەبارێبی، یا چوبێتەوە.
٤-باسریشك: بەفروباران بەباوە.
٥-کرێوە: ئەگەر بەفر زۆر بباری و خێرابێ.
٦- باپزوە: لەشوێنێکی بەرزەوە کە با بەفرئەبا بۆ شوێنێکی قوڵتر و پڕ ئەکاتەوە.
٧-بەفرە لۆکە: بەفرێکی خاوە کلوەکانی بەتەواوی نەیبەستووە زوو ئەتوێتەوە.
٨-بەفر خۆرکە: بەفرێکی نەرم و وردە لە کۆتایی بەهاردا بەسەر بەفری زستاندا ئەباری و ئەیتوێنێتەوە. مژە و زوقمە و کەڕەسیسە و پرووشدا.
(تاریك و روون- ل٢٢٠)
٩-پرووشە: کەڕەسیسە: پەلەتاتە: وورده بەفرێکی رۆژی زۆر سارد دەبارێ.
١٠- هەرەسی بەفر: هاتنە خوارەوەڕمانی بەفری کەلەکەکردووی سەرشاخ و بەرزایی بۆ خوارەوە

کلێڵە هەرەسیان هێناوە... (شەرەف- ل٧١٢)
١١-پرزوو: رەنووبەفری بچووك: پزروو،
کانی، زنە، رنوو، پرزوو،مێرگ، نواڵە، دەریا، رووبارە. (تاریك و روون- ل٢٢٣)
١٢- شیخال: بەفرێك ئەم دیوە و دیوەی رەش بێ.
١٣- بەفرباری: ئاوازی گورانییەکی کوردییە.
بەفرباری بەفرباری
١٤-بەفر رەش بوونەوە: بەفرچوونەوە.
١٥-کەستەك: سند: تۆپی بەفر کە لە بەرزایی شاخەوە غل ئەبێتەوە بەرەو خوار تادێ زلترئەبێ.
١٦-جۆگەت: رچە: رێگای نێوەبەفر.
١٧-بنگرە: جۆرە بەفرێکە.
١٨-بەفران بار: دەیەم مانگی کوردی.
١٩-روو: بەفری زۆر بەستوو.
٢٠-سیرە: دەنگی پێ کەبەسەر بەفردا بڕوا.
٢١-بەفری ئەستوور: بەفرێکی زۆر باری بێ.
٢٢-کرمی بەفری: جۆرە کرمێکە لە بەفر پەیدا دەبێ بۆ ئاو ساردکردن بەکاردێ.
- بەفراو: بەفرئاو: ئاویەخ: بەخاو: سەهۆڵاو: ئاوی سارد: ئاڤا تەزی: بوزاو: رچاو.
١-ئاوێك هاوینان کە بوزی تێدەکرێ.
٢-ئەو ئاوەی کەلە توانەوەی بەفر لە هاوینان پەیدا دەبێ.
- بەفرداکردن: بەفرخستنە چاڵەوە لەناوچەی شاخاوییەکان، شوێنی تایبەتی هەبوو لەشێوەی چاڵێك زستانان پڕدەکرا لەبەفر دەپەستراپەوە بۆ

ئەوەی لەگەرمای هاوین بەکاری بهێنن و دەیان هێنا بۆ شارەکان بۆ فرۆشتن.

- بەفیدای: بەفیای: بەقوربانی: بەفوای:

بەفیای ماڵەکەی ڕوو لە قەسرت بم

بەفیای مەیلەکەت کەموکەسرت بم

(مەلۆ- ل٦٢)

بەفوای دەمت بم باڵاعەرعەری

(گولاڵە- ل٥٢)

- بەفیز: بەهەوا: فیزدار: خالۆر: برووغ: باسەر: ڕوح گەورە: لموز بلند: قەپۆزبلند: کەپوو بلند: بەدەعیە.

حاڵی کەسێکی ئیفادەی هەبێ تەکەببور بەسەر خەڵکا بکات.

- بەفیرۆرۆیشتن: بەخۆڕایی چون: بەلاش ڕۆیشتن: سوودوکەڵك لێ نەدیتن

- بەڤل: پێچەوانە

- بەقاڵ: ١- بەو کەسە دەگوترا کە قەسپ و خوێیان بەباردەهێنا گوندان خەڵکەکە بەگەنم و جۆ لێیان دەکڕی.

٢-ئەو دوکاندارەی کە برنج و روون و شەکر و ئەو جۆرە بابەتانە دەفرۆشێ.

٣-نازناوی ئەو کەسەیە کە بەقاڵی دەکرد.

خدری بەقاڵ: کەریمی بەقاڵ.

- بەقل: ١- سلق: سرق: زلق:

سەوزەیەکی گەڵا پانە بۆ چێشت لێنان بەکاردێت.

٢-واتە بەدانە.

- بەقەدەر: ١-بەرێز: ٢-بەقەدەر: بەئەندازەی.

- بەقەدەر: هەندێ: بە ئەندازەی.

چاوێکی بەئاسماناخشاند، چ روانین و چاوپیاخشاندنێك بەقەدەرایی سەد کتێب پڕبوو لە گلەیی و بناشت.

(گەدا- ل٩٩)

- بەکار: مەدرەکار: تێکۆشەر

- بەکاربراو: بەکارهێنراو: بەکار هاتی: رەنیوهاتوو: نیمداشت: نیوداش.

- بەکارهێنان: دەکارهێنان

- بەکر: سووکەلەناوی ئەبوبەکر.

- بەکراوا: ١- بەکر+ئاوا.

٢-ناوی گوندێکە لەکوردستان کە بەکر ئاوەدانی کردۆتەوە.

- بەکرە: ١- گرگرە: بەشێکە لە ئامرازی ئاوکێشان لەبیر.

٢-خرپلە.

- بەکرە شەل: ١-بەکر+ە+ شەل.

٢-نازناوی گوندێکە لەکوردستان کە بەکر ئاوەدانی کردۆتەوە.

- بەکر مەرگەوەر: بەکرۆکە: بەکرە شۆفار: دڕکی مەم و زینان.

١-پیاوی شەڕ و خەراپە و تێك دەرکە نەی هێلا مەم و زین بگەن بەیەك یەکێکە لەناخۆشەویست ترین پیاوانی مێژووی کوردستان ڕۆژ نییە تووك و نەحلەتی بۆ نەچێ.

لەکوردستان (بەکرۆکەو) و بەکرەشۆفارو دڕکی مەم و زینانیشی پێ دەڵێن.

٢-بەمەجاز بە هەموو کەسێکی تێکدەر دەگوترێ.





بەکن: بەنك: بەلای.

بەکن چادری خانزد خانێ دارۆی.

(تحفه-٢-ل٣١٢)

- بەگ: ١-وشەی بەگ لەبنەڕەتا لە وشەی (بەغ- بەغە- بەگا) هاتووە کە واتای خودای بەخشیوە.

٢-لەدوای فەتح کردنی کوردستان لەلایەن ئیسلامەوە وشەی بەگ بووەتە نازناوی پاشا و کوێخا و ئاغاو کاربەدەستان.

٣-بەپیاوی گەورەی کاربەدەستی دەوڵەت وتراوە.

ئێستا بەگ من هەر ئەبەدی بۆ شار.

(کوێرەوەری- ل١٣)

٤-واتە میر: مەزن: سەرۆك هۆز.

٥-ئەو کەسەی لەلایەن میرەوە دەناردرایە سەر گوندێك بۆ سەرپەرشتی کردنی گوندەکە.

٦-وەك نازناوێك بەکاردەهێنری بۆ نەوە و وەچەی بەگەکان.

رۆستەم بەگ کوڕی حەسەن بەگ(شەرەف- ل٤١١)

حەبیب بەگ: کوڕی جانپولاد بەگ.

(شەرەف- ل٤٣١)

- بەگچی: پاسەوان.

بەگزادە: ١-واتە کوڕ و نەوەی بەگ بەبنەماڵەیەك دەبێژن کە پشتاوپشت لەباوانەوە حوکمدەکەن.

٢-لەکوردەواریدا چەند ماڵێکی مۆسیقا ژەنیان تیایە بەمەئە لێن (بەگزادە) ئەم موتریبانە زۆر هەژارن کار و کاسبییان ساز و دەف لەشایی و جەژناندا سازلێ ئەدەن.

- بەگنشین: شوێن و جێگای بەگ لێ دادەنیشتن.

- بەگم: ١-وشەی بانگکردنی بەگ.

بەگم، بێژم چی! داوەڵێ ڕەشە... (گەدا- ل٢٣)

٢-وشەی بانکردنی پیاوی خاوەن پلەوپایە.

٣-ناوی ژنانە

ئینجا بەگمە خاتوون دەڵێ. (تحفە-٢- ل٢٢٠)

- بەگۆك: ١- بەگ+ئۆك

٢-ناوی کوڕانە

- بەگوێی کردن: گوێدێری: گوێڕایەڵی.

فەرمانبەری کردن: سەردانەواندن: گوێی دان: بەگێ کردن: باربردن: گوێی شل کردن: فەرمان بردن: گەردن کەچی: فەرمان بەرداری.

- بەگەڕ: شەڕ فرۆش.

- بەگیانی تۆ: سوێندە، بۆ خۆشەویستی دەگوترێ هەمان واتای ( بەچاوی تۆ) دەبەخشی.

- بەل: ١-سپیانی گوێی لوول وەك کەویسار بەل، ڕسەرشین بەل، تەبەش بەل.

٢-ڕەشانی گوێی لوول وەك بەلەمس، بەلەکەژ، بەلەشین.

- بەلارەلارە: بەلەقەلەق:

ڕۆیشتنی مرۆڤی بێ توانا.

... بەلارە لارەچووە ماڵەوە...

(گەدا- ل١٨)

- بەلا بەسەرهێنان: تووشی بەلاکردن.

- بەلاش: خۆڕایی: فیرۆ: مۆفتە: مفتە.

- بەلاڤکرن: بلاوکردنەوە.

- بەلاڤبوون: بلاوبوونەوە.

- بەلان: بەران: بەلام: بەلا: بەلێ

بەلاّ ئەمە کاکەمەمی هەلگرێن بیبەینــە جزیــرە و بۆتانە. (تحفە-١- ل٢٢٦)

- بــەلان کــەوتن: واتــە لەلانــدا خــۆی مــات داوە بەتایبەتی بە ئاژەلّی کێوی دەلّێن.

- بەلاڤۆك: بلاّوکراوە.

- بەلاّ: ١-بەلاّم: ٢-چوورتم: پۆ: گێچەل.

- بەلاّ دووربی: دوورە بەلاّبی.

دوعایە واتە دووربی لە بەلاّ.

- بەلاّگەردان: قوربان.

- بەلقیس: بەلکیس: بەگیسی: ناوی ژنانە.

- بەلوور: لالە: لەمپا.

- بەلەز: بەپەلە: بەتالووکە: بەعەجەلــە: مــەکون: هەشتاو: وەتاو: پتمار: بەپەلە

بەپەلەپەل چوو گۆزەی پڕکرد. (تحفە-٢-ل١٦٠)

بەلەز چوە خوارێ (بۆرە- ل٩٨)

- بەلەك: ١-سپیانی رەنگ رەش و سپی یاسوور و سپی یا زەرد و سپی.

٢-رەشانی رەش و ســپی قــان نــەك تێکــەلاّو یاسپی لەگەلّ سوورو زەرد.

٣-پووز: لاق و لەتەر:

تەنیا بەلەکی کەمێك بریندار بووە

(حەمەدۆك-٢-ل٣٧٣)

٤-چاوی سپی و رەش تێکەلّ.

٥-رەنگی سپی و زەردی تێکەلّ.

- بەلەك پێچ: ساق: پووزەوانە: پووزەوانە: لەبەن دروستدەکرێت و لەسەر گۆریەلــەپێ دەکــرێ بەلەکی مــرۆڤ دەشــارێتەوە بەتایبــەتی بــۆ وەرزی زستان سوودی زۆرە بۆ گورج و گۆلّی و بۆ گــەرمی بەلّەك و پێ و بۆ پاراستنی بەکار دێت.

- بەلەك کەڕە: سپیانی (مەڕ و ئەوەی لــە مــەڕە) بێ گۆییێ وەك: (بەلەك کەڕە، قولەمس کەڕە)

- بەلاّم: بەلاّن: بلّێ: بەلّێ: بەلاّ.

بەلاّم ئەو حیزە بخۆیی و سەرشۆڕییەی بە دلّ نەبوو.

(شەرەف- ل٣٥٨)

- بەلەنگاز: هەژار: ژار: کەسیب: فەقیر.

- بەلّگە: دەسەگ: پالّگە: هۆ.

- بەلینگ دان: بەغاردان: بەڕاکردن: بەهەراتن بۆ خۆی بە لینگدان گەییەوە جەلّەبی خۆی

(تحفە-٢- ل١٥٩)

- بەلّێن: ١-ســۆز: هــەرێ: گفــت: قــسە: پــەیمان: رۆوان: ئەرێ.

گفت و پەیمان و دەســتەبەری بــۆ جێبــەجێ کردنــی فەرمانێك.

... بــەلّێنیان بەیــەك دابــوو ســوێندیان بۆیــەك خواردبوو...

(دم دم- ل٤٨)

...ئەز دترسم ئەز سۆزا خوە بشکێنم...

(مشتاخ- ل١٤)

قوربــان ســۆرەش هەرێیــدا لەدواییــدا پەشــیمان بووە... (بۆرە-ل٨٥)

٢-ناوی کوڕانی کوردییە.

- بەم: ١- بەئەو: بەو.

(بەم شوێنە داچوو)

بەو زوانە سلار دەبنەوە.

(شەرەف-ل٣٢٨)





٢-قومبەلە: نارنجۆك.

بەمباران: قومبەلەباران.

٣-ناوی تەلەکی عوودە ئەگەر زیر دەگوتری زیروبەم.

- بەمشوور: کارزان.

- بەن: خوری ڕێسراو.

دوو بەرکۆژەی بەبەن لێ نابوو... (گەدا- ل١٨)

- بەندەوانی: جۆرە بێگارێکە، هەموو جووتیارێــك دەبــێ بــۆ مــاوەی چــوار مــانگ پیاوێــك بگــرێ بەمقدارێك گەنم بۆ خاوەن مولّك ئەو کەســەی کــە جووتیارەکــە دەیگــرێ پێــی دەلّــێن (بەنــدەوان) کەهــەموو کارێــك بــۆ خــاوەن مولّــك دەکــا، لەقورکارییەوە تا پاککردنەوەی کارێز.

- بەناوبانگ: پێش چاڤ: ناودێر: ناودار.

کەسێ زۆر کەس بیناسێ.

- بەناوسك: ورگ گەورە.

- بەناوشان: ناوشان پان: چوارشانە

- بەناوهێنان: رەنێو هێنان

- بــەنتك: لەقەنــەفل و ســۆتکەو زەنگیانــە دروستدەکرێ ئافرەت بەیەقەی کورتــەکیان دەخــەن بۆ جوانی.

بایێ شەمار تۆزی دینی

بەنتك و گواران تێك دارینی

(هونراوە- ل٣٣)

- بەنداو: ١- قەمتەر: زەوی تووتن جۆ گای بــەکن دادێ لەو جۆگایە جێگایەك هەیە ئاوی جۆگەکــەی پــێ دەگــیرێ و بــەر دەدرێتــەوە پێــی دەگــوتری (بەنداو).

٢-ئەستێل

- بەندە: ١-بەنی: کۆیلە: کۆلە: عەبد: بەنە

ئەوکەسەی ئاسوودە و خۆش رایبوارد

قەت خەمی ئێخسیر و کۆیلانی نەخوارد

(نالّەی جودایی هێمن- ل١٥)

٢-حەپسە: بەندە: گراوە: گیرایە

- بەندە خوێن: دێخۆن: دۆخین:

دوخێن: بەنەخوێن: بەشولّێن: بەندووخێن: بەندۆخین.

هەرهەوداوبەنێکی دەپزووی دەرپێ، پانتۆل، رانك و پێجامەی هەلّکێژی بۆ ئەوەی لە ناو قەدی ئینسان توندی کا.

بەنەخوێنەکەی بەسەر دەرپێ سپییە چــلّکنەکەیەوە تاقمانە جووتی دەکرد (گەدا- ل٦٥)

ناچار بەندۆ خینە دەزووە دەستکرد.

(غەوارە ل٦٥)

- بەندیخانــە: بەدێخانــە: بەنیخانــە: حــەپس خانــە: سجن: زیندان: گرتی خانە: گرتوخانە: زینان

مەریوان حەوت سالّی لەبەندی خانە بەسەربرد...

(ئاشتی- ل١٥٠)

جێگایەکە ئەوکەسانەی تێدایە رادەگرن کەلەسەر تاوانێك حوکم دەدرێن و بــۆ ماوەیــەك ئازادییان لێ زەوت دەکــرێ، یــا ئــەو کەســانەی پێویــــست دەکـــا تـــا رۆژی موحاکەمــــە لەدەرەوەنەبن.

- بەنقادە: بەنێکە لەسـێتا ئەســتورترە و لــەگوریس باریکترە، لەسەر دارکلاوە کانی لای دەرەوەیە کــراوە و نیروکوپەلانی لەیەك دەبەستی لە ئامرازی جووت.

- بەنکراوە: ١-بەنێکی کشتی هۆنراوەیە بۆ قایم و بەستنەوەی هەردوودار کراوەکەی ئامرازی جووتکردن بەکاردێت.
٢-حەپس کرایە: گرایە: گیراوە.
- بەنگ: ناوی گولێکە و جۆری پەڕەکەی وردتۆپەڵە، لاسکەکەی رەقە و دڕکاوی نییە بۆنێکی کەمی هەیە کێوی و ماڵییە بە تۆوزیاد ئەکرێ.
- بەنگ بوون: گیربوون: تەئخیربوون.
- بەنگی: عاشق: سەوداسەر.
- بەنگین: ١-هاوەڵ و هاوڕێی کاکەمەمی بوو لە یەمەنەوە بۆ جزیرەی بۆتان.
- بەنگین، ئەتو واناکەی لە دڵم ببێ سەفارە.
(تحفە -١- ل٢٦٥)
٢-ناوی کوڕانی کوردییە.
- بەنی پشتەك: کشتەکی تۆزێك باریکە بەکەڵك جاجم و بەرماڵیش دێت.
- بەنی خاوك: رێسراوی خوری بۆیەکەم جار.
- بەنی دوولارە: دووداوە خاوەکە بێ بادانەوە بەیەکەوە هەڵدەکرێنەوە.
- بەنی فریت: کشتەکێکە لەپشتەك ئەستوورترە.
- بەنی کشت: دووبەنی خاو بەکیەکەوە بادەدرێنەوە تاکشت دەبن.
- بەها: بها: نەرخ: نرخ: نەخت: قیمەت: فیات: بایی:
بری ئەو پارەیەی بەرامبەر کەلوپەل فرۆشتن دادەنرێت.
- بەهادار: بەقیمەت: بەنرخ.

- بەهار: بوهار: بهار: بوار: ڤەهار: بۆهار: بووار: باهار.
دەچمە کانییێ خەزەرێ جێی ئاخ و کەسەرێ
هەموو فەسری بواران کار مامزی دێنە سەرێ
یەکەم وەرزی ساڵ لەنێونەتەوەی کورد وەرزی دوای زستان وەرزێکی زۆر خۆشە و هەوا دەگۆڕێ و وەرزی بەهار بەسێ قۆناغ دا دەروات.
قۆناغی یەکەم: بەهاری ساوا: سەرەتای بەهار کە دەشت و دەر و سەوزایی پەیدا دەکات و دار چرۆ دەردەکات و ساردی نامێنی.
دووەم قۆناغ: جەنگەی بەهارێ: ناوەندی بەهار.
قۆناغی سێیەم: بەهار پیربوون: نێرێنەی بەهار: کە کۆتایی وەرزی بەهارە و سەرەتای وەرزی هاوین.
(مەبەستی ئەوەبوو هەرچۆنێك بێ بگاتە بەهار).
(گەدا- ل٢١)
٢-ناوی کچانی کوردییە.
٣-ئاوازی زۆر گۆرانی کوردییە: وەکو ئەمانەی خوارەوە:
١-دیسان بەهارە کەژوکێورەنگین.
٢-بەهار خۆشە شاری سەردەشت.
٣-بەهاران بەهارە هەستە بچینە سەیران.
٤-ئازیز بەهارە.
- بەمەجاز: واتە خۆشی و سەرکەوتن و دڵخۆشی
پایزە لەمن بەهارە لەتۆ
زەردەبن خەزان زەردەبن لیمۆ
بەهاربوو فەسلی زستانم ئەگەر یارم لەگەڵ بایە
(تاریك و روون)





- بەهار بەنی: کۆز: تەیمان و پەرژینێکە لە حەوشە دادەکرێ بۆ ئەوەی لە بەهاردا بەشەو بەنێوڕان کاروبەرخی تێ بکرێ.
- بەهاری تەڕ: بەهارێك بارانی زۆربێت و دەرنگ بخایەنێ.
- بەهارەمیز: بەو شوێنە دەڵێن کە لە بەهارا حەیوانی لێ رادەگرن بۆ ئەوەی خاکەکەی بەهێزبێت.
- بەهارە هەوار: شوێنی هەڵدانی هۆبە لەوەرزی بەهاردا.
بەهرەوەر: ١-بەبەهرە: بەسوود: بەئیستفادە.
٢-ناوی کچانی کوردییە
- بەهلول: ١-باویل: بالول: باول: ناوی کوڕانە.
٢-برای هارونە رەشیدی بووە مرۆڤێکی زیرەك و عاقڵ بووە.
بەهلولی بەغدایی، رەزابوو بەکایێ کاشیان نەدایە:
بەیەکێکی بەڕێز دەڵێن کەداوای شتێکی بێ نرخ بکاو نەیدەنێ.
(پەند خال- ل١٢٥)
- بەهەشت: ١-بەهەیشت: بەهێشت: بهوشت: جەنەت.
بەرلەوەی سەری ئاوابێ بەهەشتی خۆی سازدابوو.... (شەرەف- ل٣٨٥)
٢-بەمەجاز بە شوێنی خۆش و دڵڕفێن دەڵێن.
- بەهێ: بێ: بەی: بێھ
بەری داری بەهێیە لە هەرمێ گەورەترە
جۆری هەیە وەك: ١-شامبیرن: ٢-کرماوە: ٣-خاتوونی:
٤-گوڵاوی
٢-ناوی کچانی کوردییە: ٣- بریتییە لە مەمك: مەمکی چەپت زەردە( بێ) ئەوی دیکەت هەنارە
- بەهەند هەڵگرتن: بایەخ پێدان:
- بەی: ١-بێی: بەهی: ٢-بێتەوە:
- بەیات: جۆرێکە لەمقامەکانی رۆژهەڵاتی و عیراقی بەرەچەڵەك کوردییە و ناوەکەی لەخێڵ و عەشیرەتەوە وەرگیراوە (مەقامی بەیات) مەقامێکی سەرەکییە و بەلقە مەقامی فەسل دەوترێ کە (مقاماتی فەسل)ی خۆی هەیە کە لە دوای مەقامی بەیات دەوترێ وەك بەیات و مقامە فەسلەکانی ( بەیات- ناری- تاهری- سێگا- موخالیف- حلێلاوی).
- بەیار: بەون: ١-بەو زەوییە دەڵێن کەلە ساڵێك زیاتر نەکێڵدرابێت یا هەر نووکی گاسنی پێنەکەوتبێت: ٢-ناوی کوڕانی کوردییە.
- بەیاربڕ: بەو زەویە دەڵێن کە یەکەم گاسنی لێ دەدرێ.
- بەیبون: بەیبین: گولێکە لەبەهار دەڕوێت.
- بەیی: نەوەك: نەبادا.
- بەیت: پۆیەتیك.
١- هەر چیرۆکێکی تاڵ و شرینی دڵداری و هەرشایی و ئیشێکی گەورە لەهەر مەڵبەندەکی کوردستان قەوماوە خۆوێژ و خۆشخوانە کوردە نەناسراو و نەخوێندەوارەکان لەسەر کێشی بڕگەیی خۆمانە و بەزمانێکی ساکار بەڵام پوخت و پاراو و رەسەن و رەوان هۆندوویانەتەوە و ئاهەنگی

تایبەتی خۆشیان بۆ داناوە ئەمە پێی دەڵێن بـەیت وەك ئەم بەیتانەی خوارەوە:

١- لاس و خەزال،
٢- شەم و شەمزین
٣- سەیدەوان
٤- خورشیدی چاو بەخاڵ
٥- کەریم و ستی
٦- حەبیبا غای سیاوی
٧- محەمەد و سێوێ
٨- خەجێ و سیامەند
٩- بەیتی دم دم
١٠- مەم و زین
١١- بەیتی ناسر و مال مال
١٢- بەیتی برایمۆك
١٣- شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی
١٤- مەحمەل و برایمی دەشتیان
١٥- قۆچ عوسمان
١٦- جوڵندی
١٧- بەیتی خەزیم
١٨- بەیتی کاکەمیر و کاکەشێخ
١٩- بەیتی لەشکری
٢٠- بەیتی قەل و گولزەر
٢١- بەیتی زەمبیل فرۆش
٢٢- بەیتی مەمی ئالان
٢٣- بەیتی باپیر ئاغای بابی هەمزەغای
٢٤- بەیتی عەبدورەحمان پاشای بەبە
٢٥- بەیتی عەلی عاشق

٢- مامۆستا هێمن مهابادی دەڵـێ بـەبڕوای مـن وشـەی بـەیت هـیچ پەیوەنـدی بـە (بـەیت)ی عەرەبییەوە نییە و رای مامۆستا فـەتاحی قـازی بەڕاسـت دەزانم کـە دەڵـێ رەنـگ بـێ لەوشـەی بەیاتەوە هاتبێ کەناوی ئاوازێکە.

- بەیت بێـژ: بـەو خۆشـخوانە دەوتـرا کەبـەیتیان لەسەر ئاوازی تایبەتی خۆیـان دەگـۆت، کـەخۆیان ئاوازیان بۆ ئەو بەیتانە داناوە و لە کۆڕی دیوەخـان و داوەت گێڕان دەیان گوت وەك:

١- عەلی بەردەشانی
٢-رەحمان بەکر

- بەیت و باو: بەیت و بالۆرە

ئاخری بۆمـان دەکاتـە بـەیت و باوێـك ئابڕومـان دەچێ. (گەدا- ل١٩)

- بـەین: نێـوان: مابـەین: مەعبـەین: نەعبـەین: مابێن: مەعبێن: نەعبێن: بێن:

١- دووری دووشت لەیەکتری.

بەینی مەمکانت شانەی هەنگینی.

(سێسەد- ل٤١)

٢- پەیوەندی نێوان دوو یا چەند کەسان:

- بەینە: بیبەینە:

عەلۆی بەینە سراوێ
لێی بڕشێنین گولاوێ (هۆنراوە- ل٢٩)

- بەینەك: بەینێك: ماوەك: ماوەیەك:

بەینێك رۆیشت، برسی بوو.

(گەدا- ل٨٧)

- بەینەکە: بەینێکە: دەمێکە: ماوەکە: ماوەیەکە: ماوەیەکە لە کات.





- بەیەکەوە: پێکەوە: بهڤرە: پێکوە: پێکڤە:

بی: ١-ناوی دارێکە بەناوی داری بی.
٢-بوو

تاسۆب سپی بی: واتە تا بەیانی سپی بوو.

- بیابان: بیاوان: سەحرا: سارا

بیاوان: دەشت: چۆل: ئاران: بەڕیا: شەپاڵ: مەخـەر: هاموون: سەحرا: دەشتی بە مەودا و بـێ ئـاو بـێ گیا و گۆڵ و راستان.

بە جارێ کەوتە کێـوو دەشـت و سـەحرا تـەرکی شاری کرد.

(دیوان- ئەحمەد ل٧٢)

بەجێ نایێ، دەبێ رۆکەینە سارا

(مەحوی- ل٧)

- بیدەمێ: بەمێ

ئیسە گشت پەمگەکەی بەمێ...

(گەدا- ل٦٨)

- بیراز: دەمەزردکردن: گرنج گرنج.

کردنەوەی هەردوو بـەردی ئـاش بـۆ ئـەوەی دان باش بهاڕێت.

- بیر:١- فکر: هزر:
٢-چاڵ

- بیربتون: بیل بتون: هەمووبەیەکەوە

هەموو لەتەرم بەڕێ کردنـدا خەڵکەکـە (بیلبتـون) بەپەرۆشەوە وەگەلی دەکەوتن...

(غەوارە- ل٧)

- بیربەرز: زۆرزیرەك: بیرتیژ.

- بیرتـــە: ١- ئـــەو گۆرانییانـــەی لەشـــایی کوردەواریدا دەبێژرێن.
٢-لەبیرتە: لەفکرتە:

بیرتە ئەو رۆژەی بەشادومانی
بۆ خۆمان ئەگەڕاین لەنێو ئاوایی

(فۆلکلۆر)

- بیروبۆچۆن: بیروڕا.
- بێژۆك: نۆکی رەش و سووری ناو نۆك.
- بیـژی: ١-بیـژو: زۆل: بـیچ: بیـژك: بییـژلك: بیژمۆتە: بیژمییلەك: بیژبیلەك: بیژلۆتە: بیژیلـەك: بیژك: شەلۆف: حەرامزادە: حەرامزایە: شـیر حیـز: شیر حەرام:

منالێك کە لە پیاوی شەرعی پەیدا نەبووبێ
کوڕە چکۆڵە زۆڵەکەی ناردە گردکان

(شەرەف- ل٤٤٤)

ئەگەر مەیلەکەت دەرچێ لەبیرم
حەرامزادەبم نەعلەت لەشیرم
کورێ کە ناوی قابیل بوو چـووە زگ کـچە کاولیـە زگی پڕ کردوو
بیژوێکی لێ ببوو.

(شەرەف- ل٢٤٤)

٢-بریتییە لەزیرەکی فێڵباز و هاروهاج
هەرچی نانەجیب و زۆڵ و بیژووی ئەم
نێوە بوو لە دەوری دۆردوخربوونەوە.

(حەمەدۆك -١- ل١٤٣)

- بێگونیا: گوڵێکە پەرەکانی گەورە و سێ و چوار پەڕیە لاسکەکەی ڕەقەو دڕکاوی نییە بـۆنی نییـە،

مالّییه، بەقەلّەم و راکێشان زیاد ئـەکرێ، متوربـە ناکرێ بۆ جوانی لە کوردەواریدا بەکار دەهێنرێ.

- بیلا: بێلا: بێله: بهێله: بیەله: لێگەرێ

بێله با برۆین.

- بێلۆ: کانیاوی ناوچەی بەرداوی لـە کوێـستان کە بـەهاران ئەتـەقێ و ئـاخیری بـەهاری زیـاتر وشك ئەبێ.

- بیل: کل: سورمە.

- بین: بینە قاقا: خنخنۆك:

... دەتگوت دەستیان لەبینێ ناوە...

(حەمەدۆك-٢- ل٢٧٩)

- بیور: تەور: داربڕ:

ئامێرێکی داربڕینە و دارشکاندنە

دار وتی: تەور ئەگەر کلکی لـەخۆم نەبووایـە نـەی ئەبڕیمەوە: واتا ناپاکی ناو خۆنەبێ دوژمن ناتوانێ دەست بەسەر نیشتمان بگرێ.

(پەند خال- ل٢٠)

- بیهـە ژێنـە: بیژینـە: بیهەژینـە: رایژێنـە: رایژینە

رایژێنم رایژێنم لانکی بۆ رادەژینم

کۆرپەلەی گەلێ جوانە لە خەوهەلّی ناستێنم.

- بیهەوێ: بیەوێ.

بنیادەم ئەگەر بیهەوێ بژی.

(حەمەدۆك-٢- ل١١٨)

- بێ: ١-ناوی پیتی (ب):-

٢-هێ: بێ لەوی: هێ لەوی.

٣-دژی نێ: بابێ: ٤-بەهێ: بەی.

- بێئسول: بێ ئیحترام.

- بێ ئەمەك: بێ وەفا: بێ نمـەك سـپلە: سـفلە: بێ شەرت:

بێ شەرت بێ وەفا بێ تانە و بێ پۆ

کافر بناسم چاترە لە تۆ

(مەلۆ- ل٥٦)

- بێ عەنوا: بێ نەوا: بێ ئەنوا: پڕنسی: پێدەر: بێ شوێن و جێگا.

قزلجی یش وەك شاعیر و نووسەرەکانی کورد

بێ ئەنوا و بێ داشدار و دلّسۆزمایەوە...

(گەدا- ل١٢)

- بێ بازاڕی: سەودا و مامەلّە وەستان.

- بێ بڕشت: کەم بەرەکەت: کەم بەرهەم.

- بێ برەو: بێ رەواج.

- بێ بەری: بێوەری: حاشا: دوورلە.

- بێ بەزە: بێ روحم: بێ رەحم.

- بێ حدور: بێ داروبار: لەڕ: لاواز نەساغ و نەخۆش.

لێو بەبار و بێ حدر و دەتگـوت خـۆلی مردووانـی بەسەردا..

(تحفە- ل)

- بێ حورمەت: بێ رێز: بێ قەدر.

- بێ حەمد: بێ دەسەلّات.

- بێجگە: جگە: جیا: جیالەو: بێجگە لەو

بێجگـە لـە مـەزرا و سـەبیلەکەی خـۆی کـاری بەکەس نەبوو.





- بێ خودان: بێ ساحێب: بێ خاوەن: بێ ساحێو.

- بێ تەجروبە: کەم ئەزموون.

بەلّام حەیف کە زۆر کەم ئەزموونی.

(حەمەدۆك- ل١٣٣)

- بێ دەسەلّات: بێ دەستهەلات: دەرنەبەر.

- بێفەر: بێ سوود: بێ فایدە.

- بێرکردن: مەڕ دۆشین.

- بێرکردنی بەهاران: بەهاران بێر دووجار دەکـرێ سـبەینان لـە پەڕگـەی گونـد و ئێـواران لەدەشت و دەر.

- بێرکردنـی هاوینـان: کـە هـاوین هـەر دوو بێـر لەگوند دەکرێ.

- بێرکم: قەفەس: قەوەز: رکە: بیر: توولە:

لە دار دروست دەکرێت بۆ راگرتنی کەو و بلبـل و... هتد.

بم خەنە قەفەز قەفەز ئەشکێنم.

ئەمدەن بە چاوڕەش خۆم ئەخنکێنم.

(مەبۆ- ل٥٨)

کامەیاغی دێ لە قەوەزێکی وادا بەدەسـتی خـۆی خۆی بەکوشتندا. (حەمەدۆك- ل٣٤٦)

- بێرکەر: ئەو کەسانەی مەڕ ریز دەکەن و بەری دەدەنە شوانی سەردار بێر لێناگەڕێن بی دۆشـین هەلّبێن و دە پشت شـوانەکە بکـەون لـە کـاتی مەڕ دۆشین.

- بێـرگ: بـیرە: دۆشـینی مـەڕ و بزنـی زاو لـە شوێنێکی تایبەتیدا کـە پێـی دەوتـرێ (بێـرگ) و کرداری دۆشینیان پێی دەوترێ (لەبێرگ دان).

- بێرە: ١- بەئێرە.

بێرە دا بڕۆین: بەئێرەدابڕۆێن.

٢-بێنە: بینـە: ٣-وەرە: شـەوێ تـۆ بێـرە بـالێنم

(بێرەوە گولّەگیان ئارامی دلّ و گیان)

(دیوان-ئەحمەد- ل٩٢)

- بێرەبا: بێلە بـا: بـەباکردنی دەغـل و دانـە بـۆ جیاوازکردنەوەی کوزر و تۆز و خـۆلّ و بـە سـایەی (بێرۆك).

- بێرۆك: بێل: لەچەشنی خاکەناسە، بەلّام دەمەکەی لووس و پانە و دەسکێکی بەقەدەر دەسکی شـەنەی هەیە و لە داریش دروستدەکرێت.

- بێری: بێروان: بێرڤان:

١-واتە ئافرەتی مەڕدۆش

یەك لە مالّان هاتە دەر چاوڕەش ناسکە بێرییە.

(هۆنراوە)

٢-ناوی کچانی کوردییە.

- بێڕەبێر: دەنگی تەگەیە لەکاتی بزن بە تەگە هاتن.

- بێزار: هەراسـان: وەرز: کـەوەڕێ: لـۆس: وەرس: جارس.

کەوەڕێ بووم: بێزاربووم.

- بێزو: مەگیرانی: تامەزرۆ.

زاراوەیەکە بۆ ئافرەتی دووگیان

بـەکاردێت کـاتی حـەز و ئـارەزووی لـە جـۆرە خواردنێکە.

- بێ زەلەت: بێ لەزەت: بێ تام.

- بێژەر: بێژندە: قسەکەر.

- بێژیر: بێڤاج: کەرچوڤە:: گەمشو: گەمشۆ: ئەبلە.

- بێژینگ: سەرراد: بێژنگ: وێچنە: وێژنگ
ئامرازێکی خاوێن کردنەوەی دەغڵ و دانە لە هێلەگ کونەکانی فراوان ترە.

ئێستا و ئێستاش شەنە و کەو بێژنگی بەخۆیەوەنەدی. (گەدا- ل٦٧)

ئاو لە بێژینگ هێنان: کاری بێ سوودکردن.
(پەند)

بێژنگێ بگرە بەرووتەوە: بەتەوسەوە
(پەند خال- ل١٢٧)
بەیەکێ دەوترێ کە لە کارێك شەرم بکات.

- بێژینگ بەسەر: چیایەکە لە تەنیشت قەرەجوغە سەری وەك بێژینگ خڕە بۆیە پێ دەڵێن بێژینگ بەسەر.

چاوت ئەستێرەی سەحەرێ
هەڵدێ لەبێژینگ بەسەرێ
(هونراوە-ل٦٠)

- بێ غیرەت: بێ خیرەت: ترسنۆك: دژی ئازا.

- بێستان:
١- بیستان: بوێستان.
٢-ناوی کچانی کوردییە

خاوەنی باغ و بێستان شەرمەزارە بەزستان
(پەند)

سەری شاخە بنی بیستان
(هۆنراوە)

- بیستانە: گوندێکە لەدەشتی هەولێر، بارەگای هێزی دەشتی هەولێر بووە لە ساڵی (١٩٦١).

- بێستانە: گوندێکە لەدۆڵی خەلەکان.

- بێسارانی: ١-ناوی دێ یەکە لە ناوچەی ژاوەڕۆی نێوان هەورامانی تەخت و گاوەڕۆ.
٢-نازناوی شاعیری گەورەی کورد (مستەفا)یە.

- بێ سیم: بێ تەل: لاسلکی.
ئامرازێکی سەربازییە بۆ دوور قسەی پێدەکرێ.

- بێشۆ: بێ رادە و سنوور.

- بێشك کرتە: بەچووك بە بەچووك: کچکە بە کچکە: ئەوەیە کە کچی منالێ لەسەر بێشکە مارە دەکەن وەکو ئەگەر یەکێك کچێکی بوو، یەکێکی تریش کوڕێك ئەوە لەڕۆژی لەدایك بوونیان کچەکە لەکوڕەکە مارە ئەکەن و کاتی هەردوو منالەکە گەورە بوون ئەو کاتە جارێکی تر سەر لەنوێ خوازبێنی ئەکرێتەوە.

- بێڤان: فیسار: شتێ یان کەسێ کە ناوی نەبەن: فلانی: ئەوك: هەرامە: وانەك: هین.

- بێکار: بێ ئیش: بێ شۆل: بەتاڵ.

- بێگار: ئۆلام: سوخرە: سوغرە.
جۆرێکە لەپەیوەندی دەرەبەگایەتی لەکوردستان ماوەتەوە بریتییە لەو کارانەی کەخاوەن موڵك و ئاغا بە جووتیار و خەڵکی گوند دەیکرد وەك ئەمانەی خوارەوە:
١- دروستکردنی خانوو و ڕێگا بۆ دەوڵەت و خاوەن موڵك.





٢- پاککردنەوەی کارێزەکان و هەموو کاروباری ئاودێری.
٣-گواستنەوەی بەشە بەرهەمی خاوەن موڵك بۆ هەر کوێیەك با.
٤-کێڵانی زەوی بێجگە لە زەوی خۆی بۆ خاوەن موڵك.
٥-کۆکردنەوە و کێشانی تفاقی زستان مەڕ و مالاتی خاوەن موڵك.
٦-بەندوان گرتن بۆ خاوەن موڵك.
٧-بەجۆکردنی ئاژەڵی خاوەن موڵك.
٨-ئامادە کردنی ولاغی بار بۆ خاوەن موڵك.
٩-ئارودووی زستان ئامادەکردنی بۆ خاوەن موڵك....هتد.

برایم لەدەمت دەربێ کەروێشکی ماڵیت لێ ون بووە، لەژێر بێگاردا دەتپڕووکێنم...
(گەدا- ل٦١)

جارێك گزیر هات و دەنگی دان بۆ بێگار پیرۆت گوتی: من دەچم .
(گەدا- ل٨٢)

سەرباز دەوری شاری گرتووە، سوخرەیە، ماین، ئەسپ، وشتر، گوێدرێژ، هەرچی بەکاری سواری و باری بێت بەسوخرە دەگیرێ.
(گەدا- ل٤٢)

- بێگارچی: ئەو کەسەی دەچێتە بێگار
کاتێ گەیشتە ناو بێگارچییەکان و دیتنی هەموو هەرزەکار و کوڕوکاڵن.
(گەدا- ل٨٣)

- بێگارانە: جۆرێك بوو لە باج کە ئاغا لە جووتیاری دەستاند ئەگەر جووتیارەکە حازر نەبووایە بێگاری بکات.
وەك جاران دەستیان نەدەرۆیشت بێگارانە بدەن، ناچاربوون خۆیان بچنە بێگاری ئاغا.
(گەدا- ل٨٢)

- بێ گاف: مەجبور: ناچار.

- بێگانە: بیانی: هاڤی: وەدەر.
کەڵتەوەن: غەیرە: لایدە: لاوەکی: ئاوارە: تاچیك
نەناس: نەناسراو: غەوارە: نامۆ: ئەغیار: غەریبە
کەسانێکی نامەحرەم حساب دەکرێن بۆ مەسەلەیەك
نامۆ و غەوارە و شاری ئاور دویان لە سەردارە...
(شەرەف-ل٦٦٠)

دێوانە خۆم دێوانە خۆم
لەخۆم و خۆیش بێگانە خۆم
(فۆلکلۆر)

دەڵێ هەر کەس ببینێ یارو: ئەغیاری بە ئەتراف خودا چین ئەم هەموو دێوە لە دەرەوەی ئەم پەری شێوە (مەحوی- ل٢٩٠)

بیانی هەر بیانییە خۆیی هەر خۆییە.
(کانی- ل٢٧)

- بێ گوێ: لاسار: یاخی: گوێ نەدەر.
سەرکێش: سەهەندە: ختمی: کەللەرەق: سەرڕەق: مل هوڕ: عیناد: سەرسەخت: کەللە شەق.
کەسێ ئامۆژگاری قەبوول نەکات.
... پیاوێکی زۆر کۆنە پەرست و کەللەرەق و خۆپەرست و...

(تاريك و روون- ل٢٣)

... ئەی سەرسەختی چارەڕەشی پیس...

(ئاشتی-ل٥٠)

... هەی هەی لەم درۆزنە لەم دوورۆزنە کە تەمل هوورە.

(ئاشتی- ل٤٥)

- بێ مراز: بێ مراد: بە ئاکام نەگەیشتوو.
- بێ منەت: منەتی نییە.
- بێ موبالات: کەم تەرخەم.

ئەگینا چەتەیەکی کۆنەکاری وەك وی بێ موبالات نابێ..

(حەمەدۆك -٢- ل٣٤١)

- بێ نموود: کەم نموود: پووزە:
- بێنوێژی: حەیز: کنج: وەهك:

ئافرەت هەموو سەرەمانگ کە خوێنی دەبینێ

ئەو مرۆڤەی بەلەش و لار بچکۆلە بێ.

- بێوەژن: ژنەبێ: ژنبێ.

١- ژنی مێرد مردوو.

٢- ژنی تەڵاق دراو.

ئەوەی بەبێوەژنی ئەیکەیت، بەکچێنی بتکردایە:

(پەندخاڵ- ل٦١)

بەیەکێك ئەوترێ، کەلەکاتی خۆیا ئیشێکی نەکردبێ و لەپاشابییکا.

بێوەژنە یان کچە هەر دەڵێی شەکی کاڵە

سەعات لە چواری شەوی ماچ کەم ئەم ختوخاڵە

(زیرەك)

(سۆل)ی زەرد و (مەحس)ی چنە

خۆی لێ مەدەن بێوەژنە.

(هۆنراوە- ل٥٤)

- بێوەمێرد: بێوەمێر: رەبەن: رەبەنۆك: بێ ژن پیاوی بێ ژن.

"سۆرمێ ژنی یەکەمی دوای کوڕ و کچێك خوا ئامانەتی خۆی وەرگرتەوە دووساڵ بە بێوەمێردی ژیانی بەسەربرد.

(غەوارە- ل١٨)

- بێ وەی بن:

١-واتە بێ بەڵابن:

٢-دوعایە بۆ پاداشت دانەوە دەگوترێت واتە دوورە بەڵا بن.

- بهیستن: بیستن: گوێی لێبون: گۆبیست بوون: گوێ بیست بوون.
- بێهن: ١-بۆن: بۆ. ٢-ئیسراحەت. ٣-ماوە: مەجال.
- بێهین: بکە: بۆنبکە.
- بیهە ژێنە: بیژینە: رایژێنە.
- بێهنەك: بەینەك.
- بی: ١- بوو:

٢- ناوی دارێکە بەناوی داری بی

- بینم: بێنم: بهێنم: بهینم: باوەڕووت:
- بیوك: بەهی: بێ: بەه

بەری درختی داربی لەتیرەی هەرمێیە، بەلام لەهەرمێ گەورەترە رەنگی زەردە.

# پ

پیتی (پ) دەنـگ گـۆرکێ دەکـات لەگـەڵ چـەند پیتێك وەکو هەموو پیتەکانی تری زمـانی کـوردی بەم شێوەی خوارەوە.

١-دەنگ گۆرکێ دەکات لەگەڵ پیتی (ك)

بۆ پرووز: بۆ کرووز.

٢-بە دەنگی (ب) دەنگ گۆرکێ دەکات وەك

پ: ب

پچووك: بچووك

پە: بە

پەچۆغەبوو، پەخوای وەبوو، پەرانی بوو، پەخوای وە بوو پە پارە بوو، پەخوای وەبـوو، پـە... بـوو ئەوەی مەبێ.

شێوەنی ژنی مێرد مردووی ناوچەی دیانا.

٣-لە کرمـانجی بـاکوور پیتـی (پ) بـە ناسـك و قەڵەوی دەبێژرێ.

١-(پ) قەڵەو زمان دادەگرێ (ە) زنە دەخاتە سەر پیتەکە بۆ زمان گرتنە.

پەز، پار، پانك، پان، پسمام، پوز.

٢-بۆ( پ) ناسك.

پەڕ، پەیت، پیڤار، پا.

- پا:

١- داوێن: ٢- پای: پار: پـشك: پـەش: ٣- بـەو: ٤- قاچ: لاق: لیـنگ: ٥- ژێـر: بـن: ٦- شـوێنی چاك بۆ پەڕینەوە.

- پابەرە: شەڕواڵ.

- پابەست: پابەند: پێوەند: پێوەن: پێبەند: پاوەند ئامێرێکی ئازاردانی مرۆڤە و بەم شێوەیە دارێکـی ئەستووری قایمە، بەئەندازەی داری کاریتەیەك لـەم سەرەوە تا ئەچێتە ئەو سەر چەند کونێکی تێدایـە، زنجیر یا گوریسی خراوەتە بەینی کونـە کانـەوە زۆر تر زنجـیرە، هـەر دووپێـی تاوانبارەکـەی ئەخرێتـە بەینی دار و زنجیرەکەوە و زنجیرەکە توند ئەکرێتـەوە ئیتر کابرا ناتوانێ هەستێ.

پابەپابەند و مل بەکۆتەوە

پەنجەم هەڵوەری وەلیمۆتەوە

(گوڵاڵە- ل٦٣)

پابەپابەند و مل وەمووروەوە

دەست وەدزوێنکی زەرد و سوورەوە

(گوڵاڵە-ل٦٣)

- پابلقە: پایە: پێ: پێی: پەیژوقادرمە.

- پاپا: ١-سوپاس کار:

٢-ناچار: بێچارە: شڕ: ناجەسە.

٣-پیاوی ئایینی دیانان.

- پاپابوون: تەشەکور.

- پاپاخ: پەپاغ: پـەپاخ: جـۆرە کڵاویکـی کـولکی ڕەشی عەجەمانە.





تەماشای کرد عەجەمی کەول رەقی پەپاخ رەش بوون.

(تحفە-٢- ل٢٠٤)

- پاپان:١- پێ پان: ٢- کۆی پاپا.

- پاپەتی: پێ پەتی: پێخواس: پێ خـاوس: پـێ خاس.

- پاپك: بێ کۆتایی: بێ پایان.

- پاپۆکە: پەپکە: خربوونەوەن.

ماربە دەوری خۆیدا.

- پاپۆش: ١-پێڵاو:

٢-دەرپێی ژنان.

- پاپووچە: بابوج.

- پاپێچ: بەلەك پێچ لەهەرشتێك بێ.

- پاپیلکە: قادرمەی دار.

- پـات: ١-لاوازی: ٢- دووبـارە:٣-هـەویر: ٤- بەشی چاك: ٥-مەجال.

- پاتار: ١-پاتاخ: پاتاك: ٢-ئەسل:.

٢-پاتاڵ.

- پاتاڵ: ١-کەل و پەلی کۆنەی ماڵەوە

٢-تالان: ٣-چەڤزی

- پاتالانە: باجی پاتاڵ کە لەوەرزێر دەسێنرێ.

- پاتك: جێز: گێز: پشتەمل.

- پاتەخت: پێ تەخت: پایەتەخت.

ئەوشارەی سەرۆك کۆمار و ئەنجوومـەنی وەزیرانـی لێ دادەنیشی.

خان ئەحمەد خان سنەی کردە پایتەختی خۆی...

(شەرەف- ل٣١٥)

- پاتەك: پەڕۆك: پەڕۆ: کنجك.

- پاتی: پاتێڵ: مەنجەڵ: بەڕۆش.

- پاجێ: ئەسەری پێ: شوێنی پێ لەسەر زەوی.

- پاچ: ١-ماچ: موچ:

٢-کولینك: قازمە

- پاچڤە: تەرجومە: وەرگێڕان

گۆڕین لەزمانێکەوە بۆ زمانێکیتر.

- پاچڤەزان: موتەرجیم: وەرگێڕ:

ئەو کەسەی بابەتان وەردەگێڕێ لە زمانێکـەوە بـۆ زمانێکی تر.

- پاچك: ١-پێ: ٢-غەرگە.

- پاچناڤ: ناوی خوازراو: نازناو:

ئەو کەسەی ناوێك بۆ خـۆی هەڵدەبـژێرێ جێگـای ناوی ئەسڵی دەگرێتەوە لەبواری سیاسی و ئـەدەبی و هونەری وەك گۆران، هێمن، نالی.

- پاچین: بڕینەوەی پرچ.

- پاچینە: پەیژە: قالدرمە: پێبلقە.

- پاخاڤامەکە: مەترسە: مەترسێ.

- پاخەسوو: بەربووك: پێ خەسوو: رافە:

بـەو ئافرەتـە دەگـوترێ کەشـەوی گواسـتنەوەی بـووك دێتـە مـاڵی زاوا گوایـە ئـەو شـەوە ئامۆژگاری بووك ئـەکات سـبەینی ئەگەڕێتـەوە هەواڵی رووسووری دێنێتەوە .

- پاخەند: یاقوت

- پادار: بەپێ:

ئی بەپێ بگرن، بێ پێئی خۆمانە. (پەند)

- پاداش: پاداشت: بەخشیش.

ئەو پارەیان دیارییەی لەبەرامبەر چاکە وەردەگرێت

- پادان: شوێنی باش بۆپەرینەوە:
- پاداو: ئەو کەسەی بەسەبەتە لەنانەواخانە نانی بۆ خەڵك دەبات.
- پادەشت: پێ دەشت.
- پادشا: پاشا: پاتشا: پادشاه: پاوشا: پەدشێ:
١- سەرۆکی وڵات.
٢- پلەوپایەك بوونە لە زەمانی عوسمانی دەیدا داروودەستەی خۆی.
٣- گەورەم:
سلتان شیخادی پەدشێ منە
(ئێزد- ل٣٤)
٤- پلەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانیدا دەدرایە ئەو کەسانە.
أ- بەخشراوەتە سەرکردەکانی سوپا والی ولایەتە گەورەکان.
ب- دراوەتە هەندێ موتەسەریف و قایمقام.
ج-بەخشراوەتە سەرۆکی ئەو هۆزانەی پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەت هەبووە، لەمووناسەبەت دا (پاشا) جلی رەسمی لەبەر ئەکردوو فێسی لە سەردەنا، هەرپاشایەك مووچە و بەراتی خۆی هەبوو.
د-لەقەبێك بووە دەدرایە میرەکان لەلایەن خەلیفەی عوسمانییەکان.
و-وەك پلەیەك یا وەك نازناوێك دەدرایە سەرۆکی سەنجەقەکان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی.
٥-لە چیرۆکی ئەفسانەییدا بە فەرمانڕەوای وڵات و میری شار و گەورە سەرۆکی وڵات و مەلیکی مەملەکەت و ئیمپراتۆری دەوڵەت بەکاردێ.
٦-دووەم کەس کە لەیاری ماتانێ دەیهاوێ.
٧- بریتییە لە ژیانی خۆش و ئاسوودە (وەك پاشایان دەژی).
- پار: ١-بەش: پشك: ٢-پارەکە: پارساڵ.
- پاڕازتن: پاراستن: بەرگری لێکردن.
دژی یەکێ بۆ پارازتنی ئاوەکە و ئەندەروونێکی زۆر قایمی بۆ خۆی و ماڵ و منالێ لێ هەڵخستەوە.
(شەرەف- ل٢٥٣)
- پارازك: حەراسەت.
- پارازۆ: محامی: پارێزەر:
بەرگریکەری گوناهبار لە دادگادا.
- پاڕانەوە: لالانەوە: تکاکردن: ناورانەوە.
شفا: رجاکردن: نووزانەوە: لاڤ لاڤ: لالیان: پاڕیانەوە
(جەهارار، هاوار شفا و لالەی من بێسارانی)
ئەوەندەی وەیسە پاڕاوە و لا لاوە سوودی نەبوو.
(گەدا- ل٨٨)
گریام و پاڕامەوە ئاوری لێ نەدامەوە
- پاراو: ئاودانی چاك.
- پاراوکردن: تێر ئاو کردنی زەوی.
- پارچە: بەش: لەت: کوت: جزار: کارتك: ساد: کەرتك: زوولاك: جەنەکە: دەرەقەل: کەرك: تبیلە: تیکە: زۆل: فەلق: پەرچوم: پەرچە: داغان: پارە بەشێکی بچووك لەبەشی تەواو.
چومە ماڵی دۆستی فەقیر
لە بنی دانام پارچە حەسیر
(هۆنراوە- ل٦٤)
پارچە پارچە: پارە پارە: لەت لەت:





بەس بلاوێنە رەقیب وا دڵەکەم لەت لەت بوو.
(دیوان- ل٥١)
- پارچە پدنە: بەو پارچە قایشە دەڵێن کە لە پێی باز ئەخرێت.
- پارچە فرۆش: بەزاز: قوماش فرۆش.
- پارچۆلکە: پارچۆکە: پارچەی بچووك.
- پارچەلە: بۆتەمەنی منالێ بەکاردێ کە تەمەنی لە (١٢-١٣) ساڵان دابێ.
دیانەکانی کۆیە، منداڵی ساوا و پارچەڵەیان کە دەمرد.
(مێژووی کۆیە- ل٢٧)
- پارخان: دەنگ: دەنە: پاراسوو: پەراسوو: پەراسوە: دەندە: دەندەل: ئێسقانی قەفەزی سینگ
- پارزونگ: ١-بازۆرنگ: چاپالێو.
٢-پارچە بووزیە کە لەسەری مەنجەلۆکی مەڕدۆش دەگیرێت شیری پێ دەپاڵێون.
- پارس: دەرۆزە: سواڵ: گەدا:
دەست پان کردنەوە و لالانەوە بۆ پارە پەیداکردن.
- پارسەگ: دەرۆزەکەر: دەروازەکەر: سوالکەر: گەدایی کەر: گەیی: دەروزەکار: خوەستۆك.
- پارسەگ: ئەو ئاسنەی بۆ کێشان بەکاردێ.
- پارڤەدبن: دابەشدەبن.
- پارکر: باریکرد.
- پارکە: بارکە.
- پارکۆن: پارگین: پاش کۆن.
چاڵی دەورویشتی رەشماڵ بۆ ئەوەی ئاو نەیەتە ناو رەشماڵ لەکاتی باران بارین.
- پاروو: پا: تیکە: پاروی:
دیسان میاو: پاروویەکی بۆ هاویشت.
(گەدا- ل١٩)
پارو بکەوێتە کۆشێ، بە قازانج حیسابە، (پەند)
- پارووی دڕکاوی: بریتییە لەسوود و قازانجی پڕ ئێش و ئازار.
- پارووی چەور: بریتییە لە سوود دیتن لە کەسێ یالە کارێ.
- پارووی کو جیلانی: بەو پاروەوە دەڵێن کە دەمەکەی فراوان و قونکەکەی باریکە بۆ ئەوەی ماستێکی زۆر هەڵبگرێ لەکاتی خواردنا.
- پارە: پویل: پول: دراو: پەرە: دراڤ
پارە چاڤان لە خودانێ تاریدەکەت.
(کانی- ل٢٨)
پارەی سپی بۆ رۆژی ڕەش: واتە پارە لە رۆژی پێویست رزگاریدەکات.
(پەند)
زیاتر بیری لەپارەی سەرفیترەکە دەکردەوە
(گەدا- ل٧٦)
پارەی بدە مەلای لەمزگەوتێ دەرکە:
واتە پارە هەموو کارێکی پێ دەکرێ
- پارەدار: هەبوو: زەنگین: دەوڵەمەند: دارا: تێر: سامانداز: هەبوون: موڵکدار: حاڵ خۆش: دەوڵەمەند: ماڵدار: کۆك: کەسێ پارەی زۆر بێت.
- پارەدان: پەرەدان: جزدان
لەقایش دروستدەکرێت بۆپارە هەڵگرتن.
- پارەك: پاروێك: پاروەك: یەك پاروو: تیکەیەك

- پارەکانی محەمەد پاشا: محەمەد پاشا لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆی لەرەواندوز چەند جۆرە پارەیەکی لەسکەدا بەم شێوەی خوارەوە:

١-یوزلغ: یانزە قرۆش بوو

٢-ریال: پانزە قرۆش بوو

٣-جلق: (٤/١) قرۆشێك بوو

٤-تەنیگەل: (٤) قرۆش بوو

٥-قرۆش: ٧ قرۆش بوو

٦-خواد بەند: حەوت چارەکە قرۆش بوو

٧-شایی: ١/٢ قرۆش بووە

- پارەی هیشکە: تەنها دراو

- پارێز: پەهرێز: ١-نەخواردنی هەندێ خواردن

٢-هەل وەرگرتن بۆ راوکردن

- پارێزپەڕاندن: ئەوەیە کاتێك راوچی لە پارێزی نێچیردادەنیشی بۆ نێچیر گرتن ئالەوکاتەدا کە نێچیرەکە لەڕاوگە نزیك دەبێتەوە هەست بەڕاوچی دەکات و دەڕوا و ناگیرێ بەمەدەڵێن پارێز پەڕاندن.

- پارێزگار: ئاگادار: پارێزەر: ئەو کەسەی خەڵك و شوێن دەپارێزن.

- پاژ: بەش

- پاژە: بەڵگە: سەلماندن

- پاژنە: پاینە: قونپانیە: قوپانی:

قونپانی: پاش پانی: پانی: پانیە: پەحنی: ١-بەشی دواوەی پێی مرۆڤ.

٢-بەشی دواوەی کەوش

عەرەق لەو هانیەی دەتکێ تك تك دێتە خوار تەر دەکا پانیەی کەوشان

دەستت پێت بنی پاژنەکانت ماچدەکەم.

(تەنەکە- ل٦٠)

- پاس: ئێشك.

- پاس کردن: پاسگرتن.

- پاسار: سواندە.

لە هەندەجێ پاسارەی بانەکان کەوتبوونە خوارە.

(گەدا- ل٣٤)

- پاسارە: رنوو.

- پاساریی: کێشکە: چۆلەکە: کۆشکە.

- پاسەن: وایە: وەیە.

- پاسەوان: کێشك گر: ئێشك گر: پاسدار: شەوگەڕ: وەردیان.

ئەوبورجە قەرەبەگ و پیاوەکانی پاسداری بوون و هەموویان کوژران.

(شەرەف-ل٥٥٢)

- پاسگا: مەخفەر: پاسگە:

ئێستاش سەرکار رەزایی پاسگاکانی کوردستان لەجەنابی سەرهەنگ بەئیجار دەگرێ.

(گەدا- ل٦٥)

- پاسەوانی: گێشك چێتی: یارازك:

کێشکڤانی: پارسەکی: قولخیی

دەی ماڵی بابم نەسرین

دانیشە کێشکی بگرین

- پاش: ١-پشت: دواوەی

٢- دوای





لە پاش ئەوەی: لەدوای ئەوە:

خوێنەر پاش خوێندنەوەی زۆربەی چیرۆکەکان.

(گەدا- ل١٤)

- پاشا: ١-پادشا: ٢-ناوی کوڕانە.

- پاشاپاشا: میر میرانی: جۆرێکە لە یاری کوردەواری.

- پاشاخوڕ: پاش ئاخوڕ.

- پاشان: پاش دان: دوای ئەوە:

پاشدان عوسمان تێی هەڵکردووە.(غەوارە- ل٤٢١)

- پاشای کۆرە: کۆرپاشا: نازناوی میر محەمەدە میری سۆرانە کوڕی موستەفایە سالی (١٨١٣) بووە میری سۆران.

- پاشاو: تیژاو: سێ یەمین ئاوی حەوزی سابوون دروستکردن کەلە (قلی و قسل)ی ناو چۆڕکەوە وەردەگیرێ دەکرێتە سێیەم بەرمیل.

- پاشبەند: ١-دوابەند: ٢-قایشی دواوەی زین.

- پاشبۆکی: بەرەواژ: ئاوەژوو.

- پاش خان: ژووری دواوەی خانوو.

- پاش خوان: بەرماوە: ئەو خواردنەی لەدوای خواردن دەمێنێتەوە بەتایبەتی هی ئاغایان.

- پاش خوان خواردن: بەرماوە خواردن.

- پاشخوان خۆر: بەرماوە خۆر: گزیر و چڵکاو خۆر

- پاشبێژی: غەیبەت کردن: پاشدوو.

- پاشتێلانە: چوونە لای بووك دوای سێ رۆژ بۆماڵە باوانی بۆ دیاری پێشکەشکردن.

- پاشخستن: دواخستن.

- پاشدادمینن: دوادەکەون: بەپاش کەتن.

- پاشرۆژ: ١-دوارۆژ: پاشەڕۆژ.

٢-کۆکردنەوە:

- پاشکەوتن: پاشکەتن.

- پاش دز: ئەودزەی لە دەوروپشتی شوێنی دزیکردن وەیالەدواوە چاودێری ناوچەکە دەکات و هەرشتێك رووبدات ئاگاداری دزەکان دەکاتەوە لەشوێنی دزی کردن.

- پاشکەوتوو: پاشکەوتە: دواکەوتوو.

- پاشکێ: ئاخیری: دوای کێ.

- پاشگورد: ئامێرێکی کارگەی تەونی چنینیە، دارێکی بچووکە نزیکەی (١,٥٠) درێژ لەهەوراز دارگورد دەخرێتە ناو رایەلەکانی. لەکاتی چنیندا دار گورد چەسپاوە تەنیا پاشگورد دەجوولێتەوە.

- پاشگەز: پەشیمان.

- پاشگەزبوونەوە: پەشیمان بوونەوە.

- پاشگۆتنی: غەیبەت.

- پاشەبەرە: دوابەرە: پاشەڕۆك.

١-دوابەری بەرهەم

٢-دوابەری شینایی و میوە

٣-دوازا: دمازا: دوازانی ئاژەڵ

- پاشڵ: پاشەل: دوایی جەستە.

- پاشڵ پیس: پاشەل پیس: بریتییە لە تاوانبار: قون پیس.

- پاشماشە: پەخماخەی تفەنگ.

- پاشماك: پاشماوە: ١-وەرسە: میرات

٢-ئەوەی مایەوە لە هەرەشتی

- پاشماکگر: میراتگر:

- پاشملە: پاشەملە: پاشە ملی: غەیبەت: زەم:
بەناڕەوا باسکردنی کەسێ لە دووری ئەو کەسە.
- پاش نوێژ: دوای نوێژ: کات و ساتی پاش نوێژ.
- پاش نیڤرۆ: پاش نیوڕان: دوای نیوەڕۆ.
- پاشوو: هەردوو پێی دواوەی کەر و ئەسپ و
ماین و سەگ.
تاوس بەرە دەست و پاشووی لە خەنە بگرە.
(گەدا- ل٥٩)
- پاشەر: ١-هێز: ٢-پاشەڕۆ.
- پاشەکەوت: پاشەکەفت: خڕکردنەوە: گڵدانەوە.
- پاشەکشە: ١- ئینسحاب: ٢-تۆبە.
- پاشەوە: پشتەوە: دواوە.
- پاشی: پاشێ: دوایی.
- پاشیا: پرژوبڵاوبۆتەوە.
- پاشیو: پارشێو: نان خواردنی شەوی ڕەمەزانان.
- پاشێن: دوای.
- پاشەڕۆژ: ئاینده: داهاتوو.
ڕۆڵەگیان بەڵان بۆ پاشەڕۆژ تروسکایەك بوویت
(غەوارە- ل٢٣)
- پاقر: ژەنگ، نارەسەن.
- پاقلە: پاقلە: سەوزەیە بەدنك دەچێنرێ وەرزییە
دەکرێتە شلە و وشکیش دەکرێتەوە بۆ زستان.
پاقێژ: فرێیدە: فرێیە
- پاك: ١-خاوێن: ٢-پیرۆز: ٣-بێ تاوان: ٤-
ساقی: ٥-هەمموو:
چوون لە دایك بووە هەر بەو پاکی و
خاوێنییە ماوەتەوە.

- پاکانو: هەمموو‌تان:
پاکانو سەردەبڕم شاری داودیەی دەکەم بڵاوە
( تحفه-٢-ل١٢٣)
- پاککردن: خاوێنکردن.
- پاکانە: بەرائەت: بەشدارنەبوون لەکاری ناڕەوا
پاکانەی خۆی دەکات.
- پاکار: خزمەت کار.
- پاکتاو: پاکەوپاك.
- پاك داوێن: داوێن پاك دژی داوێن پیس.
- پاکروو: ١-روخسارپاك: ٢-نییەت پاك.
- پاکوپاراو: ١- پاك: ٢- پیرۆز.
- پاکول: پێ کورت.
- پاکی: پاکێتی: دژی پیسی.
- پاکیزە: ١-پاك زادە: ٢- ناوی کچانە.
- پاگرتن: پێ گرتن.
- پاکژ: خاوێن: پاقژ: پاك.
- پاگیر: ١-پێ بەستراو: ٢-گرفتار.
- پاگە: تەویلە.
- پاڵ: ١-لا: کن: ٢-گرد: ٣-بناری شاخ.
- پاڵا: پێڵاو: کەوش: پێتاو: قۆندەرە.
- پالان: کورتان: کۆپانی حەمال.
- پاڵ پێوە نان: پاڵ پیانان.
- پاڵاوتە: پاڵافتراو: پاڵاوتراو: خولاسە: پیس
لێ فرێدراو.
- پاڵاوتن: پاڵافتن: پیسی لێ فرێدان.
- پاڵاغ: گۆلکی تەمەن یەك دووساڵەی گامێش.
- پاڵتۆ: پالۆ: سەکۆ: ساقۆ: قاپووت: پاڵتاو: پاڵتە





جۆرە بەرگێکی ئەستوورە زستانان لەکاتی سەر
مالەبەردەکرێت بۆ گەرم بوونەوە.
- پاڵە: ١-بەو کەسانە دەڵێن کە بەرۆژانە کار
دەکا و دروێنە دەکا نەك بەمەرجی و ڕێژەی ڕەسەو
سەپانی: ٢- ناوی کوڕانە.
- پاڵە پەستۆ: فشار: ئەفشار: گوشار: تەوژم
لەبەر زوڵم و فشار و جەورویێداد
(تاریك و روون- ل٦٦)
- پاڵەمێر: کارزان: زیرەك لە کاردا.
- پاڵەوان: قارەمان: ئازا: ئازا لەشەڕدا.
- پاڵەوانی چیرۆك: ئەو کەسەی لەچیرۆك دا ڕۆڵی
سەرەکی دەبینێ.
... پاڵەوانی چیرۆکەکانی قزلجی هیچ کامیان بۆ
خوێنەرێکی کورد نەناسیاونین... (گەدا- ل١٣)
- پاڵەوانی چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی: بریتییە لەو
پاڵەوانە فۆرلکلۆرییەی کە لەچیرۆکی کوردی
دەوری سەرکی دەبینێ وەك:
(١-خڕکۆکی داری، ٢-گورنە تەلە)
- پالەنگ: شەل: شل:
شەلەماڵەکی قەلپی
حەسەنەشل
- پالەوپەست: قەرەبالغ: ئیزدیحام.
- پاڵەوەدان: پاڵدانەوە.
- پاڵکەفتن: پاڵکەوتن: پاڵدانەوە.
- پالۆز: حەوتەی شەشەم لەوەرزی زستان (پیت و
پالۆز ساڵ بوو ئالۆز).
- پاڵ لێ دانەوە: لێ پاڵ دانەوە.

- پالوو: قایشی پشتەوەی کورتان و زین
هەر دەتکەمە تەنگە هەردەبییەوە پالوو
دەچیەوەبن کلکی کەرێ: واتە باش نابی
- پامال: ١- هەموو شتێکی لە ژێر
پێدا پلیشابێتەوە.
٢-پەست و زەبوون
- پامز: کاڵە دڕانە: پێڵاودڕانە: حەقی ماندووبوون
- پان: بەرین: پەهن: پەحن: داکێشراو: پۆڕ
چاوکچکۆکەی ڕوومەت پانە. (هونراوە- ل٥٦)
- پانەگۆر: ساکەگۆر: گۆڕایی: عاردی هەموار.
- پانایی: بەرینایی.
- پانتۆل: شەروال
پاند رووس: ١-کەم: ٢-ناڕاست.
- پانزە: پازدە: ژمارەی دوای چواردە.
- پانگەه: تەویلە.
- پانۆکی: جۆرێکە لەدوورین.
- پانۆڵە: خریلە: کورتی قەڵەو.
- پانیە: پاژنە: قوپانی: قون پانی
دواوەی پێی مرۆڤ.
چاوی وەستاکەت کوێربێ سۆلان دەکوشێ پانیانی
- پانەدزە: پەنادزە: قوونەدزە: دەرەدزە: خۆ
دزینەوە بێ ئەوەی کەس هەست پێ بکات.
- پاوان: ١-لەوەڕگە:٢- قەدەغە
وەك پاوانی ئاغاکەت (هونراوە- ل٨٢)
سنگی تۆ باخەچەو پاوان بێ
دەبا بۆ من بی بەتەنێ
٣-پاوانە: خرخاڵ.

- پاوانه: ١-پاوەن: خرخاڵ: پونە: پامور.
٢-ئاوازی گۆرانییەكی گۆرانی كوردییە
پاوەنەكانی ئەزرینگەیتەوە.
قافلە لە عەجامە ئەگێڕێتەوە.
- پاوەرە: شەرواڵ.
- پاوەن: ١-پاوەند: سندم: ٢-خرخاڵ.
- پاووپل: دەست پێ.
- پاوپۆز: لاق و لەتەر.
- پاوە: شارێكە لەكوردستان، ئەم شارە بەناوی (پاو) كوری شاپور كوری كیوس برای نەوشیروان كراوە پێش سەدەی پێنجەمی زایینی (یەزدی كوڕی شای ئێران (پاو)ی كردە سەرداری هێزێكی دووهەزار كەس بەرەو شارەزوور نارد لەو بەری رووباری سیروان لەنزیكی دێیەكی گەورە چادر هەڵئەدەن خەڵكی دێ یەكە پێشوازی گەرمی لێ ئەكەن (پاو) لەگەڵیان ئەكەوێتە گفتوگۆكردن ئەیانخاتە سەر فەرمانڕەوایەتی ئێران و ئەیانگێڕێتەوە. سەر ئایینی زەردەشت جاناوی ئەودێیە گەورەیە بەناوی (پاوە) وە ناو ئەنێن.
- پاوڕ: زێی ئاژەڵ: پزدان.
- پاومان: پایان.
- پای: ١-داوێنی: ٢-پێی.
- پایتوون: پەیتوون.
- پایدۆس: پایدۆست
١-ئازاد لەكاركردن
٢-ئیجازە: ٣-رۆیشتن
- پاییز: ١-پەیز: پەهیز: گەڵارێزان
بارێزان: گەڵارێژان: پائیز: خەزان: پاهیز: پازیر
سێیەم وەرزی ساڵ، هەوادەگۆڕێ و بەرەو ساردی دەچێ و گەڵای داردەوەری و رەنگی زەردەبێ
پاییز و بەهار و زستان
سەمائەكەن بەدەستان (مەلۆ- ل٩٧)
خەزانی رەنگی من بۆ ئاوێنەی رووت
خەزانم دێ لە ئاخوش بەهارا (سالم- ل٢٥)
رەنگ زەردی خەزان خەتای پاییزە
رەنگ زەردی من دووری ئازیزە
(گۆرانی كوردی)
پاییز كە خوری و رۆن و شەك و كاوڕیان فرۆشت.
(گەدا- ل٨٢)
٢-بریتییە لەغەمباری
پاییزە لەمن بەهارە لەتۆ
زەردبن خەزان زەردەبن لیمو
٣-پێوەری كاتە
پارپاییزی رۆیشت.
- پاییزەبرا: برادەری ون بووی ماوەك. كە پایز بۆ یارمەتی هاتبێ.
- پاییزە: ١-(پاییز+ە) واتە وەرزی پاییزە
پاییزە پاییزە پاییزە و هەڵاڵە.
٢-ئەو زەراعەتەی لەوەرزی پاییز دەچێنرێ.
٣-ئاوازێكی گۆرانی كوردییە.
- پاییزەمیز: لەپاییزان ئاژەڵ لەشوێنی زەراعەت كردن رادەگرن بۆ ئەوەی میز و قشپلی لێ بكات بۆ ئەوەی زەوییەكە بە هێز بێت بەو شوێنە دەڵێن (پاییزە میز).





- پایە: ١-پلە: ٢-پێی قادرمە:
٣-مەقام: هەركەسێ مەقامی خۆی دەناسێ.
٤-روتبە.
- پایەبەرز: رێزدار: رێزو حورمەتی ناو كۆمەڵ بەرامبەر بەكەسێ.
- پایەدار: جێگیر: خاوەن پایە
پایەداربێ شەهریار لە بۆ قانوتەختی
(مەلۆ- ل٩٧)
- پایە ماڵ: كلۆل:.
- پایتەخت: پێ تەخت: پاتەخت.
- پایی پڕ: پڕاوپڕ.
- پای دكن: بەشدەكەن.
- پت: ١-كەم: ٢-نوقتە: ٣-ژن: ٤-كەپوو: لووت
- پتێك: پتەك.
پتەكت لێدەم تورە دەبی.
- پتەو: بتەو: ناوپڕ.
- پتر: زیاتر: پێتر: پرتر: زەهڤتر: فرەتر: زێتر
بخوێننەوە تاپتر شایەتیتتان بە زمانەكەتان.
(گەدا- ل٨)
- پتركردن: زیادكردن.
- پترین: زیاترین.
- پتكۆ پتكۆ: ژن: ئافرەت: مێینەی مرۆڤ.
- پتیك: چۆلەكە : كێشكە.
- پچ: ١-كەم: ٢-پارچە.
- پچە: مناجات: پاڕانەوە.
- پچەڕان: پچڕان.
- پچەڕاندن: پچڕاندن.
- پچراو: پچڕای.
- پچڕپچڕ: پارچە پارچە.
- پچڕیاگ: پچڕاو: پچڕای.
- پچك: كەمەك: پیچەك: كەمێك.
- پچكڕاندن: پچەڕاندن.
- پچووك: بچووك: گچكە.
- پچی: لەبەرچی: لەبەرچ.
- پخ: ١-ورد: ٢-كوژاو:
- پخكردن: كوشتن.
- پرەنگ: ئەخلاق: سلوك: رەوشت.
- پرەنگاندن: پرەنگین.
- پربەر: بەبەر: بەری زۆر.
- پربەها: بەنرخ: بەقیمەت.
- پربێژ: زۆروەر.
- پربیر: زیرەك: هوشیار.
- پرپرس: ١-زۆر پرسیاركردن: ٢-عەجیب.
- پرپرە: جۆرە خشڵێكە.
- پرپولە: جۆرە خواردنێكە بۆ جوجكەی مریشك و عەلەشیش دروستدەكرێت.
- پرێسكە: كوتە پەڕۆ: پارچەپەڕۆ.
- پرپێ: ١- هەزارپێ:
٢- پێلاوی نەكچكە نە گەورە.
- پرت: كەم: كێم.
- پرتاڵ: جلە كۆنە.
- پرتۆخ: پۆخلەوات: كاری نهێنی ناڕەوا و نابەجێ
ویستی پڕ توخی خۆی لەپێش ئەو عەشاماتە زۆردەرنەخات.
(بۆرە- ل١٠٤)
- پرتاو: هەشتاوی: لەناكاو.

- (پڕتاو هات و ڕۆیشت).
- پرته: پرته و بۆڵە: پرتەپرت
- پرتکە: پارچەی بچووك: هورتکە
- پرتووك: ١-شت: ٢-ئەنجام.
- پدۆ: پدو: بدو: پوکە: لاووس: لۆوس: پووك: پویك: پوی: ژێردان: گۆشتی بەردان.
- پر: پرد: جسر.
لەدار یان ئاسن دروستدەکرێت لەسەر رووبار و زێ بۆپەڕینەوە.
- پڕ: ١-تەژی: ٢-قەرەبالغ: سیخ بۆ تەون: ٣-زۆر
- پرادەلال: پرازاخۆ: پرامازن
پردێکە لەشاری زاخۆ بە (بەرد) دروستکراوە، بۆیە پێی دەڵێن (دەلال) بەناوی کچێك کراوە کە ناوی (دەلال) بوو چۆیەتی ناولێنانی بەم شێوەیە بووە کە لەگۆڤاری چیا باسیدەکات، پرا زاخۆ یان پرا (مازن) ناڤێ پرا دەلالێیە، چونکە ئەو پرە نەدهاتە ئاڤاکرن هەتا بخوینا پاقژا کچا خوندکارێ زاخۆ یاناڤێ وی (دەلال) نەهاتە شێلان هنگی کوچا ناڤی یا (پرێ) راوەسا و نەکەت: ژبەر هندێ ناڤێ وی بوو (پرا دەلالێ).
- پڕانی: زۆرتر.
- پڕبوون: تەژی بوون.
- پڕدان: رووبون: پەلاماردان.
- پڕکردن: تەژی کردن.
- پڕژانر: زۆر چەشن.
- پڕکێشان: پڕدان: گوڕکردن.
- پڕشنگ: ١-پڕدان: گوڕکردن: ٢-تیشك:
٣-ناوی کچانە.
- پڕشنگ: پرشەنگ.
- پڕپێ کردن: پەلاماردان.
- پڕوهندك: تەقریبەن: بەنزیکی.
- پڕتۆل: جلە کۆنە.
- پرچ: ١- قژ: شەعڤ: گژاك: پۆر: پوور
مووی سەری ئادەمیزاد شێوە لوولە یان لووسە بە (پرچ)ی جوانت باوەشێنم کە پێش ئەوەی دەرچی روحی شرینم ( عوسمان عوێزی).
٢-رەنگی هەیە وەك سوور، رەش، سپی، ماش و برنج، زەرد، دەبێتە نازناوی مرۆڤەکە،
عومەر سەربۆز، عبدالله سەر سپی و رەش.
- پرچقاندن: فیقاندنەوە.
- پرچك: دەوەن: تەڕاش، لکەداری وشك.
- پرچن: بەپرچ: کەسێ پرچی زۆر بێت.
- پرخە: پرخەپرخ:
دەنگی مرۆڤی نووستوو.
- پرچی بە گروازە: پرچی قرقژن
پرچی لوولی سەر.
- پرد: پر: جسر: پێل: پل.
- پلا سلاتی: واتە پردی سیراتی
(مجێور- ل٤١٤)
پردەکەی ناودێ ژێرەکەی بۆشە. (مەلۆ- ل٩٤)
- پردە باز: بەردەباز: بەردی ناو ئاو بۆ پەڕینەوە.
- پردۆکە: پردی بچووك: پرك.
- پردۆکەی جەنجەر: دوودارە هەردوو سەرەکانیان بە چوارگۆشەیی یا لاکێشە کۆڵدرایە و دەچێتە





سەرسەری (شونکی حوشترۆکە) و ئەویش هەر بۆبەندکردنی جەنجەڕە.
- پردی دانیشتن: لەوحەدارێکە بەقەدەر بستێك زیاتر، کەمتر دەکەوێتە نێوان پردۆکەی پاش و پێشی جەنجەر بۆدانیشتنی جەنجەڕوانە درێژیەکەشی بەقەدەر بەرینی جەنجەڕەکەیە.
- پرزە: هەست: شعور:
- پرزە بڕاو: بێ تاقەت: بێ هێز.
- پرژ: ١-بڵاو: ٢-تاڤگە.
- پڕژان: ١-رشان: ٢-مەجال: ماوە.
- پڕژاندن: رشاندن.
- پڕژووبڵاو: بڵاو: پرژ.
- پرس: سوال: سوئال: پەرس.
- پرس کردن: سوئال کردن.
- پرس پێ کردن: راوەرگرتنی کەسێ بۆ کارێك.
- پرس ژن کرن: پرساندن
- پرسەك: ١- پرسێك: ٢- نیشانەی پرسیار(؟)
... پرسێکی بکە بەیایەزینیش. (تحفە-١-ل٢٨٨)
- پرسانە: تازیانە.
- پرسە: تازیە.
تاسێ رۆژان پرسەیان دەگرت. (غەوارە)
- پرسە خەسوانە: پرسە خەسوان: پرسە گورگانە
پرس پێ کردن بەکەسێ و بەقسەنەکردنی.
- پڕەك: ماوەیەکی کەم
کەس لەپڕەك نابێ بەکوڕەك
- پرسیارکار: پرسیارۆك.
- پرسین: سوئال کردن.
- پڕش: بڵاو: پەرش.
- پرشاندن: رشاندن.
- پڕشەنگ: پڕشنگ.
- پرقە: حریتە حریتە: قاقا: پڕکە.
- پرکێشان: ئازایەتی.
- پرکێشی: جەرائەت.
- پڕمەی گریان: گرینی بەهێز.
- پڕمێشك: زیرەك.
- پڕنسی: فەقیر: هەژار.
- پرۆز: بەتال
چەند نوێژئەکەم نوێژم بەتاڵە
- پرۆنەڤیس: مەنهەج: پرۆگرام.
- پرۆناڤ: پرۆنێو: راناو: جێناو.
- پرنك: پڕناخ: لووت: کەپوو.
- پروو پەشێو: مەشغول: سەرقاڵ.
- پرووپۆشتە: پۆشتە و پەرداخ: لە جل و بەرگا نوێ و تازە.
- پرووپووچ: ١-خەرافیات: بێ مانا.
٢-هیچ و پووچ.
- پرووسك: پڕووشك: پڕیشك: پریشکی ئاگر.
- پرووشە: کینە: رق: رك.
- پرووکان: زۆر ماندووبوون.
- پروکاندن: هلاککردن.
- پریژ: بەسوود: بە فایدە.
- پرێسکە: پریاسکە.
- پریی: برۆ: بچە: هەرە: بچۆ.
- پرینگان: ترس.

- پرینگانەوە: ترسان.
- پز: ١-پس: کوڕ: ٢- کۆرپەلە.
- پزە: پسکە.
- پزپزۆك: جغارە.
- پزدان: بەردان: مندالّدانی ئاژەلّ.
- پزمام: پسمام: کوڕەمام.
- پزوو: پزیی: نیفۆ: مالّ دوخین: پزگ: زی: بەقەد دوو پەنجە لەسەرەوەی شەروال دەنووشترێتەوە و جێگای دۆخینە بۆ راوەستانی شەروال.
- پزگ: ١-دۆخین: بەندەخوێن:
٢-پزوو: نیفۆ.
- پزیسك: پڕوشك: پڕیشك: پڕیس: پریسك: پروسکە: پڕشە: پرشنگ

ئەو ئاگرە وردەی لە سووتەمەنی هەلّدەستیّ
ئەوەی لەنزیك کوورەی بیّ پریشکی پیّ دەکەویّت.

- پزیشك: دکتۆر: دختۆر
- پژبێن: پژدێن: پژبێن: بژبێند: بیبین: قۆلان ناڤدەنگ: شینك: هەفتاك: نزمە: شوتك: شالّ: پشتێند: نێوقەدبەند: شۆتك: پژبین: پشدێن: پشتێن: پشوێن: پشتك: شیتك: پشتوین: لەقوماش دروستدەکرێت بە درێژی دەیدورن لەچوار مەتر کەمتر نییە لەسەر جلی کوردی لەپشت دەبەسترێ.

دەمانچەیەکی رووتی لەبەر پشتێنی نابوو
(حەمەدۆك -٢- ل٢٦١)
پژدێن شل و مل باوانم هەستە لەخەویّ
لەگەردنی زەردت ئەی هاوار یەك ماچم دەویّ
پشدێنی لێبکەوە: دلّنیابە و لەهیچ مەترسە
(پەندی خالّ- ل١٣٢)
پشتێن شل و مل پاکەتت لیّ کەوت
خۆزگەم بە دوێنی چاومان بەیەك کەوت
(مەلۆ- ل٩٤)

- پژاك: دلۆپ:
- پژدان: ١-کولاّن: ٢-بلاّوبوونەوە.
- پژاندن: ١-نەشر: ٢-کولاّندن.
- پژگال: ئیش: ئەمر.
- پژمان: ١-پەشیمان: ٢-پشمین.
- پژمانی: پەشیمانی.
- پژمل: پشت مل: گێزی مل.
- پژمین: پشمین.
- پس: پز: ١-کۆرپە: زگ: ٢-کوڕ.
- پسات: دونیا

بوەپەندی پساتی (پەند)

- پس ئاغا: ئیچ ئاغا: ئەو کەسەی وەك ئاغا جلی جوان و پاك لەبەر دەکا و وەك ئاغایان رەفتار دەکا و ئاغانییە.
- پسخالّ: کورەخالّ
- پسمام: کوڕەمام
- پسکە: ١- جۆرە نەخۆشییەکە وەك پەسیو ئاژەلّە تووش بووەکە ئاو لەلووتی دێتە خوارەوە ئەم نەخۆشییە سەلامەتە کاتی خۆی بۆ چارەسەری بەداوەبەنێکەوە پسکەیان لەملی ئاژەلّەکەوە دەکرد.
٢-رووەکێکە لەچەشنی رنك.





- پساو: پسای:

هەرکەس بۆ لای خۆی راکێشا و نێوان پساو..
(شەرەف ل٦٧٤)

- پسان: ١-دووکەرت بوون: ٢-ترسان:
٣-زۆرماندووبوون.

پسام هەندی بڕۆم.

- پسەپس: فسکەفسك: پستەپست.
- پسپسو: داوە بەنی بێهێز کەزوو بپسیّ.
- پسپۆڕ: خەبیر: لێزان.

کۆنەپیاوانی پسپۆڕ و لێزانی راست و چەوتی راوداوان: (شەرەف- ل٣٥٨)

- پستە: فستق.
- پسدان: پزدان.
- پسوولە: کارت: بلیت.
- پسك: پشیلە: پسیلە.
- پش: بەش.
- پشافتن: پشاوتن.
- پشە: پشیلە.
- پشەپش: پشپش: وشەی بانگ کردنی پشیلە
- پشت: ١-پەشت: ٢-رەچەلّەك: ٣-پاش: دوا

یارەی بەدبەخت پشتی شکاوبوو. (گەدا- ل٨٤)

- پشت بالّ: پشت بار: لەکاتی دەست بالّ کردن دەبێت کەسێك هەبێت بۆ پشت بالّ کە هەر دوو گوێچکی تایەکە یاخرارەکە یافەردە یا جوارەکە بگرێت و تاوەکو بەپشتدا نەڕوات و بەر نەبێتەوە یارمەتی دەست بارەکە دەدات بۆ بارکردن.
- پشت بە خۆ بەستن: ئیعتماد بەخۆکردن.
- پشت پەژ: رەنگێکە لەرەنگەکانی شال و شەپك کەڕەنگی کەژی سروشتییە، بەبیّ رەنگ کردن وەکو رەنگی رەش، سوور، سپی.
- پشتاو: زەوی دێم.
- پشت خوار: قەمبور: پشت دەرپەڕیو.
- پشت باڤی: باوك مردوو.
- پشت پەهن: پاژنە: قوپانی.
- پشت چاڤ: پشت چاو.
- پشدان: بەزین.
- پشتڕاست: ١-دلنیا: ٢-ئەمین.
- پشتڕیّ: ناوچەیەکە لەپارێزگای هەولێر، بەهەموو ئەو گوندانە دەگوتریّ کە دەکەوێتە نێوان رێگای هەولێر- پردیّ، هەولێر- کۆیی لەزۆر شوێن بە دەشتی هەولێر بەناوبانگە.
- پشت سارد: نائومێد.
- پشت شکان: ١-بەزین: ٢-تووشی بەلاّبوون.
- پشتکۆم: پشتکوڕ: قەمبور.
- پشت قام: پشت ئەستوور.
- پشت گرتن: یارمەتیدان.
- پشتی گویّ خستن: ئیهمال کردن، گویّ پێنەدان گوێی بەدووزمانی سوزمانان نەدا و فەرمانیشی پشتگویّ خستن. (شەرەف- ل٧٥٣)
- پشت مل: پشتە مل.
- پشتملە: پاش ملە
- پشتملپان: گەواد.
- پشتووپەنا: یارمەتیدەر
- پشتهەڤ: بەشدار.

- پشتی سەر: پشتەسەر.
- پشت لێ ستاندن: بەزاندن.
- پشتیوان: دەستگیر: هاڤگەل: پشتەك: پشتوپەنا: هاریکار: یارمەتیدەر: یاریکار: یاریدەدەر: سیار: ما: هاوپشت: پشتۆڤان.

جاری یەکەمیان پشتیوان و خۆشەویستەکەی خۆی لەگەڵ بوو.

(حەمەدۆك -١- ل١٥٣)

٢-ناوی کوڕانە.

پشتیوانی کردن: ١-تەئکیدکردن: ٢-یارمەتیدان

- پشتۆ: ١-بار: ٢-دەمانچە: دەبانچە.

٣-سووکە لە ناوی پشتیوان.

- پشتی: ١- لەپاش: لەدوای: ٢- کۆل

پشتی عید ئەز دێهێم.

- پشتیر: تەویلەی ولاّغ، بەلاّم لەگەل ژووری ماڵەوە دەبێ بەناو برەیەك لێك جودا دەکرێنەوە
- پشقل: قشپل: پشکەڵ: کشپل: پشکل.
- پشك: ١-بەش: ٢-دلۆپ. ٣-پاژ.
- پشکامن: پارامن: بەشی من.
- پشکدار: بەشدار.
- پشتە بۆ: ئەوشوێنەی (بۆ) لە کەرخاو ئاوی لێ وەردەگرێ بەم جۆریە تەنیشتی بۆ لە عاردی تووتن والآیە و ئاوی لە کەرخاو وەردەگرێ.
- پشتە قەد: بەو خەتە دەڵێن کە قەدەعاردی تووتن دەکاتە دووبەش.
- پشتەك: ١-بەقەدەر دووسێ ناولەپ لەکاتی مەڕبڕینەوە خوری وەك قاقۆل لەسەر پشتی مەڕە ساوازێ و بەران و بەرخەمێ و ئەو بەرخەنێرەی کە بۆ بەران دەهێڵدرێتەوە تاکو گەرما ژۆنەبن.

٢-یارمەتی دەرێك

پشتەماڵ: بەشی دواوەی رەشماڵی نۆ کۆڵەکە کە بە پەردەیەك لەگەڵ پێش ماڵ جیا دەکرێتەوە بۆ ژنانە.

- پشکداری کرن: بەشداری کردن.
- پشکادەر هنگێڤ: فعلی متعەدی.
- پشکاسالتگر: فعل لازم.
- پشکان: ١-پشمین: ٢-پشك+ان کۆی پشك.
- پشکاندن: پشکاتین: لێکۆلینەوە.
- پشکاو: ١-دلۆپەك: ٢-فەحس کراو.
- پشکساڵ: فەسل: وەرز.
- پشکفتن: پشکووتن.
- پشکاندن: تەفتیش.
- پشکنین: زۆربەوردی گەڕان.

ئەو کر کارانەی فێسکی پەستاوی کولکەی مێژوویان رێك پشکنیوە.

(شەرەف- ل٥٥٧)

- پشکنەر: موفەتیش: بشکێنەر.
- پشکۆ: ١-پەنگر: پۆلی: ٢-ناوی کوڕانە.
- پشکوان: گوڵ کرانەوە.
- پشکووتن: پشکفتن.
- پشکۆژە: پشکۆ.
- پشکۆ کەتن: پەنگرکەتن: ١-بەگۆڕانی ئاو و هەوا دەڵێن لەکاتی تەواوبوونی وەرزی زستان: کە





وەرزی زستان تەواو بوو هەوا خۆش دەبێ سەرما نامێنێ دەڵێن پشکۆکەت یان پەنگرکەت.

٢-لە کۆتایی چلەی هاوین هەوا دەگۆڕێ بەمەش دەڵێن پشکۆ کەت یان پەنگرکەتن.

- پشکی حەرام: بریتیە لە حەرامزادە.
- پشکێ: پشکەك.
- پشم: کینە: رق: رك: لەدڵەوە تورەبوون.
- پشمل: پشت مل: گێژی مل.
- پشمین: پشمە: پشکان: پژمین: پێکژین: پیرکژنی: هەپشکرن: پیرکژین.
- پشوو: پشی: ١- نەفەس: ٢-ماوە: فورسەت: ٣-سەبر: ٤-ئسراحەت: ٥-راوەستانێکی کەم

"پشوو دەرگا دەکاتەوە" (شەرەف- ل٦٧٨)

- پشووخواردنەوە: پشی خواردنەوە:

واتە (هەناسە —با) وەرگرتن لەکاتی زورنا ژەن، یابلوێرەژەن. زورنا دەژەنی یا بلوێر دەژەنی بەم شێوەیەی خوارەوە پشوو دەخواتەوە.

لەرێگەی کەپووەوە لە دەمێتەوە بایەکە لە کلۆرایی ئامێری فووتێکردن وەردەگرن وەك زورنا، بلوول، دەنگی ئامێرەکە بێ پسانەوە بەردەوام بێت

- پشوو درێژ: بەتەحەموول: پشی درێژ: ملیان: بەخۆویێر: ئارام: بەچیکدانە: دلڤراوان: باڵدرێژ: بەپشوو: بەپشی: دان بەخۆداگر: بین فرە: بین فرەه: مرۆڤی کە بەدرەنگی بێزار دەبێ لەکارکردن و درەنگ تورە دەبێ.

بەپشی بە: بەری خۆفرەهکە.

- پشووسوار: پشی سوار: تەنگەنەفەس.
- پشوو هەڵکێشان: نەفەس هەڵکێشان.
- پشی: ١-پشوو: ٢- پشیلە: ٣-ژەنگی گەنم
- پشی جغارە خواردن: پشوودانی سەپانان بوو دوای دووبەرە دروێنە.
- پشیلە: ١-کتك: پشیك: پیسك: پسیلە: پشی: پشو: پشیلە.

کتکە بۆرە پەیدابوو، دەستیکرد بەمیاو میاو.

(گەدا-ل٦٩)

٢-بریتییە لە مرۆڤی بێ وەفا.

٣-لەبەر ئەوەی چاوی پشیلە شینە مرۆڤی چاوشین بەچاوی پشیلە دەچوێنرێ و دەبێتە نازناوی.

حەسەن کتك: لەبەر چاوشینی وایان پێدەگوت.

٤- لەپەندی کوردیدا.

پشیلە دووگی دیوە: کەسێ دوای تەماعێك کەوتبێ.

- پف: پوف:١- بەدەم فوولەشتێ کردن.

٢-درۆ.

- پفکردن: ١- پفدان: ٢- درۆکردن.
- پفدریاگ: پفدارو: پفداری.
- پفکە: ١- هەڵتۆقین دەست و پێ لەزۆر کارکردن و رۆیشتنی زۆر.

٢- درۆی بکە : لۆخۆت پفکە.

- پلار: پەلار: ١- پارچە دارێکە شوان لە ئاژەڵی دەگرێت و بۆی دەهاوێ بۆ گەڕاندنەوەی.

٢-پەلار: تەوس: تانووت: تەشەر: قسەی بە توێکڵ: توانج: تانە: تیز: لاتاو: قۆپ.

تەوس و تەشەری قسەی بە توێکلی دێهاتییەکان.

(حەمەدۆك -٢- ل٣٣٥)

پێکەنینێکی پڕ تەوس و پڕداخ.

(کوێرەوەری- ل١٥)

- پلار تێ گرتن: پەلار لێدان: توانج لێدان.
- پلان: ١-خوتتە: ٢-حیلە: فێڵ.
- پلان دانان: نەخشە کێشان.
- پلان زان: سیاسی.
- پلاو: پلاڤ: ١-چێشتی برنج: پلاو برنج
٢-چێشتی ساوار (پلاو ساوار)
- پلاوپارزن: پلاوبارزن: پلاوپالێو: پلاوپەز: پارزونگ.
قالبێکی کون کونە برنجی پێ دەپالێون
- پلتە پلت: قسە کردنی ئەو کەسانەی دانی لە دەم دانەمابێ، کەسێك زۆر لەسەر شتێك قسە بکا.
- پلکوپلتور: هەموو ئافرەتی خزمی دایك و باوك.
- پلە: ١-دەرجە: ٢-مەرتەبە: ٣-وشەی بانگ کردنی (پوور).
- پلك: پوور: ١-خوشکی دایك: خاڵەت: خوارك:
٢-خوشکی باوك.
- پلکزا: پورزا: میم زا: میمك زا.
- پلکێ: پوورێ: پلە:
١-وشەی بانگکردنی (پوور):
٢-وشەی بانگکردنی ئافرەتی بەتەمەن:
لە دایکی کیژەم پرسی پلکێ ناگری جووتیاری سێ سەد.
- پلکن: ١-چلکن: دژوین: دژون:
٢-پلکمان: پورمان.
- پلم: ١-عەسەبی: ٢-عەبوس.
- پڵمان: پرتە و بۆڵە: لەبەر خۆ نارەزایی دەربرین.
- پلمەڕوو: بەدرەوشت: بێ ئەخلاق.
- پڵنگ: ١-پلینگ: پرینگ: پەڵنك: پڵپڵی: پالنگ: ئاژەڵێکە لە تیرەی شێرە.
٢-بریتییە لە پیاوی ئازا.
پڵنگێك بوو لەبەر هەزار کەس نەدەپرینگاوە.

(مجیور- ل٣٣١)

- پلۆ: ١-جالجالۆکە: داپیرۆشکە: داپیرۆچکە.
٢-پڵنگی بچووك.
- پلووپا: قودرەت: تاقەت: وزە و هێز.
- پلوور: ١-نەی: ٢-پلوسك.
- پلێت: پلیتە: فتیلە.
- پلیتە: مەرەزی لەشە دراو کەشال و شەپکی لێ دروستدەکرێت.
- پلینانەوە: رزانەوەی میوەی پێگەیشتوو.
- پلیزگرد: پلیسر: پلیسرگ: پەرەسێلکە.
- پلیشانەوە: پان بوونەوە.
- پلیکان: پلەکان: قادرمە: قالدرمە: پەیژە: پێبلقە: پێ پیلکە: نەردەوان: نەردیوان: پیپلکانە: نەردنگ: پێسترك: پەیسك: قاندرمە: پێ پێلکە: پێلکانە: پلەکانە: پلەکان: پلیکانە.
١- لە مالان و بالاخانە لە چەمەنتۆ دروست دەکرێ بۆ سەرکەوتن.
٢- لە دار دروستدەکرێت بۆسەرکەوتن.
کە قایمقام بەپلیکانەکاندا بەسەرکەوت.

(تەنەکە- ل٣٦)

- پنار: بنار: مەنبەع: کان.





- پنتی: رەزیل: قرچۆك.
- پنج: ١-رەگ: ٢-ئەسل: ٣-هەویری کلسی.
- پنجار: گیای وشك:
- پند: کالاسە: قرنە: گەنە.
- پندە: پرتە.
- پندوپیر: جالجالۆکە.
- پندربوونەوە: وشك بوونەوە.
- پندەریسکە: جۆرەتەیرێکە.
- پنك: ١-ماك: ٢-هەدەف: ٣-پارچە.
- پنگ: پونگ: پونگە: پوینگە: گیایەکە گوڵ دەگرێ کیوییە بە تۆورەگ زۆر دەکرێ:
١-بەهێلکەوە ئەخورێ:
٢-بۆ ژانەسك بەکاردێ
لەگەڵ بوونی پونگ و جاترەی کێوی.

(حەمەدۆك -١-ل٦٦)

- پنۆك: ماك
- پنە: خوان: فەرشە: خونە، خوانە:
لەداردروستدەکرێت یا گێچ شێوەی خڕە سێ پێچکەی هەیە نانی لەسەر دەکرێت.
- پۆ: ١-پوود: ئەو دەزوەی لەسەر پانایی بۆ چینینی هەر جۆرە پارچە چنراوێك بەکاردێ.
٢-بەلا
٣-لێ: چڵ: لك.
پۆپساندن: پۆشکاندن: تەجاوزکردن.
پوخ: کولیچەی نیوە رەق بوو.
- پوخە: بێ نموود.
- پووار: پووش: گیای وشك.
- پۆپ: ١-پوپیتەی کەڵەباب: ٢-پرچ.
- پۆپەرەشە: نەخۆشییەکی مریشکانە.
- پۆپیتە: پۆپە: پۆپانە: زیادەگۆشتی سوری سەری کەڵەشێر.
- پوت: ١-زنجیرە: ٢-درۆ: ٣-حەیا.
- پۆتە: ١-گرنگ: ٢-تاقگە.
- پۆتەك: پۆتەلاك: سەروسکۆت: سەر و گوێلاك.
- پۆتراك: پۆتەلاك.
- پۆتین: جزمە.
- پوخت: پوختە: باش: چاك.
- پۆپەی کەڵەشێر: گولێکە جۆری پەرەکەی تۆپەڵە لاسك نەرمە درکاوی نییە بۆنی نییە مالییە و کیوی بە تۆوزیاد دەکرێت.
- پۆپیتەی سلێمانی: پاپی سلێمونی: پەپۆسلێمانکە: پەپولەی سلیمانی: پەپوو سلێمانە: بوو بووکەرە: شانەسەرە: پەشوو: هەپووە: جووبوو: شانەسەرە: پەپووسلێمانی.
- پۆتاری بن شە: لای بنەوەی (شە)ی کارگەی جۆلای کە دووداوی پێوەشۆر بوونەتەوە شەپکەی پێ لکاون.
- پۆڕ: زیرەکەو: زرەکەو: تڤلیك: سوێسکەرەشە: کەناچە: دووراج: مریشکی دەشت.
بالندەیەکی دەشتەکییە لە سوێسکە دەچێت، بەلام گەورەترە و کونجە واتا پنگ پنکەی رەش و سپی پێوەیە دەنووکی کورتە گۆشتی خۆشە لە گوێی ئاو ناو بێشەلاندا دەژی رەنگی نێر و مێی جیاوازە سەری بە پۆپیتەیە چاوی رەشی مێوژییە (١٢) هێلکە دەکات.

٢-پان: پان و پڕ: ٣-قەرەبالغ: ٤- ناو:
- پورتك: عەمامە: جۆرێکە لە پۆشاکی عەرەب.
- پۆڕسپی: ئەختیار
- پۆڕکوور: ١-بەدرەوشت: ٢-پرچ کورت
- پۆرگ: پفکە: هەڵترۆقان: هەڵتۆقان: پوورگ:
پەشام: پەنام:
پیستەی لەشی گیانەوەر ئەستوور پڕ ئاو دەبێ لەئەنجامی ئازاری زۆر یان سوتان پەیدا دەبێ.
- پۆڕی مێ: ڕەنگی بۆ ئەو خاکییە و قاوەییە هێڵی بچووکی لە هەموو لەشی هەیە.
- پۆڕی نێر: ڕەنگی ڕەشە و ڕەشێکی بریقەدار پنك پنك سپی وردی لە هەموو گیانیدا هەیە.
- پۆز پیژین: لووت تیژ: لووت باریك.
- پۆز چەلاك: لووت قولێنگی: لووت بەرانی.
کەپوو بەرانی: بەکەپووی کەسی دەووترێ کە کەپووی وەکو سەری بەران چەماوەبێت.
- پۆزکەپی: دەم و لووت.
- پۆزەوانە: بەلەك پێچ.
- پۆس: پۆست: پێست: پیست.
- پۆست: ١-پارێزگا: پاسگا: پاسگە: مەخفەر
٢-پێست.
- پۆستە: بەرید:
کارگێڕی پۆستە و تەلگرافیش هەموو ئێوارەیەك.
(تەنەکە)
- پۆستەخانە: دائرەی بەرید.
- پۆستەچی: ئەوەی پۆستە دابەشدەکات.
- پۆش: ڕەشانی: مووڕەش و سپی تێکەڵاو.

- پۆشاك: پۆشەنی: جل و بەرگ.
- پۆشتە و پەرداخ: بەبەرگ بار: پۆشتە: پەرداخ:
پۆشتە و پەرلاخ: مرۆڤی ڕەنگ و رووخۆش و تێر و جلی جوان و پاك و خاوێن لەبەر کراو.
- پۆشی: ئافرەت بەکاری دێنن پێنج جۆرە پۆشی ئافرەت هەیە کە هەریەکە ئەرکی خۆی هەیە بەشێوەی جیاواز سەربەخۆ پۆشەکانیش ئەمانەن:
١-دەسماڵ:
٢-سەرپۆش:
٣-تارای زەرد یا سووری بووکێنی:
٤-تارای ئەورووپی: ٥-پێچە.
- پۆشین: لەبەرکردن.
چیاکان تارای زێڕینیان پۆشی.
(تەنەکە- ل٧٥)
- پۆغین: سەمەنی.
- پۆل: ١- سەف: ٢- فەوج: ٣- ئامرازی گەل:
پۆلی باڵندە.
٤- پشکۆ:
تەشقی هەوا: پشکۆی هەوا: تەوژمی هەوا.
بەرزونزمی ئاو هەواو لەساردی و گەرمیدا.
- پۆیلانە: ١-دیاری دەدرێتە بووك.
٢-جۆرێکە لە چەکی ژنان.
- پۆیی: ئاسۆیی.
- پوو: پووك.
- پوواز: هۆرە: قەڵەش.
(دار پوازی لە خۆی نەبێ عومری هەزار ساڵە)
(پەند)





- پووەدای: دەرگەداخراو.
- پواو: مردە: بەری رزی.
- پوورە: شەڵخە: شەڵغە: شەرغە: زەیی: پۆلی مێشی هەنگوینان.
- پووز: بەلەك.
- پووزە: نابووت: ١-مرۆڤی بەژن کورت و لاواز.
٢-ئاژەڵی جەستە بچووکی لاواز.
- پووش: پوار: پیش: پویش: گیای وشك
ئەو گۆڵاوانەی بۆنی گەلاوپووش و پەلاش و خاکی رزیویان لێ دێ. (حەمەدۆك- ل٩)
- پووشانە: ١-جۆرە باجێك بووکە خاوەن موڵك لەئاژەڵداری لادێی وەردەگرت.
شێخ هەڵپێپچان کە سەد دینار پووشانەم بدەنێ.
(مجێور- ل١١٩)
٢-ئەو خەرج و باجە نەغدییە بوو عەشیرەتەکان دەیاندا دەوڵەت کە لە هەر سەرێك لەئاژەڵ و جۆری ئاژەڵ وەردەگیرا.
- پووشپەڕ: مانگی ئاب.
- پووشکە: لاسکی: گیای وشك بوو.
- پووشکەکردن: پووشکە کۆکردنەوە بۆ سووتەمەنی.
- پووشکەکەر: ئەوەی پووشکە کۆدەکاتەوە.
- پووشکوتن: پشکووتن: پشکەفتن.
- پوشڵ: نەفرەت: لەعنەت.
- پووشۆ: ناوی کوڕانە.
- پووشین: چارۆگەی ڕەشی سەری ئافرەت.
- پووك:١-پدو: ٢-بەتاڵ: ٣- لافاو.

- پووکە: جۆرە قەمیشێکە مەیلەو نەرمە بۆپیکی زورنا و دووزەلە بەکاردێ.
- پوول: ١-پارە: ٢-مۆری بەنامە و سکالا.
- پوول گۆڕەوە: سەراف.
- پوولە: جۆرە ماسییەکە.
- پوولە سوورە: فلسی سوور.
- پوولەکی: بریتییە لە قرچۆك.
- پوونگال: ١-چەق: ٢-کۆڕ.
- پە: ١-بە: ٢-وشەی سەرسورمان.
- پەپە: نان بەزمانی مناڵان.
- پەپووك: ١-بەربەخت: ٢-پەپووسلێمانی:
٣-بێدەسەڵات
٤-پەککەوتوو
- پەپۆکە: ئەستوورکی بچووك.
- پەپۆکە خواردن: پەپکە خواردن
خڕبوونەوەی مار بە دەوری خۆیدا.
- پەپوولە: پەروانە: پەلاتینك
ئەوشەمع و من پەروانە بووم
پیاڵەی دەستی کارخانەبووم
- پەت: لەبەن دروستدەکرێت بەن هەر ڕەنگ ناکەن هەر بە ڕەنگی ساکاری خۆی یان ڕەشێکی تاڵ یان زەرد... هتد دەیهۆننەوە پێدەڵێن (پەت) زۆر جۆری هەیە وەك:
١-گوریس: پەتێکی خڕ و درێژە جاران بۆ شەغرە و جەنجەڕ بەکاردەهات.
٢-کەژی: لە موو دروستدەکرێت پەتێکی پانە چوار پەنجە پان دەبێ.

٣-بەنقادەو گولە وسار:
وەکو گوریس وان، بەڵام باریك تر و کورتترن.
٤-دەسترازە: دەس رازە: وەکو کەژی پانە، بەڵام بچووکترە و رەنگاورەنگیشە بۆ لانك بەکاردێ.
٥-دۆخین:
پەنجەیەك پانە.
٦-سەرکەلە.
- پەتبڕ: بریتییە لەیاخی.
- پەتپساندن: یاخی بوون.
- پەتك: جۆرە گوریسێکە لەسێ تا ئەستوورترە.
- پەتکردن: پەتککردن
- پەتا: پەتۆ: درم: درمانە: درمی: تەنینەوە: گرەوە: نەخۆشی پێ درێژ.
- پەتاتە: گازوولە: خڕکە: گازوولکە: سێوکە: سێفەزەمینە:کەرتووب: سێوە ئەرزیلە: یەرئەلماسی: کارتۆل: یارلماسی: کرتوپە.
بەتۆ دەچێنری لەژێر زەوی گەورە دەبێ خواردنێکە گرنگە.
- پەتۆنیا: ناوی گوڵێکە پەڕەکەی وەك دەم و چاو وایە لاسکی نەرمە و دڕکاوی نییە بۆنی هەیە ماڵییە بۆجوانی بەکار دەهێنرێ.
- پەت پسێن: پەتك پسین.
بریتییە لە دنیادیدە و تێ نەوکەوتوو.
- پەتڵە: ساوار: ساوەر.
- پەتوو: بەتانی:
بۆنووستن و لەسەر دانیشتن بەکاردی.
- پەتی: ١-خالس: ٢-رووت.
- پەتیارە: شێت
شێتی پەتیارە! کوڕەکە قاچاغە: جارێکی دیکە ناوی حەمەدۆکت بەدەم دانەیە.
(حەمەدۆك -٢- ل٢٣)
- پەچە: ١-پێچە: گەز: حیلی: کەتان: رێپۆش: رووبەند: رووبەن: رووپۆش: چارەپۆش: خافك
شێوە لاکێشەییە (٠,٤٦×٠,٤٥م) لە ئارمووشی رەشی تەنك و شانەیی دروستدەکرێ، پێش ئەوەی پێچە لەسەر بنێن هەردوو لچکی سەرەوە بەدەرزی لێك دەدەن پێچە بەتەواوی دەم چاو دادەپۆشی.

کۆڵان بەکۆڵان — جادە بەجادە
شەرمی پێناوێ — پەچەکەت لادە
ئەو پەچە و رووبەند و چارشێوەی نەدیوە تەنکی تۆ
(تاریك و روون- ل٣٤)
ئەرێ رووبەندت لادە چ وادەی شەرمە.

٢-لەشەو کەژادا ئێواران ران نەدەهێنرایەوە بۆ ماڵەوە، بەڵکو بۆ شەو بە زاخەولێژییە کەوە مۆل دەدرا بەم شوێنانەیان دەوت (پەچە).
- پەخشان: ١- پروسان: ٢- ناوی کچانە.
- پەخشانی کوردی: پروسانی کوردی.
- پەخشکار: پەخشکەرەوە: وێژەر: موزیع: ١-خوێنەری رادیۆ: ٢-خوێنەری تەلەفزیون.
- پەراسوو: پاراسوو: نێوان زگ و پشتی بوونەوەر
- پەراغ: گیا و قەسەل لەشوێنك زۆر بێت لەوەرێکی باشی حەیوان بێت.
- پەراگەندە: پەرگەندە: پرژوبڵاو: پەرش وبڵاو.
- پەرتی و پەرێشانی: سەرلێ شێوان.





- پەرچڤان: پاچڤان: وەرگێڕ: زمانزان: ئەزمانزان: پێچڤان: موتەرجیم.
١-گۆڕینی هەرنووسینێك بۆ زمانێکی تر.
٢-قسەی کەسێ گۆڕین بۆ سەرزمانێکی تر.
- پەرچقاندن: پەلخاندن: پانکردنەوە.
- پەرچەم: مووی سەرکە بەسەر نێوچەواندا دێتەخوار: ئالا.
- پەرچەم سوور: ئافرەتی پەرچەمی سووربێ.
- پەرداخ: ١-حازر: ئامادە: ٢-بیراز: ٣-بەرداخ.
- پەرداخ کردن: سەقل کردن.
- پەرداخ دار: سەقل کراو.
- پەڕدار: تەیر.
- پەردەرپەی: پەل دەل پەی.
- پەردەپلاو: جۆرە خواردنێکە.
- پەردەناس: زانای مۆسیقا و ئاواز.
- پەردژ: بوار: مەجال.
- پەرزەوان: پارزونگ.
- پەرستەر: عەبد.
- پەرستراو: مەعبود.
- پەرستگا: مەعبەد:
- پەرستن: عیادەت.
- پەردەی بووك: لەکوردەواریدا ئەو ژوورەی بۆ بووك دەرازێتەوە پەردەیەکی تێدا دەگیرێتەوە. ئەمە پێی دەڵێن پەردەی بووك. لەبەنرخترین قوماش وەك حەوت رەنگ یا جاجمی بەنرخ و نایاب دەبێ بۆ ماوەی حەفتەیەك یا چل رۆژ پەردەکە دەمێنێتەوە ئەمە لەوانەیە لەوەوە کە هەر ماڵێك لەکۆندا ژوورێکیان بووە بۆ نووستن ئەو پەردەیە لە ژوور گیراوەتەوە بۆ بووك و زاوا بۆ ئەوەی لە ئەندامەکانی ماڵەکە جیاببنەوە.
- پەرژین: ١-تانۆك: پەرچی: هەمان پەرچین: هۆلك: پەرگین.
دڕك و دارە لەدەوری باخچە و رەزدادەچەقێندرێ بۆ پاراستنی لە ئاژەڵ.
٢-شوورە: ٣-ناوی کچانە.
- پەرستن: پەرەستن.
- پەرشەو: پلهوی: پەهلەو: پەهلەوی.
وشەی (پەهلەو) ئەم لە وشەیەکی کۆنی چەرخی ناوەندی زمانە ئێرانییەکانە لەوشەیەکی ئێرانی سەرووی چەرخی دێرینی ئەم زمانانە کەوتۆتەوە کە (پەرشەو) بووە لەمحەکی ئاڵوگۆڕی دەنگ و شێوەی زمانی و ماوەی زەماندا (ر) کەی بووە بە(ل) و (ث) کە بە (ه) و بووە بە (پلهووی) دیسان دووبارە لەمحەك دراوەتەوە و ئەم دیو و ئەو دیوکراوە و بووە بە (پەهلەو) وشەی (پەرثەو) بەپێی زۆربەی ئارا ناوی ئەوتیرە ئێرانییە بووە کە لەناوچەی خۆراسانەوە تاکو ئازەربایجان دەگرێتەوە کەمیلیی کۆن دەبێ بەشێکی بێت و کوردستانی ئەمڕۆ دەکەوێتە دیوی رۆژئاوای... پەهلەوی زمانی پێنج شاری ناسراون لەئێراندا کە ناوچەی پارتیاو کوردستان دروستدەکەن (اصفهان، وەری، هەمەدان، ماه نهاوند و ئازەربانجان و لەبەر ئەوەی ئەم زمانە واتا لەدەوری ئەشکانییەکانەوە کە لە ناوچەی پارتیاو وڵاتی (پەهلەو) دامەزراوە ناوی

ولاتەکە و نەتەوەکەی بەسەردا ساغ بۆتەوە و ناونراوە (پەهلەوی).

پەرکەم: ١-فێ: خوو: گەشکە: تەپ:
٢-موسیبەت: ٣-لەناکاو: ٤-دڵ وەستان:
٥-مردنی لەناکاو.

- پەرکەم دار:
خووگر: فێدار: خوودار.

- پەروەر: ئەڤیندار.
مللیەت پەروەر: ئەڤینداری مللەتی خۆیە.

پەرەکەر: ١-ئامێرەکە لەکارگەی جۆلایی کە دارێکی (٠,٧٣٠م) درێژە و لە هەردوو سەرەوە بەداری قیت لەدەفە دەخرێ و لەولاوەش بەدارێکی ترەوە دەلکێ بۆ هێنان و بردنی دەفە.
٢-بەو کەسەی کە بە پەرەکردن هەڵدەستێ.

- پەرۆنان: سەرنان: سەرهەویر: سەرەویرك: خوانچە پارچە پەرۆیەکی لاکێشە یان چوارگۆشەیە بەسەرنانی دادەن.

- پەرە: بەیارێکە لەنێوان دوو خەتە جووتدا بەرگاسن ناکەوێت بە هەڵنەقەندراوی بمێنێتەوە.

- پەری: ١-زەری: ٢-ناوی ژنانە: ٣-بۆ جوانی ئەندامی لەش بەکاردێ پەری ئەندام: ئەندامی جوان و رێك.
٤-لەگەڵ: ٥- جوان: ٦-لەبەردڵان: ٧-ئاوازی گۆرانی کوردییە هەی پەری عومرم پەری.

- پەرێز: ١-کێشە: جار: جێ دەغلی درواو: ٢-ناوی کورانە.

- پەرێزی پاك: ١-پەرێزێك گوڵە گەنمی لێ بەجێ نەمابێ لەکاتی دروێنەدا.
٢-کەسێك رابردووی پاك بێت.

- پەرێزی پیس:
١-پەرێزێك لەکاتی دروێنەدا سەپان گوڵە گەنمی لێ بەجێ مابێ و نەی دووریبێتەوە.
٢-کەسێك رابردووی پیس بێ.

- پەرپەر: گوڵێ پەرەکانی لێك بووبێتەوە.

- پەراور: پەرەندە: باڵندە: تەیر: مەل.

- پەرگ: بەنێکە لەخوری دەرێسرێ و سەر گلاشی پێ دەچنن.

- پەرگال: خانەوادە: بەرەباب.

- پەرگەنە: ١-پەرگەندە:
٢-ناحیە.

- پەرگەنەدار: مودیر ناحیە ئەو کەسەی کاروباری شارۆچکەیەك بەرێوە دەبات.

- پەرگماندن: جەمع.

- پەرگهین: رێکەوت.

- پەرموون: بەروا لەسەرخۆکردن: پشت بەخۆبەستان.

- پەروو: دیاری.

- پەروا: خۆف: ترس.

- پەروانە: ١-پەپوولە: ٢-ناوی کچانە.

- پەرۆش: خەم.

- پەرۆشدار: بەپەرۆش: خەمبار.

- پەرۆك: پەرۆ: کنجك.

- پەرگە: دەزوە.





- پەرەتاس: ریشەی تاس: ئامێرێکی مۆسیقای کوردەوارییە بریتییە لە دوو دەسکی داری لووس و رێك و درێژی هەرداری دەوری (٢٠)سم لە کۆتایی سەرێکی هەریەکە لەو دووداره هێشوەك زنجیرکە (پەرەتاس) زیون و شۆڕ بوونەتەوە بەهۆی بزمارێك کە لە کۆتایی دەسکە دارەکە دراوە و سەری قرتێنراو، کراوتە ئەڵقە ئەو زنجیر بەدارەکەوە لکێنراون.

- پەرەچی: پەرەکەر: هەلاج: پەرەوان.

- پەرەناش:
هەڵدانەوەی ئەو بەشە قرشەیە کە لەکاتی گێرەکردندا بەرەو دەزوە پەرپوە و بڵاوبووەتەوە.

- پەرەسێلکە:١-پەرەسلێرکە: بالی سوولە: پلیزگرد: پلیسر: پلیسرك: پلیسرگ: پەرەئەسترێلکە هەچن چك: حاجی رەشك: پایزگەرد: پلسکر: زیقاوە: مەقسۆك: سیپروسنەك.
پەلەسیرکە: باڵندەیەکە بن زگ سپی و باڵ و پشتی و سەری رەشە و دەخوێنی گەرمێنی و کوێستان دەکات لە بەهارێ دێتە کوردستان و لە کۆتایی پاییزدەڕوات.
٢-بۆ پێوەری کەژ بەکاردێت کە هاتەوە کوردستان لە سەرەتای بەهاردا نیشانەی ئەوەیە زستان کۆتایی دێت.
٣-لە کوردەواریدا هێلانە تێکدانی پەرەسێلکە بە باش نازانن و تووشی نیگەبەتی دەبن.
چ هێلانە پەرەسێلکەم تێکنەداوە چ کۆ لکەداری سەرچاکانم نەسوتاندووە تا ئەوها ئاوقای نوسکۆیانم بکەیت. (غەوارە- ل١٨)

- پەریجار: ئەغلب: ئاغلەب: زۆرینە.

- پەریرەش: ١-جۆرەگەنمێکە: ٢-پەریرەشك.

- پەریروو: پەریروخسار: پەریی پەیکەر.

- پەریز: قادرمە: پەیژە.

- پەریزاد: ١-نەوەی پەری: ٢-ناوی کچانە.

- پەرین: ١-هەرزۆقینەوە: هەرزەقینەوە.
٢-گلان
سوار هەتا نەپەرێ نابیتە سوار. (پەند)

- پەز: مەڕومالات: پەس: رەشان و سپییان.

- پەژاج: مامان: ئافرەتی یارمەتیدەر لەکاتی ژنێ منداڵی دەبێت.

- پەژاجی: مامانی.

- پەژارە: ١-غەم: ٣-ناوی کچانە.

- پەژەل: درك: درو: چقڵ.

- پەژە لاندۆك: نورە: دەرمانی حەمام.

- پەژم: خوری.

- پەژن: سەوت: دەنگ.

- پەساپۆرت: پەسەپۆرت: رارەوی نامە: رێرەو: تێپەرنامە.

- پەسادان: پاسادان: تەحقیق: لێکۆڵینەوە.

- پەسادەر: موحەقیق: ئەو کەسەی لێکۆڵینەوە دەکات لە تاوانبار.

- پەسار: ١-بەندەر:
٢-پەسارگە.

- پەسارگە: ١-پەسار: ٢-لوتکەی چیای لار.

- پەسەن: پەسەند: پەسند.

- پەسپەسەکۆلێ: جالجالۆکە.

- پەست: ١-نزم: ٢-غەمبار: جۆرە ئۆتۆمبێلەكی كۆنە. قايمقام بەخەم پەستييەكەی ملی لاركردەوە.

(تەنەكە-ل١٠٧)

- پەستبوون: كارلێكردن: قەلس بوون.

چەتۆ لە دڵەوە بەم قسەيە يەكجار پەست بوو.

(غەوارە- ل١٤٥)

- پەستكردن: ئيزعاج كردن.

- پەستان: پەستانەوە: پەستاوتن.

- پەستەك: ١-پەستە: پەسەك: چۆخ: لەمەرەز دروستدەكرێ زۆر ئەستوورە لەپشتەوە تاناوشان لەبەرەوە بەسەر هەردوو گۆی مەمكدا تاسەر ناووك هاتۆتە خوار لەپشتەوە دووتەختەيە تاسەر كەمەر هاتووە وەكو پێشەوە.

٢-بووەتە نازناوی ئەو كەسەی زۆر پەستەك لەبەر دەكات (محەمەد پەستەك): پەستەكی زۆر لەبەر دەكرد.

- پەستراو: پەسترای: پەستوو.

- پەسخەل: لاساكەرەوە.

- پەسلان: رۆژی قيامەت.

- پەسند: ١-گوڵێكە پەڕەكەی وەك گوڵە مێخەكەماڵی و كێوييە بۆ جوانی بەكاردێ.

٢-باش: چاك: سەرپلی.

- پەسندكردن: بەچاك زانين: راڵیێ بوون.

- پەسيرە: پەسييلە: خرورە: خوورە: خوورگ: قۆرە: هاڵە: پەرسيلە: بەرسيلە: بەسيرە: بێ سيرە: قۆرن: هاڵەتری: ژۆر: بێسويرە.

تادەڵێ بەرسيلە ترێ پێ دەگات.

(پەند): واتە درەنگ قسە دەكات.

سەبرسەبر بەسيرە دەبێتە حەلوا: واتە پشودرێژی لەكاراندا پێويستە.

- پەسيو: باهۆر: هەلاٚمەت: هالەومەت: زەكەم: نەخۆشييەكی كاتييە و سێ رۆژ دەخايەنێ تا سووڕی ڤايرۆسەكە تەواو دەبێت.

- پەسيسە: برنجی كولاو لە زۆر كوڵانی يەكتری بگرێت.

- پەش: بەش: پار

- پەشتەماڵ: خاولی

تەنراوێكی ئەستوور لە حەمام بەكاردێ بۆ وشك كردنەوە.

- پەشتەپەشت: هاتوچۆ: هاتوچو.

- پەشك: پشك.

- پەشم: خوری.

- پەشمە: شەروالی خوری.

- پەشمينە: قوماشی حەريری تەنك

ئۆخەی دەسرەو پەشمينە

وەختی با دەيشەكێنی.

(گۆرانی فۆلكلۆر)

-پەشۆكان: سەرلێشوان: بگرەوبەردە: شپرزەيی: نيگەرانی: پشێوی: پەرێشان: تێكچوون: ئاشەڤ: شڵەژان: هۆژان: هەلاجان: شلووقيان.

رۆژی يەكەم بەجارێ پەرێشان ببوو...

(تەنەكە- ل٩٣)





- پەشۆكاو: شڵەژاو: شەپڕێو: شێواو: نيگەران: پەرێشان: پەشێو: دەستەپاچە: سەخڵەت: نامااز: شڵەژاو.

- پەشێمان: پەشيمان: پەژيوان: ژيوان: پشێمان: پۆشمان: پۆژما: پۆژمان: پاشگەز: ژيڤان: ژووڤان: ژئولا بەرێ پۆشمان بووەوە... (شەرەف- ل٥٦٤)

ئەوەی ئەو قسانەی دەكرد هەرخۆت بووی ئێستا پەژيوان بوويەوە... (حەمەدۆك- ل١٨)

بەزمان لەكارەكەی خۆی پەشيمان بێتەوە

(تەنەكە- ل٦٠)

بەلاٚم دەگەيشتە دايەرە لەبڕيارەكانی پاشگەزدەبۆوە.

- پەڤ: بەيەكەوە.

- پەڤ كەتن: دەعم: لێكدان.

- پەقاندن: تەقاندن.

- پەقاو: پەقيو: تەقای: پەقيای.

- پەقرەج: پەقلەج: سەتڵ: ستل.

- پەقيژۆك: ١-قونێر: دۆمەڵ

٢-بلقی سەرئاو.

- پەلاپيتكە: پەلەپتكە: پليتكە: پێتكە.

پەنجەی لەسەر پيتكە بوو.

(تەنەكە- ل١٢٥)

- پەكان: رمان

- پەك كەوتن: پەككەتن.

- پەككەوتوو: پەككەتی.

- پەكوو: پەككوو: پەكووپۆك:

وشەی سەرسوڕمان

- پەل: ١-دەست: ٢-پێ: ٣-ئەندام: هەرچوار پەليان بەست.

٤-پارچە: ٥-بەرد: ٦-پەنگر: ٧-پەلكی داری: ٨- بريتييە لە (٣٠) پێش مەرگە و ئەوەی سەرپەرشتيان دەكات پێی دەڵێن (سەرپەل).

- پەلاتە: عەريزە

- پەلاتەمان: ئەنجوومەنی وەزيران

- پەلاختن: ريسواكردن.

- پەلاٚش: پووش: گيای وشك بووە.

- پەلامار: هۆمەن: هێرش

- پەلاگر: ماشە: مقاش

ئامێرێكی سادەی پەنگركێشانە تاماشە هەبێت دەست نەسوتی.

- پەلاميز: پەلەميزە

- پەل بازی: مەڕی قولەكە دووپەل يان يەك پەل سپييە يان ماك ماك سپييە جاری وا هەيە بن زگ و گوانيان سپييە.

- پەلپ: ١-ئەنجەت: ٢-راز:

- پەلپ گر: ئەنجەت گر

- پەلپ گرتن: ئەنجەت گرتن

- پەڵچقاندن: ئيهانە: ريسوا

- پەڵداری: پيلداری: شيردانە منالٚ لە پەلی ئاژەڵەوە ئەگەر ژنەكە هيوای منالٚ بوونی هەبووبێ.

- پەلك: ١-گەلاٚ: ٢-زبڵ خانە.

- پەڵك: ناوی دارێكە.

- پەلكۆ: پەركۆ: كوتانی ساوار

تاپەلكەكەی فرێ ئەدات.

- پەلدانك: كوراسە
- پەلساندن: پالْكردنەوە
- پەلكە رەنگینە: پەلكەزێرینە شەبەنگە بەرۆژ سەوزوسیل: سیمینەوزرینە: كۆلكە زێرینە: كەسك و سوور: پرچی ئایشە و فاتمە: چاوی كەوت بەكەوانەیەكی سەوز و سوور و هەم رەنگ پەلكە زێرینەیەكی زێرینی جوان.
(ئاشتی- ل٥٠)
- پەلكەمێو: گەلاْمێو.
- پەلگرك: پەلاگر: ماشەی بچووك.
- پەلم: نەفرەت: لەعنەت: دوورخستنەوە لە خوا.
- پەلوپۆ: پەروپۆ: ١-هێز: تاقەت: ٢-لق.
خەلكی ئەم ناوچانە بەجۆرێك چەوساندەوە كەلە پەروپۆی كردنەوە... (شەرەف- ل٥٥٦)
- پەلۆولە: جۆرە چێشتێكە
- پەلە: ١-ماك ماكی سپی كەلەلەش پەیدادەبێ ٢-بەبارانێكی تێكرا دەلێن كە زەوی وەك رەبازلێ بكات. پەسندترین كاتی پەلە مانگێك پاییز بمێنێت
- پەلەبزۆت: سەركە بزۆت: پارچە دارێك لایەكی سوتابێ.
- پەلەپیسە: كرمێكی رەشی بچكۆلەیە لە سەر پەلكەكانی دەغل دەدات و دەیخوات پەلكەكانی كورژ و وشك دەبنەوە.
- پەلەپەل: عەجەلە: خێرا
- پەلە دەولك: دووپەلەدارن درێژیان (٣٠-٤٠) سم دەبێت ئەم سەرو ئەو سەریان كونە و تیز و فیز بەبزمارێك لێك دراون بەخرێنە موو یان سیرمە هەرقولفەیەكی دەولكەكە لە كونێكی پەلە دەولكەكە دەیەخرێت.
- پەلەقاژە: پەقاژی: لنگە فرتێ
١- قاچ و دەست جولاندن زیاتر بۆ ساتی مەرگژك بەكاردێ.
٢- بالندەیەك كە سەر ئەبردرێ دەست بە پەلە ئەكات.
- پەلەواژە: سەرەو خوار: ئاوەژو
- پەلەكوتە: پەل وەشاندن:
گیران و لەپ لەعەرددانی كەسێك.
- پەلەكەتن: پەلەدان: زەوی رەباس بوون لە ئاوی باران.
- پەلە هەور: پارچە هەور
یەك دوو پەلە هەوری پەراوێز سورمە بە ئاسمانەوە بوون.
(تەنەكە- ل٧٥)
- پەلەی گولالە: كۆمەلێ گولالەی
زۆر لەنزیك یەكەوە رواون و فەرشێكی پر گولۆگولزار.
- پەلەی یەعقووب ئاغا: باشترین پەلەیە لە ناوچەی دەشتی هەولێر ئەمەش بەم شێوەیە ولاخ لە دوای باران بارین لەناوكێلگەدا بڕوات بەسەر جێی سمەكانی پڕئاودەبێت یا گۆزەیەك لەبەر باران بێت تا پڕ ئاو دەبێت.
- پەمۆ: پەمبو: پەمگ: لۆكە: پەممە: پەمە: لۆكە: پەنبو: پەمۆ.





بەتۆو دەچێنرێ تاپشتێن بەرزدەبێتەوە گەلای كەمی پانە گولێكی شین كار دەرئەكات گولەكە ئەبێت بە قۆزاخە تاسەرەتای پایز قۆزاخەكە دەم ئەكاتەوە ناوەكەی پڕەلە لۆكە ئینجا لۆكەچن ئەیچنێتەوە.
ئەوی عەمباری شای پڕكرد لە پەمۆ.
(تاریك و روون- ل٦٦)
گشت پەمگەكەی بەمێ ئینجا رزگارم تێ.
(گەدا- ل٦٦)
لۆكەو كونجی و بێستان كردرابان و گوندنشین دەم كوت كرابان. (تەنەكە- ل٤٤)
- پەن: ١-پەند: پەنگ: قەبات: كاری خراپ و ئابروبردە.
پەنا: پەناگا: پەسیو: سەدە:هۆكان: دالدە: پەسار: شوێنی حەوانەوە.
لەوكاتە دا خۆیان لەپەنا داران مات كردبوو...
(بۆرە- ل٥٣)
- پەنابردن: هانا بردن: هاواربردن.
لەدوای ئەوەی كەمیرەكانی كوردستان پەنایان بەعوسمانی برد. (شەرەف- ل٥٥٥)
- پەنابەر: پەناهەندە: پەنابردوو: هانابەر: هاواربەر: پەناهەندە: پەناهێناو: پەناگرتوو: پەناگر: مەكۆ گرتوو.
- پەنج: پێنج
- پەنجەرە: پەنجێرە: پەنجەر
- پەنادەر: ئەو كەسەی پەنابەر ڕادەگری و یارمەتیان دەدا پێشودەری هەژاران پەنادەری بێچاران.
(شەرەف- ل٧٢٦)
- پەنجەی خانم: گولێكە پەرەكەی وەك قۆتاك تاكە لاسك نەرمە و دڕكاوی نییە بۆنی هەیە مالییە و جۆری هەیە بۆ جوانی بەكاردێ.
- پەنجشەمە: پێنج شەم: پەنشەم.
- پەنج كەلە: پەنجەی گەورە: كەلەموست.
- پەنجك: ئەنگوست: هەنگوست.
- پەند: ١-ئامۆژگاری: ٢-تەلقین: ٣-عیبرەت: ٤-موسیبەت: ٥-فێل: حیلە
- پەندی پێشینان: قسەی پیروپێشینان: پێشونان: گوتنێن پێشینان: وتەی مەزنان: وتەی بەجێ: گوتیا پێشینا: مەسەلەی پێشینان: بێژوپەند: پیروپێشینان دەلێن: باپیران گوتویانە: قسە قوتان: قسەی باڤان: گوتنێن پێشیا:
بریتییە لەرستەیەكی ماناداری كورت، زۆربەی كێش و سەرواداراە لەڕووی زۆری مانا و زۆری بەكارهێنانەوە توانایەكی زۆری بۆرازاندنەوەی قسە هەیە شاكاری گەلن، گەل دروستی كردون ژیانی خۆیی پیشاندەدات لەهەر پارچەیەكی لەپارچەكانی كوردستان ناوێكی تایبەتی هەیە، ئەم ناوانە وەكو ئەمەی سەرەوە لەڕووی روخسار و دیمەنەوە لەیەك جیان، بەلام لەناوەرۆكدا هەموویان یەكن بۆیەك مەبەست بەكاردەهێنرێن ئەم جیاوازیی (ناو) لەئەنجامی جیاوازی ئەو دیالێكتانەیە كەگەلی كورد لە هەر لایەكی نیشتمانەكەیدا قسەیان پێ دەكا و ئەمەش لە ئەنجامی جیاوازی باری ژیانی ئابووری (سیاسی) كومەلەوە پەیدابووە. پەند لە

کوردەواریدا بەو قسە بەمەعنایە دەوترێ کە هەمیشە بۆ بتەوکردنی قسە یا بۆ روونکردنەوەی بابەتێك یاوەك خوێ بکرێتە چێشتەوە ئەهێنرێتەناوەوە و ئەوترێ و مەرجە خاوەنی دیار نەبێ وەك:

قسە هەزارە دووی بەکارە: واتە یان ئا یان نەء

برا لەپشت برابێ مەگەر قەزا لە لای خوابێ: واتە یەك گرتن و تەبایی مەرجی سەرەکییە.

زورنای بە برای بێ لێو لێدەن: واتە کارێك بدرێتە دەست کەسێ کە شارەزایی لێ نەبێ.

کەس نەبێ رەجەب سەرپاڵەبێ: کەسی نەزان بکرێتە خاوەن پلەوپایە.

- پەنگ خواردوو: پەنگانەوە: پەنگاو خواردنەوە.
- پەنگر: ١-پشکۆ: ٢-تەشەق.
- پەنگرکەتن: پشکۆکەوتن
- پەنگرگر: ماشە

ئامرازێکی لە پلێت دروست دەکرێت پەنگری بێ دەگرن.

- پەنگری ئاوکەوتن: واتە ئاو گەرمی و ساردی دەگۆرێ.
- پەنگری زەوی کەوتن: زەوی گەرم دادێ ئەمەش لە (١٥)ی مانگی رەشەمە دادەکەوێت دەکەوێتە حەوتەی (خدر).
- پەنگری هەواکەوتن: لەحەوتەی (پیت) دەکەوێت و هەوا دەگۆرێ و لەیەکەم مانگی رەشەمەیە، هەوا دەگۆرێت.

- پەنمان: پەندمان: ئاوسان: ئەستووربوون: پەنماو: پەندماى: پەنمیگ
- پەنهان: نهێنی: پەنێ
- پەنیر: دەڵەمەی ناو جۆرکی گوشراو

کە تەماشای کرد نان وپەنیرێکی باشی تێدایە...

(گەدا- ل٨٧)

- پەهـ پەها: پەهپەهـ: بەهـ بەهـ: وشەی سەرسوڕمان بۆ خۆشی.
- پەهڤان: حەرەس: ئاگادار لە دەوروبەر: ئاگادار لە ولاتی.
- پەهن: پان: پۆڕ
- پەهنایی: پانایی
- پەهناڤ: زۆنگاو: زۆلگاو: زەلکاو.
- پەهیز: پاییز: وەرزی دوای هاوین.
- پەهێرۆك: جۆرێکە لە گۆرانی
- پەهنەك: پێیەك: بێلاقەك
- پەی: ١-دوای: ٢-پێ: پا
- پەی پێ بردن: شك: گومان بردن.
- پەیا: پەیدا:
- پەیابوون: پەیدابوون.
- پەیاکردن: پەیداکردن.

بۆپەیداکردنی پارووە نانێکی بێ منەت ناچاربوو... هتد (گەدا- ل ١٣)

- پەیاپەی: پەی پەی: پیاپەی: پەیتاپەی: یەك لەدوای یەك.
- پەیا بووما: دابەزیمایە.
- پەیابوو: ١- پەیدابوو: ٢-دابەزی بوو.





- پەیاکربوو: دای بەزاندبوو: دەستی کەوتبوو.
- پەیام: ١- خەبەر: ٢- نامە:

٤-ناوی کچانە.

پەیامبەر:

- پێغەمبەر: پێخەمبەر: هەواڵ بەر: پەیام گەیێن.
- پەیتا پەیتا: پەیاپەی: یەکبینە: بەردەوام: بێ پچڕان.
- پەیت و پۆڕ: توندوتۆڵ: دژی شل و شەویق.
- پەجە: قادرمە: پەیژە
- پەیجۆر: کەمین: خۆداگرتن لە دوژمن
- پەیچێش: لەبەرچی
- پەیچەل: قسر: پەرك: زڕ: ژنێ مناڵی نەبێ: نەزۆك.
- پەیدا: پەیا.
- پەیداکار: کاردۆزەروە: زۆرکاسب
- پەیداکردن: پەیاکردن.

... بەزەحمەت پەیدایان دەکرد...

(گەدا- ل١٠٠)

- پەیدەرپەی: پەی دەل پەی: پێڕ-پێڕا
- پەیرا: پاش ئەوە
- پەیرەو: پەیرۆ
- پەیژە: قادرمە: پلیکان: پێسترك: پێل پێك
- پەیژەی مۆسیقا: زنجیرەیەك ئاوازە و لەحەوت ئاواز پێکهاتووە و هەشتەمینی ئەبێتە وەڵامی ئاوازی یەکەم هەروەها مەرجیشە لەبەرزی و نزمیا تەرتیبی پەیژەی هەبێ.
- پەیخام: پەیام

- پەیخام بەر: پەیامبەر
- پەیڤدار: قسەکەر
- پەیڤین: ئاخافتن: قسەکردن
- پەیك: تەتەر: شاتر: پۆستەچی: چەپەر: نامەبەر: نارده: قاسید: چەپەرچۆبۆسەر ئێلانە

(تحفە-١- ل٢٠٥)

دۆپەیکی نامۆ لەبەر دەرگای مزگەوت لێی دەپرسین... (دم دم- ل٥٤)

- پەیکان: ١-سەرەنێزە:٢-سەرەتیر
- پەیکاوەر: ١-جەنگاوەر:٢-پوستەچی
- پەیکەر: ١-روو: ٢-جسم: بەدەن: ٣-کۆتەل
- پەیکوڵە: جۆرە رووەکێکە.
- پەینکە: پێنکە: ئەو ئاردەی لە کاتی لەنان کردن بەکاردێ.
- پەیوان: دوای وان: لەدوان
- پەیمانگا: ئامۆژگا
- پەیوەند: پێوەن
- پەیوەندی: بەندیواری: ڤڕ: تەڤجڤان: بەستن: کەین: هەڤ بەندی.
- پێ: ١-پا:

٢-پێوەرێکە بۆ درێژ و پانی بەکاردێ

- پیا: پیاح: پەح: پەحا: پێح.

ئامرازی سەرسوڕمان

پەح ئەو گوڵە چەن جوانە!

- پیا خشان: پێداخشان
- پیادە: ١-پەیا: پەیار: دژی سوارە.

٢-هێزێکی سەربازییە کەسەر بە دەوڵەتە.

٣-جۆرێکە لەتفەنگی کۆن.

- پیادەرۆ: شوست: رەسیف
- پیادەرێ: پێگە: رێگایەك
تەنها پیادە هاتوچۆی پێبکات
- پیار: بەرەحم: بەروحم
- پیارە: نارەسەن
- پیاز: پیواز: پیڤاز: سەوزەیە سەڵك دەچێنری.
- پیاگ: پیاو.
- پیاگی: پیاوەتی.
- پیاڵە: ١-پیارە: ئیسکان.
٢-جۆرەگوڵێکە:
- پیانگۆ: یانەسیب
- پیاو: مێر: مرۆ: پیاگ
زەینۆچ زەینۆوەك پیاو پیاو بوو (تەنەکە- ل١٠٩)
١- نێرەی ئادەمیزاد:
٢- بەرێز و موحتەرەم.
٣- دارودەستە: گزیر
زۆر لـە پیاوەکـانی خـان کـە تـاڵانی قزلباشـیان دەستکەوتبوو.
(شەرەف- ل٥٥٤)
- پیاوچاك: ١-شێخ و پیری خاوەن کەرامەت:
٢-هەندێك ئەصحابەن
- پیاوەتی: پیاگەتی
من پیاوەتیم لەگەڵدا کردوون. (تەنەکە- ل٥١)
توخوا ئەوە پیاوەتییە لەگەڵ ئێمەی دەکەن...
(گەدا- ل٣٨)
- پیاوکوژ: زەلام کوژ: قاتیل.

- پیاوی ئایینی: شێخ و سەید و مەلا.
- پیاوی بارەدار: ئەو پیاوەی ئیشی تەنها ئـەوەبوو کە (مێخ و دار کوتر و کۆماج) شتومەکی دارینـی (دەواری) دروسـتدەکرد پیـاوی تایبـەتی ماڵـە گەورەکان بوو.
- پیاوی چاك: پیاوی بـاش: ئـەو مرۆیـەی کـاری گەند نەکات و هەمیشە بیرلە چاکە دەکاتەوە.
( مام سـەعدون): کـورە پیـاوی چـاك بـە کـەتیرە دەلێی جەواهێرانە. (گەدا- ل٣١)
- پیاوی خوایی: مرۆی بە دین و خۆپارێز و دونیـا نەویست.
- پیاوی خەراپ: پیاوی گەند
- پیاوی دونیا: مرۆڤی هەوەست باز و کەیف چی.
- پیتل: عەیارە نزیکەی (٣) کیلۆیە.
- پیر: وشەی پـیر لـە وشـە رەسـەنەکانی کـوردی دەژمێردرێ لە زمانەوانیدا واتای:
١-بەساڵاچو دەبەخشێ.
٢-کات تەواوبوون: بەهار پیر بوو.
٣-ژیانی مرۆڤ بـەرەو کۆتـایی بـڕوا وەك پـیرەژن، پیرەمێرد.
٤-ژیانی گیان لەبەران بێ وەك بەرەو کۆتایی
پیرە سەگ، پیرەکەو.
٤-ژیانی دار و درەخت(داری پیر)
داری پیرەدار کەی بەداربووە
٥-وشەی پیر بووەتـە نازنـاوی پیـاوی بەتەمـەن و ریش سپی و رابەری ئاین و مەزهەبەکانی.





٦-وشەی پیر لە سـەرتای سـەرهەڵدانی ئـایینی و خواوەند پەرستن لە ساڵانی (٦٠٠٠-٤٠٠٠) هەزار ساڵەی پێش زایین لە کوردستان و وڵاتی سۆمەر لە ئاوەڵکاری کاتی و ئاوەڵناوی سەربەخۆ گوستراپەوە بـۆ نازنـاوی ئـایینی بەڵگـەشمان نـاوی هەنـدێ لەچیاکانی کوردستانە کەوشەی پیریان هـەڵگرتووە هەڵبەتە ئەم ناوەش ناوی رابەری ئەو پەرستگایەیە کەلەسـەر ئـەم چـیایە دروسـتکراوە وەك: چـیای پیرەمەم: پیرەمەگرون، پیرس.
٧-وشـەی پـیر خـۆی کردۆتـەوە وەك پایەیـەکی ئـایینی، ئـەوەتا سـەرەتا لـە ئـایینی ئێـزدی خوداوەندی لافاو تۆفان نفاوی (پیرافـات) و (پـیری لینا)ش خوداوەندی زەماوەنـد و ئـاوات خواسـتنی بووە لەجەژنی خدری ئەلیاس و خدری زیندە.
٨-رابـەری ئـایینی زەردەشـتییەکانیش پـیری موغانیان پێدەوترا.
٩-وشەی (پیری موغان) کورت بووەوە و بووبە (پـیر) کـەپیاوانی ئـایینی و مـەلاکانی ئیـسلام و قەشـە و مەترانی مەسیحی و شەبەك و کاکەیی پێ ناودێرکرا.
١٠- وشەی پیر بەهۆی بوونی بەپێشگر و پاشـگر نـاوێکی زۆری لێ دروسـتدەبێت وەك پـیر ئۆمـەر، پیروەیس، پیرداود.
١١- وشەی پـیر دەبێتـە نازنـاو و نـاوی تایبـەتی مرۆڤ وەك:
پیرشاتی، پیر ئەشکانی، پیر پادشا، پیری شـالیار، پیرداود، پیرکۆ، پیرە، پیرۆمـەر، پـیرۆت، پـیرزادە، پیری جەوران، پیرام، پیرباڵ.

١٢-دەبێتـە نازنـاو بـۆ زینـدەوەران وەك داپیرۆچکە، پیرهەڤۆگ.
١٣-لەناوی جوگرافی رۆڵی هەیە وەك نـاوی گونـد پیرزین، پیرمەم، پیرۆمەر، پیران، پیرداود.
هەروەها رەنگـی لـەناوی چیا و دۆڵ داوەتـەوە وەك، چیای پیێرس، پیرمام، پیرەمەگرون، کەچەل پیر، پیرۆستەم.
١٤-وشەی پیرمانای داپیر: نەنك: دەبەخشێ.
١٥-بەگـەورەی (ماڵیـان) وتـووە کـە کـار بـاری ئـایینی تـەنها لـە ئەسـتۆی ئـەوبووە تـا هـاتنی زەردەشت پێغەمبەر.
١٦-وشەی پیر بەپیاوی ئایینی سەردەمی زەردەشت وتـراوە وەك ئـەڵێن (٩٩) پـیر هـەبووە لەناوچـەی هەورامان وەك ( پیرزەرین، پیرجان، پیروەتێ).
- پیران: ١-ئـەعیان: ٢-نـاوی کوڕانـە: ٣-نـاوی گوندێکە شێخ سەعید هی ئەوێ بوو.
- پیرایەتی: پیریەتی: کالتی
- پیرداود: ١-چاکێکە لەنزیك هەولێر.
٢-ناوی گوندێکە لەنزیك چاکی پیرداود.
٣-ناوی گردێکە کە چاکەکەی لێ نێژراوە.
٤-بووەتە ناوی گۆرستانەکە.
٥-ناوی کوڕانە
- پیرشالیار: یەکێکە لەو پێشەوایانەی کە پەیڕەوی ئایینی زەردەشتی کردووە.
- پیری موغان: گەورەپیاوانی ئایینی زەردەشتی.
- پیرۆز: ١-مبارەك: موبارەك: ممبارەك:
٢-ناوی ژنانە.

لەو سەفەرە پیرۆزە پلەی قوتبی مەداری پێ دراوە.
(غەوارە- ل٢٧)
٢-ناوی ژنانە: ٣- پیزە: کورت کراوەی پیرۆزە.
- پیرۆزبایی: موبارەك بایی (خولە پیزە).
- پیرەباب: باوکی بەتەمەن.
- پیرە بووك: ١-وەهم: ٢-وێنەی خەیاڵی.
- پیرە پیاو: پیرەمێرد.
- پیرەدا: پیرەداك: پیرەدایك:
نەنك: داپیر: ١-دایکی دایك: ٢-دایکی باوك
- پیر خەل: پیر+ خەل(خەلیل) چاکێکە لە قەد شاخی برادۆست ناوچەی خەلیفان
مانەوە پیرخەل و برازا: لە کۆمەڵە کەسێك دووکەس مابێ. (پەند)
- پیرەژن: پیرێژن: ژنی بەتەمەن.
بەدیار ئەو پیرە ژنە ڕەمیەتەوە ئەم قسانە دەکەی.
(گەدا- ل٣٩)
لەپیرەژنەکم پرسی پیری ئاخر زەمانی.
(هونراوە- ل٨٦)
- پیرەدار: داری کۆنەساڵ و ئەستوور و لك و پۆپ زۆر و ناوکلۆر.
داری پیرەدار کەی بەدار بووە
دۆستی کۆنەساڵ کەی بەیاربووە
(فولکلور)
- پیرەسە: پیرەسەگ: ١- سەگی بەتەمەن کە تەمەنی لە (١٠)ساڵ زیاتربوو ددانی گیرەی دەکەوێ چاوی بێ حوکم دەبێ خەمۆك دەبێ، کەم غاردەبێ.

٢- جینوە بە کەسانی بە تەمەن دەڵێن (وەك ئەم پیرە سەگە گاڵتەمان بە سەربەخۆیی مەملەکەت نەکردووە).
(حەمەدۆك -٢- ل١٣٦)
- پیرەکچ: کچی بە تەمەن کە شووی نەکردبی.
- پیرەکوڕ: کوڕی بەتەمەن کەژنی نەهێنابێ.
- پیرەکەر: ١-کەری بەتەمەن لەڕ و لاواز دەبێ، توانای باری نامێنی گوێی شۆڕدەبێ.
٢-جنێوە بەپیاوی بەتەمەن دەگوترێ.
- پیرەکەو: کەوێ تەمەن (٥)ساڵ.
- پیری: پیریتی.
- پیزۆ: ئەکزما: نەخۆشییەکی پێستە.
- پیس: ١- پۆخل: ٢- بریتییە لەمرۆڤی خۆری:
٣-نارێك و پێك
٤:-خەراپ: پیس وەستا: پیسیان لێدا.
- پیس و پەلۆس: پیس و پۆخل: پیس و پەلۆخ.
- پیستە: کەوڵ: چەرم.
- پیستە خۆر: ناڕەوا خۆر: حەرام خۆر.
- پیسۆ: پیسۆك: ڕەزیل: قرچۆك.
- پیسۆیی: پیسێتی: قرچۆکی.
- پیش: بوغز: حەقد.
- پیش خواردنەوە: مەراق خواردن.
- پیشان: پیازخستنە ژێر پەنگر بۆ برژان.
- پیشاندان: پێشاندان: نیشاندان: پشاندان.
راوەستن: پیشانتان دەدەم...
(تەنەکە-ل٥٦)
- پیشك: پیشەقان: داردەستێکە





ئاسنێکی وەکو دەماپاچ لەسەرەکەی گیراوە بۆ هەڵکەندنی کەنگر و گیا و کاردی.
کیژ هەر کیژی میرەکانی
دەستیان دایتە پیشەقانی
(هۆنراوە- ل٢٥)
- پیشە: کار: ئیش
- پیشەکار: ١-پیشەگەر: پیشەساز: پیشەوەر: سنعات کار: ٢-پیاوی لە بەر دەست راوەستاو.
- پیشەسازی: پیشەگەری
- پیشکار: پیشکەر: فاعل
- پیشە میللیەکان: پیشە خۆماڵییەکان: پیشەسازی خۆماڵی: وەك
١- کاری گلێنەو و جل و بەرگ.
٢- کاسە و کەوچك و سابوون دروستکردن و
٣- پێڵاو دروستکردن: ٤-جۆلایی:
٥-سبیل چیەتی.
٦- چەخماخساز: ٧- شیرگەر: ٨- ئاسنگەر:
٩-دارتاش.
١٠-کلاودروو: ١١-لبادچی: ١٢-تەونکەر:
١٣-مەتاڵچی: ١٤-گۆزەچی: ١٥-بەردتاش:
١٦-زیندرو: ١٧-کورتان دروو: ١٨-دەباخچی:
١٩-کارێزچی: ٢٠-دەرمانگەری.
- پیشۆك: پیشۆك: پیفۆك: پیفۆك: رووەکێکە گوڵەکانی پەڕەکانی وردە و تاکە و چوارپەڕەیە لاسك نەرمە و دڕکاونییە بۆنی خۆشە سەلکی هەیە و دەخورێت.

- پیك: ١-بەشێکە لە ئامێری زوورنا پارچە قەمیشیکی گچکەی جۆری (پووکە: واتە نەرمە) کە دەخرێتە ناو لوولەیەکی تەنەکەوە و بەپارچە (تەنەکە یاخود کودییەکی بازنەیی کۆتایی دێت ئەم پارچەیەش بۆ ئەوەیە زورناژەن (با) لەدەمەوە وەرنەگرێ بەڵکو لە کەپووەوە.
٢- دووقەمیشی باریکترە لە قامیش زەل دەخرێتە سەر دەمی دووزەلە دەچێتە ناو دەمی دووزەلە ژەنەوە.
٣-بریتییە لە هەمووشتی کەباریك بێت بچێتە ناوشتی لەخۆ ئەستوورتر.
- پیك برە: جۆرە کرمێکە لەگرێی سەرەوەی گوڵی دەغل دەدات دەبێتە هۆی وشك بوونی گوڵەکە پێی دەڵێن (پیك برە).
- پیل:١-شەپۆل: ٢-پاتری: ٣-قۆڵ.
- پیلاڕەش: کەبەد
ئەندامێکی لەشی بوونەوەرە.
- پیلاسپی: سیپەلاك
- پیلان: پهلان: کەین و بەین: دەهۆ: پچەپچ سورتك هەر ئەو دەم پیلانێکی زیرەکانەی دانا جۆرە. (ل٥٦)
لەمێژبوو دونگەی کەین و بەینێکی کردبوو.
(تەنەکە- ل٦٧)
- پیلان گێڕان: موئامەرە کردن.
- پیلان باز: پیلان گێڕ
- پیلوو: پەلکی چاو
- پیم: پیو: چەوری

- پینە: پنی
- پینەدۆز: پینەچی: پینەکەر: پینەدوز: دلـوف: پنی دوز:
کەسێ پێڵاو چادەکاتەوەو دەدوورێتەوە.
- پیواز: پیاز
- پیوازە کێویلە: پیواز خووگانە
- پیوار: ناودیار: شاراوە
- پیەکی: پاکی: خاوێنی: دژی پیسی
- پێ: ١-پا: لاق: ٢-ناوی پیتی (پ)
٣- ئـەو قرشـەیان هـوردەی جەنجـەڕ بـە سـەردا دەسوڕێتەوە.
٤-پێوەرێکە بۆ پێوانی درێژوپانی بەکاردێ.
- پێبون: ١-هەڵگیرسان: ٢-بەرۆژوبوون.
- پێئەسپاردن: پێسپاردن.
- پێبازك: پردەباز
- پێبەر: پارێزگار.
- پێبران: قازانج کردن
- پێ بەقونە: رەش بەش
باڵندەیەکـە کێوییـە و فڕینـی کەمـە و لـە نـاو زولگاوەکاندا مەلە دەکا و رەنگی رەش و بـۆرە و ناوچەوانی سـپی و زەرد و سـوورە لـە خـوارووی عیراق زۆرە.
- پێبلقە: پەیژە: قادرمە
- پێپانە: دەست بلاو: هەڵە خەرجی
- پێپەتی: پێ خواس: پێ خاوس
- پێ پەلاس: پێبلقە
- پێ پۆش: پێڵاو

- پێ پێچ: لەفاف
- پێت: ١-بلێسە: گڕ: مەشخەڵ
٢-پات: ٣-لات پێت نەبوو: لات نەبوو.
پێتان دەڵێم: پێودەلێم: وەوەرێمێ.
واتە بەئێوە دەڵێم
- پێتاو: پێڵاو: کەوش: قۆندەرە
- پێت داگم: پێت داوم: پێت داومە
- پێتر: پتر: زیاتر: زێدەتر
- پێنك: شەمچە: شخاتە
- پێتهار: خێرا: سەریع: بەلەز
- پێتە: ١-پاتە: ٢-وێتە: لەلاتە:
- پێتوایە: لات وایە
ئەتۆ پێت وایە ئێمە تۆ دەخەینە زاری ئەو گورگان
(حەمەدۆك-٢- ل٥)
- پێچ: ١-پێچك:تایە: ٢-لۆفە
٣-جەمانە: جەمەدانی: سەمموونەی بورغی
- پێچال: جۆلایی: کارگەیـەکی چـنینە بەئاسـۆیی دەکـرێ (واتـە کـارکردن بـە دەسـتە) رایەڵەکـە لەبەردەم جۆلایە رادەکێشرێ ئەمانەی خوارەوە بـە (پیچاڵ دەچێنرێ)
١-شاڵ: ٢-جاجم: ٣-دووگرد: ٤-پۆپەشمین
- پێچکردنەوە: هەنیشکردنەوە
- پێچراو: پێچراوە: پێچراوی
- پێچڤان: وەرگێڕ: موتەرجیم
- پێچکە: ١-پێی بچووك: ٢-ناوی گولێکە
- پێچن: رووەکێکی پزیشکییە گەڵاکـەی سـەوزی مەیلە شینە.





- پێچووپەنا: ١-فێڵ: ٢-پەناگە
پێچ و تاو: ئازار: عەزاب
- پێچووکلۆ: باو بەفر بەیەکەوە
- پێچوون: خایاندن
تۆزێکی پێچوو ئەفەندی بانگی کرد.
(گەدا- ل٣٠)
- پێچە: پەچە: ئافرەت بە رووی خۆیـان دادەن بـۆ نەزەر نەکردن.
- پێچەوانە: بەڤل: عەکس:
- پێچ پێچۆکە: حەلەزونی
- پێخاس: پێ خواس
ئەو ناوە پڕ بوو لە شڕەوپرە لـە بـەروپێ خـاوس و لات و لەوار
(تەنەکە- ل٦١)
- پێغامبەر: پێغەمبەر: پەیامبەر
- پێخزان: پێ هەڵخلسکان: خلسك بردن
- پێخوست: پێشێل
- پێخۆش: مائیل: رازی
- پێخۆش بوون: رازی بوون: قایل بوون
- پێخەف: سەرەخەرە: لێف: ساجل
- پێداخورین: ١-فەخر: شانازی: ٢-ئیعتماد
- پێداچوون: بەردەوام
- پێداچوونەوە: چاوپێخشاندنەوە.
- پێدادان: هێرش: ئێرش
- پێدار: سوڵتان
- پێداکەندن: پێ لەبەرکردنەوە
- پێداگرتن: ئیلحاح: سووروەستان: رکەگرتن

- پێداگر: رکەگر: براندوغ: رقن: رکن.
- پێدامالێن: لێدان
- پێداویست: موحتاج: ئاوسەرکەم
- پێداهاتن: بەردەوام
- پێداهەڵچوون: پیاهەڵگەڕان: پێداهەڵگەران
- پێداهەڵگوتن: پیاوەتی
- پێدە: بە بەردەوامی
- پێدەر: فەقیر: هەژار: کلۆل
- پێ دزیلکە: پاشە پاش کردن.
- پێ دەچێ: پێ دەچی: وێدەچی: لەوانەیە
وێ دەچێ لەزمانی قاجاراندا قوتبی
(تحفه-١-ل٩٥)
- پێدەشت: دەشت: بناری چیا
- پێدرێژی: لەئەندازە دەرچوون
- پێرار: دووساڵ بەر لەئێستا
- پێراگەیاندن: خەبەردان
نامەی بۆ بێگەدلی نووسی و پێی راگەیاند
(شەرەف- ل٥٥٥)
- پێراگەین: پیراگەیشتن:
- پێرەو: پەیڕەو: مەنهەج
- پێرەوین: پێوەڕین
- پێربەست: حەرف جەر
- پێرست: فەهرەست
- پێرك: مێز
- پێروو: کۆ: پەروین: حەوت
ئەسـتێرەیە و وەك هێـشوە تـرێ دەردەکـەوێ لەکۆمەڵەی (گا) (الثور)ەیەو.

ئەستێرەکەم لێ هەرات لەلای یەمەنی
پێروو هەراتن تەرازوو ناتگەنێ
(حەیران)

- پیوار: نادیار: شاراوە
- پێرێ: دووڕۆژ بەر لە ئێستا
- پیز: بەقوەت: بەبرشت:

سالّی بە باران دەغلّی گـەش و عوبابـە و پێـنج و بریار و بە پیزی پەنجە بازی لەگەلّ دەشـتی قـەراج دەکات. (غەوارە- ل٦)

- پێزان: بە وەفا
- پێژن: ١-سەدا: دەنگ دانەوە: ٢-ئەمین
- پێژە: پەیژە: پایە
- پێژنا: تاین: گۆرین: ناوبراو
- پێست: پیـستە: کـەولّ: کـەڤلّ: پۆسـت: پـۆس: پووس: کەوڕ: کەوڕك: کەور: پێستە: چەرم: عیـار: کەڤل: پوس: پێس: گوێن: پەرگ: کەول

لەسەر کەولّ و پۆستی خودادۆستی جێ‌گیربوو...
(شەرەف- ل٣٦٠)
دایکت بووەتە چنگێك ئێسك و پێست.
(حەمەدۆك-١- ل٤٨)
ئـۆقرەی لێ هـەلّگیراوبوو، لـە کـەولّی خۆیـدا نەدەگونجا. (حەمەدۆك-٢- ل٣١)
گورگێ ل کەڤللاً مهێ دایە. (مشتاخ- ل٢٤٧)
چەرمیان بەبەرەوە نەدەهێشت.
(شەرەف- ل٣٥٠)

- پێسۆر: ئەزمە: نەبوو: دەست نەکەوتن
- پێسیر: ١-سنگ: ٢-بەرۆك
- پێش: ١-بەر: وەر: ٢-بەرامبەر

بەپێش مالّیاندا رابردم.
(هۆنراوە- ل٧٠)

- پـێش چـاو: ١-ئامـادە: ٢-مـەرغوب. ٣-سەرنجڕاکێش.
- پێـشان: پێـشو: بـەروو: بـەرنگ: رابـردوو: لێرەبەرەوە: جاران: بەرلەمە: زوو: پێشدان
- پێشاندان: پیشاندان: نیشاندان
- پێشانگا: مەعرەز
- پێشانگی: نێوچەوان: جەبین

دەستم دەستۆی کە بێنم جەبێت

- پێشاو: ئاودەست
- پێش ئەوەی : پێشەوەی: بەرلەوەی
- پێشاهی: پێشایی: ١-ئەوەلی: ٢-سەرەتایی
- پێشە: ١-هێسك: ٢-کارە
- پێشبارە: گۆرانییەکی کوردەوارییە لەکاتی بووك گواستنەوە سـوار تـەرادانێیان دەکـرد و لـەدەوری بووك ئەو گۆرانییەیان دەگۆت.
- پێشبەر: ١-نۆبەرە:
٢-بەرامبەر: رووبەڕوو: مقابل
- پێش بین: دواڕۆژ زانین
- پێشخانە: هەیوان

بەشی دەرەوەی قەلاّ دیوەخان و پێشخانە
(گەدا- ل٣٤)

- پێشدار: ١-قائید: ٢-حاکم
- پێشداهاتن: پەیدابوون
- پێشدەرگا: ١-بەردەرکە: ٢-ئەستانە





- پێشدەست: ١-خزمەتکار:
٢-فەراش: ٣-ئامادە
- پێشڕەو: ١-سەرەتا: ٢-چاو ساغ: رێناس:
٣-پێشەنگی لەشکر: ٤-ناوی کوڕانە
- پێش زانی: پێشبینی
- پێشکار: خولام: خزمەتکار

ئەوکەسەی خزمەتی ئاغا و مالّە گەوران دەکات.

- پێشیکار: پێشەنگ.
- پێـشکە: پێـشوولە: مێـشوولە: پێـشوو: پێشووکوڕەك: خاکە: پەخشە: شەوسوتکە: هووردە: هۆرە: مەشوولە: گەمموورە: هورە تۆفانە: کـەلمێش: کوڕکوڕۆك: گمۆرە: مـۆر: ئـاخۆرە: وردە ئـاخورە: پێشووکورك: تەپۆ

پێشکە و مێشوولە چۆن بووە هەر وادەبێ.
(تەنەکە- ل٨٧)
مێشوولە لە چاو سالآنی تر هەر لـە سەرەچـاوەکەم بوو. (تەنەکە- ل١٢٨)

- پێشکەوتن: پێشکەتن
- پێشکەش: پێشکێش
- پێشکەوتوو: پێشکەوتی
- پێش کۆچی: سەرقافلّە: کاتی کوردەکان لەوارەکی بۆ هەوارەکی تر بـار ئەکـەن چـەند سـوارێکی ئـەو زۆمەیـە لـە پێـشیانەوە ئـەڕۆن بەسـەر شـانیانەوە رمەکانیان هەلّگرتووە و بە دوایشیانەوە ئافرەتـەکان وەك کـاردان لەگەلّیانـدا دەڕۆن و مـەڕ و مـالآت و شتومەکەکانیان هەموو بە دوایانەوە بـەم سـوارانەی کە پێشیان کەوتن پێیان دەلّێن (پێش کۆچی).
- پێش کۆش: پارچە پەرۆیەکی لەنێوك بـەرەوخوار لـەخۆیان دەبەسـتن بـۆ پـاك و خـاوێنی لـەکاتی کارکردندا.
- پێشگر: مانع: پێشگیر: موخالف.
- پێشگوتن: سەرەتا: بەرایی: پێش بار.
- پێش مالّ : ١-بەرمالّ: ٢-بەپێشەوەی رەشمالّی نۆ کۆلّەکە دەلّێن کەبەپەردەیەك لەگـەلّ پـشتەمالّ جودا دەکرێنەوە دەبێتە دیوەخان.
- پێشمەرگە: پێشمەرگ: گیان باز: خـەبات کـەر: چەکداری رزگاری خواز.
- پێشنمێژ: پێشنوێژ: ١-ئیمام: ٢-پێوەرێکـە بـۆ کات بەکاردێ.

پێش نوێژی عەسرێ دێم

- پێشنیاز: پێشنیار
- پێشواز: پێشباز.
- پێشوازیی: پێشبازی
- پێشوازی کردن: بەپیرەوەچون: بەرەو پیر چوون

پێـشوازییەکی گـەرمیان لەئەومالّـە تـازە هاتووانەبەین کرد. (حەمەدۆك-٢- ل٤٧٧)

- پێشووتر: زووتر: بەرتر: پێشتر
- پێشوولە: پێشکە
- پێـشەنگ: ١-ولاّغـی پێـشەوەی قافلّـە: ٢-سەرقافلّە چی: ٢-پێڕەو: ٤-ناوی کوڕانە
- پێشەوە: بەرەوە

بندار و بندار بۆی چوو تاگەیشتە پێشەوە
(گەدا- ل٨٥)

- پێفرك: سەیارە

- پێڤان: پێوان: پیوان: هەژمارکردن
- پێڤەدان: پێوەدان
- پێکان: ١-ئەنگاوتن: ٢-کۆی پێکی بادە.
- پێکهاتن: موافەقەت کردن.
- پێکەلپێك: یەکسان
- پێکەنین: کەنین

پێ‌بکەنە بابتبینم دەرچی گیانی شیرینم
(گۆرانی حەسەن زیرەك)

- پێکەوە: بەیەکەوە: وێکرا: پێکرا: هەڤرا: پێکڤە: هەڤرە:

... هەردووکیان پێکەوە ساز بکە...
(حەمەدۆك -٢- ل٢٤)

- پێبکەوە: ١-بزانە: لێ بکۆڵەوە.
٢-دووبارە دای بگیرسێنەوە.
- پێکرا: بەیەکەوە: یێکرا

چەلتووك چێنەکان تێکرا... (تەنەکە- ل٨٩)

- پێکبران: بۆیەکتری بوون.
- پێکردن: داگیرساندن.
- پێ‌کژین: پژمین: پشمین
- پێکوت: ئاسنەکی پانە کورتان دوور بۆ کوتینەوەی کورتان بەکاری دێنێ.
- پێ‌کوتن: پێ گوتن: پێ‌گۆتن: پێ وتن:

برایم: جابا پێشم گوتبێ چیی تێدایە
(گەدا- ل٦١)

- پێکورە: پێکۆڵە: رناندنەوەی زەوی بەپێ
- پێکەر: پەیکەر: کۆتەل
- پێکهینان: پێکهێنان
- پێکوڵ: ناوی درکێکە
- پێگەرمۆك: گەرۆك: سەیاح
- پێگەه: ١- فەوج: ٢- پێ‌بلقە
- پێگەیشتن: هاتنە بەرهەم
- پێگەیشتوو: پێگەیشتی
- پێلاقە: پێلەقە: پەحین: پێن: لەقە: پەهین:
١- بەپێ لەکەسێ دان.
٢-بەپێ لە شتێ دان.
- پێلاو: لەها: کەوش: پێتاو: سۆلك: سۆل: پاپۆش: پێ پۆش: تایاخ: پاڵا: قۆندەرە: قۆنەرە: پالی: شەکال

شەکالی خۆداکەند و بەپێخاوسی هاتی..
(مجێور- ل٤١٣)

لەپێستی ئاژەڵ و لاستێك دروستدەکرێت یا لە لاستیك دروستدەرکرێت یا لە بەن و داو
وشەی (پێلاو) لەپالّی وەرگیراوە، چونکە خەڵکی شار لەپێیان کردووە، هەروەها لە کوردیدا بە وشەی (پهلە)یان وتووە (پالە) و لەفارسی کۆندا وشەی (پەهلە) واتای شار دەگەینێ جا لێرەدا چونکە (پالی) وشەی شار دەگەینێ و تەنها خەڵکی شار پێلاویان لە پێ کردووە ناوەکەی لەخەڵکەکەی وەرگیراوە.

چەخماخ لێدە چراکەم هەڵنەکردووە کەوشم بۆ یارکریبوو تایەکەم ون کردووە. (گۆرانی زیرەك)

- پێلاودڕانە: کاڵە دڕانە: حەقی ماندوو بوون لەکارێکدا.
- پێلاوی خانم: گیایەکی دەشتەکییە گوڵی سپی یان پەمبەیی یان زەرد دەگرێت لەپێلاویان لە سۆل دەچێت.





- پێل پێلك: پێسترك: پێ‌پیلکە: پێ بلقە: پەیژە.
- پێلو: پەلکی چاوان: قەپێلك: پێلە: پێل: پێلوو: پشت چاڤ: کۆپێك

پێلوو هەڵمساوی چاوەکانی هەڵدێناو وێکی دەنایەوە.. (حەمەدۆك-٢- ل٣٧٨)

- پێ لەپاش: پەشیمان
- پێ لەهەڵەنان: دان پیانان
- پێ‌لێ هەڵبرین: لەئەندازە دەرچوون
- پێ لیسك: ماوە: فورسەت
- پێلێنان: دان پیانان: درکاندن: ترکەزاندان
- پێم ناخورێ: بۆم ناخورێ
- پێمزك: کرێ : مز
- پێن: ١- پێلاقە: ٢-راکردن: ٣-پان
- پێناس: ١-پەیوەندی: ٢- ناونیشان
- پێنج خشتەکی: بەشێکە لە جوانکاری ئەوەیەکە هۆنەر پارچە هۆنراوەیەکی هۆنەرێکی تر وەربگرێ و هەردێرێکی سێ نیوە دێری بۆ زیاد بکات بەومەرجەی لەسەر هەمان کێش بن و سەروای هەرسێ نیوەکە لەگەڵ سەروای نیوەی یەکەمی هۆنراوە وەرگیراوەکە یەك بێت.. هتد دیارە سەروای گشتی هۆنراوەکەش هەردەمێنێ بەکورتی چامەکەش بەش بەش دەبێت. هەربەشەی دەبێتە پێنج نیوە هۆنراوە سێ نیوە بەرایی هی هۆنەرێکە و دووەکەی دواییش هی هۆنەرێکی تر.
- پێ‌نەزان: بێ وەفا
- پێنجووکانی: قاقایانێ: قاچانی: هەلماقۆ: دەشتی کوندە: یارییەکی منالآنەیی کچانی مێرد منالّ ئەیکەن بەپێنج بەرد یارییەکە ئەکرێ.

یارییەکە بەم شێوە
یەکە: بەردەکان یەك یەك دوای
دووە: بەردەکان دوودوو داویێ.
سێیێ: بەردەکان سێ سێ داویێ.
چارچار: بەردەکان چارچار داویێ.
گزە: بەردەکان دادەنێن یەك یەك هەڵی دەگرنەوە.
مەللا: بەردەکان دەهاوێیە ناو قۆرت
سەردەست: بەردەکان دەخەیتە سەردەست

- پێنڤیس: پێنوس: قەڵەم: خامە: ئالاّ: میداد
- پێنگژین: پیشمین: پشمە
- پێوەر: ١-خەتیب: ٢-مەساح
- پێوەستان: ١-پێ وێران: ٢-توانا هەبوون.
٣-دەسەلاّت بەسەردا شکان.
- پێ و قەدەم پیرۆز: پێ و قەدەم بەخێر
- پێ وەرگێران: بریتییە لە وەرگێرانی ئەو قرش و قالەی بن پێی جەنجەر و سەراوبن کردنی.
- پێوەکرای: هەڵواسراو: دورد
- پێوەلکاو: پێوەنووسای
- پێویست: پێتڤی
- پێ هەڵدانەوە: لەمەرەمای قرشە شکێن و کوتینی هوردە کوت پێی جەنجەر هەڵدەدرێتەوە لە قرشە شکێن بۆلای راست و لە هوردە کوتیش بەلای چەپی جەنجەر هەڵدەدرێتەوە.
- پێ هەڵکان: تووك و دوعای خراپ کردن.
- پێ هەڵکوتن: حەمەد: سەنا
- پیت: تیپ: حەرف

وێنەی ئەو دەنگانەی کەلەزار دێنە دەرەوە وشەیان لێ پێکدێت بچووکترین دانە دەنگییە لەزماندا و لەوە زیاتر ناتوانرێت وردبکرێتەوە.

- پێیگان: لای پێی ئادەمیزاد.
- پێیەرێم: پێی دەڵێم: دەیلێمی: پێی ئەلێم.

# ت

پیتی "ت" لەگەڵ ئـەم پیتانـەی خـوارەوە دەنـگ گۆڕکێ دەکات.

١-چ

تەت: چەچ: تونە: چۆنە.

حوت: حۆچ: توزانم: چوزانم.

٢- لە کەسـێ دووەمـی تـاك و کـۆ دەگـۆڕدرێ دەبێ بە (د).

خۆت: خۆد: ماڵت: ماڵد: خۆشیتان: خۆشیدان.

٣-دەنگ گۆڕکی لەگەڵ: پیتی (س) دەکات.

ژنیەتی: ژنیەسی.

٤-جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاك.

هەنارەکەت بخۆ.

٥- لە دوای دەنگی (س) بێ قەت گۆناکرێ لە بـن لەهجەی گەرمەسێر وەك.

مەست: مەس: خەست: خەس: ماست: ماس.

- تا: ١-تێ: بەرتاڤ: بەرزبوونەوەی پلـەی گـەرمی لەش لە (٣٧) پلەی سەدیەوە بەرەوژوور.

٢-تاینچە:

لنگە: لنگ: تاك: لابار.

٣-تالێك: تالێ

بای شەماڵ تای زولف. (بیسارانی- ل٤٦)

٤-ئامرازی عەتفە : واتە دوو وشـە یـا دووڕسـتە بەیەکەوە دەبەستێ.

تادەمێنم، دەخوێنم.

ئەم روالەتانەشـی هەیـە (هـەتا، تـاکو، هـەتاکو، هەتاوەکو، تاوەکو: تاوەکی، حـەتا، هـەتاوەکونی، هەتاوەکێنی، هەتانەکونێ، هەرتا: دا، تاوەکونی

تا لەئەنجامدا بە نەخۆشی خورێلکە فرەڕەنگی..

(شەرەف- ل٣٨٦)

تادەتوانی خۆراکی هەرزانم دەیە. (مجێور- ل١٨١)

هەتا پەنجا: شێست ساڵ لەمەوبەر.

(حەمەدۆك-١- ل٣٤٧)

هەتا ئەمن لەو کێوانە ماوم دەبێ وابێ..

(حەمەدۆك -١- ل٣٦٧)

- تاتۆرە: رووەکێکی ژەهرینە گوڵێکی سپی گەورە و بەرێکی دڕکاوی دەگرێت، بەرەکەی لـە باینجـان دەچێت ماددەیەکی سڕکەری تێدایە، دەرمـانی لێ دروستدەکرێت بۆنەخۆشی ئاژەڵ و ولاغ بەکاردێ

- تاتە شۆر: تەختەشۆر: تەتەشۆر: تاتەشوار.

بەردێ کە مردووی لەسەردەشورێ لەزۆر شوێن لەدار دروستدەکرێ.

- تاتی: واتە لەسەر پێیان رۆیشتن بە زمانی منالان.

- تاج مجـوهرات: نـاوی گوڵێکـە پەڕەکـەی ورد و کۆمەڵە بێ بۆنە و ماڵییە.

- تاجەدین: تاژدین: ناوی کوڕانە.

- تاجوب: تەعەجوب: سەرسوڕمان.





سەرسوڕمام خوایە لەو کوردە وا. (مجێور)

- تابر: تاپر: تفەنگی راو.

- تابلۆ: دیمەن: رەسمی کێشرا: نەخشی جوان.

- تات: تاتە: بەردەنوێژ.

بەردێکی پان لەنزیك کانی دادەنرێ بۆ نوێژ کردن.

- تاتان: شوێنی بەردەلان.

- تاتەد: باوکد: باوکت: بابت: باوت: باوکی تۆ.

(ئەدام مرۆ تاتەدمرۆ).

(خوادایکت بگرێ بابت بێ ئیمان).

- تاتك: تەتك: تات:

بەردی پانی بن زەوی و هەندەکی بە دەرەوەیە.

- تاجەرووده: تانجەڕۆ.

١-نـاوی رووبارێکـە لـە شـارەزوور: ٢- نـاوی شارۆچکەیەکە لەنزیك رووبارەکە.

سوانی (پیت) و سەربار خستنە سەری

سـەیرنییە لەکوردەواریـدا بـاوە جـالێرەدا وشـەی (روود) بـووە بـە (روو) واتـە تاجـەرو بەسـوان و خستنەسەر بووە بە تانجەرو.

خۆزگەم بە دوێنی نێوەڕۆ

لێو ئاڵیان برد بۆ تانجەرۆ

- تار: ١-کەو: کەوە: لەدار دروستدەکرێت شێوەی بازنەییە لەدەوری بێژینگ و سەرەند دەدرێت.

٢-ئامرازێکی موسیقایە و ژێدارە بەپەڕە موچێکی رەق لێ دەدرێت.

لەو دەمەیدا گوێ هەڵدەخەن بۆ تارێ

(تاریك و روون- ل٢٠٧)

٣-شێوە: ٤-تاڵ: تەحل: دژی شیرین: ٥-تاریك

رۆیشتنی بسات لێم بیەن بەتار (بێسارانی- ل٧١)

٦-یەکەم هەفتەی مانگی مارت.

- تارمە: تارم: کۆمەڵـە خـڕ کراوەکـەی هوردەیـە لەپێش شەنەبا کردن.

٢- خڕکردنـەوەی "کـا" لـە سـەریەك بـە بارستایەکی چاك.

- تارە: تالە: ١-جۆرێکە لە شێوەی رەنگی مـەڕی کوردی سەروگوێلاکی مەڕەکەڕەشە، بـەلام رەنگـی سۆری تێدا بەدی دەکرێ.

٢-واتە شیرین نییە.

- تاران: تۆران: تۆریان: ئاوارەبوون: دەربەدەربوون.

بۆ تۆریکرد بۆ تۆریای

نازدارەکەم کی لێیدای

- تارژەن: تارلێدەر: ژەنیاری تار.

- تارکردن: دەرکردن.

کەسێ لە شوێنی خۆی دەربکرێ.

- تارنان: تاراندن: دوورخستن: راونان.

کەسێ لە شوێنی خۆ دەرکردن.

- تارومـار: پـژگ و بـلاو: تێـك شـکان: تـەفرو تونابوون: داغان داغن.

ئاوا تەفر و تونای کردین.

(بۆرە- ل٧٢)

- تاریف: پیاهەڵدان و باسکردن

باس باسی راو و تاریف تاریفی تاوس بوو.

(گەدا- ل٦١)

تاریفی عێل و عەشیرەتی دەکرد.

(حەمەدۆك -١-ل٣٤٩)

- تاریك: تار: تاری: تونەك: تنۆك: تاعری: تەعری: دژی ڕووناكی.

ماڵی كابرای هاوڕێم تەڕ و تاریك و تەنگ بوو.

(مجێور- ل٩٠)

- تازە: تەزە: نو: نوێی: ئێستا.

(تازە ڕۆیشت).

تازە زانیم ئەو شەڕەفنامەی كەمن هیچم لێ نەزانیوە.

(شەرەف- ل٣)

- تازەبووك: نەوبووك: نۆبووك.

ئای شل شل و مل شل و شێواوی

ئەڵێی نەو بووكی زاوالێ داوی

(گۆرانی مامۆستا عەلی مەردان)

بێنە ماچت كەم یاری تازەبووك

(گوڵاڵە- ل٦٨)

- تازی: ١-تازیە: جۆركێكی خامی گەورەیە كە نزیكەی شەش، حەوت تەنەكە دۆی دەگرێت و دۆی تێدەكرا بۆ ئەوەی ئاوەكەی لێ بچۆڕێتەوە جا ئەو جۆركە پێی دەڵێن (تازی-تازیە).

٢-ڕووت: تازیڤا.

٣-پرسە.

- تازیە داوێنەدار: تازیەیان لە دارە واتا دۆی وشك دەكەنەوە.

- تاژۆن: داژۆن: لێدەخوڕن

مێگەل دانەپێشەخۆ بەرێك و پێكی

- تاژی: تەعژی: تانجی: تاجی: سەگی نێچیروڕاوە

تاژی دوو جۆری هەیە: ١- تاژی بەڕیشۆل: ئەو تاژیەی هەندێ مووی لەسەر گێو سەرپێیەكانی هەیە.

٢-تاژی ڕووت: ئەو تاژییەی هیچ مووی نییە لەسەر گێو و لەسەر پێیەكانی.

ئەو تاژییە دزیەتییە.

(گەدا- ل٥٣)

خەریك بووم ڕاگرم دووگۆڵە تاجی

(تاریك و ڕوون- ل١٥١)

تاجی و تۆلەیان بانگدەكرد ئەوبەر ئەو بەرە

(تحفە-ل٣١٧)

- تاژیانی: بە ناوقەدی ئەسپ و ماین دەڵێن بۆ پەسندی.

ناوقەدی ولاغی وی تاژیانییە (لاوك- ل٣١)

- تاژی دەم سارد: پێچەوانەی تاژی دەم گەرم.

- تاژی دەم گەرم: بەوتاژییە دەگوترێ كە لەڕاودا كە دەگاتە نێچیر، لموزی دەخاتە نێوان هەردوو پێی دواوەی نێچیر بۆ ئاسمانی بەرز دەكاتەوە وكە نێچیرەكە دەكەوێتە سەرزەوی زوو بەدەم دەیگرێ.

- تاژییەوان: ئەو كەسەی تاژی بەخێودەكات.

- تاس: یەك تەپلە: ئامرازی موسیقایە ئامرازێكی ڕەزم گرتنە لە تەكیە و خانەقاكاندا لەتەك (دەف) بەكاردێ بەدووداریش لێدەدرێ.

٢-جۆرە خشڵێكە ژنان لەسەری دەنێن.

- تاسب: مەراق: مەرق: غەم: قەهر.

- تاسوغ: واتە تامەزرۆ.

- تاش: ١-تراش: ٢-گابەرد.





- تاشت: تاشتی: تاشتێ: تێشتە چێشت: خواردنی بەیانیان دوای بەرچایی.

- تاڤگە: تاڤ: ئاوشار: قەلبەز: قەڵۆەز: ڕێژگال: تاف: قەلوەزە: ئاوڕێژ: ئابشار: ئێور: كەلوەز: كەلبەز: پرژ: ڕێژراو: شۆڕاو: شۆش: سۆلاڤ: سولاڤ شوێنێكی بەرز ئاوێكی بەخوڕی لێ بێتە خوار.

هەر تاڤگەیەك ناوێكی تایبەتی خۆی هەیە وەك تاڤگەی بێ خاڵ: تاڤگەی گەلی عەلی بەگ: تاڤگەی سۆلاڤ.

- تاڤل: دەبی: دەبێ: ئەبێ: دبی: ڕەنگە: لەوانەیە: پێ دەچی.

- تاق: تاك: دژی جووت.

ئەو كچە بێ مرادەیان بە تاقەوە ناشت.

(تحفە-١- ل٧٧)

- تاق تاقكەرەوە: جۆرەمەلێكە.

- تاق واز: شاش و واش.

ددانی شاش و واشە

- تاقەت: هێز: شنگ: شینگ:

جانازانم: تاقەتت: هەیە گوێم لێ بگری یانا؟

(كوێرەوەی- ل١٤)

- تاقەت بڕان: بێ تاقەت بوون: بێ هێزبوون.

١-وزە و هێزنەمان لەبەر ماندووبوون.

٢-وزەو هێز نەمان لەبەر نەخۆشی.

- تاقی: خەفتانە: كەوا: قەبا: جلكی ژنان و پیاوانە.

- تاقی كیسرا: كۆشكەكەی ئەنوشیروان لە تەیسفون كە ئێستا پێی دەڵێن سەلمان پاك، كیسرا لەقەبی ئەنووشیروان و خوسەرەوی پەروێز كە دوانن لەپادشاكانی بنەماڵەی ساسانی.

- تاقیگە: تاقیخانە: لابۆر: موختەبەر: شوێنی تایبەتە بۆ تاقیكردنەوەی بابەتی كیمیایی

- تاك: ١-تەك: تاق:

٢-كراوە.

- تاكتوك: تاك و توك: تاكولۆك: تاكولۆق: كەت كەتە.

تاك و تەرا: تاكتوك.

تاك و تەرا لێرەو لەوێ خڕیان پێداداوین.

(شەرەف- ل١٤)

- تاڵ : ١-جەوت و تۆێكڵە هەناری هاڕاو كە بۆ مەشكە بەكار ئەهێنرا.

٢-تار: تەحەل:٣- هەودا: داو.

ئاوەكەش تاڵ و سوێر. (غەوارە- ل١١)

- تالان: تالۆو: تاراج: چەپاو: بڕۆ: یەخترمە: فەرهود: پەلیسەر: هەموو ئەو شتانەی لەشەڕا بكەوێتەدەست.

تالان و ماڵ و شمەكی زۆر و زەوەند وەرگیر لاوانی سۆرانی. (شەرەف- ل٤٩٣)

- تالح: بەخت: شەنس: هیر.

- تاڵك: سپڵ

- تاڵە: ١-تەحلە: شیرین نییە: ٢- تالح: بەخت.

- تالەمس: جۆرێكە لەرەنگی مەڕی كوردی تەواو تاڵە بێ، بەڵام دوو خەتی سۆری بەلمۆزی داهاتبی.

- تاڵی شاری: ناوی گوڵێكە پەڕەكانی زۆر ورد و پڕە.

- تالۆریك: سەركردەی شەڕ لەدوای خانی لەپ زێرین لە قەڵای دم دم شەڕەكەش هەر بەناوی خۆیەوە بوو بەناوی (شەڕی تالۆریك).

- تالّیشك: رووەكێكە گوڵەكەی پەڕەكانی ورد و زۆرن لەشێوەی ئەستێرەدایە لاسكی نەرمە و دڕكاوییە بۆنێكی كەمی هەیە، كێوییە بە تۆ زیاد ئەكرێ لە كوردەواریدا.

- تام: لەزەت: زەلەت: چەشەكە: چێژ: مەزە: چەشە: چێش: مێلاك.

تاماوم تامی ناچێتە سەرزارم.

(بۆرە- ل٣٩)

لە دڵەوە بۆ تامی گۆشتەكانیان سووێ دەبوو..

(بۆرە- ل٢٠)

- تام دڕن: گۆشتی تام ناخۆش.

- تام سارد: تام سار: بێ تام.

- تامسۆ: تام سوتای.

- تام كردن: چێشتن: چەشتن.

- تام گێل: گێلێكی ئاشكرا و دیار.

- تامەزرۆ: تامازرۆ: سۆمایی: مرخ: ویست: دڵ خوازی: تاسە: ئەلها: داودڵ.

دڵچوونێكی بەكاروتوند و بەحەز بۆ شتێك.

بخوێننەوە تا تامەزرۆتان بشكێ.

(گەدا- ل٨)

- تامێسك: تامیسكە: پزلك: قنچكەیە لەسەر لچ و لێو دێت و لەكاتی (تا) تووش دەبێت.

- تان: تار: ئەو دەزوەی كە لەسەر باری درێژایی بۆ چنین بەكاردەهێنرێ.

- تان لێدان: رشت كردن: دنەدان: هاندان: گالدان.

- تانە: پلار: پەلار: تەوس:

قسەی بەتوێكڵ.

- تان لەخۆدان: خۆرشت كردن.

- تانگ: تەنیا: تەنها: بەتەنێ: تەنێ

- تانجی رەسەن: بەتانجی باش دەڵێن كە زۆر خێر و گورج و گۆڵبێت، بەبێ هاوسەر واتە بەتەنها لە چلەی زستاندا كەروێشك بكوژێت. چونكە كەروێشك لە زستاندا لەهەموو كات باشتر و زیاتر دەبەزی.

- تانجی عارفە قوش: بەو تانجییە دەوترێ كە لەگەڵ قوش راهێنرابێت بۆ راو.

- تانین: توانین: هێز و وزەی مرۆڤ.

- تاو: ١-تاڤ: هەتاو: خۆر: ڕۆژ :هتاڤ: رۆ: تاعڤ

تازە تاو لەئاوایی كەوتبوو.

(گەدا- ل٣٥)

٢-گوڕ: غار.

بەتاوی هات و رۆیشت.

- تاوان: سووچ: پیازە: سەووش: وەپاڵپەزە: چەڵم: وەباڵكار: گوناح : گوناه.

بۆ گوناحێكی بچووك سزای زلی دادەنا.

(شەرەف- ل٢٦٤)

لەتاوانی زۆر گەورە چاوی دەپۆشی.

(شەرەف- ل٢٦٤)

- تاوانانە: تاوانە: حەقی تاوان: كە لە تاوانبار دەستێنری.

- تاوانبار: تاوانكار: سووچدار: گوناهبار: خینوو: وەبالگەدار: گونابار: تاواندار: خووە پوچ: پاشەڵپیس: ناپاك: خوێنخور: وەبالبەز.

- تاوانەوە: توانەوە: تواوین: بەئاوبوون: تاوینەوە: تاویانەوە: تێویانەوە





تواندنەوەی گەلی كورد لە كوردستانی ئێراندا.

(گەدا- ل٩)

- تاوپەڕین: رۆژ ئاوابوون: خۆرئاوابوون

تا ئێوارێ نزیك تاوپەڕین قوركاری بۆ ماڵی ئاغا كرد.

(گەدا- ل١٣٥)

- تاوتووكردن: جێبەجێكردن: قسە لەسەركردن: گفتوگۆ كردن.

- تاوسان: هاوین: تاوستان: هاڤین: تاوسو.

- تاوسانی: هاوینی.

- تاوكەوتن: تاو هەڵاتن: خۆرهەڵاتن: رۆژ هەڵاتن

هەر لەتاوكەوتنەوە تا ئێوارە. (گەدا- ل١٣٤)

- تاوگاز: هەتاو گازی: هەتاوبردی.

- تاوەگۆزی: ١-واتە (تاووك و گوێز): تاوەوگۆزی.

٢-دووجۆرە درەختن كە لەوناوچەیەدا دەڕوێن.

٣-هەر دوو دار لەسەر كانییەك روان بەو شێوەیە ناونراوە (تاوگۆزی).

٤-ناوی ناوچەیەكە و ناوی عەشیرەتێكە لە ناوچەی هەورامان.

- تاول: رەشماڵ: چاتۆل: چادر: دەوار: خێوەت: خیوەت: كۆن: سیاماڵ: رەشمار: ماڵی پەڕۆ: تاولی: تئووك: پانك،

لەمو دروستدەكرێت و هەندێكیشیان لەپەموو دروستدەكرێن، گەورە و بچووكیان هەیە هاوین یان لە هی زستانانیان بچووكترە وەك رەشماڵی نۆ كۆلەكە واتە رەشماڵی گەورە وەك هی ماڵە دەوڵەمەندەكان

رەشماڵی دووكۆلەكە: واتە رەشماڵی بچووك هی ماڵە هەژاران.

دەواری دوانزە ستوون: گەورەترین رەشماڵە هی سەرۆك عەشیرەتان.

رەشماڵی مەنگوریان لەچۆلو لەكێوان.

خاتون گوڵەزەر بۆ خۆی لەبن پانكێی دانا.

(تحفە-٢-ل٢٧٨)

زێن و مرۆت و ئەسمەر

لەتاولی هاتوونەدەر. (تاریك و روون-ل١١١)

- تاوناتاوە: ناوەناوە: جارجارە: دەم نادەم.

هەرتاو ناتاوێكێش دەنگیان دەدا بۆ بێگار.

(گەدا-ل٨٤)

- تاونان: تواندنەوە.

- تاوە: تاوا: مقلی: ئاغلەویك: مقلك.

- تاویا: تاواوە: تواوە.

- تاوی دایی: غاری دایێ: لینگدایی: پەلاماریدا

لینگیان دایێ دەستەو خەنجەر. (گۆرانی زیرەك)

- تاوێ: ١-هەندەك: ٢-تا ئەوێ: تا ئەوێندەر

تاوێ وەرە باوەشم.

- تاوێك: تاوێ.

تاوێك لەوێ حەساینەوە. (گەدا- ل١١٧)

- تاهیر: تایەر: تەهۆ: ناوی كوڕانە.

- تایەن: تاین: گۆڕین: ناوبراو:

كابرای تایەن لەپێشەوە بڕوای بە.

(كوێرەوەری- ل٦٣)

- تایبەتی: رادایی: دانسقە: دانستە: بەلاوە: خۆماڵی بەتایبەتی كەلێ یان نزیك دەبووەوە. (بۆرە- ل٥٠)

تخوب: ١- پارچە ناوەنەكی راستە لەشێوەی ڕێچكۆلەی شەغرە وە یا حیوان لەنێوان دووپارچە زەوی دیاریكراوە سنووری زەوی دیاردەكات.
٢-تووخب: حدود: سنوور: یخووب: سنووری دوو دەولەت.

تخوب بەزاندن: سنوور پەڕاندن:
لەسنوور چونە دەرەوە.

- ترار: ترگال: بادی ئاوخواردنەوە.

- ترازاندن: لەپاڵ یەك دەرهێنان.
ئەمجارپەنجەكانی لەبەریەك ترازاند. (گەدا- ل١٨)

- ترازای: لەباڵ یەك دەرهاتوو: لەسەر یەك لا كەوتن.

- ترپات: سرپات: ترپ: تلپ: پاشماوەی میوەی گوشراو.

- ترس: بزد: پاخاڤ: پاخ
هەڵچوونێكی سروشتییە لەدەروونی مرۆڤدا بەرامبەر هەندێك مەترسی سایا بۆ خۆ پاراستن یا بۆ ئاگاداركردنەوەی بیروهۆش ئەم ترسە سروشتییە بەنەخۆشی دانانرێت، بەڵكو بەروخسارێكی زیندووی گیانەوەران ئەژمێرێت ترسیش جۆر هەیە وەك:
١-ترسی ئاسایی. ٢-ترسی دەماری.
٣-ترسی هەمیشەیی.
بۆرە هەرچی ترس و خەفەتی دنیابوو.
(بۆرە- ل٦٨)

ترسنۆك: بزدونەك: زەبوون: بێ زاڵە: بێ جەرگ: دڵكەچك: قرچالە: بێ زات: بێ جەوهەر: چاڤ ترسنۆك: رەوەك: نەوێر: باكدار: بەباك: رەمكار: قەلەزراو: بێ زراڤ:
ئەو كەسەی ترسی لە دڵدابێت.
بێ زراڤ كەس ناگهێت دۆزاخوە.. (مشتاخ- ل٣٦)

- ترش: ١- ئاڤك: ٢- دژی شیرین.
ترش و شیرین تێكەڵاوبوو.
(شەرەف- ل٦٤)

- ترشۆكەی زەرد: رووەكێكی زیان بەخشە لەشوێنی شێداردادەڕوێت گوڵەكەی زەردە.

- ترشیات: مزرەمەنی: مزرەلۆك.

- ترمە: حەلالی: رەنگی زەردە حاجی لە سەری دەنێن.

- ترشۆكە: ناوی گیایەكە و گوڵەكەشی بەوناوە دەناسرێ، كێوییە و دەخورێ.
بەكاردێ بۆ: ١-گرفت: ٢-بۆ برین و دۆمەل.

- ترنج: ناوی گوڵێكە پەڕەكانی وردە ئەستێرەییە لاسكی نەرمە و بێ دڕكە، بۆن خۆشە.

- تریفە: ١-شەوقی مانگ:
٢-ناوی دێیەكە لەنزیك هەڵەبجە.
٣-ناوی كچانە.

- ترۆ: خوێڕی.
كوڕە ئەو ترۆیە خۆی هەیە تا چاوی سووربێت.
(غەوارە- ل٦٦)

- ترۆكردن: خۆڕی كردن: دەركردنی بەسووكایەتییەوە.

- ترۆكراو: خۆڕی كراو.

- تریان: ١-سەبەتەیەكی پەل و پانە بەشوار: دەكرێ و بۆ ئەوەیە نانی لە سەردادەكێشن:
٢-ترێ تێ دەكرێ.





- ترێ: ئەنور: هەنوور: ئەنگور: ئەنگیر: هەنگور: هەنگوز.
بەری داری مێوە دێمو بەراوی هەیە جۆری زۆرەوەك:
١- ترێ رەشكە: ٢- گزرەبی: ٣- رەشمیری
٤-سۆراو: ٥-باكورمان: ٦-تایەفی: ٧-میرانی:
٨-ترێسپی: ٩-ئاوكە: ١٠-پەسیرانی:
١١-ناسكەترێ: ١٢-زەرتك: ١٣-رەوگە
زۆر جۆری خواردن و خواردنەوە لە ترێ دروستدەكرێ. وەك
١-خۆشاو (شەربەت) :٢-سركە: ٣-رەنگاو:
٤-دۆشاو: ٥-باسوق: ٦-سجووق: ٧-مێوژ.

- ترێ مارانە: گیایەكە جۆری هەیە توكاوی و بۆ گەنە، گوڵەكەی مەیلەو سپییە بەرەكەی لە ترێ دەچێ رەش و تاڵە رەگەكەی دەرمانی لێ دەردەهێنرێت.

- ترياك: تلیاك: وافوور: بافوور.

- ترحەو : ترحێو: وشەی گاڵتە پێ كردن.

- ترێزە: سمت و كولۆك.

- تشت: ١-كشت: ٢-شت: شمەك.

- تشت نابە: قەی ناكا.

- تف: تو: خوزی: خۆزیی: خۆرییس: توف: ئاوی ناو دەم.
توف لە دەما وشك بوو. (كوێرەوەری- ل٢١)
كوڕە شەیتان تفی لەزاری كردووە. (غەوارە- ل٢١)

- تفال: ساوا.

- تفە: دەست پەڕ: ئاوهێنانەوە بەدەست.

- تفە دەست: تفت لەدەستدان بۆ كار پێ كردنی.

- تفەنگ: چەكێكی درێژی سووكی لوولەدارە گوللەی پێ ئەتەقێنرێ جۆری گەلێك زۆرە وەك:
١-تفەنگە كۆنەكانی سالانی (٢٠) زۆربەیان توركی عوسمانی بوون خۆماڵی بوون.
١-كەوكوژ. ٢-تفەنگە رەشەكە.
٣-تفەنگی ساچمەزن.
٤-قونداغ بەگرێ. ٥-قەسلی. ٦-سێ تیر.
٧-پێنج تیر.
٨-تفەنگە شینكە. ٩- تفەنگی قەپاغلی.
١٠-تفەنگی كارخانە یەك فیشەكی دەخوارد.
١١-تفەنگی قەرەبینا.
١٢- جامبێزار.
١٣-حەوت تیر.
٢-لەدوای ئەوانە جۆرەكەی گۆڕاوە وەك:
١-تەیارەشكێن. ٢-كەنەدی. ٣-پەڕەشوت.
٤-مانهیرە. ٥-برنۆ. ٦-كلاشینكۆف.

- تفەنگچی: تفەنگدار: تفەنگەوان: چەكدار: چەك لە شان.

- تفەنگچی باش: نیشان ئەنگێو: ئەو كەسەی یەكەم گوللە لە ئارمانجی دەدات.

- تفەنگچی باشی: لەسەرەتای حوكمی عوسمانی لە كوردستاندا بە ماموری مەركەز، یا معاونی پۆلیس دەگوترا.

- تقدیر: تەقدیر: پلان: نەخشە.

- تقر: ترب: تور:
بەتۆدە چێنری سەرك دەكات و گەڵای سەوزە بە خواردنەوە دەخورێت.

- تککە: دلۆپ: تنۆك: زەنگول.
- تك تك: دلۆپ دلۆپ: زەنگۆل زەنگۆل:

وێستاوە زەنگۆڵ زەنگۆڵ.
ئاونگ لەسەر پەلکی گوڵ.

(تاريك و روون- ل١٠٥)

- تلانەوە: تولانەوە.
- تليت: تريت: نانی ناو شۆربا
- تلی ليلی: کلی ليلی: تريیلی لی: هەلهەلە

ئاوازێکی کەم و کورتی دەنگیە نەغمەیەکی بێ وتەیە بە هۆی (قورگ و زار) و (لچ و لێو)ەوە پێکدێ کە بۆ (بەزم و رەزم) منالّ بوون و شایی و شەوارە و بەزاوابوون و بووك هێنان و بۆنەی شادی هێنەوە ئەم ئاوازە بەکاردێ.

- تم: تم وتم: هەمیشە: هەردەم: هرتم: تمێ.
- تو: ١-هیچ: ٢-ئەتو: ئەتۆ.
- توجار: هیچ جار.
- تواوە: تاویاوە: تاواوە: تۆلاّوە: بەئاوبوون: بوونە ئاو.
- توبی لاویت: ئەتوو جوانکەیت: تۆولاویت: سوێندە واتە بە (لاویت).
- توتکاندن: بەسەردافسین.
- توتکچی: گورزەبەدەست.
- توغدا: خواکەی: خولاکەی: توخودا: توخوا: توخولا ١-وشەی تکاکردن. ٢-راستی گوتن.

توخوا فاتم دە وازبێنە
غەریبم دلەکەم مەشکێنە

- توخم: تۆ

هەموو توخم و تۆوێکی لێ کۆبۆوە.

(شەرەف- ل٧٠)

- توخمە سە: جوینە واتە نەژاد و رەسەن سەگ.
- توخن: تخون: نزيك بوونەوە.

...ناوێرم توخنی کەوم... (شەرەف- ل٢٤٨)

تخوون کەوتنی لایان پەسندنەبوو.

(غەوارە- ل١١)

- تورش: ١-ترش: سماق: ٢-مزر.
- تورتورە: شاور: سافیرە: دوردوگ: فیقە: دودوگ
- توررر...ررر: وشەی بانگ کردنی پەز لە لایەن شوانەوە.
- توك: ١-نفرین:- نزا: ئاهوونزولّە: ٢- کولّك: مووی لەش.

(تووك و نەفرین لەهەموو کوردی سەرزەمینە کرد.

(شەرەف- ل١٦)

- تووك کردن: دوعای خەراپ کردن.
- تومەز: تمەز: جیرەش: تومەس: تومەزانە: تومەرز: تۆمەز: تمەز: وتمەز: ئەتومەزانە.

... تومەس زۆراوبەگ گرتبووی... (گەدا- ل٦٧)

وتەیەکە ئەبێژرێ لە کاتێکا کە بەتەمای شتێك بووبێت و کەچی بەپێچەوانەی ئەوە شتەکە بووبێ.

- تون: ١-تیژ: کەسکون: ٢-کۆلّخانەی حەمام: ٣-شوێنێکی تەسك و تووشە ئاویش ئەبێ وەك تونی مەمەڕی لای لفی.
- تونچی: کولّخانچی:

ئەوکەسەی ئاوی حەمام گەرم دەکات.
توونچی: براله توونی حەمام





پاڕانەوەی بۆ چییە؟ (گەدا)

- توند تەبیات: بێ تەبیعات: تورە و تۆسن.

تایفەی حاجی کەریم هەروان، نەختی توندە تەبیاتن..
(گەدا- ل١٤٢)

- تونە: نییە
- تونوك: تنوك: تاريك: تاری.
- توێکلّ: پەلك: تۆکلّ: تێکول: توێك: توێ: تۆك تیڤل: قالك: بەشی سەرەوەی دار و میوە و هێلکە و... هتد هەندی شتی تر.
- توێی: توێ: توێکل.

توێی جێی: ناوجێ: ناوپێ خەف.

- تۆ: ١-تۆڤ: تۆخم: تحم: تۆم: توو: توێم: توێمە.

ئەوەندە دەغلّەی دانراوە بۆ تۆکردن.
٢-ئەتو: ئەتۆ: ٣-برێشکەی برژاو وەك گولّەبەڕۆژە و.. هتد

- تۆبە: تەوبە: وازهێنان لەکاری گەند.

تۆبەم کردووە، دەچمە حەجێ.

- تۆبەی بە حق کردن: واز لە هەموو خەراپەیەك هێنان.
- تۆبێی: ١-ئەتو بلّێی: تۆ بلّێی:

٢- خۆت بێی

- تۆپ: ١- ئامێرێکی ئاشی ئاوە سەرێکی بلّوسك دەچێتە ناورەهن ئەو سەرەی کە چویتە ناورەهنەکە بەدار و بە تەختە وەکو گورزێکی گەورەی لێ کراوە پێی دەلّێن (تۆپ).

٢-قفل:
٣-شێوە خری لاستیکە بۆ یاری کردن بەکاردێ.
٤-چەکێکی شێوە لولەیەکی درێژە و کۆکوژە.
٥-قوماشی هەلّکراوەی سەرتەختە: ٦-تێکڕا: تۆپ دەفرۆشم.

- تۆپراخ: خاك: خۆلّ: گلّ.
- تۆپال: شەل: شل.
- تۆپانێ: تۆپێن: بەتۆپ یاری کردن.
- تۆپ فڕێنە: جۆرێکە لەیاری کوردەواری کە بەتۆپ دەکرێت.
- تۆپك: گرد: گر.
- تۆپکن: کۆکەنەوە: خڕکەنەوە: تۆپەل کەن.
- تۆپی جەنجەر: بەشێکە لەئامێری جەنجەر لە گۆلّتە دارێکی ئەستوور و لوولەیی و نەختی درێژ پێکهاتووە بالّتەی ئاسنی لێ دراوە ئەم بالّتەیە ئاسنانە بەپۆلاّ دووشاخ کراوەتەوە و بەجۆرێکی والە تۆپەکە قایم کراون.
- تۆتك: کولێرە: خەپلە: ئەستوورك: ئەستوك.
- تۆتۆ: ١-توێتوێ: ٢-ئەتو ئەتۆ: تاکید کردن.
- تۆخ: تێررەنگ.
- تۆودان: پەرتکردنی دەغلە لەکاتی تۆوکردن بەیەکسانی تا هەموو لاتەکە دەگرێتەوە.
- تۆودانی بۆڕ: لەزەوی بێ هێزدەبێت.
- تۆودانی تەنك: بەو تۆودانە تەنکە دەلّێن کە لەزەوی بەهێز دەبێ.
- تۆودەر: ئەوکەسەی دەغل بەزەوی وەردەکات.
- تۆو دەری باش: ئەو تۆو دەرەی لە تۆودانا ناولاتی نەبێت.

- تۆراندن: هەرتەکردن: هەلەتەکردن.
- تۆراخ: توراق: ماستی پەیتی کولاّ.
- تۆراو: تۆرای: تۆریاو: هەرەتە: هەڵەتە

بۆ تۆری کرد بۆ تۆریای
نازدارەکەم کێ لێی دای
لەسەر ئەوە بەدر بەگ تۆراو دەستی سوڵتانی ماچ
نەکرد.. (شەرەف- ل٢٩٠)

- تۆغماغ: ماوەر: ئەوکوتکەی بەردی پێ دەشکێنن.
- تۆریك: تورك: واویك: تورگ: چەقەڵ: دووخۆر: تیرەوو.

چەم بێ چەقەڵ نابێ. (پەند)

- تۆر: ١-چەموش: ٢-لەداودروست دەکرێت بۆ پەلەوەرگرتن.
- تۆزەك: تۆزێ: هەندەك: تۆزێك: کەمەك: کەمێك: بڕەك: ئەندازەیەکی کەم.

ئەگەر تۆزێك شەرمت بە خۆت بایە.
(غەوارە- ل٢٢)

- تۆزکال: تۆزقال: تۆزقالەك: تۆزقالێك: کەمۆکەك: هەندۆکەك: بڕۆکەك: ئەندازەیەکی زۆرکەم.
- تۆغیان: هەڕەمە: هەرەت: وەخت: جەنگە: هەرەمە جەنگەی بەهاری ساڵی هەزار.
- تۆش: ١-ئەتۆش: ٢-تۆیێ.
- تۆشەدانە: تێشوبەرە: تێشوانە: تۆشەبەرە: تێشودان.

جۆرکێکە نانی تێ ئەکرێ بۆ ڕێگای دوور.

- تۆقین: هەترەش چون: روح چوون.

بەتۆقین لێی تۆقی. (غەوارە- ل٩)

- تۆقاندن: داخورپاندن: زراوبردن: دڵ داخورپاندن: هەترەش بردن: روح بردن: ترساندن: راچڵەکاندن: بزداندن.
- تۆقەلە: ترۆپك: پۆپە: دوند: سەرکەل: لوتکە: تۆق: - تەپەسەر: کەمك: تەپلەسەر.

واتە سەری چیا و کۆتایی سەری چیا هەر لوتکەیەك ناوی تایبەتی خۆی هەیە وەك:
١-حەسارۆست: لوتکەی هەڵگورد.
٢-گادەر: لوتکەی چیای ئاسۆس.

لەسەر ترۆپکی چیاکە. (شەرەف- ل٦٧١)
تەپڵە سەرچیا رما و رۆچوو.
(شەرەف- ل٦٠١)
ئەو ترۆپك و نشێوە. (تاریك و روون- ل١٠٧)
خۆر لە تۆقەڵەی کێوی مەلا کاغا شۆر ببووەوە.
(غەوارە- ل٢٤)

- تۆقی تۆپ: پارچە ئاسنێکی پانە دەوری سەری تۆپی جەنجەڕی داوە نایەڵێ تۆپەکەبشکێ ژمارەیان چوارن.
- تۆوکەر: بەو کەسە دەوترێ کە دەغڵ دەچێنێ.
- تۆوکردن: دەغڵ چاندن.
- تۆوکردنی بەتاپۆ: جۆرێکە لە تۆوکردنی زەوی زەوی هی یەکێکە و دەیداتە یەکیتر بۆ تۆو کردن.
- تۆو کردن بەرەهن: رێك کەوتنێك بوو لەنێوان خاوەن زەوی و تۆو کەر لەجیاتی دەغل پارە وەردەگیرا لە رەهینی زەوی لە تۆکەرەکە بۆ چەند ساڵێك.





- تۆکردنی سەربەخۆ: کەسێ خاوەنی زەوی خۆی بێت و بیکاتە دەغل.
- تۆلاز: تولاز: هەرزەکار.
- تۆڵم: تولۆم: ئامێرەکی موسیقایە.
- تۆلکە: تۆڵەکە: تۆرکە: پەنیرە: گیادوگمە: نانی حاجی لەگلەگی: - تۆلك: پەپکەی میچکانە.

ڕووەکێکە گوڵەکەی و پەڕەکانی پان و ورد و جیاجیا لاسك نەرمە و بێ درکە و بێ بۆنە کێوییە بە تۆو زۆر دەکرێ بەکار دەهێنرێ:
١- بۆ چێشت.
٢- بۆ دەربوونی دوومەڵ.

- تۆڵەکە درۆزنە: گیایەکە لە کۆمەڵەی تۆڵەکەیە گوڵی هەمەجۆر دەگرێت.
- تۆڵەکەی زەلکاو: گیایەکی دەشتەکی و رازاندنەوەیە رەگ و گەلاّ و گوڵەکەی دەرمانی پزیشکییان لێ دەردەهێنرێ.
- تۆڵەکەی سپی: جۆرێکە لە تۆڵەکە، لق و لاسکەکەی مووی پێوەیە گوڵەکەی پەمبەییە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت.
- تۆمەت: تاوانبارکردن: بوختان.
- تۆوبراتۆ: جۆرێکە لە دەغل چاندن بەوە دەڵێن کە شتیارێك دوو عەلبە گەنم دەچێنێت لەکاتی دروێنە و رەوسە هەڵگرتن سەرکۆیەکەی دەبێتە چوار عەلبە بەوە دەڵێن (تۆوبراتۆ) واتە تۆیەکە چەندە هەندەی کردییە.
- توو: تفی: توویێ: تێ: تووك: توویی: تی

تووەکەی بەرماڵتان گەلاّ مرواری بەس جواب بنێرە
بۆ یادگاری (مەلۆ- ل٦٨)

بەری داری توو لە هاوین پێدەگات.
لەتامدا شیرینە و جۆری هەیە وەك:
١-تووە سپی: ٢-تارانی: ٣- شاتوو: ٤-بەیاعی ٥-تووڕەش.

- تووترك: تۆودرك: دەوەنێکە و گولەی هەیە.
- تووتن: تەمباکۆ: تەماکۆ: تویتن.

تووتن لێ مەدە دەست تاڵەوی. (گولاڵە- ل٦٧)

- توورەکانە: ئەو بەشەگەنمەی لەکاتی دەغل هاتنەبەرهەم سەپان دەیبات.
- توورەگە: توورەکە: توەرە: جۆرك: جهیز: توورك: توور: ١-جاغ: جاخ: کیسە:

لەپەڕۆ دروستدەکرێت سێ لای دوورایە زارکی هەیە شتی تێ دەکرێت بۆ زەغیرە تێکردن بەکاردێ.
٢-جۆرێکی موتاوە کاو جۆی تێ دەکرێ بۆ ولاّخ لەکاتی جووت کردن.

نانی شوانی چ لەهوری، چ لەتووری.
(پەند)

- توورەگە شوان: گیایەکی کێویلەیە قەدەکەی بێ گەلاّیە گوڵەکەی لە شێوەی هێشوویەکی سپی مەیلەو زەردە بۆ میزکردن و بەهێزکردن بەکاردێت.
- تووڕە: تۆسن: تویڕە

لە ترسی توڕەبوون روولێ وەرگێرانی.
(شەرەف- ل٤٩٣)

- تووڕەق: ١-تووی وشك: ٢-ناوی دێیەکە کە لەبن هەولێر.

- توورەیی: رابەل: رك: خەیدین: هەڵچوون.
- تووشە: ١- میچ: جەگی رەنکراو بۆیاری کردن.
٢- واتە توورەیە و نزیکە لەشەڕ.
- تووکن: کوڵکن: تیسکن: موویین.
بەموو: کەسێ مووی زۆربێ.
- تووکە حەرامە: گەندە موو: گەنەموو:
گەنەمووی دەم و چاو مەچەك هەڵ نەگرتوو.
- توولە: تویلە: گجولە: بێچوی سەگ: تووتکە سەگ: - تووتە کۆلە: بۆچك: قویلە: گوجیلە: تووتە.
- توونی: تێنو: تێنوی: تێهنی: تی: تێنی: تهن: تینو: توونی: تەژنە: تینی: تیهن: تینگ.
...لەتینوان خیز لەگەروویدا وشك...
(غەوارە- ل٣٢)
..کە تینووش دەبوو شەو درەنگانێ...
(بۆرە- ل٧)
- توونیل: لە غەم: دەخمە: جۆگای ژێر زەمینی.
- تە: ١-ئەتۆ: تۆ.
٢-چەرموو: ناوی سپیانی (مەڕی) کوردییە ئەمەش جۆری هەیە.
١- تەڕوومەت رەش: ئەو سپیانەی کە خورییەکەی هەموو سپییە تەنیا دەم و چاوی رەشە.
٢-تەڕوومەت شین: سپیانی دەم و چاوشین.
٣-تەڕوومەت زەرد: سپیانی دەم و چاو زەرد.
٤-روومەت سپی: سپیانی دەم و چاو سپی.
- تەبا: رێك و پێك: کۆك.
- تەبای: وەکو.
تەبای خەڵکی:وەکو خەڵکی.
- تەپ تەپ: ١-لێدانی دڵ لەکاتی ماندووبوون یان تورە بوون.
٢-دەنگی رۆیشتنی پێی کەسێك کە خێرا بڕوات.
- تەبەرا: بێ قەدەغە.
- تەبەش: ١- سپیانی دەم و چاو رەش و نیو چەوان سپی.
٢-مرۆڤی دەم و چاو خڕ.
- تەبەق: ١-تەبەك: قیرتەبەق: وەکو سینی وایە لەدار دروستدەکرا.
...تەبەکی هەڵوادەگێڕن...
(گەدا- ل٧)
٢-شەلکە: نەخۆشییەکی درمە تووشی گا و مانگا و ئاژەڵ دەبێت.
- تەبەقە: بردنی دیاری بۆ بوك و زاوا دوای هەفتەیەك لە گواستنەوە.
- تەبەقی رۆژ: شێوە بازنەییەکەی رۆژ کە سەرەتای بەیانیان لەکەلەوە سەردەردێنی.
- تەبیات: تەبیعەت.
- تەپ: ١-تەو: پۆك: چەپە لۆك: ٢-دژی گورج.
- تەپاڵانە: جۆرە پیتاکەك بوو کە خاوەن موڵك لە جووتیاری دەستاند لە (٢٠٠-٥٠٠) تەپاڵەی دەستاند.
- تەپاڵە: شیاکە: ئازاڵە: تەپك:
چەنگە ریخێکەبەتەڕی لەگەڵ قەسەر لێکی دەدەن و دەیشێلن بە دیواریدا دەدەن تاوشك دەبێتەوە.
- تەپان: ١-دوو بالینەیە بەدرێژای کورتانی شەغرە لەکۆنە گوش و لبادو پەرۆ دروستدەکرێت





لەسەرپشتی کورتانی ولاغی شەغرەی دەبەسترێ.
لای پێشەوەی بڵند دەبێت تاوەکو شەغرەکە بەلای سەریدا وەرنەگەڕێ و نەڕوات.
٢-رۆچون: ٣-بەشێکە لەبێشکەی منالان.
- تەپاندن: رۆچواندن: رووخاندن: بەسەریەکدا.
- تەپس کردن: نهێنی نەدرکاندن: سوورِ داپۆشین: بەرد لە سەردانان.
- تەپسی: ١-سینی بچووك: ٢-جۆرە خواردنێکە
- تەپکی سەر: تۆقی سەر: لای سەرەوەی لوتکەی چیا.
- تەپشو: تەوشو: ئامرازێکی دارتاشی و بەناییە دار و بەردی پێ دەتراشن.
- تەپڵ: دمبەرەك: دمبەك: دمەك: دمبك: دمبەڵەك: دوومەڵەك: زەرب:
ئامێرێکی مۆسیقایە لەشی ئامێرەکە لە (گلێنە یاخود کانزا یانیش (دار) دروستدەکرێت پیستێکی تەنك لە دەمەگەورەکەی دەگیرێ، چەند جۆرە و شێوەی هەیە.
دەبدەبەی (دمەك- دمبك) سەدای تەپڵی باز..
(شەرەف- ل٧٢٤)
- تەپڵ کوت: تەپڵ ژەن: دمبك چی: ئەو کەسەی تەپڵ دەکوتی.
- تەپڵە: جۆرە کڵاویکە وەستای تایبەت لەخوری دروستی دەکات ئەیسووێتەوە وارەق ئەبێ خەنجەر نایبڕی پیاو لەسەری ئەنێ.
- تەبڵی باز: ئەو تەپڵەی کە بۆ رێکەوتنی لەشکر لێ دەدرێ.
- تەپڵچی: ١-بەو کەسە دەگوترا لەلایەن خان مووچەی تایبەتی هەبوو ئیشی ئەمەبوو ئاغا کاری بەخەڵك کۆکردنەوە بووایە، تەپڵچی ئەکوتا و خەڵك کۆدەبۆوە.
٢-تەپڵ کوت.
- تەپڵی سەر: ١-دووندی چیا: ٢-تەختی سەر.
- تەپڵی قیامەت: واتە رۆژی قیامەت.
دەڵێن رۆژی قیامەت خولاْ.
دەماندااتێ ئیمانی
(تحفە-١- ل٢٠١)
- تەپۆڵکە: گردی بچووك:
- تەپە: ١-دەنگی کەوتنی شتی لەبەرزییەوە.
٢-وشەیەکی تورکییە واتە گرد.
- تەپەسەر: چەوساوە: کەسێ ئازاد نەبێ و سەربەستی لێ زەوت کرابێ.
- تەپەسوڕی: وڕبوون: هوڕبوون: بێ هۆش بوون لە ئەنجامی رووداوێکی ترسناك.
- تەپێکە: لەپێکە: بیکە پاتەوە:
فەرمان پێ کردن بەکەسێ بۆ لەپێ کردن.
- تەپین: رمان: رووخان:
بەسەریەکدا کەوتنی دیواری خانوو.
- تەپ: پەچە: دەست: بەزمانی منالان:
- تە تەڵەمیران: کایە: بالیفۆکە.
گیانداریێکی ڕەش باوە کۆلکنی بەهاری جومگەداری درێژە دوورێز قاچی هەیە لە هەزارپێ دەچێت.
- تەجاوز: تێپەراندن: پێلێ هەڵبڕین.

شۆل لیٚ هەڵکێشان: لەتام بردنەدەر: سنوور بەزاندن: لەتام چونەدەر: بیٚ تام کردن: لەئەندازە دەرچوون.

١-کاری نابەجیٚ کردن

٢-قسەی نارەوا کردن

- تەجرەبە: تەجروبە: جەرباندن: تاقیکردنەوە بەکارهێنان بۆ لیٚ زانین.

- تەح: تەحا: ئامرازی تەعەجوبە.

تەحا لەو جووتە چاوە!

- تەحر: جۆر: چەش: نەوع: رەنگ

- تەحەمول کردن: بەخۆوەستان: دڵ فرەیی: بەرگەگرتن: خۆگرتن: پشوودرێژی

- تەخار: خواردت

- تەختە: ١- لە موو دروستدەکرێت پانایی گەزێکە و درێژی تابیست گەز دەبێت رەشماڵی لیٚ دروست دەکرێت.

٢-داری پان و رێك.

- تەختەرەوان: ژوورێکی بچکۆلانەیە لەتەختە دار دروستکراوە شووشەبەندە بەرەورەوە ئەروات ئافرەت سواری ئەبێت دوو ولاٚغ رای ئەکێشن.

- تەخشان و پەخشان کردن: پەرت و بلاٚوکردنەوە.

- تەدبیر: تەگبیر: تەویر: تقدیر: شێور: مشور خواردن لەکاری: تەکبیر.

تەویرم کردووە تەویری خاسە. (مەلۆ- ل٣٢٩)

هیزە تەکبیر چیە!؟ (غەوارە- ل٣٩)

- تەرازوو: ١-تەرازووی: ترازوو: میزان ئامرازی کەل و پەل کێشان.

٢-چوار ئەستێرەی ئاسمان بەیەکەوەن بەکەلووی تەرازوو ناسراوە (برج میزان).

- تەرت: زۆرگ: هەورازێکی بەردەلاٚن.

تەرت و رژد و شیو و دۆڵ

لێی هاتەدەر گیا و گۆڵ (تاریك و روون ل١٠٤)

- تەرت و تونابوون: تەرت و وێران بوون.

- تەرحەل غەزالی: بەپەسندی ئەسپ دەڵێن.

- تەرخ: تەرك.

- تەرخان: جیاواز: جوودا: جهی: جووی کراوە.

- تەرخکردن: تەرك کردن: وازلیٚ هێنان

- تەرخون: ناوی گوڵێکە پەرەکانی بەرامبەر و بەرێزن و لاسك نەرمە.

- تەرجومە: وەرگێڕان: پاچفە: گۆڕینی.

١-نووسین بۆ سەر زمانێکی تر.

٢-قسەی کەسی بۆ سەر زمانی تر.

- تەرز: جۆر: چەشن: تەرح: تەرع: نەوع: رەنگ: شێوە.

خەڵك ئەڵێن کفرەمەکە بەم تەرحە مەدحی یاری خۆت.. (ماملیٚ- ل٥٢)

- تەرسەقول: قەرسەقول: تەرس: پیسایی کەر و ئەسپ و ئێستر.

قەرسەقول بە کەرتك بیٚ هەردووکیان بە نەعلەت بیٚ. (پەند)

- تەرش: ترش: سەوال و پەزە.

- تەرم: جەنازە: مەیت: جەسەی بیٚ گیان.

قەلپە لە دیار تەرمەکانەوە وەستا و...

(غەوارە- ل٦٨)





- تەرزەی: جلدروو: بەرگ درووو: خەیات.

- تەرەکال: ١-تەراز: سەبزە: سەوزە: سەوزەوات:

- تەڕە: سەوزی:

ئەو رووەکەی کە هەموویان بەشێکی راستەوخۆ بخورێت یان بکرێت بەجێهشت.

٢-دواکال: تەرەکال: هەرتۆیەك لەچلەی زستاندا بکریٚ.

- تەرۆزی: ترۆزی: تریٚ زوو: چەمەرە خیار: خەیار چەمەرە: بەتۆ دەچێنریٚ لە تیرەی ئاروە گندۆرە و تەرۆزی ئەو ساڵمان...

(غەوارە- ل٦٨)

- تەریقەت: رێباز: پاش بلاٚوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و پەرەسەندنی پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (ص) وەچەی یەکەم و دووەمی موسڵمانان لەناو موسولمانان چەند رێبازێکی ئایینی پەیدابوو کەپاشان تەریقەتەکانی ئەهلی تەسەوف لەسەر بناغەی ئەو رێبازانە هاتنە ئاراوە یەکیٚ لەو تەریقەتەش کە پاشان لەسەر بناغەی ئەو رێبازانە پەیدا بوون وەك تەریقەتی نەقشبەندی.

- تەریقەتدان: خەڵك هێنانە سەر رێبازی تایبەتی شێخایەتی خەڵك کردن بە دەروێش.

- تەریقەت وەرگرتن: بوون بە دەروێش پابەندبوون بەپەیرەوپرۆگرامی خاوەن تەریقەت.

- تەریقەتی علوانی خلوەتی: یەکێکە لەتەریقەتەکانی کە لە کوردستان بلاٚبۆوەتەوە ئەم رێبازە لەسەردەستی (بابا رەسولی گەورەی بەرزنجەیەوە لەنێوساداتی بەرزنجە و هەموو کوردستان بلاٚوبۆوە لەسەدەی شانزەهەم) بابە رەسولیش ئەم رێبازەی لەشێخ شەمسودین شوشە بادینەوە وەرگرتووە.

- تەریقەتی نووربەخشی: یەکێکە لەتەریقەتەکانی کۆنی کوردستان سەید محەمەدی نووربەخشی برای سەید عیسا و سەید موسابەرزنجە دایمەزراند.

- تەریقەتی نەقشبەندی: کاتی خۆی مەولانا خالد چووە بۆ هیند لەسەردەستی شاه عەبدوللای دیهلەویدا تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە گەراوەتەوە کوردستان بۆ ئیرشادکردن.

- تەڕاش: دەوەن: پنچەداری گەورە.

تەڕاشی بکەینە ئاش: دەوەن بەئاش کردن.

(پەند)

- تەڕاوز: تەڕاوس: هەرتۆوێکی لەدوای (١٣ی مانگی ١٢) بکریٚ کە لە زستانە پێی دەڵێن (تەراوز) یان دوای کەوتنی پەڵە یان لەگەڵ هاتنی حاجی لەق لەق.

- تەڕکوژ: بەو پیستەیەی دەگوتریٚ کە پەنیری تێدەکەن بەمەرجێك هی کوشتی ئەوساڵبێت و نویٚ بێت.

- تەڕووشك کردن: تیروپشك هاویشتن.

- تەڕەتولە: تەڕەتیزە.

- تەڕەتیزە تاڵە: گیایەکی دەشتەکییە تۆوەکەی ورد زەردە و توونە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت.

- تەرەتیزەی ئاوی: رووەکێکی بۆن خۆشە گوڵێکی زەرد دەگرێت.

- تەڕەسـاڵ: وەرزی زسـتانی، ئاسمـان بەهـەور و سەران بەتەم و ڕەهێڵەی توند و ڕێژنەی بەخوڕوەم پڕ لە لەنگیزە و باسریشك و قـوڕ و چـڵپاو و جلێتـاو بەهاری زۆر بەباران و بارانی زۆر.
- تەڕیەتی: تەڕاتی.
- تەرزەلوکـە: نـەوەکو تەرزەرەقـە و نـەوەکو بەفرنەرمە ئەتوێتەوە.
- تەڕە ماست: پاییزان هەندێك ماست لە گۆزە و تەنەکە ئەکەن، ڕۆنی قرچاوی بە سـەردا ئەکەن لە شـوێنێکی فێنـك دادەنـێن زسـتانان بـە کەوچـك شوێنێکی ڕۆنەکە ئەشکێنن و ماستەکە دەرئەهێنن.
- تـەزرە: عولۆلیـك: تەوەرگـە: تـەوەرگ: تـەرزە: تەگەر: تەگرەگ: تەورگ: تەیرۆك:
تەگەرگ: گلێرە: گۆك: تـەرگ: گارپیـسۆك: زیـپ: گۆلۆك: خرخرۆك: بەرخۆرك: تەگر: تەوەرك: زیپـك: تەگـژۆك: کۆژلـوك: گاریـسۆك: تـەرەز: گزلـوك: کۆزلۆك: گۆلوك:
لەهـەڵمی ئـاو لـەئاسمان دەبەسـتی و لـە شـێوەی دەنکی وردی ڕەقە بەسـترای دەبـارێ گـەڵا و گـوڵ ئەشکێنی.
تەوەرگ کوتشن کرد: تەرزە کوتی کرد.
(ئیدیوم- ل١٠٤)
- تەزین: تەفز: تەفزین: سڕبوون: کاتی دەسـت یـا قاچ سڕدەبێ.
- تەسك: تەنگ: دژی بەرین.
کونەرێوی هەبوو تەسك بوو.
(بۆرە- ل٣٦)

- تەشت: تەشتە: دەفری گەورە بۆ جل شۆرین.
- تەشك کەوتن: قاچ لەجێ دەرچوونی کەر.
- تەشقی سەرما: سەرمای بەتێن.
- تەشی: ئـامێرێکی خـوری و مووڕسـتنە لەسـێ پارچە پێکدێ.
١-کلکە تەشی: دارێکی خڕ و باریکـە و تابـەرەو خوار دەچێ باریك دەبێتەوە.
٢-سەرکەتەشـی: پارچـە دارێکـی خـڕ و پانـە ناوەندەکـەی کونـە دەسەرکلکەتەشـی دادێ و توند دەبێ.
٣-نێرکەتەشی: تێلێکی پتەوی وەکو چەنگاڵ وایـە لەسەری هەرە سـەرەوەی کلکـە تەشـی دەگـیرێ و لـەکاتی تەشـی ڕسـتندا داوەکـەی بەناوادادەچـی تەشییە باریکە، خوری مێ تالە. (گوڵاڵە- ل٦٨)
- تەشیلە: تەشی بچووك.
- تەعزی: تازیە: پرسە.
- تەعل: یەغبال: ئیغبار: بەخت.
- تەعمیل: تەحموول.
- تەغاراو: حەوزێکە یان دەفرێکە پێستەی تیـا دەخوێنرت.
- تـەغمین کـر: تـەخمینی کـرد: لێکیدایـەوە: مەزەندەی کرد.
- تەفسیر: وەلامـە: ڕاڤـەکردن: شـەرح کـردن: شرۆڤەکردن.
- تـەفرەدان: ئیخفـال کـردن: خافڵانـدن: خـەریك کردن: لاسدان: فـوودان: فریـودان: دەسـخەرۆکردن: خاپاندن: تـەپ پـێ کـردن: لەخـشتە بـردن: قـۆڵ





شکاندن: قـۆڵ بـڕین: دەسـت بـەزاخاکردن شـۆپ: ڕێشگاوی کردن: دەسـت خـستنە قـۆرتێ: دەسـت بـڕین: تـێ خـستن: خڵەتانـدن: دۆشـین: لەڕێگـە دەربردن: هەڵ خەڵەتاندن: کەڵەك لێدان.
- تەقەڵ: ناوی ئەو نیشانەیە (-) کـە لەنووسـنیدا بـەکاردەهێنری لـە نێـوانی ١-ژمـارە و شـتە ژمێرداوەکەدا (وەك ئیش کردنی ڕێك دەبێ بە هۆی تەندروستی باش).
٢-پێش گوزارەی ڕستەیەك.
٣-دوورمان.
- تەڤکاری: تۆبەکاری: کاری تۆبەکردن.
- تـەڤن: تـەون: ئـامێرێکی چـنینە سـتونییە لەدووکاریتەی نارێکی یەك بەژن بڵنـد پێـك دێ بـۆ چنینی (مافور، تیڕ، جوال، خرار، ڕەشماڵ، بەکاردێ.
- تەقە: قاقەز وەکو نوشتەی لێ ئەکـەن ناوەکـەی پڕ ئەکەن لەباروت ئەولا سـێ گۆشـەییەکەی کـە درێژترە چاڵی ئەکەن و فتیلەی تێ ئەخەن بۆ شەوی نەورۆز لەسەربان ئاگر ئەکەنەوە ئەم تەقەیە ئەخەنە ناو ئاگرەکە و ئەتەقێتەوە.
- تەقتکردن: تاقەتکردن: شاردنەوەی باش.
- تەقەڕاو: واتە ڕاوی ئاسك.
- تەکۆز: ڕێك و پێك.
- تەکەنم: نیودەر: نمدەر: ڕاییخی بچووك.
- تەگە: ١-سابرین: نێرەی ڕەشان لەسـاڵ و نیـو تـا دوو ساڵ و نیو (کوورە) لەوە ڕەت بێ دەبێتە تەگە.
٢-لەگەڵ : تەگەتینی: لەگەڵ دێنی.
- تەگەگرتن: جووتبوونی نێری و بزن.

- تەگەی خرت: تەگەی تەمەن سێ سال و نیو.
- تەگەی یەك قەیرە: تەگەی خرتی چوار ساڵ و نیو.
- تەلاجە: سەلاجە: ڕۆژانێك: بەفرخەرەوە: بەفرکار: سەهۆڵکار: سەهۆڵی کەر: سەهۆڵدان.
- تەلاش: هەراسانی: نیگەرانی.
- تەڵاق بەتەڵاق: ئەمەیان دووچاری ئـەو کەسـانە ئەبێ ئەگەر ناکۆکی کەوتە نـاو یـەکێك لـەو دوو خێزانە کەژن بەژنەکـەیان کـردووە گەیـشتە ڕادەی لێك جیابوونەوەی پیاو و ژنێکیان ئەوا لایەنەکـەی تریش ناچار ئەبێ دەست لە ژیانی ژن و مێردایەتی هەڵگرن و ئەوانیش لێك جیابینەوە.
- تەمادانان: بێ هومێدبوون.
- تەماشاکردن: سەیرکردن.
تەماشایان کرد مراوێك لە ئاودا هاتووچۆی ئەکرد.
- تەلیسم: ئەفسون.
- تەڵمی وار: بارگە سوار.
تەڵمی وار ڕەنگین بەلبادی سور
(گوڵاڵە- ل٣٠)
- تەلەفوز: کرك: کرك کردن.
- تەلەتەل: ماتەمات.
- تەڵەب: داوا: دەعوا: مونا.
- تەڵەکەباز: فێلباز.
(تەلەکەبازی عەولا ئاغای هـەر) ئـەودەم بـۆ ڕوون بووەوە. (خاك- ل٩٤)
- تەلەفۆن: دوور ئەژنەو.
- تەم: مژە: مژ: کەهەور زۆربێت لەئاسمان و بێتـە سەر زەوی لەزستاندا.

- تەماتا: تەماتە: باجانا سۆر: باجانا شامی: ئفرنجی: بەشتل دەچێنرێ وەرزییە خواردنێکی گرنگی مرۆڤە.
- تەماتە: ١-تەماتا: ٢-بەتەمای.
- تەماع: تەماح.
- تەمەن: عومر: عەمر: حومر: ژی: سونع: بریتییە لە قۆناغی ژیانی مرۆڤ دیاریدەکات. خێزانە کوردەوارییەکان راهاتوون کە ژیانی منداڵییان تا رادەیەکی زۆر بکەن بە چەند قۆناغێکی دیاریکراو بە پێی تەمەن و نیشانە و قەبارەی لەش و بەرهەمی بەدەستهێنان و خۆراك بە منداڵ وەك ئەمانەی خوارەوە

قۆناغی یەکەم

١- کۆرپە: ئاولەمە: منالٚ: زراچك.

کە لە زگی دایکی دابێت تاکو (٩) مانگ و (٩) رۆژ و (٩) سەعات و (٩) دەقیقە تەواو دەکات.

قۆناغی دووەم:

مەلۆتکە: قۆنداغە: قنۆرکە پێچ لە تەمەنی لە دایك بوون تاکو تەمەنی (٧) رۆژ: ساوا

قۆناغی سێ یەم

شیرە خۆرە: تەمەنی کە دەخرێتە سەر لانك تاکو ساڵێك و نیو.

خەریکە نواندنی ساواکەی بوو. (خاك-١-ل٨)

قۆناغی چوارەم:

سەرپێ یان هەڵسوکەوت یان دەڵێن منالەکە نانی بابی دەخوات واتە لە شیر براوەتەوە کە دەکا (٢-٣) ساڵ.

قۆناغی پێنجەم:

سەرکە و بنکە: واتە لە (٤-٧) ساڵە

بەخۆی و پێنج منداڵی سەرکە و بنکە

(خاك- ل٨)

قۆناغی شەشەم:

(نانەبەر) ئەو تەمەنەیە کە تێیدا منداڵ دەتوانێت نان و دۆ بەرێت بۆ سەپان لە سەردرە و یا لە سەر خەرمان.

قۆناغی حەوتەم:

پارچەلە:کوریژگە: تولەك: نیمچە عازەب: ئەم قۆناغەیە کە دەکەوێتە پێش هەرزەکاری کە دەکاتە (١٠-١٣) ساڵ دڵی لەگەڵ فاتێ کە پارچەلە بوو.

(خاك- ل١٨)

قۆناغی هەشتەم:

جاحێڵ: جحێل: ئەوەل عومر لە (١٣-٢٠) ساڵ

(تەمەنی گوڵ: جەنگەی بەهاری ژیان: هەرمەی ژیان: هەرەتی لاویەتی: تۆغیان).

- قۆناغی نۆیەم: پیاو لە (٢٠-٣٠) ساڵ.
- قۆناغی دەیەم: قەیمە پیاو: (٣٠) ساڵ.
- قۆناغی یازدە: بە ناوساڵ کەتی: کاملە پیاو: لە (٤٥-٥٠) ساڵ.
- قۆناغی دوانزە: پیر: ئەختیار: لە (٧٠) ساڵی بەسەرەوە.

خۆ لە ماڵی پیرە پیاوێکی هەشتا ساڵەی.

(حەمەدۆك-٢-ل١٤٢)

- قۆناغی سێزدە: دوایی قۆناغی ژیان واتە مردن.





- تەمار: دەمار: رەگ.
- تەمری: کوژاوە.
- تەمووتەمان: تەم و مژ.
- تەمەت: هندی: هەندی.
- تەمێ: نەسیحەت: ئامۆژگاری.
- تەمیرە: تەمورە: تەنبوور: ساز: بزوق: ئامێرێکی مۆسیقای ژێدارە ناوی ئامێرەکەش واتا (تەنبیر) یاخود (تەنبور) زۆربەی زانایان وای بۆ دەچن (فارسی)ی بێت، بەڵام ئەوەی باوە ئەم ئامێرە تورکەکان (ساز) و عەرەب (بزق) و کوردیش (تەنبیر).
- تەمبورژەن: تەنبیرژەن.
- تەنبەڵ: تەمەڵ: تەمبەڵ: تەپ.
- تەندور: تەنوور: تەندویر: تەنویر: ئارتوون: ئارگوون لە قوڕی خوساو و خوێ و مووی بزن دروستدەکرێت (٠,٧٥)م قوولە و تیرەکەی نزیکەی (٠,٥٢) دەبێ، لە عەرد دەگیرێ هەر چوار دەوری بە قور سواق دەدرێ،

لەلا تەنیشتێکی خوارێ گولبینەیەکی تێ دەهێشترێتەوە. بەدار و چیلکە گەرم دەکرێ تاسوور دەبێتەوە ئینجا ئەستورکی پێوەدەن و دەیبرژێنی.

- تەندوورەی سەروچاوە: شوێنی پڕ ئاوی دوای زارکی سەروچاوەکە ئاوی سەروچاوەی لێ کۆدەبێتەوە.
- تەنگانە: تەنگایی: سەختی: سەخڵەتی: تەنگاوی تەنگاهی: گیروگرفت: گۆلێژە.
- تەنەکە ساز: تەنەکەچی.
- تەنگ: ١-تەسك: ٢-ناسك.
- تەنها: تەنێ: تەنیا: تەنا: تنێ.

(تەنیایەك بەرەجۆتی نەبێ)

(خاك -١- ل٩٤)

- تەمبولی: جۆرێکە لەشایی کوردەواری.
- تەوش: ١-بێ فیدە: بێ فایدە: بێ خێر: بێ مانا: (گوتنێك گوتنی بێ سوود).

٢-کاری بێ قازانج.

- تەواشاکە: تەماشاکە: برۆنە: بروانە: سەیرکە: بنواڕە.

تەواشاکە ئەو شۆرەسوارەی تەرخانی.

(رشتە- ل٢٨)

- تەواوەك: ماوەیەکی زۆر: تەواوێك:

سورمێ دوای تەواوێك نووکە نووك.

(غەوارە- ل٢٢)

- تەواو مەنزڵ: بەو بازە دەگوترێ کە بە تەواوی راهێنرابی و بە تەواوی راوبکات.
- تەوەن هاڕە: بەردەدەستاڕ.
- تەوەرە: پارچە ئاسنێکی درێژی پانە ناوەڕاستەکەی کونکراوە، ئەم سەر و ئەو سەری ئەو ئاسنە بەلای سەرەوە چەمێنراوەتەوە کونی ئەو ئاسنە ئەکەن بە میلەکەدا و لێ توند ئەکرێ ئەمەش ئامرازێکە لە ئامرازەکانی ئاشی ئاو.
- تەون: تەڤن.
- تەونکردن: واتە هەموو ئەوشتانەی کە بە تەون دەکرێت.
- تەونکەر: تەونچی: تەونگەر: ئەو کەسەی بەئامێری تەون بەڕوفەرش و جەوال و تێر و رەشماڵ و گوریس دروستدەکات.

- تەوێڵە: تەویڵە: تێۆڵە: ژوورێکی درێژ و ئاخوری تێدایە شوێنی حەوانەوەی وڵاغە.

شەوانە ئێستره بۆز فەرمانڕەوای شەشدانگی تەوێڵە بوو.

(گەدا- ل٤٥)

- تەوی: ١-دختۆر: دکتور:

٢-تاوێ ماوەیەکی کەم.

- تەها: ١-ئەی ها: وشەی سەرسوڕمان.

٢-تەهۆ:

ناوی کوڕانە.

- تەهالۆك: تەها+لۆك: بۆ بچووك کردنەوە و سووك کردنە.

- تەیان: دەست پێ کردنی لە غەمی کارێز لە سەرچاوەوە.

٢- کێرکەر: ئەو ژنەی خزمەتی ماڵان دەکات بە پارە.

- تیان: مەنجەڵێکی گەورەیە لەمس دروستکراوە لەشێوەی لوولەك بەرزی (١٦)پێ بوو تیرەکەی (٦-٨) پێ بوو ئەم مەنجەڵە کەرەسەی خاوی تێدا دەکوڵێنرا لە دروستکردنی سابوون بەکار دەهێنرا.

- تیبوون: تینووبوون: تێنی بوون.

- تیت بوویە: باریك بووە.

- تیتە: جۆرێکە لە خشڵی ژنان.

- تییتۆ: دێتەوە: بێتەوە.

هەتا تییتۆ لە خاکی بانە

(هۆنراوە گەرمیان)

- تیر: ١-یەکجار کەلا هاویشتن لەیاری ماتانێدا.

٢-ئەو دارە نووك تیژەی بەکەوان دەهاوێژرێ.

٣-دژیڕوون: ٤-کێشە و هەرای لە بچووکییەوە گەورەبێ و زۆر بخایەنێ.

- تیراوە: ناسوور: ئەو برینەیە کە دوای چاك بوونەوەش سەرهەڵبداتەوە.

- تێرایی: بایی: بەش: پەش".

- تێرایی دەکا: بەش دەکا.

- تیردان: تیرپێچ: جێگای تیری کەوان.

- تراویلکە کردن: رێشکە و پێشکەکردن.

- تیروکەڤان: تیروکەوان.

چەکی شەڕکردن بوو لەپێشاندا.

- تیرە: ١-سەردەرە: داری نێوان دوو کەوەی لانك کە بۆ هەڵگرتنی لانك بەکاردێ.

٢-بەرە: لەبنەماڵەپێك دێت.

- تیرەی حوشترۆکە: لەچەشنی دار ئەقرەبەیە بەم دواییە دروستدەکرا لە دوای حوشترۆکە بەرامبەر بە داری ئەقرەبە بە زمانە دەچووە ناو حوشترۆکەکانی جەنجەر.

- تیرۆگ: وەردێنك: وەردێنە: وەردێنکە: تیرەنان: دارێکی بە خەرات خۆش کراوی نزیکەی (٧٥)سم درێژ دەبێت بەزۆری لەدار جاو دروستدەکرێت بۆ هەنگوتك پان کردنەوە و کردنە بە نان لەسەر فەرشە ژن بەکاری دەهێنن.

- تێرێژ: تیراژ: تیرێژوو: پارچەپەرۆیەکی درێژە و لەم لا و لەولای کراس دەبڕێتەوە: ٢-تیشك.

٣-چۆڕاوگەی خوێن.

- تیز کاددن: لوشکەی داوین: جۆتکەی داوێن کەر و بارگین.





- تیز کاددی: لوشکەی داوی: جۆتکەی داوی

- تیژ: ١-خێرا:

بەتیژی: هات ڕەت بوو:

٢-خواردنی پڕلەبیبەر:

٣-دژی کول: کۆر

چەقۆکەتیژەددانی لە کەباب تیژ کردبوو.

(تحفە -١- ل١٩٢)

- تیژاو: ١-تێزاب شلەیەکی کیمایە زێڕی بێ گەردی لە ناپاك پێ جیادەکرێتەوە.

٢-ئەو ئاوەی بە ئاو گەردان لەو (قلی و قسلە) دەردە هێنرێ بۆ سابوون دروستکردن.

- تیژکردن: سوونەوە: سوانەوە

- تیشك: گزنگك: گەزەنگ: گزەنگ.

- تیڤل: توێکل: قالك.

- تیل: بڵند: بەرز.

- تیلاك خوارکردن: جەمەدانی هێنانە سەر نێو چەوان ئەمە لەکاتی کەیف خۆش بوون دەکرێ.

ئەمنیان کرد تەبریە

تیلاکی خۆم خواردەکرد

- تیلم تیلم: پارچە پارچە.

- تیمار: ١-بەوپارچە زەوییە ئەمیرییە دەگوترا لەکاتی دەوڵەتی عوسمانی کە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەدرایە هەندێ کەس تادەیەکی دەستکەوتەکەی بۆ خۆیان لێ وەربگرن بەرامبەر بەوەی لەکاتی پێویستدا ژمارەیەك چەکداری ئامادە کراو پێشکەش بەدەوڵەت بکەن.

٢-ناوی چەند گوندە لە کوردستان تیمانج ئەو پێستەیە کە خۆشدەکرێ ئەوەندە نەرم و تەنکە دەڵێی پەڕە کاغەزە.

- تن: نیشانەی چاوگە لەزمانی کوردی وەك خستن، فرۆشتن، گەرتن.

- تیو: تیك: لای باریکی خشت و کەرپوچ.

- تێ: ١- دێ: یێی:

٢- تا: گەرم بوونی جەستە:

٣-ناوی پیتی (ت).

- تێ ئاوتین: هاوێشتنە ناو: خستنە ناو.

- تێبینی کردن: حساب کردن: مولاحەزەکردن.

- تێتەقاندن: هەڵاتن.

- تێچون: لەناوچوون.

- تێخانی: بەدیاردەکەوێ.

- تێخرنجان: تێکەوتن: تێکەتن.

- تێر: تەسەل.

ئینسانێکی ساغ و تێروتەسەل بویە.

(گەدا- ل٢٣)

- تێرخواردن: ١-سك تەژی کردن.

٢-دەوڵەمەند بوون.

- تێرێ: دێنێ: دینی.

ئەچێ لەو ئاوەبێ فەرەکەی ئەو خوارە تێری؟!

(رشتە ٨-ل٢٨)

- تێروپڕ: زۆرزۆر: گەللەك.

تێروپڕ بۆ حاڵی خۆی گریا. (غەوارە- ل٩)

- تێرخەوبوون: زۆرباش نووستن.

- تێرکەڤر: بەبەرد: شوێنێ بەردی زۆربێ.

- تیٚرمانا: پڕمانا: زۆر بەمانا.

- تیٚڕ: بۆ ئاوهیٚنان بەکاردێ.

لەخیٚوەت دروستدەکریٚت کە دەخریٚتە سەر ولاغەکە هەریـــەکیان دەکەویٚتـــە ســـەر لاتەنکیٚـــشیٚکی ولاغەکە.هەرلا تیٚـرِەییٚکیٚش سـەرەوەی کراوەتـەوە وەکو کونیٚکی لەگۆشەی لاپیٚشەوەیە.

- تیٚڕامان: تەماشاکردن: سەیرکردن: رۆنین: روانین.

- تیٚشتان: چەشتنگان: چیٚشتنەگاو: کیٚشتان

کاتی ئیٚواران بەیانی و نیوەڕۆ. (شەرەف- ل١٥٦)

دانەویٚڵە و تیٚشوی زۆر وەسەریەك.

- تیٚـــشوو: تۆشـــە: ئازۆخـــە: ئازوقـــە: تویٚـــشم: دانەویٚڵەی و تیٚشوی زۆر وەسەریەك.

- تیٚفکرین: لیٚکدانەوە: بیرلیٚکردنەوە.

- تیٚك: تیٚکرا: تەواو: هەموو: گش: گـشت: تـەڤ: بەجارەك: لیٚکڕا.

تیٚك وەرن: یانی گش وەرن: تیٚکڕا وەرن.

- تیٚکۆشەر: کۆشیار: هەوڵدەر: کۆشەر.

- تیٚکەر: تیٚکەڵ.

- تیٚگەهیشتن: تیٚگەیشتن: زانین.

- تیٚل: ١-تەل: ٢-تەلەگراف: بروسکە.

لەتیٚلیٚیدا: واتە بروسکەی کرد.

- تیٚلەگە: باریٚکی سووك و قەبارە گەورە

لەپووش یا قەسەل ئافرەت بە کۆڵ هەڵدەگرێ.

- تیٚل لیٚدان: بروسکە کردن.

(تیٚـــل لیٚـــدەن: لـــەبۆ بەغـــدایێ حەســـەن عاســـیٚیە نایێتەڕایێ).

(فۆلکلۆر-ل٨٦)

- تیٚلی عەیشان: ناوی ئەسپەکەن.

چەتۆ کوڕی فەرعۆیە لەبەر بەوەفایی و خۆش بەزی ولاٚغەکەی بووە بۆیە بەشانازییەوە ناویان لێ ناوە.

- تـــیٚن: ١-دیٚـــن: یـــیٚن: ٢-هیـــز. ٣-توانـــا. ٤-گەرمایی.

- تیٚم: دیٚم: بیٚم.

- تینن: دینن.

- تیٚولین: تیٚکۆشین.

- تیٚـــوەم رامـــا: ســـەیری کـــردم: تەماشـــای کـــردم: زەینی دامێ: دیقەتی دامێ.

- تیٚوەراندن: ئالاٚندن.

تورگەکان لە خۆشی تەکبیر ئامیٚزیان تێ وەراند.

(بۆرە- ل٢٧)

- تیٚوەریخ: ئەو داوەیە کە بەشوژنیٚکەوە دەکـــەن و بـــە نـــاوی داوی رایـــەکان دەیهیٚـــنن و دەبـــەن بـــە (کەتکت) دەیکوتن لەکاتی چنین لەکارگەی تەوندا.

- تیٚوەر هاتن: بەگژداهاتن: لێ کۆبوونەوە.

- تیٚی وەرهاتن: بەگژیدا هاتن.

- تیٚوەردان: تیٚوەدان.

- تیٚهەڵکیٚش: بەشیٚکە لە جوانکـــاری ئەوەیـــە کـــە هۆنەر یا نووســـەر نیـــوە دیٚـــری هـــۆنراوە یـــا دیٚـــرە هۆنراوەیەك یاپارچە هۆنراوەیەکی تەواو هۆنەریٚکی تـــر بیٚنـــی و لەنووســـین یـــا هۆنراوەکـــەی خـــۆی هەڵبکیٚشی و پیٚی برازیٚنیٚتەوە.

# ج

پیتی (ج) بـەم پیتانـەی خـوارەوە دەنـگ گـۆڕکێ دەکات:

١- ج: ی

جاگە: یاگە

جاگەش لەیلاخ بۆ، هەوار فرێ سەر

شێ بە یاگەویش شۆخ بێ ئەندێش (خانا).

٢-دەنگ گۆڕکێ دەکات لەگەڵ پیتی (ژ):

ج: ژ

لافجە: لاوژە

تانجی: تاژی

گێج و وێج: گێژ و وێژ.

٣-بە پیتی (چ) دەنگ گۆڕکێ دەکات:

ج: چ

بنج: بنچ

بنجك: بنچك

٤-پیتی (ج) بە (گ) دەنگ گۆڕکێ دەکات:

ج: گ

جێژن: گێژن

- جا: جێ: جێگە: جەهـ: شوێن: جێگا.

- جـائیزە: بەخـشیش: خـەڵات: دەستخۆشـانە: دەمخۆشنە.

- جاب: ١-شتێکە نیشانچییەکانی عەنتاب بۆ تیر هاویشتن لەبەر پشتی خۆیانی قایمدەکەن.

٢-جواب: وەڵام: وەرام.

- جات: ئامرازی کۆ: میوەجات.

- جاجم: مەوجە: جارجم: بەرماڵ.

پلاس: سەرەخەرە: بانەخەر

لەخوری دروستدەکرێ و بەخۆ دادەدرێ.

- جاجوو: ١-دژ: ٢-دوژمن: ٣-نەیار.

- جاحێل: رەوال: جەحێل: خۆرت: رۆل: جاهێـل: جحێل: رۆلە: جاهال: جعێـر: لاو: گـەنج: جـوان: جایەل: جاعێر: تۆلاز: جـەوان: جـامێر: جهێـل : دژی پیر، مرۆڤی لەتەمەنی (١٥ ساڵییەوە تـاکو ٢٥ ساڵی.

جاهێل وەیەك شت هەوائەسێنێ

کچ لەناو کۆڵان دەست هەڵتەلێنێ (گوڵاڵە-ل٧١)

کردت بەعادەت دەرگانشتن

چاوان دەگێڕێ بۆ جاحێل کوشتن. (فۆلکلۆر)

لاوەکان و پیاوەکان هەروا راوەستابوون.

(حەمەدۆك -٢- ل٤٢)

- جادوو: تەلەسم: تەلیسم: باربەژن: چاپۆل

- جـادە: شـەقام: شـارێ: شـارێگا: جادووکـار: جادووباز.

- جار: کەرەت :چەل: حەل: را.

ئیمرۆ دوو (را) هاتمەلات.

- جاران: جاری جاران: کاتی خۆی.





- جارجارە: بەین بەین: جارناجارێ: جاروبار: گاگا: نێونێو: تاوتاوە: ناوەناوە: هاوڕ: بێن بێن.

- جارز: جارس.

- جاڕکێشان: جاڕراکێشان: بانگراهێشتن.

جاڕیان راکێشا هەموو لەشکر خڕکراوە.

(تحفە -٢- ل١٢٥)

- جارنا: هەندێ جار.

- جارەك : جارێك: جارێ.

- جارەکادی: جارێکیتر: جارەکیدی.

- جارەك لەجاران: جارەکێ ل جارا.

- جاری جاران: کاتی خۆی.

- جارەکێ: جارێك: جارەکێ.

- جارەکیان: جارێکیان.

- جاڕ: ئامرازی شوێن و جێگا.

مەرەزە جاڕ: نێرگزە جاڕ.

- جـاڕدان: جـاڕ رایەشـتن: جاڕکێـشان: بـانگ راهێشتن: بەدەنگی بەرز بەناو خەڵکا هـاوارکردن و خەڵك تێگەیاندن لەکارێك.

- جاڕوپەرێز: شوێنی گەنم و جۆ پاش دروێنە پێـی دەووتری (جاڕ) یـان (پـەرێز) یـان هـەردووکی بـە سەریەکەوە پێ دەگوترێ واتە دەڵێن (جاڕ و پەرێز)

- جاڕەجۆ: پەرێزەجۆ: جێ جۆی درواو .

- جاریو: جارێ.

- جاسووسکا: سیپە: شوێنی خۆحەشاردانی راوچی بۆ راو.

- جاسوس: شۆفار: نێراو: شاندی: زێـرەوان: جـاو: ئەراکیل: سووسەکار: سیخوڕ: دەمڕاسـت: دزنـیرۆ: دیدەوان: زمان لێ دەر: سوڕی: سرێ: خەفیە.

کەسێ دەنـگ و باسـی نهێنـی کۆدەکاتـەوە بـۆ دوژمن دەبیات.

بەکرە شۆفارە ئەوەی مووخەی چنیم

زی مەم و زینان ولاتی لێ تەنیم

(ناڵەی جودایی)

- جاشـك: جـاش: جاشـەکەر: کـوڕی: کـەرکۆڵ: جاشەهەر: کورین: هۆڵی کەر: جەحشك: دەهـشك: جاشولکە: هۆڵی: بێچوی کەر کەتازە بووبـێ هـەتا لە شیر دەبێتەوە نزیکەی ساڵێك دەبات.

- جاشە هێستر: بەچکەی ماین و نێرەکەر.

تازە بووبێ تالە شیر دەبێتەوە.

- جافەڕەشکە: تەلانی: تیرەیەکەن لە هۆزی جافەی عیراق.

- جاڤان: جاوان: جافان: جاف.

وشەی (جاف) لە (جاڤان)ەوە هاتووە ئینجـا بـووە بە (جـاوان) (جافـان) (جـاف) گـەورەترین هـۆزی کوردە تـا سـەدەی هـەژدەم لەهـەرێمی (جـوانرۆ) دابوون تا ساڵی (١٦٣٩) کەرێککەوتنی (زەهـاو) لەنێوان دەوڵـەتی عوسمـانی و حکوومـەتی ئێـران مۆرکرا. هۆزی (جاف) بوون بەدووبەش بەشـێکیان کەوتنە ناو دەوڵەتی عوسمانی و بە (جافی مورادی) بەناوبانگن و بەشـەکەی تـر کەوتـە نـاو دەوڵـەتی ئێران بە (جافی جوانرۆیی) بەناوبانگن.

- جاقی:١-بریقەدار: ٢-چەقاوەسوو.

- جاڵجاڵۆکە: پیرعەڤۆك: شەیتانەکی: داپیروشکە: کارتێـك: پـیر هـەلالۆك: داپیرۆشـك: داپیرۆچـکە: جۆلایی کەرە: کاکڵە مووشان داپیرۆچك: ماماڵـە:

# ح

پیتی (ح) دەنگ گۆڕکێ دەکات لەگەڵ ئەم پیتانەی خوارەوە:

١-دەنگ گۆڕکێ دەکات لەگەڵ پیتی (ع)

ح: ع

حەلی: عەلی

سەحات: سەعات

٢-لەگەڵ پیتی (ه)

ح: ه

حەفت: هەفت

حەموو: هەموو

حەق: هەق

حەتا: هەتا

٣- پیتی(ح) لەگەڵ پیتی (خ) دەنگ گۆڕکێ دەکات:

ح: خ

محەمەد: مخەمەد

ئیحتیاج: ئیختیاج

(فەرخ مەمکی ناخوا و ئیختیای بە کەس نەماوە)

(تحفە-٢-ل٧٦)

( ئەگەر حەققم دەدەنێ ئیختیاجم بە دراوی نییە)

(تحفە-٢-ل٧٧)

- حا: ئامرازی سەرسوڕمانە.

- حاتەم: ١-حەتەم: حەتەکە: حەتەك: ناوی کوڕانە.

٢-پیاوێکی دەوڵەمەند و چاوتێر و بەخشندە بووە.

- حاجیلە: جۆرێکە لە گوڵی خۆرسکی بەهاران کە ڕەنگی گوڵەکەی سپی و زەردە.

- حاجی: ١-کەسێ حەجی کردبێ: ٢-پیاوی بەتەمەنی پێ بانگ دەکرێ.

- حاجی ژن: وشەی بانگ کردنی ژنی حاجی.

- حاجی لەق لەق: باڵندەیەکی قاچ درێژی دەنووك درێژە و بەقەد قەلەمونێك دەبێت ڕەنگی ڕەش و سپییە (حاجی لەق لەق) هاتن و چونی لە حیسابی کوردەواری چەسپاوە و بەڵکو حسابدارە کوردەکان بۆ حیسابی خۆیان بەکاریان هێناوە بەپێی حیسابی (کانی تۆ) کەیەکێکە لە حیسابە کوردییەکان لەشاخی هێلانە قەل جێگایەك هەیە پێی دەڵێن (بورجی لەق لەق) کە خۆر دەگاتە ئەوجێیە حاجی لەق لەق پەیدا دەبن.

- حاحا: وشەی لێخورینی گا لە کاتی گێرەکردن.

- حازر بەدەست: تەڕدەست: زوو وەڵام دانەوە.

- حاشا: هاشا: ئاشا: حاشی.

١-دوورلە: جێی لێ نەبێ: پەرژین قایم.

٢-ڕاستی نەگوتن.

- حاشاردان: حەشاردان.

- حاشاکردن: جۆرە جیابوونەوەیەکی نێوان ژن و مێردە کە لەسەر ئارەزووی ژنەکە ڕووئەدات، ئەو ئافرەتەی کە دڵیان بەماڵ و مێردەوە نییە لەبەر هەر هۆیەك بێت بەبێ پرسی مێردەکەی ئەڕواتەوە





بۆ ماڵە باوانی و پێ دا ئەگرێ کە نایەتەوە لەئەنجامدا پیاوەکە ناچار ئەبێ تەڵاقی بدات.

٢-جۆرێکە لەوازلێهێنان و دووربوونەوە لەکەسێ نزیك لەبەر خەراپی ئەو کەسە.

٣-ڕاستی نەگوتن.

- حاشا هەڵنەگر: زۆرئاشکرا.

- حاڵ خۆش: دەوڵەمەند.

- حالۆری: بەو بەرانە دەگوترێ کە دەچێتە ناو مێگەلێکی تر دەپەڕێ و مێگەلی خۆی بەجێدێڵێ.

- حاملان: عاملان: پەروەردە.

- حاوانەوە: حەوانەوە: ژیانی بێ قرەوبڕە.

- حاوی: حاویك: حاوینگ: ڕەن: چەولیك: لێواری چەم و ڕووباران کە دەبێتە قوم بۆ شینایی زۆر باشە.

- حاه: وشەی سەرسوڕمان.

- حدری: دابەزی: هاتە خوار.

- حدود: سنوور: توخیب: کەوشەن: تخوب: تخیب: سەرحەد: ئاقار: جەسپەر: چیلە: درسەگ: تەخویب.

١- ئەو هێلانەیە دەوری زەویی هەر دەوڵەتێکی دابێت و لە زەویی دەوڵەتانی دراوسێی جیاکردبێتەوە.

٢-سەراوەرد: ناوان: نێوانی دووپارچە زەوی گوندێك.

- حرمێن: دەنگی: وڵاغ لەکاتی ماندوو بوون.

- حریتە حریت: قاقاکێشان.

- حساب: حساو: حسێب: حیساب.

- حسابدار: ئەوکەسە شارەزا و زانایانەن کە بە هۆی ئەستێرە ئاوابوون و خۆرهەڵاتن و ئاوابوون حسابی ساڵیان راگرتووە بۆ وەرزی تۆوکردن و ڕەزبڕین... هتد.

- حسابی کوردەواری: بەو ساڵ نامانە دەوترێ کە مامۆستا زانا ئایینییەکان لە نێو مزگەوت و سەرچیاکان سازیان کردووە ئەوەش بۆ زانینی چەند کات و قوناخێکی گرنگی ساڵ، وەك سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وەرزەکان و چلەی زستان و بۆ چاندن و ڕەزبڕین و زانینی کات و ساتی بانگ دان و گەلێ شتی تر ئەم حسابانەی کەلە کوردەواری هەبوونە وەك :

١-حسابی سنە: ٢-حسابی گلەزەرد: ٣-حسابی گەرمیان: ٤-حسابی کەلی خان: ٥-حسابی مەحموود پاشا: ٦-حسابی گڕاوێ:

٧-حسابی ڕۆمی.

٨- حسابی کێلە شینی- کوێستانی: جۆرێکە لە حسابی کوردەواری حساب گرەکانی کوێستانی بەکاری دەهێنن بۆ زانینی وەرزی زستان و بەهار..هتد.

- حسکرن: حەزکردن.

- حس دەکی: واتە حەزدەکا.

- حشیار: وشیار: هشیار: هوشیار: هۆشیار.

- حکوومەت: حوکمەت: هکوومەت.

- حکوم لێ کردن: زۆرلێ کردن و فشارخستنە سەر حوکمیان لێ کردم کە لاکان بژمێرم.

(تحفە ل١٢)

- حوجرە: حجرە: ١- ژووری دەرس خوێندنی فەقێیان لە مزگەوت.

٢-ژووری خان کەکەل و پەلی تێدەکرێ.
- حورمەت: ڕێز: پەرای: بەزە: هێند: پـەرە: ڕاژە: ئوودا: پەز.
- حورمەت گرتن: ڕێزگرتن.
- حورمەت نەگرتن: ئیحترام نەگرتن.
- حورمە: ئافرەت.
- حورمێ: وشەی بانگکردنی ژنان.
- حوریەت: ١-جۆرە خشڵێك بوو ژنان لەگەڵ جلی کوردی بەخۆیان وەدەکـرد لەپێـشەوەی سـەرکلاوی ژنان دەدروا. ٢-ئازادی.
- حوسێن: ١-هوسێن: وسێن: حوس: حوسە: ناوی کوڕانە: حەسۆ: حوسێنکە.
- حوسەینی: ١-یەکێکە لە مقامەکانی ڕۆژهەڵات و عیراقی، بەفەسل دەگوترێ ئەم مقامە مقامێکی سەرەکییە و لقە مقامی لەگەڵ دەگـوترێ لـەدوای خۆیدا وەك لقە مەقامەکان (ئەمەش حوسـەینی و لقە مەقامەکانیتی)
(حوسـەینی-دەشـت- ئورفـە- ئـەرواح- ئـەوج- حەکیمی- سەبا).
- حوشتر: شوتور: حێشتر: وشـتر: هێـشتر: لۆکـە: ئاروانە: ئارڤانە: هەشتر: حیشتر: هۆشتر: حۆشتر ئاژەڵێکی سحراوییە و بەرگەی گەرما و تینووبوون دەگرێ و بۆ بار هەڵگرتن و ڕۆیشتن بەکاردێ.
- حوشترۆکە: هەردوو داری تەنیشت جەنجـەر (لـە شێوەی حوشـترە، بۆیـە پێـی دەڵـێن(حوشـترۆکە) هەموو کەرستەکانی جەنجەر دەگرێتەوە.
- حوشترەوان: ١-وشترەوان: سارەوان: هێشترڤان.
جاران قافلە بە حوشتر دەکرا، جا دەبووایـە کەسـێ هەبێ ئاگای لـە حوشـترەکان بێـت و لـەبارکردن و ئالیك دان و لە ڕێگـا ڕۆیـشتن جـا بـەو کەسـەیان دەوت حوشترەوان.
٢- بووەتــە نازنـــاوی ئـــەو کەســـەی کـــاری حوشترەوانی دەکرد.
حەمەدەمین حوشترەوان.
- حوکم: زۆری.
برای خۆم حوکمم لێ دەکەن مارەم دەکەن..
(تحفە-٢- ل٨٩)
- حلکوتك: قەڵانگ: چەڵەمە.
- حوکمە: بەزۆری.
میر دەڵێ برایم، حوکمە دەبێ بڕۆی لەولاتی.
(تحفە-ل٣٣٧)
- حۆقە: هۆقە: وەقـە: حەقـە: پێوەرێکـە دەکاتـە دووکیلۆ.
- حۆلە: ١- جگی گـەورە کـە لـە یـاری جگـانی بەکاردەهات.
٢- حەیتـە: چـەتەوڵ: زەبـەلاح: زەلامـی گـەورە بەلەش و لار و شان پان و پۆڕ.
- حۆیی حۆیی: واتە هیچ بە هیچ نەکردن.
- حووت: ١-بورجی دوانزەهەمی بورجەکەی ئاسمان.
٢-ماسی گەورە: ٣-زۆر خۆر.
- حەب: ئەندازەیەکی کەم.
- حەباندن: خۆشویستن.
- حەپۆك: حەبەلۆ: گیایەکی بۆن خۆشە.





- حەپەسـان: واق وڕمـان: پەشـۆکان: هێـدمان: سەرسام بوون: تاس بردنەوە: تەوسان: دۆش دامان: تاسـان: ڕامـان: دامـان: کاسـان: لەگۆچـوون: سەرگەردان بوون: هوت بوون: کلمسن.
کەوتنەدنیای ئەندێـشەوە بـەهۆی کارێـك عـەقڵ قەبووڵی نەکا.
- حەپەساو: سەرسام: واقماو: تاسای:
واق وڕمـا: بـاهێر: پەشـۆکاو: پەشـێو: پەشـێواو: دووگومان: سەراسیمە: سەرسیمە: سەرسوڕماو: سەری سوڕمای: سەرگەردان: شاش: گێچ: وڕ: دەسەسەد.
- حەجکردن: چۆنە حەجێ.
- حـەجمان: حـەجمین: ئـۆقرە گـرتن: هـەدادان: تۆتکەگرتن.
- حەچە: هەچە: وشەی لێخوڕینی کەر.
بەهەچەهەچـی کـەرێ چـۆن بـاری لادێـی کـوردی دەگاتە شاری. (تاریك و ڕوون- ل٧٥)
- حەچلوورا: سەگ وەڕ: سەرەو.
- حەدەژن: کوڕێ وادەی وەی هاتبێ ژن بێنی.
- حەدەمێرد: بەربەخت: کـچێ وادەی مێردکردنـی هاتبێ.
- حەدوسەد: واتە کات و سات.
- حەدی چییە: حەدی نییە: واتە ناتوانێ.
- حەدی مـاڵ نووسـتنان: کـاتی خـەڵك لـەماڵی خۆیی دەچێتە نێو جێ بۆ نووستن.
حەدی ماڵ نووستنان دەبوو، دەبوو بە چریکە چریك و هاوارە.
(تحفە-٢-ل٤٢)
- حەرام: نارەوا.
- حەرام خۆر: پێستە خۆر: ناڕەوا خۆر.
- حەرام زادە: حەرام زایە: حەروم زایـە: شـیرحیز: قەحپەشیر.
ئەگەر مەیلەکەت دەرچێ لەبیرم
حەرام زادە بم نەعلەت لەشیرم
(فۆلکلۆر)
- حەڕاف: کەنار.
- حەرەماپاشێ: ژووری پاشا.
- حەرەم گران: بەشەرم و حەیا: گران و سەنگین.
- حەزار: هەزار.
- حەزکردن: حەزژێ کردن.
- حەزدەکەی: حەزێ دکەی.
- حەژ: حەز: ١-ئارەزوو: ٢-خۆشەویستی.
- حەس حەس: بەپاسەوانی ناو بازاڕ دەگوترا کەلە سەرحسابی دووکانداران بوو.
- حەسـار: لـە چـەند ژوورێـك پێکهـاتووە و حەوشێکی گەورەی هەیە: ٢-نـاوی دوو گوندانـە لە کوردستان.
- حەسانەوە: حەسیانەوە: ئاسوودە بوون.
- حەستەم: ئەسـتەم: سـەخت: دژدار: هەڵـەموت: عـاسی: ئاسی.
- حەسرەت: عەزرەت: ئەزرەت:
(لەعەزرەت بالآت بوومە کاکەیی). (فۆلکلۆر)
- حەسوود: بەدخواز: چەپخووس:
درژ: خـووە زۆك: دەخـسۆیی: گـزاڤ: دەزگرتـی: کندوس: چکوس: ڕژد: ڕوژد: پەرچل: پوور دژ: چاو

پیسی: زرگی: دەخسن: نەکێش: زگرەش: چاو پێ هەڵنەهاتوو: کەسێ خەم بە سەرکەوتن و هەبوونیو پلە و پایەی خەڵك بخوات چاوی بەرایی نەدا.

- حەسەن: هەسەن: هەسۆ: حەسۆ: ناوی کوڕانە

- حەشامەت: حەشامات: ئاپۆرای خەڵك: کۆبونەوەی جەماوەر.

- حەفت: حەوت: هەفت: حەو: یەك کۆ شەش.

- حەفتانە: ١-مزی کارکە بۆ حەوت ڕۆژ.

٢-دوای حەوت ڕۆژی بووك گواستنەوە خزم و کەس و کاری زاوا و بووك لەماڵی زاوا کۆدەبنەوە دیاری و پارەی بۆ ماڵی زاوا و بووك دەبن.

٣- گۆڤار یا ڕۆژنامە کە هەفت ڕۆژ جارێك دەردەچێت.

- حەفت ترینگە: جۆرێکە لە خواردنی کوردەواری.

- حەفتە: حەفتە: حەوتو: هەفتە: حەوتە: شەوەرە: حەوتو.

١-بەو حەفت ڕۆژە دەڵێن کە بە درێژایی ساڵ دووبارە دەبێتەوە بە شەممە دەست پێ دەکات و بەهەینی کۆتایی دێت.

٢-لەماوەیەکی دیاری کراوی ساڵدا هەن کەکەش لەو ماوەیەدا زۆر سارد دەبێت و دەکەونە چلەی زستان کەهەریەکەیان (حەوت) ڕۆژە و مەرج نییە بەشەمە دەست پێ بکات و لەهەینی کۆتایی بێت.

- حەفتیر: جۆرە دەمانچەیەکە.

- حەفلە: ئاهەنگ: کۆمەڵە: هوێن: سلسات: جڤات: زێوە: بتۆم.

- حەفت و هەشت: ١-دەنگەدەنگ: چەقەچەق: مشتومڕ.

٢-واتە حەفت کۆ هەشت دەکاتە پانزە.

- حەڤدە: حەڤە: هەڤدە: ژمارەی دوای شانزە.

- حەقایەت: هەکایەت: چیرۆك: حەکیات.

- حەقایەت خوان: چیرۆك ڤان: چیرۆك وان: حەکایەت بێژ.

- حەق دەست: مزی کاری دەست.

- حەقە: هەقە: ڕێبازێك بوو لە ڕێگای تەریقەتی نەقشبەندییەوە پەیدابوو بە هۆی شێخ عبدالکریمی شەدەڵەوە شێخ بەوە نەوەستاوە کەڕێبازی ئایین بەساکاری دوور لەباری ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو خەڵکەکەی دەورپشتیابڵاو بکاتەوە، بەڵکو بایەخی بە ژیانی کۆمەلایەتیش داوە، جا سۆفییەکانی شێخ هەمیشە لە خانەقای شێخدا جەزبە گرتوونی و ئاگایان لەخۆیان نەماوە و کەوتوونەتە (ئەڵلا... ئەڵلا) و (یاحەق.. یاحەق) کردن و لەڕوویەکی کەشیەوە بە هۆی شانازی کردنیانەوە بەو ڕێبازەی گرتوویانەتەبەر، زۆر زۆر وشەی (هەقە) یا (حەقە) ناوبانگیان دەرکردووە دیارە خۆشیان ئەم ناوەیان پێ ناخۆش نەبووە و لەلایەنی خۆیانەوە کەوتوونەتە مەعنا لێدانەوەی وتویانە: ئێمە هەقپەرستین و بە دوای حەقیقەتدا ئەگەڕێین و ڕێگای ئێمە حەقە چونکە ڕێگای تەریقەتە بوون بە (حەقە).

- حەقپەرست: لایەنی حەق گرتن و لە حەق لانەدان.

حەق نادر: خودا.





- حەقە پشت: ئەو تەمەنەی کە جاشك دەتوانێ باری بنرێت.

- حەق: هەق: حەقق:

١-ماف: بەش.

٢-ڕاست: دروست: بەجێ.

٣-داد: ڕەوایی: ڕەوا.

٤-مز: کرێ.

- حەقە پەڵە: کاتێك بە ئەندازەیەك باران ببارێت کە زەوی تەڕ و پاراو بکات و بەکەڵکی شین بوونی گەنم و جۆبێ پێی دەڵێن (حەقەپەڵە).

- حەقەزین: ئەوتەمەنەی کە وڵاغە بەزرەی تێدازین دەکرێ.

- حەیا کردن: شەرم کردن.

تەماشا کرد دووسێ پیاو دیاربوون.

(حەیای کرد بیدوێنێ) (تحفە -٢- ل٩٧)

- حەقیر: کەم: نزم: پەست: سووك: پنتی: زرپەهرە: بێقەدر: بێ ڕێز: هیچ و پووچ: کەسێ کاری نابەجێ بەرامبەرت دەکات.

- حەقیقەت: چۆنیەتی: ڕاستی: دروستی: بەڕاست: ڕاستەقینە: بنج و بناوان: ڕاست و دروستی: ڕاستەکینە.

- حەقین وەکەی: حەقمان بسێنی.

خوایە حەقین وەکەی: واتە خوایە حەقمان بستێنی.

- حەکەم: سەرپشك: ناڤبر: تەرخان: دادکار: بەرەوان: بەرەڤان: ناوبژیوان.

- حەلال: ڕەوا: درووست: درووس: شیاو: پاك.

- حەلال زادە: دە: شیرپاك.

- حەکیم: ١-جاران بەو پسپۆرە دەووترا کە برینی تیمار دەکرد، یادەردێکی گرانی سووك دەکرد یائێش و ژانی نەخۆشێك لەناودەبا. ٢-ناوی کوڕانە.

- حەلەقوبەلەق: حەلەق و مەلەق: قسەی ناتەواو.

- حەلقەی ئەقرەبە: ئاسنێکە کە لە چەشنی لاکێشەدایە بەبازنەی مژانە بەندە بۆ ڕاکێشانی جەنجەڕ بەکاردێت.

- حەم: بخۆ بەزمانی منالان.

- حەماسەت: ئازایی: خۆرتی: پەرۆش: دلێری: دڵگەرمی: مرۆجە: جۆش: چۆشان: خرۆش: خوێن گەرمی.

- حەماسەتگرتن: جۆشگرتن.

- حەمام: حەمو: گەرماو: گەرمك: گەرم ئاو: گرماڤ: کراسۆ: حومام.

- حەمامچی: خاوەن حەمام.

- حەمامکردن: خۆشۆردن لەحەمام.

- حەمایل: ١-ئەوەی ڕاست و چەپ لەمل کرابێ وەك فیشەکدان و شمشێر و شتی وا.

٢-دوعای لەکیف گیراو.

- حەمبال: عەمبار: کۆڵکێش: کۆڵهەڵگر:

حەمدانی: ١-سپیانی گۆیی پان و درێژ.

٢-ڕەشانی گوێی لە لموزی خۆی درێژ ترە تەنکە.

- حەمشەری: هەمشاری: هەوشاری.

- حەموو: حەمی: هەموو.

- حەمە: سووکەڵە ناوی (محەمەد) لە کوردەواری ڕەنگی ئەو کەسە وەك بانگی لەگەڵ یەك دەژی وەك.

-حەمەسوور، حەمە بۆر.

- حەنەك بێژ: جەفەنگ باز: گاڵتەچی.

- حەو: ١-حەفت: ٢-وشەی سەرسوڕمان:

٣-دەنگی وەڕینی سەگ

- حەواڵە: هەواڵە

باوكە پیرەكەت هەواڵەی هەق وێ

لەباندا كەوێ وەك شوتی شەق وێ (فۆلكلۆر)

- حەوتوچوون: حەفت ڕۆژ دوای بوونی مناڵ ژن خۆی دەشوا و جل دەگۆڕێ، مناڵ ناو دەنرێت و داوێژرێتە سەرپشتی لانك و گوێزە بانەی بۆ دەكرێ ئەمە پێی دەگوترێ (حەوتوچوون).

- حەوجە: هەوجە: پێتقی: بەرمنەتی: پێویست: مانگ لە (١٤)ی حەوجە بە ئەنگوست.

- حەور: ئەوەیە چاڵێك لەزەوی دەكرا بۆ ئاوی باران كۆكردنەوە و بۆ سوود لێ وەرگرتن.

- حەوش: حەوشە: هەوش: نێوان دیوار و ژووری ماڵ.

- حەولدان: هەوڵدان: كۆشش كردن: تەقەڵادان: ماندووبوون بۆ ئەنجامدانی كارێك.

- حەیران: ١-جۆرێكە لە گۆرانی دڵداری شاكارێكی هونەرییە، زادەی (ئەوین و ئاوات) ە دەربارەی (سروشت و) دەروون و جوانی دەدوێ... بەدەگمەن (شەڕوشۆڕ) دەگرێتەوە (حەیران) تایبەتە بەزاری كرمانجی باشوور بەتایبەتی زاری سۆران تایبەتی تر بە ناوچەی (هەولێر) هەوای حەیران مەقامێكی تایبەتی نییە، بەڵكو بەچەند نەغمەیەكی جۆراوجۆر دەگوترێ هەر (بەیت) ێكی حەیران گۆرانی بێژ بەندێكی تایبەتی هەوای خۆی هەیە وەك هەواكانی لاوك پێوەی دەڵێ ... كە ئەو بەندانە لەڕیشەدا لەڕەگەزی مەقامەكانی (بەیات) و (حسێنی) و (حیجاز) و (موحەییەرن) هەوای حەیران بە هۆنراوەی كێشی كوردی (دەبڕگەیی) ئەو هۆنراوانەی كە بەزاریی گۆران وتراون ناوترێن هەروەها بەكێشی شانزدە بڕگەیی (عەروزی عەرەبی) و دەستووری هۆنراوەی (فارسی) ناوترێن، بەڵكو هەر حەیرانە (بەیت)ی تایبەتی خۆی هەیە هونراوەكانی لەكێش دا فرە ماوەیی و پشوو درێژییان تێدا هەیە لەبارەی (قافیە)وەلەزۆر جێ دا جەمسەری (بەندەكانی) بەشارەزایی و ناسكی لێكی داون.

٢-وشەی حەیران: واتە (سەرگەردان، بەڵاگێر، سەرسوڕماو) دەگەینێت.

٣-دەبێتە سەرەتای دەست پێ كردنی گۆرانی حەیران كاتێك حەیران بێژ دەست بەگۆتنی دەكات دەلێ حەیران دەرێم.

٤-دەبێتە نازناو بۆ ئەو كەسەی حەیران وەك حەسەن حەیران، عوسمان حەیران.

٥-سەربەندی هەیە كە حەیران بێژ لەسەرەتای حەیران دەست پێ دەكات و ناوبەند و دوا بەندیشی هەیە.

٦-جۆری هەیە وەك :

- حەیرانی سەرچیایی: تایبەتە بە تیرە و هۆزی خۆشناوەتی.

- حەیرانی پشدەری: واتە ئەو حەیرانانەی لە ناوچەی كۆیە و رانیە و قەلادزێوە دەگوترێن.

- حەیرانی دەشتی هەولێر: كە تایبەتە بە ناوچەی كەندیناوە و ملكیە و بەڕانەتی.





٧-جۆری گوتنی حەیران: بە دوو جۆر دەگوترێ: ١:-سەرچیایی، مەجلیسی.

٨-حەیرانی كۆن: جیاوازی هەیە لەگەڵ حەیرانی نوێ حەیرانی كۆن كورتە.

٩-وشەی حەیران، دەبێتە نازناوێك بۆ دڵداری.

كچەتیمە حەیرانێ، حەیران دەڵێ.

ئەمن دونێ ئێوارێم زانیە لەشەوبایێ شەوێ

لەبایێ شەمارێ، لەپلكە پێناوێ

دەرێن (كورەتیمە حەیران) گەلە نەخۆشە

١٠-وشەی حەیران دەبێتە نازناوێك بۆ دڵبەری

كورەتیمە حەیرانێ.

ئەنگۆ جوابەكی لە بۆ من بدەنە دایكی (كچەتیمە حەیرانێ)

گەلەكی چەك و زێڕ بەخۆوە نەكا نەوەك لەشایی چۆكی بچەمێ

١١-دەبێتە نازناو بۆ

داكی و بابی كچەتیمە حەیرانێ

- حەیران بێژ: ئەو كەسەی حەیرانی دەڵێ لە ئسولی گۆتنی حەیرانی دەزانی وەستای لە گوتنی حەیراندا بەدەردەكەوێ ژنی حەیران بێژیش هەبووە بۆ مەجلسی ژنان حەیرانی گوتووە وەك (مەنیج حەیران).

- حەیرو: حەیران: سەرسام.

- حەیف: ١-موخابن: مخابن. ٢-تۆلە.

- حیجاز: مەقامێكە بەناوی مقامی حیجاز: یەكێكە لە مەقامەكانی رۆژهەڵاتی و نەغمەیەكی لەپەیژەی موسیقای عەرەبیدا لەوانەیە ئەم مەقامە لەوڵاتی (حیجاز)ە وە سەری هەڵدابێ (فارس و تورك و كورد) لەبەر پیرۆزی ئەو خاكە مەقامەكەیان بەو ناوەوە داهێنابێ، چونكە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و گرتنی وڵاتەكانی (عەجەم و رۆم و كورد) زۆر لە هونەرمەندەكانی گۆرانی ئەم وڵاتانە روویان كردۆتە وڵاتی(حیجاز) لەوێدا لە كۆڕی تایبەتی و گشتیدا بەئاوازی وڵاتی خۆیانەوە شیعری عەرەبییان پێووتووە (حیجاز) بەو (پلە=پەردە=نەغمە)یە دەگوترێ لە پەیژەی مۆسیقای عەرەبیدا، كە دەكەوێتە نێوان پەردەی (چوارگا) و (نەوا) وە (حسەینی) (ئەوەج) (گرتن) حیجاز و لقە مەقامەكانی (حیجاز دیوان- قۆریات- عریبون- عەجەم- عریبون عەرەب- ئیبراهمی- حەدیدی).

- حیلە: فێڵ: ٢-دەنگی ماینو ئەسپ و جوانو

- حیلە باز: فێڵباز: حیلەفان: خاپینووك.

- حیمدار: هونەرمەند.

- حیملی: لەبناغەدا.

- حێ: ناوی پیتی (ح).

- حێلجاری: رەش بگێر.

- حیكایەت خوان: حەقایەت زان.

- حێفز: حیفز.

- حیسابی رۆمی: جۆرێكە لەو حسابانەی كەكورد بەكاری هێناون بۆ زانینی وەرزەكانی ساڵ و بۆ تۆوكردن و دروێنە و چوونە هەواران، ئەم حسابەش واتە حسابی رۆمی لەناوچەی هەولێر بەكارهاتووە چونكە هەولێر كەوتۆتە نێوان كوێستانی زۆر سارد و گەرمێنی زۆر گەرم جابەپێی حسابی رۆمی وەرزەكان لە (١١) مانگەوە دەست پێ دەكەن واتە بەهار لە هەولێر لە (١١)مانگی (٣) دەست پێ دەكات چونكە لە هەولێر لە (١١)مانگ ئاو و هەوا دەگۆڕێ.

# خ

پیتی (خ) وەکو زۆر پیت لە زمانی کوردی دەنگ گۆڕکێ دەکات بە پیتی تر. وەکو ئەمانەی خوارەوە:

١-(خ: و)

خۆش: وەش

دڵ طفلاَن ئاسابەڵکم دلۆەش بۆ

(مەولەوی)

٢-(خ: ف)

خووساندوویانە: فیسناشا.

٣-(خ: ق)

خورشید: قورشید.

٤-بە پیتی (غ) دەنگ گۆڕکێ دەکات.

خەم: غەم

باخ: باغ

خەلووز: غەلووز

خونچە: غونچە

خەزوور: غەزوور

٥-پیتی (خ) بە پیتی (گ) دەنگ گۆڕکێ دەکات

خلۆر: گلۆر.

٦-بە دەنگی (ک) دەنگ گۆڕکێ دەکات

خەنین: کەنین

توێخ: توێك

٧-بە (ھ) دەنگ گۆڕکێ دەکات خوون: هوون

خوری: هری.

٨-بە(ی) دەنگ گۆڕکێ

خوردە: وردە

- خا: ١-خاتوو: خاتوون: خات: خاتە: خاد: خاتوونە: خاتووین.

لەقەبە بۆ ژنان بەکاردێ پێش ناودێت وەك (خاتووزین) (خا) کورت کراوەی (خاتوونە)ە ، هەروەها (خاتوو)ش کورتکراوەی (خاتوون) هەندێ جار بەتەنیا دێ کە قسە لەگەڵ ژنێ دەکەن (خاتوون) هەندێ جار دەبێتە خاتوونە،

خاتوونە خانزاد، خاتوونە مریەم،

فەرموو دانیشە خات جەننەت: فەرموو دانیشە.

(حەمەدۆك- ل٦٣)

٢-خایی: هێلکە: خایە: هێك: هێلك.

٣-خۆ.

خادۆر خن ژنە یاری

(ئیزدیاتی- ل٦٢)

- خاپ: فێڵ: تەفرە: فریو: حیلە.

- خاپاندن: فریودان: لەخشتە بردن: تەفرەدادات: قسەی زار و بەڵێنی بەدرۆ.

- خاپور: وێران: کاول: پەختەسار: کاڤل: ژێنگەی تێکچووی مرۆڤ.

- خاپۆ: فێڵ باز: ساختەچی: حیلە باز.

- خاپیان: تەفرە خواردن: پێچون.





هەڵخەڵەتان: فریوخواردن: خلەتان: لە خشتە چوون: هەڵفریوان.

- خاپینۆك: ساختەچی.

- خاتراتە: ١- خاترخوازی کردن: خواحافیزی کردن.

٢-لەبەر خاتری تۆ.

- خاتوون: ١-خاتوو: خاتە.

٢-ناوی کچانە: ٣-ژنی مالداریکەر.

- خاتەم: لەشی ئامێری (زەرب: تەپل) کە لەکۆلەکە گوێز دروستکرابێت کە لەشی ئەم ئامێرە لە (دار) دروستدەکرا دەنگی زۆر خۆشترە لەو ئامێرەی (لەشی) تەنەکەیە.

- خاتێ: خالۆژن: خارۆژن: ژنی خاڵ

- خاچ: سەلیب: هێمای فەلان

- خاچ پارێز: جەژنی خاچ پەرستان

- خاچ حەبێن: خاچپەرس: خاچپەرست

- خاچەرێ: دوریان: چەپراز

- خادیم: ئەو کەسەی خزمەتی مزگەوت و مەزرگەی پیاو چاکان دەکات: ٢-نازناوی شاعیرێکی کوردە.

- خار: ١-خوار: ٢-خاڵ: برای دایك: ٣-دڕك: ٤-نووکی تیژی بەرد: ٥-نوقتە رەشەکەی لەشی مرۆڤ: ٦- ئەشکەوت: غار: ٧-قوم.

- خارزا: خوارزا: مناڵی خوشك.

خالاّ خارزا راکرن، ماما برازا بنناخ کرن

(کانی- ل٤٤- پەندی کوردی)

- خاروره: قەرەبالغ: قەلەبالغ.

- خارنەوە: خارنەڤە: خواردنەوە.

- خاشخاش: ناوی گوڵێکە پەڕەکەی تاك و گەورە و پەرپەڕەیە، لاسك نەرمە بێ درکە، بۆنێکی کەمی هەیە کێوییە بە تۆو زیاد ئەبێ لەکوردەواری بەکار ئەهێنرێ: ١-تۆوەکەی بۆ سەرئێشە و کەم خەوی: ٢-بۆرەنگ

- خاڵبەندی: واتە (علامات الترقيم) دانانی نیشانەی تایبەتییە وەکو خاڵ (.) و بۆرو (،) لەکاتی نووسیندا، بۆبەدی هێنانی ئەم مەبەستە سەرەکییانەی خوارەوە:

١- دابەش کردن و خستنە رووی پارچەکانی رستەیەك.

٢- جیاکردنەوەی رستەکان و چەسپاندنی تایبەتییەکانیان.

٣- دەستنیشان کردنی شوێنی راوەستان لە کاتی خوێندەوەی.

٤- رابەری کردنی خوێنەر بۆ گۆڕینی گفتوگۆ کردنی بەگوێرەی واتای رستەکان.

- خازێ: خازە: خوازێ: ناوی کچانە.

- خافل: غافڵ.

- خافلاندن: غافلاندن.

- خاقان: خان: نازناوە واتە خان لە دوای ناوی پیاوی مەزن و سەرۆك هۆز دێت (خاقان) وشەیەکی مەغۆلییە.

- خاك: ١-خۆل: ٢-نیشتمان: ٣-وڵات: ٤-زەوی.

- خاك پەرست: خاکپەروەر: نیشتمان پەروەر.

- خاك شیرە: گیایەکە تۆوەکەی وەك تۆوی تووتن وایە لە کوردەواری بۆ لابردنی حەساسیە بەکاردێ.

- خاكەسەر: ١-خاك بەسەر: غەمبار: خاكساری بۆ كەسێكی پەژمردە و كەوتوو وبێ دەرامەت و زەلیل بەكاردێ: ٢-بێ بەخت.
- خاكی: خاكینە: بێفیز: دڵ نزم: خۆبەكەم زان.
- خاكی چاك: بە خاكێك دەووترێ كە زۆر بەپیت و بەرەكەت و بەهێزبێت.
- خاكی خەراپ: خاكێكی بێ برشت كە هیچی لێ شین نابێت.
- خاڵ: ١-خار: هاڵۆ: لال: لالۆ: خوول: لالە برای دایك.

٣-خاڵ: نیشانەیەكە كە خوێنەر چاوی پێی دەكەوێ بە تەواوی لە خوێندنەوەكەی هەناسە بدات بۆ ئەوەی بحەسێتەوە و هەناسەبدات.

٤-نوقتەی رەشی بچووكی لەشی مرۆڤ.
- خالوان: هەموو خزمی دایك.
- خالۆزا: لالۆز: هالۆزا: منالی خاڵ.
- خالۆزە: جۆرە مێشەكە لەگەنمدۆرە دەدات بۆگەنی دەكا.
- خالۆزە خواردی: ئەو گەنمدۆرەی خالۆزە لێی دابێ.
- خالۆژن: هالۆژن: ژنی خاڵ.
- خالە: ١-خاڵ: خارە: خالۆ: لالۆ: لالە: خارە: خالۆ: وشەی بانگ كردنی خاڵ.

٢-وشەی رێزلێنان بۆ پیاوی بەتەمەن.

هۆ خالۆی رێبوار ئەمنیش رێبوارم.
- خالەت: پوور: پلك: خوشكی دایك.
- خالید: خالە: خالند: خالۆ: ناوی كوڕانە.
- خام: ١-خاو: خاڤ: نەكوڵاو.

٢-بێ هێز و تاقەت.
- خەمانەخۆ: خەمی مەخۆ: خەم مەخۆ.
- خامچور: باجێكی گران بوو، لەسەر مەڕ و ماڵات و گاگەل لەهەردەسەر مەڕ و ماڵات سەرێك ئەستێنرێ ئەم باجە دەوڵەتی تورك لەكوردستانی توركیا دەی سەند.
- خامۆش: خەمۆش: كپ و بێ دەنگ.
- خان: ١-نازناوێك بووە لەلایەن شای ئێران و سوڵتانی عوسمانی دراوەتە مەزنەكانی ژێردەستی خۆیان كە دەسەلاتی بەسەر ناوچەك رادەگەیشت.

٢- لەقەبێكە لەدوای ناوی ئافرەتی كۆك و بەناوبانگ دێ لەدوای ناو دێ حەپسە خانی نەقیب.

٣-ئەگەر بەتەنێ بێی و هیچ ناوی ئافرەتانی لەپێشی نەبێ دەبێتە (خانم).

٤-بەسەرۆك هۆز دەگوترێ (خان).

٥-عەمباری بازرگانەكان كەتووتن و كەتیرە و مازی و خوریان لێ دادەنا.

٦-بەپیاوی دەوڵەمەند و موڵكداریش دەڵێن (خان).

٧-لەحەسارێكی گەورە پێكهاتبوو لەناو شارەكان لەنزیك بازاڕی ناو شاربووە بۆ وەستان و سانەوەی وڵاخەكانی رێبوارەكانی دەهاتن بۆ شار، جادار، رەژوو، بەفر، ماست، كەنگر، تۆڵكەو، كا، گەنم، جۆ، كاریتە و شەقرە و میوەیان پێ دەهێنا وڵاغەكانیان لەم خانانەدا دەبەستایەوە و ئالیك و ئاویان دەرخوارد دەدان خانەكان زۆربەیان دوونهۆم بوون قاتی سەرەوە بۆ خەوتنی شەوانەی خاوەن





كەر و ئەوەی لەوێ دەنوست قاتی خوارەوەش بۆ وڵاغان بوو.

٨-بەتەنیاش بۆ ناوی ئاغا و بەگان بەكاردەهات.

٩- بە دەسهەڵات دارەكانی ناوچەی سنەیان وتووە (خان) كە لە سەردەمی شا ئیسماعیل پێیان بەخشراوە.
- خاندان: خوێندن: خیندن: خوندن.
- خانزاد: كە بە خانزادە خاتوون بەناوبانگە خوشكی میر سولەیمانی میری سۆران بووە فەرمانڕەوایی گرتۆتە دەست و بووە بە (قەراڵیچەی سۆران) كاروباری ناوخۆی راپەراندووە چەند شوێن و جێگای لەناوچەی شەقڵاوە و هەریر بەناوی ئەم (شاژنە كوردەن) وەك ئەمانەی خوارەوە:

١- قەڵای خانزاد: قەلایەكە دەكەوێتە نێوان گوندی باویان و شارۆچكەی حەریر لە دوو ژوور پێكهاتووە كەلەسەریەكن ئەشكەوتێكی لەژێر دایە چەند خانوو بەرەیەك كەلە شارۆچكەیەك دەچێت.

٢- زوورگی خانزاد: زنجیرە زورگێكە دەڕوانێتە سەر بەستی بەستۆرەی نزیك پیرمام.

٣- گۆڕەپانی خانزاد: لەسەرەوەی چیای سەفین گۆڕەپانێك هەیە پێدەڵێن گۆڕەپانی (خانزاد) چوار تا پێنج دۆنم دەبێ بەچوار دەوریدا شاخ بەرز بۆتەوە دەڵێن كاتی خۆی خانزاد خانی سۆران بە هاوینان چووەتە ئەو گۆڕەپانە.

٤- چاڵی خانزاد: چاڵە بەفرێكە لەسەرچیای سەفین بەزستان لە خۆیەوە پڕ بەفر دەبێ و تا پاییزان ئەو بەفرەی تێدا دەمێنێتەوە.

٥- ناوی كچانە.

هاتەوە بابێتەوە خانزادەخان یاخوا بەخێربێت.

(فۆلكلۆر)
- خان و مان: ١-بەناز رۆیشتن: ٢-شۆخ: نازدار.
- خانوو: خانی: یانە: هەوار: خانە: خێنی: خانووی.
- خانە بگیر: ئەوەیە كەدەستەیەك دەچوونە سەر ماڵێك بەبێ تەقە و هەرا ئەچونە ژوورەوە، خاوەن ماڵیان ئەگرت و ئەكوشت و شتەكانیان ئەبرد.
- خانە خۆی: خانەخێ.
- خانەقا: خانەگا: جێگەی خواپەرستی پەیرەوانی تەریقەتی نەقشبەندی.
- خانەوێران: ماڵ وێران: توشی بەڵاهاتوو. زەرەروزیان لێ كەوتوو.
- خانی لەپ زێڕین: خانی چەنگ زێڕ: ئەمیرخان: ئەمیرخانی یەك دەست: ئەمیر خانی برادۆست خانی چەنگ زێڕ: نازناوی ئەمیرخانی قەلای دمدمێیە (خان) نازناویكە لەلایەن شاعەباسەوە درایە (ئەمیرخان) چونكە كرایە مەزنی و دەسەڵاتداری تەرگەوەر و مەرگەوەر لەشەڕێك لەشەڕەكانی دەستی لەئانیشكەوە پەڕی وەستا زێرینگەرەكان دەستێكیان لەزێڕی سوور دروستكرد بووە بە "خانی لەپ زێڕین" ناوبانگی دەركرد.
- خانیلكە: خانوویەكی بچووكە و بەشێكی كانی كەتوونەتەوە ناو بۆ خۆشوشتن بەكاردێ.
- خاو: ١-نەبرژاو: ٢-نەكوڵاو:

٣-سست و تەمبەڵ.

٤-گیایەكی بەرز و زۆر نەرمە لە كوێستان دەبێ.

- خاوس: خواس: رووت: پەی.

پێ خواس: پێ رووت: کەسێ پێڵاو یان نەعلی لەپێ نەبێت.

- خاوکەر: یەکێکە لە هەوا کلاسی و کۆنەکانی گۆرانی کوردی. ئەم مەقامە تایبەتە بە نەتەوەی کورد و ئاوازێکی (فۆلکلۆرە) ئەم مەقامە لەرەچەڵەکی نەغمەی (بەیات)ە بە هۆنراوەی (فۆلکلۆر) و (دانراو)ە وە دەگوترێ کە ئەو هۆنراوەیە لە سەرکێشی خۆماڵی و نیوە دێڕی دەبڕگەیی بێ. ئەم هەوایە ئازاد و رەهایە لەڕەزمی مۆسیقایی.

- خاوەبرژ: نیوە برژاو.

- خاوە خاو: نەرم و شلی.

- خاوەك: بەپێستەی کەونی حەیوان دەگوترێ کەهی ئەو ساڵ نەبێ و پەنیری تێدەکەن.

- خاوێن: تەمیس: پاك: دژی پیس.

- خاوەن: خوەدان: خوەدی: خێو: ماخۆ: خودان: خاوەند: ساحێب: ساحێو: خوە: خووەهی: خودەی: خوداوەند: باخو: ماخۆ: مالخۆ: حالی بابەتێك یان هەر شتێك کەسێك بەهی خۆی بزانێ .

(سەگ ساحێبی نەدەناسییەوە).

(ماڵی ماخۆت خرابی): (ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە).

- خاوەن بەزەیی: بەروحم: بەرەحم.

- خایاندن: بردن: هاژوانن: پێ چوون.

زۆری هاژواکارەکەت چەند رۆژی دەبا کارەکەت

- خایکرن: بەخێوکردن.

- خانێ زینی: خوانی زینی: جێگای دانیشتنی سوار لەسەر زینەکەدا لەکاتی سواربوونی وڵاخدا.

- خت: کت: کتە: کتت: وشەی دەرکردنی پشیلە.

- ختوخۆرایی: بەخۆرایی: بەلاش: هەر لەو گۆڕەی: بەبێ هۆ و سەبەب.

- خرخاڵ: پاوانە: خشلی ژنانە.

- خدو: خو.

- خداوندگار: خواندکار: خوندکار: خونکار: لەقەبی سوڵتانەکانی عوسمانی بووە. وشەی (خونکار) لەسەرەتادا (خداونگار) بووە لەئەنجامی سوینەوە بووەتە بە(خوندکار) ئنجا بووە بە خوندکار لە دوایی بووە بە خونکار ئەم وشەیە لە وشەی (خوتای) پەهلەوی کە بە مانای ساحێب و شا و ئاغا و هێندی لەقەبی فرشتەکانی وەك (ماە ندای) بوو لەفارسی دەریدا دوای هاتنی ئیسلام (خداوند) لەقەبی پاشاکان بوو تا سەدەی هەشتەم لە شیعرەکانی شێخی سەعدی و خواجە حافز و شیعری شاعیرانی کتێبەکانی مێژوودا بەو مانا قەدیمە دەبینرێ.

- خراکردن: خراپکردن: خروکردن: تێکدان.

- خراپ: خراب: خراو: خەرا خرا: خەراب: خەراو: دژی باش.

- خرت: ١-بەختەك: بەرانی تەمەن سێ ساڵ و نیو.

٢-تەگەی تەمەن سێ ساڵ و نیو.

- خرتەکەو: کەوی تەمەن سێ ساڵان.





- خرار: خەرار: تەلیس: گوش: لە موو دروستدەکرێت.

جۆری هەیە وەك:

١-خراری شاش: بۆ تووتن تێکردن هەڵگرتن و گواستنەوەی بەکاردێ.

٢-خراری سفت: بۆ دەغل و دان و گواستنەوەی و تێکردن و هەڵگرتنی دەغل و دان بەکاردێ.

- خرش: زڕ: بۆ داری مێوە بەکاردێ.

- خرفای: خەلەفاو: خەرفاو: خەرافای:

مێشك تێکچوون و ئاگا لە خۆنەمان بەتایبەتی لەتەمەن گەورەیدا.

شاعیر ماڵ شێواو بۆ دژ داماوی گێژی، خەو ئاڵۆوی شێتی خەرفاوی.

(تاریك و روون)

- خرێنی: خورینی: پێش بەرچایی.

- خرینگ: خرنگ: زۆر تر دەنگی خشڵی ژنانە.

- خڕ: ١-شیو: دۆل: دەرە: نواڵ: نهال: لەڕووی پێکهاتنەوە جیاوازن: شێو: دۆلی بچووك: خڕدۆلێك وردەبەردی زۆری.

٢-گۆ: گرد: خرت.

٣-هەموو: ٤-شێوە بازنەیی: ٥-گیایەکە بنی شیرینە وەکو گێزەریە لە چۆل و دەشت شین دەبێ دەخورێت بنی زەردە: ٦-دەفع دان.

- خڕژن: دەنگی دەرهێنانی شیر لەکالان.

- خڕە: ١-نازناوێکە بە مرۆڤی کورتەبنەی قەڵەو دەگوترێ: ٢-وەکو گۆ

- خڕکردنەوە: گردکردنەوە: کۆکردنەوە.

- خڕکۆکی داری: فێڵبازێکی زۆرزانە لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی.

- خرەك: خرینەك: خرونەك: زەوی بەردەلان.

- خڕکەبەرد: بەردی ئامال خڕ.

- خڕنووك: گیایەکە گوڵەکەی پەڕی تاك و وردە لاسك رەقە دڕکاوییە بۆنێکی کەمی هەیە.

- خڕیوە: کرێوە.

- خرمە: دەنگی پێی ئاسپان لە کاتی رۆیشتنی بەتاو.

- خڕووکاوی: خوریکاوی: گروێ: هاولەڕوو: هاوڵەدار: ئاوڵاوی.

- خزگە: لێژگە: تووش: زەرد: تاف: هەڵەت: خلیسگە.

- خزم: خوێش: کەس و کار: قەوم و کەس.

- خزمی شیری: ئەگەر دایکیك شیری نەمابێ منالەکەی شیری ژنێکی تر بمژی ئەوا هەردوو منال دەبنە خزمی شیری.

- خزمی لەپشت: هەموو ئەو کەسانەی لەباوەکەوە دەبنە خزم وەك ئامۆزا و بن عام.

- خزمی لەزگ: هەموو ئەو خزمانەی لەدایکەوە دەبنە خزمی کەسێ.

- خشت: ١-کەرپوچ.

٢-لگێن: خشتی کال.

٣-بێ کەم و زیاد.

- خشت بڕ: خشت پێژ.

ئەو کەسەی بەقالب خشت دروست دەکا.

- خشڵ: چەك: رەخت:

زێڕ و زیو، مت مۆری ژن بە خۆیانی وەدەکەن بۆ جوانی.

- خزان: لەزین: زەلین: خلیسکان: هەڵخلیسکان هەلّزەلین: هەرزەلین: سمکۆ: چووە لیسین: ترشین. شمنین: خزین: خشکین: گلیسان: لە خشیان.

- خلێسك بردن: پێ هەرزەلین.

- خلّوە: خەلّوە: چلّەکێشان.

چل رۆژ خواپەرستن بەبێ حەسانەوە لە ژوورێکی دیاریکراو.

- خم: خوم: هەش: هەژ: رەنگی شینە جاران جل و بەرگیان پێ رەنگ دەکردەوە.

- خمچی: خمگەر: گازر: رەنگرێژ: خومگەر: ئەو کەسەی جل و بەرگی رەنگ دەکردەوە.

- خنکاو: خنکیاو: خنکیاگ: خنکای.

نەفەس بڕان: نەفەس نەهاتن بەهەرهۆیەك بێت.

- خوا: خودا: خووا: خا: هۆرمیز: هۆما: خولاّ: یەزدان: خودێ داوەر: خوداوەند: پەروەردگار: یەکتا: کارساز: بینایی چاوان.

- خواڤەند: خوەدێ: خوەدا: خوەدێ: خوەدا: یەکتا

(خودا، خودا، رەحمی بکە بە حالّم).

(خودا: خودا، هەمیشە بۆی عەبدالّم).

(فۆلکلۆر)

یاخوا هەروا گەرد و تۆزبێت
دەسرۆکەی لەملی ئالّۆزبێت
لەپاشان خولاّ رەحمەتی کرد دنیا رۆشەن کراوە.

(تحفە- ل١٢٢)

- خوابت پاریزێ: دوعای پاداشت دانەوەیە؛ واتە دوورە بەلاّبیت.

- خواحافیز: بە دوعا: بمێنین بەخێر وشەی رۆیشتن و بەجێ هێشتنی کەسی دەگوترێ.

- خواخەراپترمان پیشان نەدات: بۆ دلّ نەوایی دەگوترێ کاتێ کە تووشی کارەساتێك دەبێ.

- خوادەست بەبالّتەوە بگرێ: دوعای خێرە بۆ پاداشت دانەوە دەگوترێ واتە هەردەم سەرکەوتووبی و تووشی زیان نەبیت.

- خوادەیزانێ: خوا ئاگادارە: خوا لەژوور سەریە: بۆ راستی سەلماندنە، سوێند خواردنە واتە بڕوابکەن و درۆناکەم.

-خوار: چەوت: لار: قیل و قاچ: قیر قاچ: خێچ: چەفت: چەتال: خار: شەت: تیلە: چەڤی: خێس: شورك: کەچ: گێر.

- خواردی: وی خار: واردش.

- خواردت: تەخار: واردت.

- خوارزا: ١-منالّی خوشك: ٢-لەبن لەهجەی بادینان و شێوەی کرمانجی سەروو واتە کچی خوشك {خوارزایامن: واتە خوشکە زام}.

- خوارزێ: خواهارزێ: کوڕی برام.

(خوارزێ من: واتە کوڕی برام).

- خوازبێنی کردن: داخوازی کردن.

- خوا ستری کا: دوعایە لەکاتی تەنگاوە و ناخۆشی دەگوترێ واتە تووشی ناخۆش نەبیت.

- خوا سەبووریتان بدات: دوعایە بۆ دلّنەوایی کردنی کەسێك کە یەکێکیان مردبێ.





- خوا عافوت کات: واتە خوا لە گوناهت خۆشبێت.

- خوا عافوی کات: خوا بیبەخشێ: خوا لە گوناهی خۆش بێت.

- خوا قەبوول ناکا: خواهەلّی ناگرێ: ١-راستی دەلّێم: ٢-زولّم مەکە.

- خوارك: خالّەت: پلك.

- خوالێخوش بوو: ڕەحمەتی: بەمردوو دەگوترێ.

- خوالێت هەلّناگری: واتە ئەو زولّمەت سەرناگرێ.

- خوا مبارەکی کا: دوعایە دەکرێ بۆ :١-ئەو کەسەی ژنی هێنابێ: ٢-بۆکەسێك شتی بکرێ وەك خانوو..هتد.

- خواندگەه: خوێندگا.

- خوا نەخواستە: خواناکردە: خودانەخواستە: نەی شەلاّ: نەئیشالاّ.

- خوانەناس: ١-بێ دین: ٢-زالّم.

- خوانەیبڕێ: خوانەیبڕێت: دوعایە بۆ بەشە قازانج دەووترێت واتە شوکرانە بژێرم.

- خواوراستان: خواکردی: خۆش بەختانەهات: کارەکە باش هات.

- خواوەند: خوداوەند: خودا: خولاّ.

- خوای لێ رازی بێ: خوای لێ خۆش بێت: خواعافوی کات.

- خویزە: گزیر: پاکار: نۆکەر: خزمەتکار: خزمەتچی: پیاو: پێش خزمەت: خولاّم: پێشکار: غولام: چەند زەلامێك بوون ناخۆر و پیاوی ئاغا بوون هەموو تفاق و خەرجیان لەچەك و ولاغ و خواردن لەسەر ئاغابوو بۆ دزی و رێگری و چوونە سەر خەلّك و دوژمنانی ئاغا و مالّ سووتاندن رادەگێران.

- خوت: کوتومت: کت و مت.

- خوداحافیزی کردن: مالّئاوایی کردن.

- خوداگیر: تووشی بەلاّهاتوو.

- خودان: ١-خاوەن: ٢-ئارەقەی لەش.

- خودان پارە: دەولّەمەند: زەنگین: پارەدار: هەبوون.

- خودان خیرەت: بەخیرەت: بەغیرەت.

- خوداناس: ١-خواناس: بەدین: ٢-چاکەکار:

- خودان کرن: بەساحێب کردن.

- خودێ پەرس: خودا پەرست.

- خودێ پەرێسن: خودا پەرستن.

- خوراندن: هەلّکڕاندن: کرکاندن: کرتاندن: کلاّشین: ساوین: خشتکاندن: وریاندن: کراندن: خشکاندن.

- خوراو: خوراگ: خورای.

- خورشید: قورشید: قوشە.

- خورشیدی: هەوایەکی کۆنی گۆرانی کوردییە، ئاوازەکی فۆلکلۆرییە مەقامێکی رەوان و رەسەنی خۆمالییە و تایبەتە بە گەلی کورد، خاوەنی نەغمەی سەربەخۆی خۆیەتی، هۆنراوەی نیو دێر دە برگەیی کوردی پێوە دەگوترێ هۆنراوەی (فۆلکلۆری) و(دانراو) لەگەلّ هەوای ئەم مەقامەدا دەگوترێ ئەگەر هۆنراوەکان لەسەر کێشی دە پەنجەیی کوردی بن.

- خورتی: زۆری.

بەخورتی: واتە بە زۆری.

- خورمین: رمبازی.
- خوریانه: جۆره باجێك بوو خاوەن موڵك لە وەرزێری دەستاند.
- خورەوو: خۆیی.
- خوری ئەجندە: قەوزەی سەرئاو.
- خوزا ما: ناوی گوڵێكە پەڕەكەی بەریز و تاك تاگ و وردەلاسك رەقە و بێ دڕكە و بۆنی هەیە، ماڵییە و بەقەڵەم زیاد ئەكرێ بەكار ئەهێنرێ:
١-بۆ جوانی: ٢-بۆ بۆن.
- خوزاو: چرك: چڕك: چڵك: كێم: هەوا: زوخاو: خێزاو: زۆخ: ئاو و خوێن جەراحەت پێكەوە.
دڵجەدیدەم سەید، زۆخ مەتاونۆ
(بێسارانی- ل٨٢)
- خوژیلك: گوڵێكە پەڕەكەی بەریز و بەدرێژی یەك پارچە هەیە جۆری لاسكەكەی نەرمە بێ دڕكە بۆنی هەیە ماڵییە بە تۆو زیاد ئەكرێ، موتربە ناكرێ، بۆ جوانی بەكار ئەهێنرێ.
- خوست: ١-هەست: ٢-دەنگ.
- خوسرەو: خەسرەو: خەسرۆ.
١-یەكێ بووە لەپاشاكانی دەوڵەتی ساسانی.
٢-ناوی كوڕانی كوردییە.
- خولاگیر: خوداگیر: خواگیر.
- خورینی: خورێنی: خرێنی: پێش ئەوە نانی بەیانی بخۆی هارەقی سینگ و مەمكادەرێ شانا هەنگوینی (هەوڕ و سبیانە زووە داكوڕ بخون لە خرێنی).
(فۆلكلۆر)

- خوشك: خوار: خوە: خوا هەر: خوشیك: ئابجی: واڵە: والاّ: والێ: خیشك: خوا: خۆ: خوا: خوە هەر: خێشك: خواك: خوێشك: خوینگ: خوەهگ: خۆشك: بالتووز: خوە بینگ: خۆچكە: دەدە: خوچە: مێینەی لەدایك و باوكێك.
خوە بینگاوی پۆرسوور و سادەستیابوو.
(كۆمەڵە- ل١٣٣)
- خوشكە زا: خوارزا: واڵەزا.
- خوشكۆڵە: خوشكۆك: خوشكۆڵ: خوشكۆڵێ: خوشكۆرە: بچووك كردنەوەی خوشكە لەبەر خۆشەویستی دەیڵێن.
- خولامی سەری راوچییانم: هەر راوچییەك زووتر كەروێشك بدۆزێتەوە ئەو كەروێشكە خەوتبێ و هەڵنەسابێ بە هەڵسانی راوچییەكە بەدەنگی بەرز هاوار ئەكاو ئەڵێ (خولامی سەری.. راوچییانم، یان خولامی سەری ئاغام).
- خولاوەند: خودا: خاوەنی: ئەرز و ئاسمان.
- خولق خۆش: بەكەیف.
- خول خولە: فرفرۆك.
ئامرازێكی بچووكی مناڵانەیە لە دار دروستدەكرێت.
- خوناڤ: خوناو: شەونم: ئاورنگ: ئاوونگ.
- خونچە: شكۆفە: گوڕاڵە: ول: گۆپیتە: خۆنچە.
- خونچیلانە: خنجیلانە.
- خونكار: ١- لەقەبی سوڵتانەكانی عوسمانی بوو:
٢- بێچوی سێیەم هێلكەی سەقەر كە دەتروكێ.





- خوندی: ئەو كەسەی بۆ بەشداری كردنی زەماوەندی بووك گواستنەوە لەدووی دەگەڕێتەوە و دەچێتە سەر زەماوەند.
- خۆیان: ئاشكرایە: كار و كردەوەی خەڵك پێ بزانی: دژی بن.
- خوێ: خێ: خوا: نمك: مەكێ: خوا.
(هەمووشت بەخێ، خێش بەمەعنا) (پەند)
- خوێ رسك: ئەو شوێنەیە كە مەڕ و ماڵاتی لێ خوێی دەدرێ.
- خوێری: خۆری: خێرو: توێری: تۆڕی: خوێروو: لات و لووت: بەرەڵا: گەلۆر: هیچ و پوچ: بێ كارە: تەپلەشڕ: شەحتۆ: قەلتەبان: بێ قوونەبان: گومناو: خێری.
(ئەمجار گەلێكی خۆڕی و تۆڕی لە خۆ هاڵاند).
(شەرەف- ل٤٨٣)
- خۆڕی خانە: شوێنی كەسانی هیچ و پووچ.
- خوێكردن: لەخێ وەردان:
- خوێندووتە: خیندیتە.
- خوێش: خێش: خزم.
هەی داد، هەی بێ داد لەدەس زەمانە
من كرد گەوەپەن خێش وەبێگانە
- خوێن: خین: خون: خوین: ون: هون: خی: خۆن: خێن: ونی: لەخرۆكەی سوور و سپی پێكدێت لەلەشی هەموو گیاندارێك هەیە مایەی ژینە.
- خوێناو: خوناو: خیناو: خوناب: ناو: خوناڤ: هووناو: هووناڤ: هوتاو.
- خوێن بەفیڕۆ چوون: تۆلە نەستاندنەوە.
- خوێنرێژ: پیاو كوژ: دەڤ خوین: مێر كوژ.

- خویندار: خاوەن كوژراو: ساحێب كوژراو.
- خویندوتە: خوێندگتە: خندیتت.
- خوێن كردن: كوژتن.
- خوێن گر: خێن گر: خوێن خوار.
- خوێنەوار: خیندەوار: خوەنەوار: خوندەڤان.
- خوێنی جگەر: غەم.
- خۆپان: وێران: كاول: كاڤل.
- خۆپەرست: خۆبین: خۆویستن: من منی: خۆپەسنەكارە:
- خۆپەرستی: بەخ: بڤار: خۆخۆیی: ملی ملێ: منەمنە: منێمنە: خۆبینی: خۆگایی.
- خۆخ: قۆخ: هەشتالوو: هەشتاوی.
- خوڕازاندنەوە: خۆ تاسدان: بەدەوری خۆهەڵاتن: خۆجوان كردن.
- خۆڕانان: سینگ رەپێش كردن: فیزلێدان.
- خۆرسك: خێروك: زگماك.
واتە بۆ خۆی دروست بووە و دەستكرد یان دەست نێژینە.
- خۆرك: ١-جۆرە زیندەوەرێكی بچووكە و لەجل و بەرگ و شتی وادەدا و دەیفەوتێنی.
٢- ژەنگی چەك كە لە لوولەكەی شوێنی تری دەدات.
- خۆركت لێ كەوی: دارزێی: بۆگەنی بی.
- خۆزگە: بریا: بریان: برێ: بریی: خۆزیا: كاشكا: كاشی: كاشك: بریی بەبریی خودای بایە: بریا بە برایای خوای: دەك: كاش.
كاشكێ: خوەزكا: خوە زیكا: خۆزیا: خوەزلا: خوەزی: كا: كانی: خوزیكا: خۆزكا: خۆزگا:

خەزگال: خورەزی: خازل: دەبا: خۆزی: خوەزەو: خوەزگە: کاشکای: وەشڵە: شەڵای: خۆزەیی

ئامرازی ئاوات: ئارەزووی جێبەجێ بوونە.

خوە زلا من بزانبوویا.

(ستران- ل٤٨)

خۆزی بەخوزی داران بەخۆی ئەو تووشی ئیفلجییە نەبایە. (غەوارە- ل٢٨)

کاشکی رووی ئەزەل نەبوای بەدۆستم.

(گوڵاڵە- ل١٢٥)

خۆزیا شوان بام شوانی مەڕداران

دارا خۆزیێ یا خرشە

(کانی- ل٤٨)

خۆزگە من بایام گۆزەی سەرشانی.

- خوەزل دانی: واتە خۆزگەی دەهێنا.

- خۆسەر: هێژا و شایەنی رێزگرتن.

- خۆشاڤ: خۆشاو.

- خۆش: خاش: وەش: ١-دڵگیر: دڵفڕین.

٢-بەتام: خواردنێکی خۆش: ٣-خێرا رۆیشتن خۆش بڕۆ:٤-زۆرباش: ٥- ئارام:٦ -باش: خوەش هەڤال.

- خۆشاڤ: خوەش ئاڤ: خوەشاف: ئاڤا خوەش: خوەش ئاڤ: ئاوی خۆش: مێوژ بخرێتە ناو ئاو..

- خۆش ئاواز: ئاوازی بەسۆز.

- خۆشاوی هەنگین: جۆرە خۆشاوێکە لەهەنگوین دروستدەکرێت.

- خۆش بوون: ١-لێ بووردن: ٢-بەتام بوون.

- خۆش بەز: بە تاژی خێرا و باز هاوێژی چاك دەڵێن

- خۆت خۆش: وشەی دڵدانەوەی زیان لێ کەوتوو.

- خۆش خوان: گۆرانی بێژ: مرۆڤی دڵتەڕ و قسە خۆش بوون، دڵپاك بوون.

گۆرانی بێژی دیوەخانان بوون حیکایەت زانیش بوون شایی و داوەت گێڕبوون.

- خۆش خوان راگرتن: جاران لە کوردستان هەر ئاغایەکی خاوەن دیوەخان خۆش خوانێکی رادەگرت کەشەوانە لە دیوەخان بەیت و باوی بۆبلێ لەوەختی نووستندا حیکایەتی بۆ بکا، لەشایدا داوەت و رەشبەڵەکێ بۆ بگێڕێ لە سەنگەردا تا تانوتی لێ بدا لەڕاو دا لەسەر تەمال پایزە و ئازیزەی بۆ بڵێ فران باوێتە دوژمنی و بەندان بە دۆستی هەڵبڵێ و تەنانەت لەپاش مردنی شینی بۆ بگێڕێ، لەژووری نوستندا حیکایەتی بۆ ئاغا بڵێ تاخەو دەیباتەوە، خۆش خوان تەنانەت گۆرانی و بەیت و باوی بۆ ئاغاژن و خێزانی ئاغاش دەگوت چونکە خۆشخوان وەکو کوڕی ماڵی حساب دەکرا.

- خۆش خۆر: خواردنی باش خواردن.

- خۆش دڕ: زووکۆنە کردنی جل و بەرگ.

- خۆش دەنگ: دەنگ خۆش.

- خۆش رەوت: رەوتی خۆش.

- خۆش قەلەوی: چاك چۆنی: لەیەکتری پرسین.

- خۆش کردنەوە: چاکردنەوە.

خەریکی خۆش کردنەوەی پێشت و هاربوو.

(گەدا- ل١٠٢)

- خۆش گوزەران: گوزەران باش.

- خۆش گفتار: قسە خۆش.





تۆکیژەکی خۆش گفتاری.

(هونراوە- ل١١٤)

- خۆشەبوون: دەبغ بوونی مەشکە بە هۆی پەلکە هەنار.

- خۆشەوار: پەلکە هەناریان لەناو ئاو دەکرد لەسەر ئاگر دوو بڵقیان پێ دەدا و پێستەیان بۆ ماوەی دووڕۆژان لەناو دەنا بۆ دەغ بوون لەکاتی مەشکە دروستکردندا بەمە دەگوترا (خوشەوار).

- خۆشەویست: خۆدل: ژیر لۆ: لەبەردڵان.

- خۆشناو: وشەیەکی لێکدراوە لەووشەی (خۆش+ناو) دروستبووە هەندێ دەڵێن هۆی دروستبوونی ئەم ناوە لەخۆشی ناوچەکەوە هاتبێ چونکە ئاو و هەوایەکی یەکجار خۆشی هەیە.

- خۆشناوەتی: بەم شوێنە دەگوترێ کە خۆشناوەکانی تێدانیشتەجێن هەرێمێکی شاخاوی سەختە و پڕە لەدۆڵ و رووباری سارد و سازگار و باشترین میوە و دارستان و بەروبوومی کشتوکاڵی وەکو توتنی لێ دێتەبەرهەم.

- خۆش نشین: ئەوەیە جاران جووتیار دەیتوانی بەکەیفی خۆی جێگایەك واتە هەر گوندێك بۆ دانیشتن هەڵبژێرێ بەخۆشی تێدا بژی.

- خۆلەپەتان: خۆلەپۆك: شوێنی خۆڵی وردو بێ بەردی زۆربێت.

- خۆل: خۆر: خاك: گل.

- خۆلەخوداکردن: راستی نەگوتن.

- خۆلە خودانەکردن: راستی گوتن.

- خۆکوشتن: خۆلەبەین بردن: خۆلەناوبردن.

- خۆڵەمێش: مشکی: خۆڵەکۆ: مۆلك: بوول: خۆڵکەوە: رتام: خۆڵی.

- خۆناسك کردنەوە: دەنگ باریك کردنەوە: هەندێ جار ئافرەت لەکاتی ئاخاوتندا بەزۆری بۆ خۆدەرخستن تەکنیکێکی تایبەتی بەکاردێنن کە کاردەکاتە سەر زۆربەی فۆنیمەکانی گوتن بەم تەکنیکە دەکەن کە گۆڕان بەسەر دەنگدا دێنن.

- خۆیا: خۆهدان: ئارەقەکردن.

- خووخدەباش: بەشەرەف.

- خووسار: خویسار.

خووس دەکەت: دچەمینت: کووردەکاتەوە:

خووس کردن: چەماندن.

- خووك: خووکك: خووگ: بەراز.

- خووگان: بەرازان.

- خوەش تڤی: خۆشەویست.

- خوەدۆ: خوەدێ ۆو: خوە دانۆ: خوە دیکۆ: خوایە: -خودا: خوا: ناوی خوایە: لەکاتی بانگکردنی (خوایە هاوار): خواهاوار.

- خوە شاڵ: خۆش حاڵ: شادوومان.

- خوەشك: جوان: دەلال.

- خوەم: خۆم: بەخۆم.

- خوەش مێر: ١-خۆش مێر: ئازا:

٢-ناوی کوڕانە.

- خوەشی: خۆشی: شادی: دژی ناخۆشی.

- خەبات: کۆشەو: تەقەڵا: هەوڵ: تێکۆشان: تەلاش: خەڤات.

- خەبەر: خەوەر: دەنگ و باس.

- خەبەردان: ١-خەبەرپێ دان: خەبەرراگەیاندن .
خەبەری بەوەزیرەل ئەعزەم رادەگەینم.
(تحفه -٢- ل١٤)
٢-قسەکردن
- خەبینەت: مخابن
- خەپانگ: تەڵە: تەرە
- خەپە: هەپە: چەندپارچە داری خڕ وەیا ئاسن مژانە و باسکە هەوجاری پێ قەیم دەکرێت و بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە.
- خەپە تۆڵە: ١-گوجیلەی تەمەن پێنج مانگ.
٢-منڵێك قەڵەوبێ.
- خەتەر: ترسناك: سامناك: بڤە.
- خەتەنە: خرۆبران: سوورانە: سونەت.
- خەجیج: خەجۆ: خەج: خەجە: خەجیلە: خەجاو: خەجان: خەجکۆ: خەجیلێ: ناوی ژنانە.
- خەجیلێ برێ خەجیلێ خەجیلێ مامە سۆری.
(سێسەد- ل٥١)
- خەجو سیامەند: خەجوسیابەند: بەیتێکی کۆنی فۆلکلۆری کوردییە بووەتە لاوك و لاوکەکەش هەبەرناوی (خەجو سیامەندە) دڵبەر و دڵداری یەکتر بوون.
- خەرابە: ١-گوفەك. ٢-ناوی گوندێکە.
- خەربەند: کرێکاری چاك.
- خەربۆقەکردن: پەت لەستۆ ئاوێتن.
- خەرتە: دوای بارینی یەکەم بارانی پاییزییان و پەڵەکەوتن گاسنێك لەبەیار یان لەپەرێز دەدری و ئینجا تۆو دەکرێت (ئەمە پێی دەگوترێ خەرتە).

- خەرتەل: داڵە کەرخۆرە.
- خەرتەلە: گوڵێکە پەڕەکەی تۆپەڵ و وردە لاسك نەرمە بێ دڕکە بۆنی هەیە کیۆییە بە تۆ زیاد دەبێت.
- خەرجە: خەرجی: هەستە: باج.
"ئەمن هەستەی حەوت ساڵانم دەوێ تەواو".
(تحفه-٢- ل١٥)
- خەرجەستاندن: باج وەرگرتن.
- خەرجی: ١-پارەوپول: ٢-باج.
- خەرجی خانە: سەرماڵ: جۆرێك بوو لەباج لە عەشیرەتەکان دەسێنرا.
- خەرجی کێشان: مەسرەف کردن.
- خەرقە: جل و بەرگی سۆفیان.
- خەرقی: بورایەوە: لەخۆچوو.
لەهۆش خۆچوون ئاگا لەخۆ نەمان.
- خەرگاو: قوڕاو: ئاووقوڕی تێکەڵاو.
- خەرمان: جۆخین: خەرمان.
- خەرمانەی داوە: جۆخینەی بەستاوە.
واتە ئەو تەم و مژەی دەوری مانگی گرتووە
سێ جاربە و مانگەی خەرمانەی داوە
هێشتا مەیلی تۆم بەکەس نەداوە
(فۆلکلۆر)
- خەرۆبوون: کەیف خۆش بوون.
- خەریب: غەریب.
- خەریتە: ١-فیشەك بەند: فیشەك لەق: فیشەکدان: فیشەك لغ: رەخت: ٢-نەخشە.
- خەریك: لەگژ: لەزگ.





- خەریکم: لەگژم: لەزگم.
- خەریکە: ١-لەگژە: ٢-وەختە.
... خەریکم دەتەقم...
(حەمەدۆك- ل٢٤)
- خەرەت: خەڵەت
- خەرەق: خەریك: مشغول: ئەنجامدانی کارێك.
- خەزان: گوڵێکە: پەڕەکەی بەریز و بەدرێژ و پەڕ پەرەیە لاسك نەرمە بێ دڕکە و بۆنی هەیە و کێوییە لەکوردەواری بەکار ئەهێنرێ بۆ:
١-جوانی: ٢-هەنگ: ٣- گەڵاکەی بۆ برین
- خەزنە: ١-خەزینە: خەزێنە: گەنج: خزنە:
٢-ناوی گوندێکە لەدەشتی هەولێر.
- خەزوور: خەزویر.
- خەزوران: خەسوران: ١-هەموو خزمی مێرد:
٢-هەموخزمی ژن.
- خەزوری پیاو: باوکی ژنەکەی.
- خەزوری ژن: باوکی پیاوەکە.
- خەزێم شۆڕ: بۆ جوانی و پەسندی بەو ئافرەتەوە دەڵێن کە خەزێمی شۆڕی لە کەپوویە و جوانی دەنوێنی.
- خەلیفە: ئەو کەسەی تەریقەتی وەرگرتووە ئیش و زکر و فیکر و ئەو فەرمانانەی کەلەلایەن مامۆستایەوە بۆی دانراوە هەموویانی جێبەجێ کرد لەلایەن شێخەوە ئەبێ بە (خەلیفە) و بەجێ نشینی شێخ لە ئیرشاد و لە دەروێش راگرتنا.
- خەساو: خەسیو: خەسای: خەسیاگ

گون دەرهاتگ: خەسراو.
- خەسە: خەستە: نەخۆش: نەساغ: ناساغ: ناساق.
- خەستەخانە: خەسەخانە: نەخۆش خانە: ناساق خانە.
- خەسڵەت: خەسرەت: خوو: ئەخلاق.
- خەسوو: خەسی: خەسوورە: ١-دایکی ژن:
٢-دایکی مێرد.
- خەلاس: خلاس: نەما: خلاز: کۆتایی پێهات.
- خەلایی: گرانی: قات و قڕی: دژی هەرزانی.
- خەڵك: خەرك: خەلق.
- خەلە: دەغل: گەنم و جۆ.
- خەڵوەتی: لقە مەقامە لە مەقامی رۆژهەلات و عیراقی مەقامی سەرکنیە، ناوەکەی لەناوی دەستە و تەریقەت وەرگیراوە.
- خەلەت بیم: خەلەت بووم: هەڵەم کرد.
- خەلیلە: گوڵێکە: پەڕەکەی تۆپەڵ و وردە لاسك رەقە و بێ دڕکە، بۆنی هەیە، کێوییە، بە تۆو زیاد ئەکرێ.
- خەڵکان: مەردووم.
- خەلیل: خەلۆ: ناوی کوڕانە.
- خەم: ١-غەم: خەفەت: زگار: ٢-نووشتاوە.
- خەمان: کۆی خەم.
- خەمبار: غەمبار: خەمناك: خەمگین: کز: بێ کەیف: مەلوول: داماگ: داماو: خۆڵ بەسەر: قوربەسەر: دڵتەنگ: مات: دڵگیر: پەنزەهار: خەمدار: بەخەم: غەمگین: خرۆك: بارگران: لێوبەبار: ئالووس: دڵگران: خاك بەسەر: قوڕوەسەر: دڵ بەخەم:

کەسێ تووشی بەڵا و چورتمی رۆژگـار بووبـێ و بـۆی
چارەسەر نەکرێ یان زوڵمی لێ کرابێ.

خەمبار و دڵ پەشێوم بڕوانە باری لێوم
مەجبورت کردم جوابی لەبەر تۆ قورپێیوم

- خەمبەردیر: شەك.
- خەمخۆر: خەمخوەر: دڵسۆز.
- خەمکی خەمان: خەمکەی خەمان: خەمخوار.
بەمـــشوور: دەربەنـد: غـەمخۆر: دەربەسـت: دڵـسۆز:
مامە خەمە: خاڵە خەمە: خەمخۆری هەمـوو کارێك.
- خەمل: خاوەن مولکەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە مولکیـان زۆربـوو لـەکاتی کۆکردنـەوەی دەغـل و دانیان پێش دەرەو ئەچـوون دایـان ئەنایـە ئەوەنـدە ڕەبەو ئەوەنـدە مولکانەیـەتی، بـەهۆی یـەکێك یـا چەند کەسێکەوە بەو دانانە ئەڵێن (خەمل).
- خەملاندن: رازاندنـەوە: ئـالا و والابـوون: جـوان کردن: نەخشاندن.
- خەنجەر: خەنچەل: خنجـۆك: خانـچەل: خـەنجۆك: خەنچەر: خنجر: خنجەر: چەکێکی سـامناك و پـڕ لەهیبـەتی بـەرگری کردنـە هێمایـەکی گـەورەی نەتەوەی کوردە.
خەنجەر لەم بەشانەپێکدێت.
١-دەسکی خەنجەر: لە شـاخی گامێـشە ددانـی فیـل (دەسك ماهی) لـە شـاخی بزنـی کێـوی یالـە جـامی ئەستوور کە پێی دەڵێن (جامی تەیارە) دروستدەکرێت.
٢-دەمی خەنجەر: کەلـە پۆلاوشـینە تیـغ و شـیری دەبان دروستدەکرێت.
٣-کالان: کێلان: لەدوو جۆر دار دروستدەکرێت:
١-داربی: ٢-داری سپیندار.
بەپیستەی ئاژەڵیش جوان دادەپۆشرێ ،یـا بـەئاوی زیو رووکەش دەکرێ ،یا بەئاوی زێر.
٤-ئـەو ماددانـەی کـە بـۆ خەنجـەر دروسـتکردن بەکاردێن.
١-زاخ: ٢-ئەستریلك: ٣-سەختبان: ٤- لکە:
٥-شەب.
٥-جۆرەکانی خەنجەر:
١-کرمان: ٢- خۆراسـان: ٣- شـیراز: ٤-قـەزبین:
٥- دەبـــــان: ٦-شـــــینەتیغ: ٧-دم شـــــام: ٨-
بەپشکەکەی دەناسرێتەوە بەتایبەتی زێربێ و پێـی دەڵێن خەنجەر پێشکەزێر.

یان وەو خنجێرە خۆم ئەوەدەمەکوشت
یان هەیاسەکەت ئەوەسم لەپشت (فۆلکلۆر)
ئەو بەر ئەوبەرا ناسکا دولبەرا
لەسەر بالاکەت شەڕەخەنجەرە
خەنجەری بێنە بیدە لەجەرگم
ئەوجا بخوێنە یاسینی مەرگم
(خەنجەر برایە، تفەنگ پسمام) (کانی- ل٤٤)
دۆنزدە قەواز دانە بەر خەنچەلا (ستران- ل٥٤)
خنجەر بێنن بمکوژن
باگیانم رزگاربێ (گۆلالە- ل٤٧)

- خەنجەربازی: یاری کردن بەخەنجـەر بەتایبـەتی لـەکۆڕی زکـری دەروێـشان کـە دەروێـش یـاری خەنجەر ئەکەن.
- خەنجەرچی: وەستای خەنجەر دروست کردن.
- خەنجەر هەڵکێشان:





لە کاتی پەلاماردان خەنجـەر لـەکالان دەرهێنـان و بەکارهێنانی بۆ شەڕ.
هەڵکێشە خەنجەر بیڕە خەیاڵم.
- خەنـدە: خەنـە: بـزە: زەردە: نەرمـە پێکـەنین: زەردەخەنـە: زەردە لێـوی: بـزە خەنـە: گرژنیـەوە: زەردەهاتن: نیمچە پێکەنین.
- خەنقانـدن: خەنکانـدن: خەفـەبوون: خەنـدکێن: گەروو گیران.
- خەنە: ١-خنە: هنە: هەنە: حنە:
گەڵای داری خەنەیە دەیکوتن و ژن بەکاری دەهێنن.
٢-خەندە: بزە.
٣- نـاوی گوڵێکـە پەڕەکـەی بـەریز و درێـژی یـەك پارچەیە لاسك نەرمە و بێ دڕکە و بۆنی هەیە ماڵییە.
- خەنەبەندان: خەنانە: خەنەبنان:
چەند رۆژێك پـێش گواسـتنەوەی بـووك، خەنـەیان لەجیاتی شەکر و نوقڵ بۆ ماڵان دەنارد و بووکیش دەست و پێ و سـەری لەخەنـە دەگـیرا و بەمـەیان دەوت (خەنەبەندان) لە دەرماڵ دووس خەنەبەندانە.
- خەندەران: جۆرە گـوڵێکی هاوینەیـە قـسەیەکی باوی بەدواوە هەیە ئەڵێن گەر بەرامبەری بوەسـتی و پێی پێبکەنی گوڵەکە لە داخان دەم ئەکاتـەوە و شەق دەبا.
- خەنە لێنان: خەنە لەسەری نان:
١- ژن لەسەریان دەنا:
٢- پیاو لە سمێڵیان دەنا بۆ جوانی.
- خەنی: شاد: بەختیار: بەختەوەر: کامەران: بەکەیف.
- خەو: خۆو: خاو.
- خەواندن: خەوخاندن: نواندن.
- خەوتوو: نڤستی: نوستی: نوستوو: رازایی.
- خەوبەسەرداباریـن: خەوله چاویدا بارین.
- خەوتن: خەفتن: نوستن:

خانم خەوتووە وەك خەرمانەی گوڵ
پا لەبانی پادەست لەبانی دڵ

- خەو لەچاودا شکان: خەو لەچاودازان.
- خەولێ حەرام بوون: نەنوستن بـەهۆی کارێکـەوە یان کەسێکەوە.
- خەون دیتن: خەوبینین.
- خەونەچوونەچاو: خەولێ نەکەوتن: نەنووستن.
- خەوی سووك: دژی خەوی گران.
- خەوی شیرین: شیرن خـەو: خـەوخۆش: قـوولایی نوستن: خەواشرین.
- خەوهاتن: کەوتنە خەوەوە.
- خەونەهاتن: خەوچوون.
- خەیات: جل دروو: بەرگ دروو: کالا دروو.
- خەیاتە: ١-خیاتە: تالی ئاوریشم.
پەرچەم خەیاتە: واتە پەرچەم تالی ئاوریشم.
٢-بەرگ دووروە.
- خەیانەت: خیانەت: ناپاکی: دڵڕەشی: بەدنمەکی: دەس بڕی: دەس چەپەڵی.
- خێز: زیخ.
- خێزاو: زوخاو.
- خێ: خوێ.
- خێر: چاکە: خاسی: دەسەنە.
- خێرا: زوو: لەز.

- خێراخێرا: زوو زوو.

... خێراخێرا بخوا زاری دەسوتێ...

(حەمەدۆك-١-ل١٥)

- خێرپێکەر: خێرپێ هاتنەکرن:
ئەوەی خێری پێدەکەن.

- خێر پێکردن: یارمەتیدانی ئەو کەسەی خێری پێدەشێ.

- خێرتەگاتێ: خێرت دەگات:  خێرت پێدەگات.

- خێرخوا: خێرخواز.

- خێرۆمەند: خێرەومەند: خێرکەر: خێرەوەمەن.

- خێراندار: خێرخۆز: خێرخاز.

- خواردنی کوردەواری: بریتییە لەو خواردنانەی کە تایبەتە بەکورد وەك:

١- کولێرە چەورە.

٢- کولێرە ناسکە: ناسکەنان.

٣- ئەسپناغ سوروە کراو: ئەسپناغ سور دەکرێتەوە لە رۆن.

٤- دۆغرماج: نان دەخەنە ناو ماست و کشمش تێ دەکەن.

٥- کەتە: کەتە بە برنج لێ دەنێن.

٦- تەندور پلاوی: برنج و کشمیش و دانەوێڵە بە تەنوور دەکرێتەوە.

٧- کولکەی سوورەوەکراو: کولکەی سورکراوە.

٨- دۆغەوا.

٩- داندۆك.

١٠- ساوار بە تۆڵکە.

١١- ساوار بە کەنگر.

١٢- ساوار بە هێلکە.

١٣- کەشك.

١٤- کاردی.

- خێردانەوە: لەکۆتایی خێرلەکارێك بینین.

- خێرکردن: خەیرکردن: یارمەتیدان.

- خێرنەخواز: خێرنەکەر.

- خێروشەڕ: خۆشی و ناخۆشی.

- خێری پێ دەشێ: واتە لێقەوماوە.

- خێری خودا: قازانجی باش.

- خێر هاتن: بەخێرهاتن: بەخێربێن.

- خێزان: ١- هەڵسان: ٢-عەیال: مال و منداڵ: ژن و منداڵ.

- خێڵوك: خورسك: کات: خێرۆك: جاران وادەبوو بەکارەساتی تەزرە دەغڵ دەکوترێ و دەکەوێ و نادروێتەوە گوڵەکانی دەپەڕن خاوەنەکەی گاستێکی لێدەدات دانەوێڵەکەی لەتەیروتوار دەشارێتەوە باران لێدەدات شین دەبێتەوە واش دەبێ قانقان تۆی پیوەدەکەنەوە.

- خێڵەکی: ١-بریتییە لەو باڵدارانەی گەرمێنی و کوێستان دەکەن.

٢-عەشیرەتێکی : عەشیرەتەکی .

- خێنجی: جگە: بێجگە.

- خێن ژ: جگە لە: بێجگە لە.

- خێوان: قوولایی هاتن: رێك هاتن: گونجان: تیر و پەر.

- خێواندن: لێدان.

دووشەقم خێواندێ.

- خێوەت: خیوەت.

- خێوەتی چەتری: جۆرێکە لە خێوەت کەوەك چەتر رادەوەستێ.

# د

١- له شێوەی ئاخاوتنی ناوچەی سولەیمانی گۆڕانی (دال) بەتایبەتی دوای(ن)ی زەندار (ساکن) بە (گاف) زۆرە وەکو:
چەندە: چەنگە: ئەمندە: ئەمنگە:مەند: مەنگ.
٢-دەنگ گۆڕکێ دەکات لەگەڵ (ل):
(خودا: خولا)
یاخولا هەروا گەردوو تۆزبێت.
٣-لەگەڵ(ت) دەنگ گۆڕکێ دەکات:
سادق: ساتق.
٤-لەگەڵ (گ) دەنگ گۆڕکێ دەکات: ددان: دگان
- دا: ١-دایك: داك: دیا.
٢-تا: هەتا.
حازربە دابڕۆین
هەوروسبیانە زووە دا کوڕ بخۆن لەخورینی
(فۆلکلۆر- ل٢٧)
- دائیم: دایم: هەموو کات
- دائیمەن: دایمەن
- دابڕان: دابران
- دابەستی: دابەستوو: دابەستە: ئەڕە بەستە: زاخۆران.
- داپەستراو: پەسترای: پەستراو.
- داپیرە: داپیر: نێکی: نەنك: نەنە.
- داتەپان: داتەپین: رووخان: رمان: دارمان.
- داتەپاو: داتەپیو: رووخان: رووخای: رووخاو.
- داخ: ١-سوور: سۆر: زۆرگەرم.
٢-خەم: خەفەت.
٣-کێو: ١-چیا : کەژ.
- داخان: کۆی داخ.
- داخران: بەستران: پێوەدران: قوچان: گیران: لێکنران.
نووقان: ژنیان: گالەدران.
- داخریاگ: داخراو: داخرای.
- داخ خواردن: غەم خواردن.
- داخورپیان: داخورمیان: رمان.
- داخەکەم: داخی گرانم: پەککو: داخم ناچێ: داخی داخانم.
موخابن: بەداخەوە: دەستی شکاوم: وای لمن ئەزۆ: ئاخ: داخ.
- دادپەروەر: دادگەر.
- دادایی: تەنوری داخراو.
- داددان: مرۆیەتی: سیانەرەوی.
- دادپەروەری: راست پەروەری: ئینساف.
- دادڕدادڕ: پارچە پارچە.
- دادرەس: یارمەتی دەر: رزگار کەر.
- دادگا: دادگە: مەحکەمە.
- دادە: ١-داخە: قەپاتکە: ٢-خوچە: باجی.
- دادەر: تراشۆك: قەڵەم تراش: مقتاتە.





- دار: ١-درەخت: ٢-بەردی دامەی: ٣-بووەتە ناوی زۆر گوند وەك پێشگرێك (دارەبەن، دارەتوو: دار بەسەر).
- دارا: ١- داریوش: دواپادشای بنەماڵەی هەخامەنیشی.
٢-دەوڵەمەند: ٣-ناوی کوڕانە: ٤-شوێنی تایبەتی بۆ شەڕە کەو.
- دار ئاڵا: دارچاك: داری سەرگۆڕی پیاوچاکان بەئالاوە.
- دارئاوس: داراوس: بای مانگی شوبات داری پێ ئاوس دەبێ.
- دارایی دنیا: دارەتی دنیایی: سامان: ماڵ.
- دارئەقرەبە: ئەو دارەی دەچێتە ناو هەردوو کونەکانی لای پێشەوەی ملی حوشترۆکەکانی جەنجەر.
- داربنە: دارزنجیرە: کۆلەکەی ناوەڕاستی جۆخین لە گێرەکردندا.
- داربەدار: بەردبە بەرد: داش بەداش: یەکبەیەك.
- دار بەربیر: دارێکی نیمچە تەژەیە لای پێشەوە لەسەر لێواری بیری ئاوە ئەمسەر و ئەوسەری بەبنی قاناتەکانەوە چەسپکراوە. تا ئەوەی لەبەربیرەکەیە لەکاتی دەولك وەرگرتندا پێی خۆی لێ بکاتە رکە و نەکەوێتە ناوبیرەکە.
- داربەستەك: دارێکی خۆش کرایە ناوەندەکەی خڕۆکی لوولەیە و باریکە بەقەدەر تیرۆکی نان کردن دەبێت سەرەکانیشی باریکە بستێك درێژە دەخرێتە ناوگوریس بەستەك بای دەدەن تاکو گوریسەکە توند دەبێت سەرێکی لەشەبکەی شەغرە گیردەبێت لەکاتی شەغرە بەستان.
- داربێژ: ئەگەر بێژ لەبەر گوندی بکرێت شوان لەسەردارێك دادەنیشی ئەو دارە پێی دەگوترێ (داربێژ).
- دارتاش: چیۆتاش: نەجار.
- دارتیژ: ئەو دارەی کونی تێڕی پێدەگرن.
- دارجۆت: ئەو دارەیەکە جووتیار بەدەستیەوەیە بۆ لێخورینی ولاغەکان بەکاردێ نەقیزەی پێوەیە.
- دار جۆخین: ئەو دارەیە کەلە ناوەندی جۆخین دەکوترێ و زەنگوڵەی دەخرێتە سەری بۆ راگرتنی گوریسی زنجیرەی جۆخین.
- دارخەزنە: گێروشکە: دووگۆێ نیر: دووداری تراشایی بچووکن لەناوەندی نیردا بۆ راگرتنی هیرتە بەکاردێت.
- داردۆل: ئەو دارەیە کە دۆڵەنگێو دۆڵی پێ لێدەدا: یەکیان دارێکی راست و باریکە و ئەوی تر ئەستوورە و سەری بە گۆمکە هەریەکە بە دەستێکەوە دەگرێ و لەلایەکی دۆڵەکە دەدات کە لەدەهۆڵ کوتانیش بووەوە هەردووکیان لێك دەبەستێ.
- دار ربە: دارێکی خری لووسە درێژییەکەی (٤٠)سم دەبێت و بۆ دارمالی رووبەر بەکاردێ.
- دارەبزمارە: ناوی چاکێکە لەکلکەی قەرەچوغ ئەوەی دانی بێشی بزمارێکی لەدارەکە دەدات.
٢-ناوی کلکەی شاخی قەرەچوغە.
- دارەباز: دارەبەست: دارتەم: دارەمەیت: دارەتەرم: - دارباز: تاووت: تابوت: سەرەجە.
- دار رەشکە: ئەو دارەیە کە دەخرێتە بن رەشکە بۆ راوەستانی رەشکە لەسەر پشتی ولاغ.

- دارەڕاکردن: دارخستنە سەر دیواری خانوو بۆ سەر داپۆشین.
- دارزێی: داوەشێی: واتە لە پەل و پۆبکەوی شەنگ وتینت لەبەر برێ دوعایە بۆ سزادان دەگوترێ.
- دارژتن: دارژێن: وێژکێن: پەخشان: دارشتن: پەخشانی ئەدەبی.
- دارشنگانە: دارەشمانە: ناوی گوندێکە لەسەرووی قەلادزە ناوەکەی لەداری شنگانەوە هاتووە، چونکە ئەو ناوچەیە ئەو جۆرە دارەی زۆرە لەسەر زمان سواوە بووەتە دارشمانە.
- دارسان: دارستان: شەخەڵ.
- دارسیلە: دیمەك: ئەوقوتە دارەیە کە لەوەختی دیوارکردندا دەیخەنە ناو ڕیزەکانی دیوار.
- داسوولکەدار: مەلە داسوولکە: باڵندەیەکی لاق درێژە لە قەراغ ئاودا دەژی دەنووك و مل ولاقی پانە دەنووکی درێژ و چەماوەیە بۆ خوارەوە لە داسولکە دەچێت.
- داسو: بژی سەری گوڵی دەغڵ.
- دارکلاوە: دارکراوە: چوارداری دوو گۆیە و وەك سەری قاشۆیە دەخرێتە ناو چوار کونەکەی نیر. دوولای راست و دوولای چەپ.
- دارگورد: دارێکی ئامرازی تەونە: کەنزیکەی (١,٦٠)م درێژە لەپێشەوەی رایەڵەکان بە داوێك لەسمتەکەکان توندەکرێ.
- دارلاستیك: دار لاستیق: داردلوق: فندق: بندق لە دارێکی دولق دوولاستیك و کەو لێك پێك دێت بەردی بچووکی پێ دەهاوێن بۆ دوور.
- دارماڵ: کڕاوکڕ: پڕ.
- دارمێو: مەیۆ: مێو: دارترێ: دالووت: داری ئەنگور.
- داروبار: ١-کۆی ئەندامی جەستەی مرۆڤ.
جەستەی دەوێت داروبارێ پێ لەباریەك نەچێت.
(غەوارە- ل٨)
٢-دار و درەخت.
- دار و درەخت: داروبار: دارودەڤی.
- دارودەستە: پشتەماڵ: دەست و پێوەند.
لەچەند کەس یا چەند سەد کەس پەیدا دەبن کە خزمایەتییان لەگەڵ یەك نییە و دەچنەوە سەر تیرەی جیاواز پیشەیان ئەوەیە ببنە ژێر دەستی ئاغەیەك یان بەگ زادەیەك بۆ ئەم کارانە وەك (نۆبەتدار، خزمەتکار، ناو ماڵ، ئاوکێش، قاوەچی، کارەکەر).
- دارۆخە: بەرێوەبەری پۆلیس.
- دارۆغە بازاڕ: ئەو پۆلیسەی یاریدەی حاکمی شاری دەدا بۆ شکات پرسین و ناوبژی کردن.
- داڕۆنی: یارمەتی.
- داڕۆنی کردن: یارمەتیدان.
- داردەوان: دیدەوان: زوورگێکی بڵند و رووتاوەن ئاقاری کویە لە دەشتی هەولێر جیادەکاتەوە.
- داری بەردار: داری بەبەر:
ئەو دارەی ساڵێ یەك جار بەری هەبێ.
- داری بێبەر: ئەو دارانەی بێ بەرن:
١- ئەو دارانەی بۆ جوانی باخچە و ماڵان بەکاردێ.





٢-ئەو دارانەی بۆ قەدەکەی دەچێنرێ وەك سپیندار.
- داریجان: داروجان: گوڵێکە لەناو برنجی شین دەبێ.
- داری خۆرسك: ئەو درەختەی لەخۆیەوە روابێ لەکوردستان گەلێك زۆرە بەتایبەتی لەشاخەکانی کوردستان وەك:
١- دار بەروو.
٢- دارمازوو.
٣- دارگەز.
٤- داردیدار.
٥- دارکنێر بۆنی خۆشە خەڵکەکە دەیکەن بە گۆچان.
٦- دارگێوژ بەرەکەی دەخورێ.
٧- دار بەلاّلوك.
٨- دارکرۆسك.
٩- دارکفر.
١٠- دارتاووك.
١١- دارلاس.
١٢- دارشەن.
١٣- دارەبەن: قەزوان بنێشتە تاڵی لێ وەردەگیرێ.
١٤- دارمێو: بەری ترێ دەدات.
١٥- دار چەقیلە.
١٦- دار هەرمێ.
- داری دەف: (کەوەی) پێدەڵێن کە لە داری مێو یان داربی دروستدەکرێت دەخرێتە ناو ئاو بۆماوەییەك ئینجا بەشێوەیەکی بازنەیی دروست دەکرێت.
- داری کولێن: بەرچیخ.
ئەو دارەیە کەلە سووچێکی رەشماڵدا بۆ جیغ گرتنەوە بەکاردەهێنرێ.
- دارهەرمێ: ئەو دارەیە هەرمێ بەرهەم دێنێ لەشاخەکانی کوردستان هەیە وەك چیای سەفین بەرەکەی هەرمێیە جۆری زۆرە وەك:
١-ناسکە هەرمێ.
٢-سێوە هەرمێ.
٣-سووکە هەرمێ.
٤-هەرمێیە جۆخینی.
٥-هەرمێی چاوڕەشکە.
٦-هەرمێ سپیگرە.
٧- هەرمێ لاسوورە.
- داری قلان: دێیەکە لەنزیك زەڕاینی کۆن لەبناری رۆژئاوای شارەزوور کە دارەکە بەسەر گردێکەوەیە لای دێ کە بەناوی دارەکەوە ناونراوە.
- داس: داسك: کەڵەندو: گیابڕ: کەرنتو: ڤاستورا: ئاسنێکی پانی نیوە بازنەیە کە باسکێکی ئاسنی خڕی شیشەیی هەیە سەرەکەی دەسکی پڕ بەدەستی پێوەیە دەمی لای ژوورەوەی پان کراوەتە تیژە و دوورنەی پێ دەکرێ راست و چەپی هەیە.
هەدروونە درونە درونە
دەسکی داسم بەروونە
- داس دەمە زەرکردن: زاخاودان و تیژکردنی داسەلەلایەن ئاسنگەرەوە.
- داسووکە: داسوولك: داسیلە
لەشێوەی داسی گەورەیە، بەلاّم دەم بچووك و دەسك کورتترە ژنان یامنالاّن دورنەی پێ دەکەن و دورنەی نیسك و وشیشی پێ دەکرێ.

- داشت: سپیان و ڕەشانی نەزۆر باش نەزۆر خراپ مەڕێکی داشتم کڕی: واتە مەڕێکی مام ناوەندیم کڕێ.

- داغان: ١- داخان: کۆی خەم: ٢- پارچە

داغان دەخۆم

- داك: ئەدا: دیا: دایێ: دەیك: دیـی: دادا: دادك: دالگە: دای: دی: دایك: دالگ.

- داکانە: بەمێینەی کۆتردەڵێن.

- داك برا: دایك برا.

- داکە دزانە: دالکە دزانە: ئـەو کەسـەی شـوێنی دزین دیاریدەکات و بۆ دزیـن کاتێـك دزەکـان لـە دزییەکـە گەڕانـەوە کـەل و پـەلی دزراویـان بـۆ دەشـێرێتەوە و خواردنیـان بـۆ حـازر دەکـات و یارمەتی دزەکان دەدات.

- داگـرتن: ١-بارهێنانـە خـوار: ٢-دەغـل و دان لەگونیکردن: ٣-توتن لەقەمیشی جەگرەکردن: ٤-لێدان بەبەرد یاگوللە: ٥-ئاگر بەبەرەوەرچوون. ٦-پیس بوونی برین و تەشەنە کردنـی: ٧-دەسـت پان کردنەوە بەسەر زەویدا لەیاری شێرخەتدا.

- داکەفتن: چونە خوار.

- داگەڕان: هاتنە خوار: دژی هەڵگەڕان.

بە چەند کەژ و کێو و چیاو هەورازا هەڵگـەڕاو لـە چەند شیو و دۆل و نشێوەوە داگەڕاو...

(گەدا-ل٩٨)

- داگیرسـان: هەڵگیرسـان: هەلایـسان: گڕگـرتن: هەڵبوون: پێبوون.

- داگیرسانی چاو: چاوکول بوون: سووتانەوەی چاو.

- داگیرکردن: بەندەگیری: دەست بەسەر داگرتن.

- داگیرکراو: داگیرکرای: زەوتکـراو: پـێ بـەریتی: ژێر چەپۆکە.

- داگیرکەر: کەڵەگا: پێبەر: ولاتگر: بەندگرە.

- داڵ: لاشە خۆر: تۆپیوخۆر: دالاش: خەرتەڵ دالی شایی: شادالّ:

باڵندەیەکی گۆشـت خـۆرە راوی ئاسـك و ڕێـوی و کەروێشك و مشك دەکات و دەیانخوات.

- دالان: ڕاڕەو: ناو دەرگا.

- دالغە: وت ویر.

- دلنگۆ: کتابی قانونی.

- دالنگۆك: کتابی قانونی کچکە.

- داڵە گۆشت: داڵ گۆشت : لاواز.

- دالگە: دایکە: دایە: وشەی بانگکردنی دایك.

- دالیا: گوڵێکە پەڕەکـەی پەڕپەڕەیـە و مـدەوەرە لاسك نەرمە، بێ دڕکە، بۆنی هەیە و مالییـە بـە تۆوزیاد ئەکرێ بەکار ئەهێنرێ بۆ جوانی.

- دالیە: پێوەرێکە لەگەنم پێوان دەکاتە (٢٠) ربە

- دام: ١-داو: دافك: ٢-دامە.

- داماگ: داماو.

- دامـان: ١-دامـێن: داوان: داوێـن: دامـەن: دەهمەن: دامو: دامن.

٢- تاسان.

- دامرقەلی: ناوی ئەسپەکەی گـەنج خەلیلاغەیـە کە لەلاوکی کوردی ناوی هاتووە بـۆ شـانازی پـێ کردن بەئەسپەکە ئەم ناوەی لێ ناوە.

- دامن: ١-داوێن: ٢-دائەمن: تامن.





پێم بلێ دامن بڕۆم.

- دامـە: ١-دایـتم: داومـە: ٢-یارییـەکی کـۆنی کوردەواریە بە(٣٢) بەردەکرێت: ٣-ئاغا: کاتێـك بەردێك دەگاتە ئاخیر خانە دەڵێن دامە واتە ئاغا.

- دامەچی: ئەوکەسەی لە دامەکردن زۆر زیـرەك و لێزانە.

- دامەزراندن: ١-خستنە سەرکار.

٢-دروستکردن.

- دامەزرێنەر: دروسـتکار: سـازکار: بنیـات دار: دروستکەر: سازکەر: بنیاتنەر.

-دامەکردن: ١-یاری دامەکردن لەنێوان دووکەس.

٢-ئاغاکردن.

- دامێ: پێمدا: من دایێ.

- دان: ١- کات: سەر: (سـەر لـە سـبیانێ: دانـی سیەینێ).

٢-ددان: ٣-خۆراکی پەلەوەر.

- دانان: ١-کرانەوەی دووکان بۆ فرۆشتن.

(دووکان دانرایە).

٢-وازلێ هێنان.

دانانێم مەیلی یارێ هەتا ڕۆژی مردنێ

٣-گریان: دانێ.

(گریمان زەرەرمان کرد).

- داندرا: دانرا: دامەزرا.

ئەوڕۆ سێ ڕۆژە داندراسێ دارە.

- دانـدۆك: دۆی خەسـت و سـاواری تێکـەلاوی وشك کرایەوە.

- دان ڕۆکلە: خواردنێکە لەکاتی دان هاتنی منـاڵ دروستی ئەکەن بەسەر هاوسێیان ئەبەشنەوە لایـان وایە کە ئەمەیان بۆ کـرد، ئەوەنـدە تووشـی ئـازار نابێ و عەزیەتی منالەکە کەم ئەبێتەوە.

- دانستە: دانسقە: تایبەتی.

- دانـش: ١- زانـست: ٢- وەك نازناوێـك لـە کوردسـتان بـە دوای نـاوی بنەماڵـەی زانـست زانەکانەوە دەنووسێ. عوسمان دانش.

- دانکە: نەخۆشییەکە وەك مێکوتە وایە ئەگەر لە سەروچاوی ئاژەڵەکە دەربکـات و نەداتـە هـەناوی سەلامەتە، ئەگینا دەیکوژێت.

- دانگێ: دانگە: پاوان: لەوەرگەی ئاژەڵ.

- دانوو: دانوولە: دەهنـۆ: دانـووی: دانوویێـك: گەنمی کولاو.

دانوومان پێکەوە ناکوڵێ: واتە بەیەکەوە هەڵناکەین.

- دانی: هەڵنیشت.

- دانیشتن: ڕۆنیشتن: ڕۆنین: ئەرە نیشتەی: نیشتن.

- دانیشە:

بنیشە: ڕۆنی: روونێ: رینە.

- داو: دام.

- داواکار: داخـواز: ویـستەر: خواسـتە: خـوازۆك: بخواز.

- داوان: دامان.

- داودی: گوڵێکە پەڕەکەی پەڕ پەڕەیـە مـدەوەرە لاسك نەرمـە و بـێ دڕکـە بـۆنی هەیـە مالییـە، بەرەگ و بەتۆو زیاد ئەکرێ بۆ جوانی بەکار دێ.

- داومانەتێ: دایتمانێ.

- داوەت: شایی: شاهی: هەڵپەڕکێ.
- داوەت بەرهەڵدان: شایی تێکدان.
- داوەت گێڕان: داوەت کردن: زورنا و دەهۆڵ لێدان و باڵەبان ژەندن و گۆرانی گوتن بۆ شایی کەران.
- داوەبەن: ئەو داوەی لە بەن دروستدەکرێت.
- داوە دەزوو: ئەو داوەی لە دەزوو دروستدەکرێت.
- داوێن : دامێن: دامو.
- داوێن پیس: شواڵ چەپەڵ: زیناکار.
- دایان: دایەن: ئەو ئافرەتەی منـاڵی سـاوای پـێ ئەسپێردرێ بۆ بەخێوکردن و شیر پێ دانی.
- دایتم: داومە.
- دایتیان: داویانە.
- دایرە زەن: دەف ژەن: دەف زەن.
- داین: بەخشین.
- داهی: زۆر زانا: ورد: تێگەیشتوو: بە هوردە: وریا.
- داهێنـــان: ڕەخـــساندن: هەڵبەســـتن: نقـــاری: بـــەردەباری: دەرهێنـــان: داهـــاوردن: هـــەڵنان: ناقەریکن: لەنووژەنەوە.
- دام: داو.
- دانامە: ١-داناى گەورە: ٢-زانامە.
- دانە: ١-قل: یەك (یەك دانەی بەچەندە).
٢-دانەوێڵە: ٣- دڵوپ.
- دڕیام: دڕام: دڕاوم.
- دڕیان: دڕایە: دڕاوە.
- دڵ ڕیشی: دڵ بریندارى.
- دڵکەش: دڵگیر.
- دڵ وەش: دڵ خۆش.
- دنێی: دونیا.
- دۆس: دۆست.
- دۆسا: دۆستان.
- دۆش: گۆڵ.
- دوودین: دووکەڵاوی.
- دووربا: دووربێ: خوانەکردە: خوانەخواستە.
- دەرە: چەم.
- دەگا: دێ: گوند.
- دەمە: ١-زارە: دەوە: ٢-پرووشە بـەفر کـە لـە ڕۆژی ســـایەقەدا کزەبایـــەك هەڵـــدەکا و بـــەرزی دەکاتەوە و نیهێنێ بەڕووی ڕێبوارا.
- دەمیدە: پشکووتوو.
- دیا: ١-دایك: ٢-ڕوانین.
- دیار: وڵات.
- دێر:١-درەنگ: ٢-کەنیسە.
- دین: ١-ئایین: ٢-بینین.
- دێویان: هەڵاتووە.
- ددان: دەدان: دان: دیان: دگان: دران: تیتان.
تیتانێ تە ئێشیان بکشین. (کۆمەڵە- ل٢٦٣)
ماددەیەکی هێسکییە هەر مرۆیـەك (٣٢) ددانـی هەیە هەرریزەی (١٦) سەرەوە و شانزەی خوارەوە.
لـەڕووی کـارەوە نـاوی تایبـەتی خۆیـان هەیـە هەندێکیان بەم ناوانە ناونراون:
ددان برنجی: کەسێك ددانەکانی زۆر ڕێك و جـوان و وردبن.
١-ددانی شیری: ددانی منـاڵی: لەحـەوت سـاڵەی دەکەوێ.





٢-ددانی هەمیشەیی.
٣-ددانی بڕەك.
٤-ددانی کەڵبەیی: کەڵبەکان.
٥-ددانی پێشە خرێ.
٦-ددانی پاشە خرێ.
٧-ددانی ئەقڵ.
- ددان دەرهێنان: ددان دەرکێشان: ددان کێشان.
- ددان شاش واش: ددان تاق و واز: ددان کەل بوون.
- ددان کەتن: کەوتنی ددانی کەون.
- ددان کلۆر بوون: نەمانی ناوەوەی ددان.
- ددان هێشان: ددان ژان کردن.
- داهێنـــەر: بـــەردەبار: دۆزەرەوە: داڕەخـــسێن: ڤەداندەر: هەندەر: هەڵنەر.
- دبەزتە: هەڵدێتە: غار دەداتە: غار دەداتە پێڵاوی.
- دبن: لەبن: لەژێر.
- دبێ: دەڵێ: ئەڵێ.
- دبێ: دەبێی: ئەبێت.
- دبێژنێ: پێدەڵێن: دەیڵێنێ.
- دبێن: دەڵێن: دەرێن: وارێن.
- دبێی: دەڵێی: ئەڵێی.
- دبهوری: رادەبرد.
- دپاعتن: دەبرژاند.
- دپەیڤی: دئاخفی: قسەی دەکات.
- دترسان: دەترسان.
- دجڤی: کۆم دبی: کۆدەبێتەوە.
- دچینن: خڕدەکەنەوە.
- دخوازم: دەمەوێ: ئەمەوێ.
- دخوازن: دەیانەوێ.
- دخەبتی: ئیشی دەکرد.
- دخوونن: دەخینن: ئەخوێنن.
- ددەت: دەدات.
- در: دل: دڵ.
- درازا: درێژەی کێشا.
- دەردێك درازاکەی مەبۆ ئازا. (پەند)
- درز: دەرز: قەڵش: شەق.
- درست: تەواو.
- دریفا: ئەفسوس.
- دروست: درست: تەواو: ساخ.
- دروون: درووین: دورین.
- درونگ: سێبەر.
- درۆ: دەلەسـە: ناڕاسـت: هـەڵات: پـۆت: فڕکـا: درەو: دروو.
- درۆزن: فڕکەر: فڕوکەر: دەرەوێر.
- درۆی دەکات: درۆدەکات.
ئەگەر لای ئاغا باسی کرد، تۆبڵێ درۆدەکات. (گەدا- ل٦١)
- درۆی شاخدار: بریتییە لە قسەی ناڕاسـت و زۆر دوور لەڕاستی.
- درۆی گەورە: قسەی بێ بنچینە.
- درەختـی مـراز: ١-ئـەو دارەی لەسـەر گـۆڕی پیاوچاکانە و خەڵك مرازی لێ دەخوازن.
٢-وادەبێ ڕۆژێ لـەڕۆژان پیاوچـاکێ سـەیدێ لای دابێتە ژێر ئەو دارە جا بۆیە درختەکە پیرۆزە.

- درەخشان: رووناك: تابان: پرێشك: بریقەدار.
- درەڤن: هەڵدێن.
- درەڤی: هەڵدێ.
- درەو: دورنە: دروێنە.
- درەوان: ئەوەی دورنەی دەکا.
- درین: دورین: دروین.
- درێشە: درەوشە: درەوش:

ئاسنێکی لووت تیژی مشتوو دارینە کەوش و کۆنە پێڵاو مەشکە و شتی تری پێ ئەدورێ و پینە ئەکرێ.

- دڕاو: دڕای: دڕیاو: دڕیاگ.
- دڕدۆنگ: بەشك: دوودڵ: بەگومان: دڵ کەوتنە قرت و فرت.
- دڕڕگ: دڕك.
- دڕك: دڕوو: دڕی: ستری: کەلەم: دەڕی.
- دڕکی دێو: چالووك: کونار:

دەوەنێکە گوڵەکەی بنەوشەیی یان سوور یان زەرد یان سپییە لقەکانی دڕکاوییە، بۆ پەرژین باشە، بەرێکی سووری هەیە لەترێ دەچێت.

- دڕوولان: شوێنی دڕکی زۆربێ.
- درێخی: قسوری.

درێخیم نەکردووە: قسوریم نەبووە.

- دز: ١-دەست پیس:

٢-ئەوەی ماڵی خەڵك دەبات.

- دزیکا ڤا: بەدزییەوە.
- دزا: بەدزییەوە.
- دزیاری: دزیەتییە.

- دژ: ١-زد: ٢-قەڵا: ٣-چەتون:

لەزستانی بەبەفروباران و سارد.

- دژدار: دزدار: فەرماندەی قەڵات.
- دژاو: بەو ئاژەڵە دەڵێن کە بەیەك بێن ئاو ناخواتەوە، بەڵکو قومێك لەئاوەکە دەدات وازدەهێنێت دیسان قومێکی تری لێ دەداتەوە باڵەکاتی دەم لەئاو دەنێت لەم سەری کۆڵەوە دچێتە ئەو سەر.
- دژگێن: رێشمە.
- دژمن: دوشمە: دوژمن: دشمن: نەیار: غەنیم: خەنیم: نەتەوی: ناحەز.
- دژمندار: دوژمندار.
- دژمنایەتی: دژمنایی.
- دژوار: ١-ناخۆش: دیشوار: دشوار: سەخت: دوژوار: گونگ: ئاستەم: تووش.

(تەنها رۆژێکی دژوارە).

(گەدا)

٢-سەخڵەت: نارەحەت: ٣-گران.

- دژواری: پێسیر: کۆتەك: سەختی.
- دزەیی: ١-ئەو بنەماڵەیەن کە رۆڵەکانی کاتی خۆی لەگوندی (دزە)ی گەورەی سەرسنووری نێوان وڵاتی عێراق و ئێران و تورکیا دانیشتوون (قەرەنی ئاغای گەورە لەدێی دزەوە هاتۆتە ناوچەی هەولێر و هاتنەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ پێش دەسەڵاتداریەتی محەمەدی گەورە، ئەو بنەماڵەیە لەسەرتادا بە کۆچەرییەوە خەریك بونە، بەڵام (١٠٠-١٥٠)ساڵ دەبێ وازیان لەکۆچەری هێناوە.





لە دەشتی هەولێر نیشتەجێ بووینە چواربەرەبابی لێ کەوتۆتەوە: ١-بەرەی بایزی: ٢-بەرەی فارسی: ٣-بەرەی پاشای: ٤-بەرەی کاکەخان، هەموویان بەرەچەڵەك دەگەڕێنەوە سەر قەرەنی ئاغای گەورە.

٢-ناوی دزەیی لەگوندی (دزە)ی سەرسنووری ئێران و ئێراق و تورکیاوە هاتووە.

٣-بووەتە ناوی ئەو ناوچەی کە هەرچوار بەرەبابی لێ نیشتەجێ بووینە.

٤-بووەتە نازناوێك بۆ هەموو کچ و کوڕان هەرچوار بەرەباب.

- دزپل: دزفول: دێزفول: ناوچەیەکی کوردنشینە ئەکەوێتە سەر رووباری (ئابدیز) لە خۆزستان هەرسێکی دەڵێن (دزپل و دزفول و دێزفول)، بەڵام لە سەرەتادا (دزپل) بووە (دز: واتە قەڵا)، پل واتە پرد

دزپل: واتە پردی قەڵا.

- دژیەك: بەشێکە لە جوانکاری، بریتییە لەهێنانی دوو وشەی مێمل و دژیەك یا رووبەرووکردنی دوو واتای پێچەوانە جا ئەم دژیەك و پێچەوانەیە داوێك بێ لەتان و پۆی هۆنراوە دا یا قەفێك بێ لە زنجیرەی پەخشاندا وەکو:

تاریکی و رووناکی، پیس و پاکژ، بەرز و نزم، رۆژ و شەو، رەش و سپی، گەورە و کچکە، ناشیرین و جوان، زانا و نەزان، چاکە و خراپە.

- دسووچیت: دسوژیت: دەسووتێت: ئەسووتێت.
- دش: بالتور: شوخوشك: خوشکە مێرد.
- دشۆت: دەشوات: ئەشوات.
- دڤیان: دەیانەویست.
- دڤێژن: دەبێژن: دبێن: دەڵێن: ئەڵێن.
- دڤێن: دەیانەوێ: دەخوازن.
- دکارین: دەتوانین.
- دکوت شەوار: نیوە شەو.
- دکەڤیتە: دەکەوێتە: ئەکەوێتە.
- دکەنن: پێدەکەن: پێئەکەنن.
- دگۆت: دەیگۆت: ئەیوت.
- دگەل: لەگەڵ: ڤێرە: پێرە.
- دگەل گورگی دخۆت و دگەل سەی دڕەویت.
- دل: دڵ: در: زێڵ.
- دڵارام: دڵ+ئارام.

(ئارام: سرەوت: سەبر) ئارام گرتن دان بە خۆداگرتن بووە بە دڵارام بۆ کورتی و ئاسانی لەپاڵ سووك کردنەوەی دەنگی (ل)ەکەش.

- دڵباز: دڵدار: دڵبڕاو: دڵکەتی.
- دڵبەر: دڵکێش: دۆستك: کەبابی: کەیلان: گۆلکە : یار: تڤی: دۆ: دولبەر.
- دڵ بەستە: دڵ بەند:

بۆشتێکە ئارەزوو بکرێت بچێتە دڵەوە ئەوکەسە دڵی پێوەبێت.

- دڵ بیمار: دڵ زامدار: دڵ بریندار:

کەسێ تووشی جەوری زەمانە بووبێت.

- دڵپاك: یەکدڵ: دڵسۆز: دڵڕاست: کارڕاست : دلڤەکری.

- دڵپاك: دڵڕووناك.
- دڵ چڵكن: دڵ پیس.
- دڵ حەباندن: خۆش ویستن.
- دڵخواز: ١-بۆ كەسێك یـان شـتێكە كـە دەچـێتە دڵەوە خۆشت دەوێت حەزی پێ ئەكەیت:
٢-ناوی كچانە.
- دڵخۆش بوون: كەیف هاتن: خەنی بوون: كـەیف خۆش بوون: گەشبوونەوە: پشكووتن.
- دڵدانەوە: دڵخۆش كـردن: دڵنـەوایی: دڵـسوتاو: دڵشەوتی: كۆڤاندار.
- دڵسوژ: دڵسوتاو: خەمخۆر.
- دڵشاد: دڵشا: دل خوەش: دڵ خوش.
- دل شكەسـتی: دڵ شـكاو: ١-بـەخزمی نزیكـی مردوو دەڵێن، كـوڕی شـین گـەرم دەكـەن، بەڵكـە جارجار لەشـینەكە و نـاوی مردووەكـەی خۆشـیان ئەبەن ئەمە تایبەتە بە كوردە یەزیدییەكان.
٢-ڕەنجاو:
- دڵ شەق بردن: زۆر خەم خواردن.
- دڵ شەوت: دڵ گـەرم: بـەخزم و كـەس و كـاری مرەوو دەڵێن لـەپاش مردووەكـە كەسـانی نزیكـی وەك ژنی مردوو خوشكی مردوو دایكی و كچی. پاش كفن كردنی، ژنان و خزمەكانی لای سـەریەوە دا ئەنیشن و دەستدەكەن بەشین بـۆ كردنـی ئەمـە لەناو كوردە یەزیدییەكان ئاوایە.
- دل فرەه: دڵ فرەوان.
- دل ڤەكر: دڵ كراوە.
- دلكەتی: دڵدار.
- دڵكەوتنە عاردی: دڵ تەخت بوون: دڵنیا بوون.
- دڵگران: دڵگیر: دڵ تەنگ:
قورسایی سەردڵ و هەموو لـەش لـە كـاتی مـرۆڤ پەست دەبێت.
- دڵ گەرم: سەرگەرم: خوێن گەرم: بە جۆش و خرۆش.
- دڵگوشران: دڵكوشران: دڵهەتن: دڵتوند بوون
- دڵنـەوایی: بـەزەیی: زگ پـێ سـوتان: دڵ پـێ سوتان.
- دڵ نەخۆەش: خەمبار و خەمگین.
- دڵ نشین: لەدڵداجێگرتوو.
- دڵۆڤان: دۆست: خۆشەویست.
- دڵەتەپێ: دڵەكوتێ: دڵەكوتە.
- دڵەكزە: دڵەكزی: دڵەسۆژە: گەدەكزی: سـووتانی گەدە لە كاتی زۆر خواردن.
- دلیست: یاری دەكرد: گەمەی دەكرد.
- دلیزە: یاری دەكا: گەمەی دەكا:
كەسێ خەریكی یاری كردن بێت.
- دمای: دوای: پاشی.
دمای وارانی كە پەنك: دوای بارانی كەپەنك.
(پەند)
- دماهی: دوایی: كۆتایی.
- دمریت: دەمرێت: ئەمرێت.
- دم دم: نـاوی قەڵایەكـەی ئـەمیر خانەكەسـێ فرسەخ لەشاری ورمێ دوورە لەسەر كێوێكی هـەرە بـەرزە و كەوتۆتـە بەشـی تەرگـەوەر، ئـەمیرخان بناغەی قەڵایەكی قـایمی دارشـت لـەنێو كوردانـدا بـاوە دەڵـێن لـەپێش ئیـسلامدا لـەزەمانی





ساسـانییەكان (ئەكاسـیرە) دا هـەر لـەو شـوێنە قەڵایەك هـەبووە كـەپێ گـوتراوە (دم دم) دەسـت درێژی ڕۆژگار خاپووری كردووە.
- دمۆری: دوومۆری: شوومی: دۆبـری: بێولـەتی: ناوچاوڕەشی: بەدفەڕی: نامەتی: بەدێومنی.
- دمن: لە من.
دمن بەبۆرە: لە من ببورە.
- دمەدۆ: كەسـێك دووسـێ سـەر ئـاژەڵی هـەبێ شیرەكەی تەنها بەشی خـۆی بكـات و بـەروبوومی شیرەكە بخوات.
- دن: دیكە: تر: پاش گرە.
- دندا: تردا:
لەشۆڤێك دندا.
- دووتەپڵی: دووتاس: نەققارە: جووت تەپل.
ئامێرێكی مۆسیقایە بریتییە لە دووتاس بـەهۆی داوێكی پێستی بەیەكەوە بەندكردوون لـە گلێنـە یان دار یا (كانزا) دروستدەكرێ، ڕووی سەرەوەیان شـتێكی تـەنكی بەسـەردادەگیرێ و بـەدووداری تایبەتی لێ دەدرێن.
- دناڤ: لـەناو: نێـو: لـە هەنـدور: لـە دوڕ: دەناو: دنێڤ.
بەڵكو دنێڤ ئێزدیادا گەلەك.
(ئێزدیاتی- ل١١٠)
- دنڤن: دەنون: ئەخەون.
- دنك: ١-دەنك: قل: یەك دانە:
٢-ناوكی هەندێ مێوە.
- دنەدان: گال دان: هاندان: تانووت.
- دنیا: دنێ: دونیا.
- دنیا روون بووەوە: دنیا ڕووناك بووەوە سـەرەتای بەیانی كەشەو نامێنی.
- دنێرە: دەنۆڕێ: دەڕوانێ: تەماشادەكا.
- دنیا دیدە: دنیـا دیتـە: بـەو مرۆڤـە دەگـوترێ كەبەگەرم و ساردی ژیان ئامیتـە بـووە و خـاوەنی ئەزموونە.
- دوئاژۆ: ئـەو كەسـەی لـەدواوەی مێگـەل دێ و مێگەل لێدەخورێ.
- دوابراو: دوابڕای: ١-كەسیان لێ نەمابێت
٢-تووك نزایە و دەڵێ وەردوابڕوانیە.
- دواپێشەنگ: وڵاغی ئاخیری قافلەی بازرگانی.
- دواخستن: دانەپاش: وەپاش خستن: ئەنجام نەدانی كارێك لەكاتی دیاریكراوی خۆی.
- دوارە: دووبـارە: دنـوو: سـەرلەنوێ: دووەم جـار ئەنجامدانی كارێك.
- دوارۆژ: ئایندە: سبەی ڕۆژی مەبەسـتە لـەكاتی دوای ئێستایە.
- دواكەوتن: بەپاش كەتن:
شان بەشان نەرۆیشتن لەگەڵ كارێك.
- دوان: ١-گفتوگۆكردن: ٢-دوودانە.
- دواندن: قسە لەگەڵ كردن.
- دواوە: دماوە: پشتەوە: پاشەوە دژی پێشەوە.
- دوایی: كۆتایی.
- دواهاتن: كۆتایی هاتن.
- دوبرا: شـەهێن: باڵـدارێكی ڕاوییـە وەك بـاز و سـەقەر بەگۆشـت دەژی هـیچ جـۆرە دانەوێڵـەك

ناخوات لەسەقەر بچووکترە ڕەنگی بۆر و سپی و سوورە، پەرەکانی وەك بۆیەی نینۆکی ئافرەتان وایە لەبەر تیشکی ڕۆژ ڕەنگدەداتەوە.

- دوخوین: بەنەخوین: دۆخین.

- دورنە: درەو: دروونە: درویّنە.

- دورنەی بەکرەیی: ئەوەیە چەند سەپانێك بەیەکەوە لەیەك ریز دەوەستان پاش ئەوەی سەرپاڵە گازی لیّ دەدا ئینجا بەیەکەوە دورنەیان دەکرد و گازیان دەوەشاند هەموویان بەیەکەوە جارێك بۆ لای چەپ وجارێك بۆ لای راست تا بەریان تەواو نەکرد با پشتیان راست نەدەکردەوە.

- دوڕە: دوڕەه.

- دورنەی جۆ: واتە جۆ درویّنەوە کە لە ناوەڕاستی مانگی پێنج دەست پێدەکات جۆ دەدوریّتەوە.

٢-پێوەرێکە بۆ کات بەکاردیّ هەتا دورنەی جۆی کارت بۆ دەکەم.

- دورنەی گەنم: لەدوای دورنەی جۆ دەست پیّ دەکات.

- دوژمن کاری: دوژمن داری.

- دوشنیا: دوێنی شەو.

- دوعا: نزا: خەیر خوازی: توك: نەفرین: لەبەر خودا پاڕانەوە لە خودا داواکردن دووجۆرە:

١-دوعاکردن و لەخودا پارانەوە بۆ سزادان وەك: خوامالّت کاولکات لەخوام داوەیە: کوڕت بمرێت، ئاگرت لەماڵی بەربیّ، ماڵت کاول بێت فەرخ لیّی نابوریّ و تووکی خراپی لەخۆی تۆرمەی دەکا.

٢-دوعای خێرکردن: بۆ پاداشت دانەوەی ئەو کەسەی چاکەت لەگەڵ دەکات وەك (خوا برات پیّ بێلی)، یاخوا بە بابی کوڕان بی (خوایە عەمرت درێژبێت).

- دوعا خوازی کردن: خواحافیزی کردن.

- دوعا خوێندن: دوعاکردن.

- دوعا لۆکردن: دوعای خێرکردن بۆ کەسیّ.

- دوعا لێکردن: بۆ سزادانی کەسێك دوعای خراپ کردن.

- دوعا گۆ: ئەو کەسانە بوون کاتی خۆی کەبەزەکات و سەرفترە و خێر و خێراتی خەڵکەکە بەڕێوە دەچوون وەك:

١-مەلا: ٢-سەید: ٣-شێخ:

٤-کوێر و پەککەوتە.

- دوکەڵ: دوکەر: دخان: دوو: کادوو: کادی: دوومان: دویکەل: دویکێل.

- دومان: ١-نۆرەئیشکگر: ٢-دوکەل

- دمایی: دۆماهی: کۆتایی.

- دوند: ترۆپك: پۆپ: لوتکە: تۆقەلە: تۆپەلە: شوێنی هەرە بەرزو کۆتایی لە چیا.

- دوونیّ: دوێنی: دوش: دینیا: دووهێنی: دووه: دۆ: دۆه: دوێکە: دهۆ: دوهی: دویّ: دۆیکە: هێری: دیکە: دووهێنی رۆژی بەر لە ئەمڕۆ: رۆژێك بەر لە ئەمڕۆ.

منالّی دوێنێم تۆپیرت کردم.

- دوێتەل: دوێتەگەل: کچگەل: کیژان: کچان: کۆی کچ.





- دوو: ١-دوی: یەك کۆیەك.

٢-دوونگ: چەوراتی سەرقوونی مەڕ.

- دوان: ١-دوو: ٢-قسەکردن.

- دووبارە: دوارە.

- دووبارەزا: بزن ئەگەر لەسەرتای پاییزدا تەگەی گرت بێت و لەزستاندا بزێت ئەوا هەم تەگە دەگرێتەوە ئەوجا لەسەرەتای هاویندا دەزێتەوە بەمەش دەووتری دووبارەزا.

- دووبارە شەویّ: واتە دووبەش شەو رۆیشتبیّ و بەشێکی مابیّ.

- دووبارەکردنەوە: دووپاتکردنەوە: پاتاکردنەوە: دوو جاری.

- دووبرالە: دووئەستێرەی نێزیکی باکوور.

- دووپشك: ١-دوومارە: کۆڵ: کۆژدم: دمارە کۆڵ: کولاژدوم: کولاژم: گەلاژدوم.

٢-لە ژەنگیانەی شین دروستدەکرێت لەبەرگی منالاّن دەدوورن: جۆرێکە لەخشلی منالاّن.

- دووپەل: دەم بەست: ئامێرێکە بۆ دروستکردنی قەمیشی بالّەبان بەکاردیّ بۆ بچووك کردنەوەی قەمیشی بالّەبان بەکاردیّ ئەم ئامێرە لەلقی دار مێو دروستدەکریّ دوای ئەوەی لقی دارمێو لووس و رێك دەکرێت وێکی دێننەوە و بە داوشەتەکی دەدەن.

- دووتەڕا: دوای تۆ: پاش توو.

- دووچەرخە: پاسکل: پایسکل.

- دووخاڵ: بەم نیشانەیە (:) دەگوتریّ ئەم نیشانەیە بۆ روون کردنەوە و خستنەڕووی لە دوایەوە دیّت.

- دوودەو: قازمە: قەزمە: کولینگ: ئامرازی زەوی هەڵکۆڵینە.

- دوور: دویر: دژی نزیك: ئەوپەڕ: دیر.

- دووربین: دویربین: دێربین: دوونور: دوورنوار.

- دوورەدنیا: بە مرۆی خواپەرست دەڵێن.

- دوورەگا: سەر مژانکە لەکونی ئاخیری مژانە بەلای سەرەوە دادەنێن گاسنیش رشت دەبێت ولاّغ زیادماندوو دەبێت لەکێلانی زەوییەکە، چونکە گاسن دادەکەویّ.

- دووڕوو: دووزمانی.

- دوورەشەڕ: دژی نزیکە شەڕ: ١-ئەوکەسەی حەز لەشەڕنەکات: ٢-شوێنی نزیکی شەڕنەبێت.

- دوورلە رووتا: دوورلەرووت: حاشاکی تۆ.

- دووزمان: قسەگێرەوە: قسەچین: کۆڵەفتنە.

کۆلەگێر: تێچێن: ئاگری بن کایە: دۆخمان: دووزوان: گای بنە.

- دووزەلە: جووزەلە: دوونای: دوودك: جووت زەلە: زەمبەرە: ئامێرێکی مۆسیقای هەواییە لەدووزەل (واتە قامیشی ناوئاوان) بەیەکەوە بەستراون پێکدێت. هەریەکەیان شەش کونیان هەیە کونەکانی هەریەکەیان بەرامبەری (زەل)ی دووەمە دووپێکی دەخرێتەسەر.

- دووشاخ: ١-بەرینکردنەوەی هەردوو شاپەڕی یان هەردوو گۆیی گاسنی خورا و بەهۆی تواندنەوەی ئاسن بەسەر یاندا: ٢-دووچیا.
- دووشگ: بەین نەبوون: بەین تێك چوون: دووکەس لەگەڵ یەك قسەی نەکەن.
- دووشیوان: ١-شوێنی بەیەك گەیشتنی دووشیو: ٢-ناوی گوندێکە لە دەشتی هەولێر.
- دووکەوانە: بەونیشانەیە دەگوترێ( ) دووکەوانە باوەش بە وشانە دەکات کەلەرستەدا دیار دەکرێن.
- دووگورد: دووگرد: بەرماڵ.
- دوونە: ١-دوانێ: ٢-ناوی ژنانە.
- دووەمین: دۆمین: دوای یەکەم.

بەخولاو بەزامن دەدەم و دۆمین بەحەزەرتی خدری.

(تحفە -٢- ل٧)

- دوونگ: دومە: دوینگ: دوو دەو: دووڤ: دمە.
- دویڤ: کلك.
- دۆ: ١-دەو: ماستاو: لەمەشکە دەیژەنن و کەرەکەی لێ دەگرن ئەوەی دەمێنێتەوە پێی دەڵێن دۆ

٢-دوێنێ: ٣-ماستاو: ٤-کچێ لەشایی رەشبەڵەك دەچێتە دەستی پیاو: ٥-دلبەر.

- دۆبڕ: فرۆشتنی مێگەل بە گەورە و بچووکەوە (مێگەلەکەم دۆبڕ فرۆشت).
- دۆت: کچ: کیژ.
- دۆتمیر: کچە میر.
- دۆتن: دۆشین.
- دۆتی: دۆشراو: دۆشرای.
- دۆخ هەوسار: دەست جلەو، پەتی سەری ولاخ کەسەرێکی بە دەست سوارەکەوەبێ.
- دۆدان: پیستەی مەڕە بە جفت و پەلکە هەناروشتی تر خۆشی دەکەن یان دەیخارێنن دۆی تێدەکەن.
- دۆراندن: لەدەست دان: باخت کردن.
- دۆروبەر: دەوروبەر.
- دوڕ: هەندور: ناوەند: ناوەڕاست: بەردی بەنرخ.
- دۆرك: ئەستوورك.
- دۆز: دوز.
- دۆست: دووس: دۆس.

تەپل شایم ژەن دووس میوانمە.

- دۆشاو: دۆشاب: دمس.

١-لەخورما دروستدەکرێ کاتێ کە دەیکوڵێنن.

٢-لەترێی رەش دروستدەکرێ کاتێ کە دەیکوڵێنن.

٣-لەترێی سپی دروستدەکرێ و دەیکوڵێنن.

- دۆشاوی چك چکە: ترێ لە (کۆلدا) بەپێ ورد دەکرێت شیلاوەکەی دەکوڵێنرێت و دەبێت بەدۆشاو ئینجا دۆشاوەکە بەئامێری پالاوتن دەپالێورێت و دلۆپە ئاوەکان کۆدەکرێنەوە.
- دۆڵ: ١-دەهۆڵ.

٢-نەوال: نهال: دەشتیایی نێوان دووشاخ بەدرێژی، وهەر دۆڵێك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە زۆربەیان ناوی ئەو گوندە گەورە و بەوبانگەی وەرگرتووە کە لەدۆڵەکە دایە وەك.





- دۆڵی هیران: دۆڵی سماقولی، دۆڵە دەمانچە، دۆڵە رەقە، دۆڵی بالیسانی، دۆڵی هەنارەی، دۆڵی ئاکۆیان.
- دۆغەوا: خواردنێکی کوردەوارییە لەکفتەی پڕ پیاز و گۆشت یان پیاز و هێلکە ئەو جا دەخرێتەناو دۆی کولاو و تەرەپیازیشی تێدەکرێ.
- دۆینە: خواردنێکی کوردەوارییە گەنمی کوتراونیوە کوڵ دەکرێ هەندێ پونگی تێدەکرێ.

دەربەند: بەرینی لایەکی شاخ و بن شاخ.

- دۆستەك: ١-ناسیاوی کەسێك.

٢-ژنێ پەیوەندی بەپیاوەوە هەبێ.

٣-دۆشتەك: ناوی کەسێ بووە لە خانەدانی حەمیدی.

٤-حکوومەتی دۆستەکی لە دەوروبەری ساڵی (٣٢١-٩٣١)دامەزراوە.

- دۆشەك: نیودەر: نیمدەرە: بەلالینگ.
- دۆغدر: دکتۆر: پزیشك.
- دۆڵ: ١-دەهۆڵ: ٢-نەوال: نوال: ٣-نەسل: پشت
- دۆل ئەنگیو: ١-دۆلەنگیو: دەهۆڵ لێدەر

٢-نازناوی ئەو کەسانەیە کە دهۆل لێ دەدەن عەدۆی دەوڵەنیگو.

- دۆلاب پێ کەر: ئەو کەرەی دولابی پێ دەکرا.
- دولابچی: ئەوزەلامەی کەری دولابی دەبردەسەر کەرکێشەکە کندری بیری رادەکێشی.
- دۆلکە: دۆلچە: پەقرەجی بچووك.
- دۆڵەپان: درە: دۆل، دەشتی نێوان دووکێو.
- دۆلیان: دۆلەدان: ئەو شوێنەی لەسەرەوەی ئاش ئامادەکراوە بۆدەغل تێکردن.
- دۆم: ١- کەلاش کەریشیان پێ دەڵێن هۆزێکی کۆچەرن لە دەوروبەری شاری سنەن هەندێکیشیان گەڕۆکن.
- دۆم کر: درێژەی دایێ: درێژەی کێشا.
- دۆوك: ئەو دۆیەی لەکاتی قرچاندنەوەی کەرەدا لەسەری پەیدادەبێ.
- دۆن: ١-رۆن: روون: ٢-بەز و دونگی تواوە.
- دۆنزە: دوانزە: دوازدە.
- دە: لە:

١- لەجیاتی (لە) بەکار دێ لە کوردستانی رۆژهەلات لە ناوچەی موکریان. لە نێوان چەند عەشیرەتێکی کوردستانی عیراقیش بەکاردێ وەك (پژدەر، بلباس، خۆشناوەتی، باڵەکایەتی).

دەپێناو: لە پێناو

هەموو ماڵی خۆمی دەنێم دەپێناوە.

(تحفە-٢-ل٦٥)

دەگەڵ: لەگەڵ.

دەباغەڵێ: لە باغەڵێ.

فەرخی هەڵگرت دراوەکەی دەباغەڵێ ناوە.

دەوێدا: لە وێدا.

فەرخۆلەی دەوێدا نەماوە.

(تحفە-٢-ل٧٣)

(تحفە-٢-ل٦٤)

٢-دە: ژمارەی دوای نۆ.

٣-دە: دەبا بڕۆین: دەی بابڕۆین.

٤- لە بن لەهجەی هەولێر (دە) لە جیاتی (ئە) بەکار دێنن.

دەرۆم: ئەرۆم.

دەخۆم: ئەخۆم.

- دەبا: دەی (دەبا بڕۆین: دەی بابڕۆین)

- دەبات: ١-دەخایەنێ: داژوا: پێ دەچێ ئەو کارە زۆری دەبات: ئەم کارە زۆری دەخایەنێ: ئەو کارە زۆری داژوا.

٢-ئەبات.

- دەبارە: زەخیرە: خۆراك.

- دەباڵ کردن: لەگەڵ نواندن بۆ عیلاقە کردن:

دەپێشدا لە پیاوی دەباڵ دەکردن

(تحفە-١- ل١١٣)

- دەباڵ کێشان: هێنانە سەرجێ بۆ عیلاقەکردن.

کچە پیاوان دەباڵ خۆی دەکێشێ.

(تحفە-١-ل١٢٣)

- دەبان: گەوهەربەند: دەوان: بەزاخ: زاخدار.

خەنجەری دەبان، شیری دەبان.

- دەبدەبە: میزڵان: میزڵدان: پڕبا.

دەبەزارت مرم: بەقوربانی زارت بم! دوعایە بۆ پاداشت دانەوە بۆ کەسێك قسەی خۆش بکات.

- دەبێ: ١-دەبێ: ئەبێ: ٢-دەڵێ.

میری شەمێ دەبێ ئەمن بێ ئابرۆبکا.

- دبێزی: بیزەور: لەبەر چاو کەوتوو.

- دەبێم: دەڵێم: ئەڵێم.

- دەپڕم: دەرباس دەبم.

- دەترخێن: دەگروێن.

- دەجوڕە... دەجوڕە: وشەی هاندانی بازی جوڕە لە کاتی راودا.

- دەچەلێنم: دەڵەوەرینم: دچەرینم.

- دەچنەکێ: بۆ کوێی ئەڕۆن: کێواچن.

- دەچیتە: دەچێتە.

- دەرخستن: بەدەرییێخستن.

- دەرخونە: دەرخۆنە: قەباغ.

سەرمەنجەڵی لەدار دروستکراو.

- دەخەز: دەغەز: رق: کینە.

- دەخیل: هانا بەبەر بردن: پەناهاوردو.

- دەخەل: تەمبەل.

- دەربەست بوون: مەجبوربوون.

- دەربەستە: دەرگا داخراو.

- دەربەندی رەمکان: دەربەندی رانیە.

- دەربەند: دەروەن.

- دەرپێڕا: یەکسەر.

- دەرێچە: دەرگای بچووك.

- دەرد: ١-رەنج: ماندووبوون.

٢-نەخۆشی: ناساخی.

- دەردمەند: دەردەدار.

- دەردەکوتان: گەشکە.

- دەردت لەماڵم: دوعایە واتە ئەو دەردەی تۆ پێی گرفتاری بێتە ماڵی من بەزۆری لەڕووی خۆشەویستییەوە دەگوترێ.

(دەردت لەماڵم کالێ. کەزییەت بەندی رەشماڵێ).

- دەرز: درز: قلش: قەلەش: قلێش: قلیش: شەق.

- دەرەدزە: پانەدزە: فیز مالیك: بە نهێنی رۆیشتن.

- دەردەسەری: دەردی سەری: کوێرەوەری چەشتن.





- دەرزی: ١- ئامێرێکی سەرتیژی پشت کونە دورمانی پێ دەکرێ.

٢-وەك دەرزی ئاساییە زەنگییانەی یان مۆری بەسەرەوەیە جۆرێکە لەخشڵی ژنان.

- دەرزی پیرێژن: جۆرەگیایەکە.

- دەرزی لێفان: لەدەرزی دورمان گەورەترە لێفی پێ دەدوورن.

- دەرزی مەکینەی: جۆرێکە لە دەرزی مەکینەی دورمانی.

- دەرزی لۆکە: دەنووکی حاجی لەق لەق.

- دەرسووك: چارۆگە.

- دەوێیدا: لەوێیدا:

(فەرخۆڵەی دەوێ دانەماوە). (تحفە-٢- ل٧٣)

- دەرفەت: هەل: دەلیڤ: مەجال.

- دەرڤە: دەرەوە: دەرێ: دەراڤ.

- دەرەقەت هاتن: بەرزەفت کردن: زەوتکردن: دەرۆست هاتن: دەروەست هاتن.

- دەرکابێند: بەندەرك: بەو بەنە نەخشراوە دەڵێن کەسەرێکی لەپەلی پیستە (کوندە، دۆدانە، هیزە، هەمبانە) گرێ دەدەن و لەسەرەکەی تر دەرکی پیستەکەی پێ گردەدەن و دەبەستن.

- دەرکوت: دەرکە کوت: ئالقەی دەرگاکوتانی.

- دەرکەوە: دیاربە: واتە سەردانمان بکە:

دەرگا: وەرەدەرێ.

- دەرکەلێدان: دەرگالێدان.

لەدەرکەدان: دەرگاکوتان: دەرەقوتان.

- دەرگا: بەرە: دێری: دەرکە: دەری: دەر: دەرگە

دەرك: دەروو: قاپی: دەرگەه: دەریك: دەرگانە: خوادەروویەکی باشی لێ کردمەوە.

(دەرگەهی خۆدابێخە: جیرانی خۆ دزنەکە).

- دەرگانە: مزی چوونە ژورەوە.

- دەرگای جۆخین: لەکاتی پەرتکردنی قرشە بە شێوەیەکی بازنەیی لەکاتی گێرە کردندا رێگایەك دەکرێتەوە بۆ بەسەرخستنی وڵاغی گێرە بۆ سەرەوە.

- دەرگوش: شیرە خۆرە.

- دەرگەڤان: دەرکەوان: کوێخادەرك.

- دەرماڵ: ١-عەتەبە: ٢-کارەکەر.

- دەرمان: دەوا: داروو: واجبی: دەروان.

- دەرماناو: گەڕاو: گڕاو: کانی و ئاوێك گۆگردی تێدابێ.

- دەرندەکەن: دەرماندەکەن.

- دەرنکەن: دەرمانکەن.

- دەرە: ١- کوێرە رێگای باریك و بەرز و رك و رزد.

٢-هەر رێگایەکیش لەو (دەرە) یانە بەناوی دێیەکانیانەوەیە وەك:

(دەرەهەرتەل، دەرەزێوکە: دەرەشیر).

٣- گەنمە شامی.

- دەرماناوە: ١-ئاوی گەڕکەنە خورشتی لادەبات.

٢-ناوی سێ گوندانە لەکوردستان.

- دەروێش: ١-تۆبەکار.

٢-خواناسی یەزیدی کە گرنگی بەدونیا نادات.

- دەرەو: درۆ: دەلەسە:

- دەروازە: ١-دەرگای شاران: ٢-دەرگای گەورە.

دەروازەی مەینەت بۆ من کراوە.

- دەرویش: ١-دەروێش: تۆبەکار: بەو کەسانە دەڵێن کەپەیڕەوی تەریقەتی قادری ئەکەن پرچ جێ دەهێڵن گرنگی بەریش نادەن.

٢-ناوی کوڕانە:

٣-وەك نازناوێکیش لەکوردەواری بەکاردێ.

- دەروێشانە: وەکو دەروێشان.

- دەروێش دان: تەکیە.

- دەروێش گرتن: تەریقەت بڵاوکردنەوە.

- دەرەوین: درۆزن.

- دەرۆزەکەر: سواڵکەر: پارسەك: خوازۆك: لەتەچن.

- دەرەلینگ: دەلینگ: لێواری خوارەوەی لنگەکانی دەرپێی درێژ و شەرواڵ.

- دەریا: دەلیا.

- دەریاهاربوون: شەپۆڵی دەریا زیاد دەکات و بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان و ئاو لەبەر شەپۆڵی دەبێتە کەف.

- دەریچە: هوخ: دەرگایەکی بچووك: دەرکۆکە.

- دەریانیشتنەوە: دەریا هێوربوونەوە.

- دەرێخستن: لەدەرگادان: لەدەرکەدان: هێنانە دەرەوە.

- دەرهانین: دەرهێنان: دەرهاوردن.

- دەرهەق: دەرحەق: لەبارە: دەربارە.

- دەستبێن: شگێر: لەشەو.

بەکێودا بۆ ئەوەی مەڕنەڕوات بۆیە یەکێك لەشوانەکان شەوانە سەری کشتەکە بەنێکی لەملی بەرانێك دەخست و سەرەکەی تری لەدەست خۆی دەبەستا لەکاتی ڕادانا بەرانەکەی رایدەکێشا و بەئاگا دەهات ئەمە پێ دەگوترێ دەست بین: شگێر.

- دەرسبێنك: ئەو پارچە پەرۆیانەیە کە لە کاتی منداڵ لەناو لانکاندا دەکەوێتە سەر دەست و سەرپێی.

- دەزراچە: دەسرازە: دەسترازە.

- دەزرێژ: دەست رێژ: رێژنە: شێلگ : تەقاندنی چەند گولەیەك بەیەکەوە.

- دەزی: دەزوو: دەزووی: دەشکە.

- دەژ: یەدەگ: پێدەگ: ئێدەگ.

- دەسبەر: ژێر چاودێری.

- دەس درێژ: دەسدار: دەسەڵاتدار.

- دەست: ١-دەس: دەز: ٢-بریتییە لەپێوانی ئەو سەپانانەی کەبەیەکەوە دەست دەغلەکە روودەکەن لەکاتی رەوسەبڕکردن.

- دەستاڕ: دەست هاڕ: هێردی: گێرونە: هاڕەی دەس: - دەست یار: دەس هاڕ: ئاشەدەس: هارە: دەسیار: دەسیەر.

لەدوو بەردێك پێکدێت بەردی سەرەوە (سەر دەستار) بەردی بنەوە (ژێر دەستارە).

- دەستاو: ئەو ئاوەی ژن لەهەویر شێلان دەستی لەناو دەنێت.

- دەست ئێخستن: دەستهێنان: بەدەستهێنان.

- دەست بایی: دەست باوی: هەڵەخەرجی: تەخشان و پەخشان کردن.

- دەست بڵاو: دەست بەردەس: دەست بڵاڤ: دەست شڕ: دەسباد: سەخی: سەغی: جۆمەرد: موسرف: دەست گوشاد: بەخشندە: دڵ فراوان: خۆردە





- دەست بەجێ: دەزبەجێ: گەرماوگەرم: دەم و دەست: تاڤل: دەردەم.

- دەست پێوەگرتن: سەرف نەکردن.

- دەست پەروەردە: ئەوەی لەژێر دەستی کەسێ پێدەگا.

یەکێك لەدەست پەروەردەکانی فەوزی و هاوبیرەکانی کان حەسەنی قزلجی خۆمانە.

(گەدا- ل١٠)

دەست پەڕ: ١-تفە: ئاوهێنانەوە بەدەست.

٢-سەرەتایەکە بۆ(باز) فێرە راوکردن پۆزرێکی زیندوو دێنن بۆ ئەوەی زۆر بەتیژی نەفڕێ دووسێ پەڕیان لەباڵی ئەکردەوە، بەرەڵایان ئەکرد بازەکەیان تێ بەر ئەدا، ئەکەوێتە سەری و ئەیگرت و ئەیخوارد.

- دەست پێکردن: مل لێنان: دانەبەر: هەری کردن.

- دەستت نەڕزێ: دوعایە بۆ پاداشت دانەوەی کارێکی چاك کەیەکی کردبییەتی.

- دەست داخ: دەسداخ: چەند تاڵە بەنێکی پێدا بادراوە کراوە و کار و بەرخی بەدەست پێوە بەستراوەتەوە.

- دەست دار: بەدەسەڵات: بەدەسهەڵات.

- دەست دان: ١-تەسلیم بوون: ٢-لوان.

- دەست دروو: بەدەست دروین.

- دەست درێژ: ١-دەوڵەمەند: ٢-بەدەسەڵات.

- دەسترازە: دەسرازە: پەتێکی دوو تلك پان دەبێ بە دەزێیکەوەیە و منداڵەکەی پێ لە لانك شەتەك دەدرێ و دەچێتە وە سەرتیرەی لانك و لەوێ قایم دەکرێ.

- دەستڕ: دەستەسڕ: دەسڕ: دەست سڕ: دەستماڵی: وشك کەرەوە: کەمك: مەرحەمە: هەوری: دەسڕۆك: دەسرۆکە.

ئەوپارچە قوماشە بچووك و چوار گۆشەیە کەسپی یان ڕەنگاوڕەنگەو بۆ دەست سڕین بەکاردێت.

- دەست رۆیشتن: دەس داری توانایی.

- دەست سووك: دژی دەست گران.

- دەست قوتان: چەپڵەلێدان.

- دەست شۆرك: دەستشۆر.

لەگەنێکی تایبەتییە دەستی لەناو دەشۆن.

- دەستکرد: خۆکرد: دەسکار: دەستکرت.

- دەست کەلا: دەستکەلا: ئەو کەلایەی تیری پێ دەهاوێژرێ.

- دەستکەوت: بەرهەم.

- دەستکەوە: ١-دەست شین: خومگەر:

٢-دەست بکەوە.

پەیابوون: پەیدابوون: وەدەستکەوتن: وەدەست هێنان: - دەستکەتن: وەدەست خستن.

- دەست کردنەوە: وەدەستهاتن: لەکاتی شەرکردن کەسێ بەرگری لەخۆی بکات.

- دەستگر: ١-ئەوپارەیەی لەلایەن خاوەن موڵك دەدرایە سەپان و لەسەرجۆخین لێی وەردەگیرایەوە. ئەمەش مەرجێك بوو لەمەرجەکانی سەپانی هەندێ جاریش( دەست گر) نەدەدرایەوە.

٢- ئەو پەرۆیەی کە دوو لای پارچەیەو مەنجەڵی چێشتی پێ هەڵدەگیرێ.

- دەست مز: دەست حەق: حەق دەست: کرێی دەس: دەست موزد.

- دەست نادا: ١-واتە تەسلیم نابێ: ٢-لەکڕین و فرۆشتندا واتا (نابێ: نابی).

- دەست نماز: دەست نوێژ: دەست نمێژ.

- دەسنمازگرتن: دەستنوێژ هەڵگرتن: خۆخاوێن کردنەوە بۆ نوێژکردن.

- دەستنوێژ شکان: دەست نوێژنەمان.

- دەستنوێژ لێ شکان: هەموو ئەو شتانەی دەستنوێژی پێ دەشکی.

- دەستنوێژ هەڵگرتن: دەستنوێژ شوشتن.

- دەست نوێژ نەبوون: واتە بێ دەستنوێژ.

- دەست و پل: دەست و پەنجەکانی دەست.

- دەستوور: یاسا: رژێم: زاکون: قانوون: دالنگە ئەوەی پەیرەو دەکرێت لە کار و کردەوەی دەوڵەت و کۆمەڵ.

- دەستە: ١-دەس: چەپك: دو: دۆ: تاخم.

٢- کۆمەڵێك: دەستەقەڵەم: ٣-بەژن وباڵا:

٤- قاتێك: دەستەجل: ٥-دەچێتە: ئەڕواتە.

- دەستەبەر: دامان: کەفیل

- دەستەبەری: دامانی: کەفیلی: بەرعۆدە

- دەستە خوشك: هاورێی کچ.

- دەستەدز: چەند دزێك بەیەکەوە کەدزی دەکەن.

- دەستە ژۆر: بەدەسەڵات.

- دەستە ژۆرە: زۆرانێ: زۆران بازی.

مەتاریزێ بەردی سۆرە
دووکوڕان گرتیە دەستە ژۆرە

(هۆنراوە- ل١٢٥)

- دەستەك: پارچە زەوی بچووکی (قەد) لەو عاردەی دەکرێتە توتن.

٢-دەستێك: ٣-قاتەك.

دەستێك نوین          دەستەك خۆم شوشت

(حەمەدۆك ل١١٥)

- دەستەگوڵ: چەپکەگوڵ.

- دەستە گوڵ لێدان: یەکەم زار هەڵگرتن لەیاری سنی زولفدا.

- دەستە گوڵ وەشاندن: ئەنگوستیلە دۆزینەوە لەیاری گۆرەوی بازیدا.

- دەستە مۆ: رام:ماڵی: کەوی: کەیی: خانەکی: خەرۆ: راهاتوو: کەمۆ: خووگرتوو: کەنی: لیینی: دەسامۆ.

- دەستەو دوعا: دەست بەرز کردنەوە لەبەرخودا پارانەوە بۆ بەئامانج گەیشتن.

- دەستەوانە: پەنجەوانە: دەسکێش: دەستێنە: لەپك: - دەستەوخەنجەر: دەسەوخەنجەر: خەنجەری رووت بەدەستەوە بۆ پەلاماردان.

- دەستە هەڵتەکاندن: دەست بڵند کردن: ئیشارەت دان بەدەست.

- دەست قەرتالە: قەرتالەی بچووکی تەماتە و ترێ ڕنین.

- دەست قەرز: دەستەوا.





- دەسرۆك:١-پارچە قوماشێکی دوولەسەرە بەسەرپشت شۆردەبێتەوە لە جیاتی سەربەست لەسەریان دەنا لە فێسوکڵاو دەئاڵێنرێ لەگەڵ جلی ژنانی کوردی ئێران لەسەر دەکرێ.

٢-دەستەسڕ.

- دەستەندو: دەستەدوو: دارێکە درێژییەکەی مەترێك وە یا بە گوێرەی باڵای جووتیارەکەیە لە درێژی  و کورتی بۆ ئەوەی جووتیار کە پشتی زۆر نەچەمێتەوە لەگەڵ قونکی هەوجاڕەکە بەندکرایە بۆ راگرتن و راستی خەتی جۆتە بۆ کاتی سووڕانەوە هۆدانەوە، هەوجاڕ و گاسنەکە لەژێر زەوی کە دێنێتە دەرەوە.

- دەستەمستە: ئەو دارەی دەچێتە ناو دەستەند و جووتیار دەستی پێوە دەگرێ.

- دەسماڵ: شێوە سێ گۆشە لە ناوەڕاستی لای درێژی بەئەڵقەیەك لەدراوی سەرترۆپکی تاسی قایم دەکرێ مل دادەپۆشی سەری دەسماڵەکە بەسەر پشت دا شۆڕدەبێتەوە دوو سەرە باریك وا درێژەکانی لەلای پشتەوە لێك تێدەپەرن .

- دەسماڵ کردن: رنەك کردن.

قاش و یش کردن: شانەکردنی وڵاغ.

- دەسەرسەرت گەڕێم: تکا و پاڕانەوەیە واتە بە قوربانت بم.

- دەسەڵات: هێزدار: پڕوو: توانا: باڵادەست: دەستدار: زەبەربەست: دەست هەڵات : بەدەستەڵات

- دەسەڵات دار: دەسەڵاتدار: دەستهەڵاتدار: بەدەسەڵات: خاوەن دەسەڵات

- دەسە و خەنجەر: دەستە و خەنجەر.

لینگیان دامێ دەستە و خەنجەر.

- دەسەوسان: دەستەوەستان: مەحتەل مان.

- دەسهەڵبەست: ساختە: هەڵبەست: دروستکراو: ساختەگی: دەسهەڵبەس.

- دەشت: دەیشت: شوێنی چۆلی تەختایی رووتەن زەوی و زاری نزم و تەختایی.

هەردەشتێك دابەش دەبێت بەسەر چەند ناوچەیەك و هەرناوچەیەکێش ناوی تایبەتی خۆی هەیە ناوەکانیش لەناوی شار و دێ شارۆچکە و ناوی عەشیرەت ناوی مرۆڤ وەرگیراوە وەك.

١- دەشتی هەولێر: بریتییە لەم ناوچانە" قەراج، کەندێناوە، شەمامك، سەنیە، مرکیە، بەرڕێ، پشت ڕێ، بەرانەتی).

٢- دەشتی کۆیە،( دەشتی حەریر)، (دەشتی هێرتی)، (دەشتی گەرمیان)، (دەشتە دیان).

٣- (دەشتی مەحمەشە) دەشتێکە لە سندوسی موکریان.

٤- دەشتی باڵێن: لەدەشتی بالینی ئازیزم دەهاتە خوارە.          (تحفە -٢-ل٢٠١)

٥- دەشتی شوان: دەشتی ناوچەی عێلی شوان.

٦- دەشتی جەباری: دەشتێکە لە ناوچەی گەرمیان.

- دەشتە: ١-دەچتە: ئەچێتە. ٢-دەشتاییە (دەشتەوەمالی)

- دەشتەکی: ١-کرمانج:

٢-وەك نازناوێك بەکاردێ.

- دەشکەم: دەشقەم: بەڵکی: بەڵکو.

- دەشلێن: دەڵەنگێن: دەشەلن.
- دەشـەوی شـوقاقا: واتـە دەرۆژ پـاش نـەورۆزی بەحسابی رەوەندا بۆ هەوار رۆیشتن دەرۆن.
- دەعبا: درندە.
- دەعواکردن: داواکردن.
- دەعواودۆز: گازن: گازاندە: شکات: سکاڵا.
- دەعوا: داوا.
- دەعوای: داوای: دەحوای.
- دەعـوەت: لێ گێڕانـەوە: قـاولێ کـردن: بـانگ کردن: بانگ کێشان: خولك کردن.
- دەعەمەل هێنان: بەعەمەل هێنان: بەکارهێنان.
- دەغل: گەنم و جۆ.
- دەغل داکردن: گەنم و جۆ لە عـەمبار و چـاڵ و کەندو کردن.
- دەعن: ١-دانی حەسانەوە: ٢-کۆز
- دەغیلوبم: دەخیلتان بم.
- دەغەل: نەخۆشییەکە تووشی مـرۆڤ دەبـێ و زۆر ئارەزووی ترشی دەکات.
- دەف: دایرە: ئامێرێکی موسیقایە و دوو جۆرە:
١-دەفی دەروێشی: بریتییە لە چێوەیەکی بازنـەیی دار بەوێنـەی بێـژینگ لەیـەکێك لـەرووەکانی پێستێکی تەنکی تێ دەگیرێ لەتەکیە و خانـەقا و بۆنەی مەولوودی پێغەمبەر (د.خ) بـەکار دێ ئـەم جۆرە دەفانە لـەدیوی نـاوەوەی چـیوەدارە ئەڵقـەی تێلـی بـەرێز پێوەیـە و لـەکاتی لێـدانا دەنگـی (خەشەخەش)یان دێت ئەلقەکان ژمارەیان (هەژدە) زنجـیرەو هـەرزنجیرەی (٣-٤) ئەلقـەی پێوەیـەو هەمیشە (دوودوونە)، لـە کـۆڕی زکـر و تەکیـە و خانەقادا بەکار دێ چوار ئاواز زکرکردن هەیە:
١-باری: ٢-هەوایی: ٣- حەی ئەللە: ٤-قایم.
٢-جۆری دووەمی ئەم دەفە گەورانـە بـێ زنجـیر و ئەلقەیـە بـۆ شـایی و زەماوەنـد و گـۆرانی گـوتن بەکاردێن.
- دەفتەر گرتن: حساب راگرتن.
- دەفر: گلێنە.
- دەفری گلینەی هەلیسوراو: دیزەیەکە بـەتفرێکی سەوز و لووس هەڵدەسووری.
- دەفـری گلێنـەی هەڵنەسـووراو: وەك جـەڕە و جەلعە و شەربە.
- دەفزەن: دایرەزەن: دەف ژەن: دەف لێدەر.
- دەفنبوون: وەلبوون: رۆیشتن.
- دەفنکردن: شاردنەوەی مردوو.
- دەفـە: ١-ئامرازێکـە لەبەشـەکانی جەنجـەر: هـەردوو شـەپکەداری پـان و گـەورەی پاشـەوە و پێشەوەی نێوان حوشترەکانی جەنجەر.
٢-یەکێکـە لـەئامرازی جـولا، کەبەسـاپیتە هەڵواسراوە رایەلی دەردەچێ و بەسـەر شـیری بـن رایەل دادەڕوا.
- دەڤ: دەم: دەو: زار.
- دەڤ نەرم: زمان نەرم.
- دەڤە: وشتر.
- دەڤەر: ناوچە: مەڵبەند.
- دەڤەرا: ناوچەی.
دەڤەرا بادینان: ناوچەی بادینان.





- دەڤی: دەوەن.
- دەق: ١-زۆر راست و بێ درۆ: قسەکانت دەق وەیە ٢-کتومت: یەکسان.
٣-تێکست: تکست: ٤-قەد.
- دەق خواردن: کرلە شەپکەدار هالاندن و دەق گرتنی.
- دەقکردن: لەسەریەك دانان بەرێك و پێکی.
- دەقەنـە: فـەقێ لـەکاتی پـاییز ئەگـەرێن بـۆ کۆکردنەوەی ئازوقـەی زسـتان لەشـوێن و ناوچـەی تیادان لەدەرگەی هەرماڵێك ئەچنە ژوورەوە ئەڵێت (دەقەنـەی فـەقێیان) ئـەو ماڵانـەش ئەوەنـدی لەتوانایان دابێ ئازوقەی پێ ئەدەن.
- دەك: ١-تەڵەکە:
٢-حەك: وشەی سەرسوڕمان.
- دەك و دۆلاڤ: فێـڵ و فـەرەج: مـەکر و دۆلاب: دەهۆ و تەڵەکە.
- دەولاسـکە کردنـەوە: لاسـایی کردنـەوە: لەچـاوکردنەوە تیتـالی: دەمەلاسـکی: زەهـرەدین: چاولێ کەری: دەمەزن.
- دەوێدا: لەوێدا: لەئەوێدا.
- دەگەڵ کردن: لەگەڵ کردن.
- دەگژڕاچوون: بەگژداچوون.
- دەگەدابی: دەگەڵ دابی: لەگەڵ دابی.
- دەگەورە... دەگەورە: وشەی هاندانی بازی تەوار لە کاتی راودا.
- دەلا: دەلاکەو: دەبرۆلای.
- دەلاهاتن: بەلاداکەوتن.
- دەلاقـە: رۆشـنە: پێیـەك یـان زیـاتر قوولـە لەئەستوایی دیوار براوە شتومەکی تێدادەنێن.
- دەلاقـەی حوشـترۆکە: ئـامرازێکی جەنجـەرە، بەینی هەردوو شونکی حوشترۆکەیە دەلاقەیـەکی تێدایـە و رووکەشـی نەخـشرایە پێـی دەڵـێن دەلاقەی حوشترۆکە.
- دەلەقۆر: دێلە قور: جنێوە بە ژن دەدرێت.
- دەڵەك: کووژە: کووشك: گیانـدارێکی گۆشـت خـۆرە لـەناو بێـشەڵان دادەژی، لەشـەکەی لاکێـشەییە پێـستەکەی قاوەییـەکی مەیلـە و سوورە ژێرملی و سکی سپییە کلکی پانە لمۆزی کوڵە پێستەکەی بەنرخە.
- دەڵەمە:١-هێلکەی نیوە برژاو: ٢-ماستی تـازە هەوێن کراوی زۆر پەیت نەبێت بەمەرجێك هەوێنی ماستەکە (گیا شیرە)بێت.
- دەلیڤە: بوار: مەجال.
- دەڵێن: ئەڵێن: وشەی گومان لە کـردە و کارێـك کە زۆر روون نەبێت.
- دەم: ١-کات: هەل: چاخ: گاو: گـاڤ: هنگـا: لە کاتی.
٢-دم: دەو: زار: دەڤ.
- دەمانچە: دەوانچە: دەبانچە: شەش ئاگر: جووت لوولە: دوولوولە: جۆت وەروار.
جۆرێکـە لەچـەکی شـەڕ بـە زۆری بـۆ پارێزگـاری شەخسی بەکاردێ.
- دەم بەستان: دوعـا و نوشـتە دەکـرێ گوایـە ئـەو کەسەی مەبەستە لە کاتی پێویست، قسەی بۆ ناکرێ.

- دەم بەستران: دەوبەستران: ١-قسەنەکردن: ٢-دوعاکردن لەکەسێ کەلە کاری قسەی پێ نەکرێ.
٣- دەو بەستانی گیانداری دڕندەی وەك گورگ و ڕێوی.
- دەم تەقین: دەمدڕاو: زاربلاو: زارشڕ: زۆروەر.
- دەم چەرمگ: دەوڕاست: پیاوماقول و بڕوا پێکەری بنەماڵەیەك.
- دەم خەندە: پێکەنینی تەنها بەدەم لەناخەوەنا.
- دەمۆی: دەمەوێ: ئەمەوێ.
- دەمە قڕی: هەراهەرا: کەشمەکەش.
- دەمر: ئاسن.
- دەم ڕەق بوون: قسەپێ نەکرای.
- دەم سە: دەوسە: ئاژەڵی گڕە یانی لچەکانی یەك لەیەك درێژتربێت.
- دەمکوتکار: قرتەبڕ: دامرکێن.
- دەمکوتکردن: بێ دەنگ کردن: کڕکردن: دامرکاندن: خامۆش کردن: داکاسندن: دانیشاندن: داکەساندن: سووسەبڕین: کپ کردن: دامرکاندن: وس پێ کردن: دەوکوتکردن.
- دەمگۆ: ئەم وت: وەمەگۆ: دەمگۆت: ئەمووت.
- دەم گوش: سەری لای خوارەوەی قەمیشی باڵەبان کە دەچێتە ناوباڵەبان.
- دەمەسات: ماوەیەك.
- دەم نادەم: تاو ناتاوێ.
- دەمەك: دەمێك: وشەی کات و سات دیارکردن.
- دەم ناسی: ١-سێینە: پشیلە: ناوی گوڵێکە لەشوێنی فێنك دەڕوێت ئەم گوڵە (٤٠٠) جۆری هەیە، بەڵام تەنها (٥)جۆری لەکوردستان دەڕوێت زۆر جار پێیدەووترێت (سێنە) لەبەر ئەوەی لەسێ ڕەنگی جیاواز پێکهاتووە هەروەها پێدەڵێن (دەمناس) لەهەندێ شوێن (پشیلە)ی پێ دەڵێن.
٢-ئەمناسی.
- دەمنێ: دەڵێی: هەروەك.

سوبحانەلا چەند جوانی دەمنی گوری ناوباغانی .

(هونراوە- ل٥٩)

- دەمودەست: دەملدەست.
- دەمووکا: دمکانە: بنیشتی خۆش نەکراو.
- دەمەرقران: ناوی هەسپەکەی سیامەندی دڵداری خەج.
- دەمەشێر: گوڵێکە پەڕەکەی یەك پارچە و لەشێوەی لمۆزی شێرانە لاسك نەرمە بێ دڕکە، بۆنی هەیە مالییە بەتۆو زیاد ئەکرێ بەکارئەهێنرێ: ١-بۆجوانی:
٢-بۆهەنگ.
- دەمەقالێ: دەمەقالە: دەمەقرێ: قرەقر: دەمەقڕە: مشتومڕ.
- دەمەك: ماوەیەك: ماوەك.
- دەمەو: بەرەبەر.
- دەمەوزستان: بەرەبەری زستان.
- دەمی گورگ بەستان: کاتێ ئاژەڵێك ڕەشە وڵاخێك نەگەڕێتەوە ماڵەوە لای مەلا دوعایەکی تایبەتی ئەخوێنێ و چەقۆیەك دەم لێك ئەنی گوایە ئیتر دەمی ئەو گورگە لەعاستی گیاندرەکان ئەچێتە کلیلە و ئەبەسترێت وەك چەقۆدەم لێك نراوەکە ئەمە پێی دەگوترێ دەمی گورگ بەستان.





- دەناری: دەناڵێ: ئەو دەنگەی لەبریندار و نەخۆش دێت.
- دەنجا: دەوجا: ئینجا.

میر گوتی"هەموو کارێکی پێ کردم دەنجا بیکوژن.

(تحفه-١-ل٢٣٠)

- دەندك: دەندە: ئێسقانی قەفەزی سنگ.
- دەنك: دنك: قل: دەننگ: دەندك: دەنوو.
- دەنکەن: دەمانکەن: ئەمانکەن.
- دەنگ: ئەورووداوەیە کەبە گوێ دەبیستین و دەنگ لەئەنجامی (لەرینەوە) پەیدا دەبێت هەموو دەنگیك سەرچاوەکەی تەنێکی لەراوەیە.
- دەنگت نەرزێ: دوعایە بۆ کەسی دەنگ خۆش.
- دەنگدانەوە: پێژن: رازەر: دەردەنگ: دەنگ ڤەدان: شەپۆڵدانی دەنگ.
- دەنگ ئەستوور: دەنگی گەورە.

سەگێك بەدەنگی ئەستوورەوە.

(حەمەدۆك-٢-ل١٩١)

- دەنگ دەرچوون: دەنگ چونەدەر: بە دەنگی بەرز قسەکردن.
- دەنگ دڕان: زۆر هاوارکردن.
- دەنگ کەوتن: دەنگ نووسان.
- دەنگ لەدەر: زۆروەڕی بێ حەیا و شەرم.
- دەنگە دەنگ: هەراوهوریا.
- دەنگ مەکە: دەنگێ مەکە.

بیخەرە کۆشیەوە ئیتر دەنگ مەکە.

(گەدا- ل١٨٢)

- دەنگ نییە: دەنگ نایە.
- دەنگ خۆش: بەهرەیەکە و هەندێ کەس هەیەتی، وزەیەکی شاراوەیە لەخودی بڕێك ئادەمیزاد کەرەسەیەکی گرنگی مۆسیقای گیانییە کە بەهۆی پەردەی سنگ و ژێیەکانی قورگ و (هەناسە) و (وتە) لەقاڵبێکی هونەریدا ئەبێتەوە بەرهەمێکی ڕەنگین و کاریگەر.
- دەنگۆ:١-دەئێوە: ٢-دەمانگۆ: ئەمانووت
٣-دیعایە: قاو: پڕوپاگاندە.
٤-لەئێوە: چلون پشتم دەنگۆ دەکەم.

(تحفه-١-ل٢٩٩)

- دەنگۆساز: دیعایەچی.
- دەنگی باریك: کەسێ کە دەنگی تیژە و بەیەك دەنگ دەردەکەوێت.
- دەنگی دەف: لە ئەنجامی لەرینەوەی پێستەکەیە.
- دەنگی عود: لەئەنجامی لەرینەوەی ژێیەکانی عودەوە پەیدا دەبێت.
- دەنگی گەورە: دەنگی زبر و ئەستوور.
- دەنگی مردەلۆکە: دەنگی نووسا و بێ هێز.
- دەنگی مرۆڤ: لەئەنجامی لەرینەوەی (ژێ) کانی قوڕگەی مرۆڤەوەیە.
- دەنگی نای: لە ئەنجامی لەرینەوەی هەوای ناوەوەیتی .
- دەنگی ناساز: کەسانی دەنگ ناخۆش کەناتوانن گۆرانی بەسۆزەوە بڵێن.
- دەنگی نییە: ١-واتە بێ سەروسۆراغە:
٢-دەنگی کز و بێ هێز.

- دەنووك: دنووك: دمدك: نكل: دمك.
- دەنـووك شـاخاوی: باڵندەیـەكی دەنـووك زلـە شاخێكی كركراگەیی وابەسەری دەنووكییەوە.
- دەو:١-دەم: ٢- لەو (دەودەمی): ٣-دۆ:
٤-گوند: دێ.
- دەوات: داوەت: زەماوەند
- دەوار: ١-رەشماڵ: تاولی: ٢-وڵسات.
- دەوار نشین: كۆچەر.
- دەوان: دەبان: تیغی خەنجەر كە جەوهەردار بێت
- دەودوو: جۆرێكە لەرێككەوتن لەنێوان جووتیـار و خاوەن موڵك بۆ و تۆكردن خاوەن موڵـك لێـرەدا ئاو و زەوی دەدا و ئەوی تر لەسـەر جووتیـارە لـە (٢٠٪) بەرهەم وەردەگرێ.
- دەوران: پەرژین.
- دەوس: ١-جێگە: ٢-سۆراخ.
- دەوشل بوون: زۆر قسەكردن: زارشل بوون.
- دەوڵەت: ١-سامان: ٢-ئاژەڵ: ٣-حكوومەت.
- دەوڵەت كەتی: فەقیر: هەژار.
- دەوڵەت مەند: خاوەن سامان: دەوڵەمەند.
- دەوڵەت مەندی: دەوڵەمەندی.
- دەوڵەمەندی قورس: زۆر دەوڵەمەند.
حاجی عەلی دەوڵەمەندێكی قورس بوو.
(گەدا- ل٦٧)
- دەوكول بوون: بۆقژە: پیزۆكەی دەم.
- دەوێت: ١-گەواد: ئەوكەسەی ژنی حەشرەیی بـۆ خەڵك دەبات.
٢-جوێنە وەك دەوێت باب.

- دەوە: ١-دەمە: ٢-لەوە.
- دەووستان: قسەنەكردن.
- دەول: دەولك.
- دەولـك: لەشـێوەی زەمبیلـی خـۆڵ كێـشانە، چـوارقولغی هەیـە زۆر لـە لاسـتیك دروسـتدەكرێت دەولك لەنێو تەنەكە ئاو تادوو تەنەكە ئاو دەگرێت.
- دەدەی: ئەدە:
١-سادەیی: جادەی.
٢-بەچەندی دەدەی؟
- دەی: وشەی هاندانە بۆ:
١- كار ئەنجامدان.
٢- بیركردنەوە.
٣- هەڵمەت بردن.
٤- بۆسەركەوتن لە پێشبڕكێدا.
٥- بۆ خۆرزگار كردن لەتەنگانەدا.
٦- هێشتن.
قەیناكا دەی بابێ.
- دەیدیت: دەیدی: ئەیبینی.
- دەیسا: دەوجا.
دەیسا تۆش نووشتەكەم بۆ بنووسە.
(گەدا-ل١١٠)
- دەی ماڵم ... ئافەرین: لەراوە بەراز ئەگوترێ بۆ هاندانی سەگ تابەراز بگرێت.
- دەیگۆت: دەیگۆ: ئەی وت.
- دەی بەنمەوە: دەیهێنمەوە.
- دەهۆ: ١- شەلتە: رەشكە: ٢- فێڵ.
- دەهۆڵ: دۆڵ: دۆر: داهۆڵ.





- دهۆڵ: دەف: ئـامرازێكی مۆسـیقای (ریتـۆم)ی كوردییە لە (كەمە)یەكی دارین دروست دەكرێت كـە هـەردوو رووەكـەی بەپێـستی خـاو ئـەگیرێ، دیوێكی شۆلێكی باریك و دیوەكـەی تـری بەكۆڵـە گۆچانێك لێدەدرێت ، هەروەها دەهۆل یەكێك بووە لە ئامێری موسیقای جەنگ.
دەنگی دەهۆڵ لە دوورخۆشە. (پەند)
دۆر دڕا تەقەی بڕا. (پەند)
- دەهۆڵ كوت: دۆڵەنێگو: دۆڵ چـی: دەهـۆڵ ژەن: دۆڵ لێدەر: داهۆڵ قوت.
ئامێری دۆڵ بە هۆی (قامیش، یاخود پـەت)ێـك لـەمل دەكـات، بـەهۆی دووئەڵقـەوە كەلەسـەر تەختـەی چـێوەكە كـوتراون دەهـۆڵێش لـەكاتی بەكارهێنانی دەكەوێتە بـەردەم سـینگی دەهـۆڵ كوت و بەهۆی دوودار دەكوتێ بەو دارانە دەڵـێن داردۆڵ و ئاوازی جۆراوجۆری داوەتی پێ لێدەدات و كۆڕی داوەت بەیارمەتی زوڕناگێو دێنێتە جۆش و خرۆش .
- دەیانگۆ: دەیان گوت: ئەیانوت.
- دەیندار: قەردار.
- دەیهەوێ: دەیەوێ: دەیوێ: ئەیەوێ.
- دهو: ١-فێڵ: ٢-درۆ: ٣-پیلان.
- دهێت: دێت: بێت.
- دهۆی...دهۆی: قوشیچی كاتی ئەچـی بەشـوێن بازی راو لەڕاوكردنا كـەپۆڕی گرتـووە بـەهێمنی و پارێزەوە ئـەم وشـەیە دووبـارە دەكاتـەوە ئەچـێتە پێشی پۆڕەكەی سەر ئەبڕێ.

- دیاربـەكر: قەرەئامیـد: ئامـەد: لەسەرچـۆنیەتی نـاونرانی ئـەم شـارە زۆر قـسەی جیـاواز هەیـە سەردەمێك كیژێكی جوان فەرمانڕەوا بووە لەو شارە، لەسەردەستی وێـنس پیغەمبـەر موسـڵمان بووبـوو، لەبەر ئـەوە زۆر دەوڵەمەنـد بـوو بەفـەرمانی وێـنس پێغەمبەر ئەم شارەی بەبەردی رەش دروسـتكرد. جـا چونكە بنیاتنەری شاری كـچ بـووە مێـژوو نووسـانی عەجەم (دیاربكری) پێـدەڵێن واتـە (شـاری كیژۆڵـە) بـەڵام میژونووسـانی رۆم لەبـەر ئـەوەی دیوارەكـانی بەبەردی رەش داندراوە (قەرەئامێدی)ی پێدەڵێن.
- دیاردی: لەڕاو دەگوترێ كـاتی نێـچیر دەبینـرێ یەكێ دەڵێ خوڵامی سەری... راوچـیانم راوچـیانی تر دەڵێن (دیاردی).
- دیاری: سەوقاتی: سەوقاتی.
- دیـان: ١-گـاور: فەلـە: گـەبڕ: خـاچ پەرست: ٢-ددان: ٣-دیتیان.
- دیتن: بینین.
- دیتم: بینیم.
- دیتنگە: جێگای یەكتری دیتن.
- دێتەوە: یەتەوە.
- دیدەی شرینم: بریتییە لە خۆشەویست.
- دیرۆك: جۆرێكە لـەگۆرانی ئێزدییـەكان وەكـو سترانایە، بەڵام لەسـەر مریـا دبێـژن بەتایبـەتی ئەگەر یەكێكی ئـازیز بێـت بـەزۆری ژن دەیڵـێن بەڵام بەدەنگێكی مەلول و كزڤـان دەیلـێن دڵـی مرۆڤی دەسووتێنی.

- دێر: ١-دەیر: کلێسا: کەنیسە: کنیسە: ٢-ناوی چەند گوندێکە: ٣-لەگەڵ زۆر ناوی تر وەك پێش گرێك، دێر حەریر، دێر جندی.
- دێرێن: قەدیم: کۆن.
- دیزە: دێزە: هەمەلێزە: مەنجەڵ: پاتی: قازان: مەنجێڵ: تیانە.
- دیتنەوە: دۆزینەوە.
- دیتمەوە: دۆزیمەوە.
- دیتتەوە: دۆزیتەوە.
- دیتمانەوە: دۆزیمانەوە.
- دیکەش: کەش:
(نیوەکەی کەش: نیوەکەی دیکەش)
- دیزێ: دیزە.
- دیزی: گوڵێکە پەڕەکەی پەڕپەڕەیە و مەدەوەرە لاسك نەرمە، بێ دڕکە بۆنی نییە کێوییە، بەتۆو زیاد ناکرێت ئەکرێ بەکارئەهێنرێ: ١-بۆجوانی.
٢-بۆ هەنگ.
٣-سك ئێشە.
- دیسان: دیسا: هەمیسان: هەمدیسان: جارەکی دی: جارەکادی: لەنو: هەمیسا: دیسانەوە: دووبارە: سەرلەنوێ: بەتازەگی: هەمدیس: لە نۆژنەوە.
- دیك: دیقل: کەڵەباب.
- دیلگرتی: بەدیلگیراو.
- دین: ١-ئایین: ٢-شێت.
- دینانە: شێتانە.
- دین کر: شێتی کرد.
- دین کرن: شێت کردن.
- دین دوژمن: هەرچی ئیسلام نەبی.
- دین کورد: کۆنترین پەرتووکی کوردییە کە بەزمانی پەهلەوی بووە کەزمانی لور و کەڵهورشوانانە.
- دینگ: دنگ: ئەم ئامێرە لەبەرد دروستدەکرێت، هەندێك دینگ بەردەکەی یەك پارچەیە و هەندێکی دووپارچەیە کە بە (تۆق) لێك دەدرێت شێوەی خڕە، بۆ ساوارکوتان بەکاردێ واتە بۆ ئەوەی پەلکی لەگەنمی ساواری بکاتەوە بۆ سوڕاندنی ولاغیان بەکاردێت.
دینۆ: پیاوی شێت.
٢-ناوی کوڕانە.
- دینێ: ١-ژنی شێت: ٢-ناوی کچانە.
- دێبینین: ئەبینین.
- دێنێ: دینی.
ئەوانیش دێنێ و لێی دائەنشێ.
(گەدا- ل٩٥)
- دیوار: تییك: کۆسەر: تیکار: جیوار.
- دیواری مەد: یەکێکە لە شاکارەکانی ماد: دیوارێکە لە نێوان وڵاتی میدیا و بابل لە خشت دروست کراوە.
- دیوەخان: دیوان: کۆچك: زۆربەی گوندەکانی کوردەواری دیوەخانی هەبووە دیوەخان پێکهاتبوو لەژوورێکی گەورە و ئاگردانێکی لەناوەڕاست و چەند سەکۆیەکی لەقوڕ دروستکراوی تێدابوو، بۆ دانیشتنی میوانان و براگەورەی گوندی لبادی درێژی لاکێش و مافوور و سەرەندازیان رادەخست





بەزۆریش لەشوێنی بڵند دروستدەکرا هەتا دیار و بەرچاوبێت تەوێلەش بەتەنیشتییەوە دروستدەکرا بۆ ولاغی مێوانان.
دیوانێ و دیوەخانێ
چوونە لای دیوانێ
- دیوەخانی سپی: ژووری تایبەتی بووکە بەتەنیشت دیوەخانی گەورەی ئاغاوەبوو، بەگەچ سپی کرابوو مافووری تێدا رادەخرا کورسی لێ دادەنرا بۆ میوانی تایبەتی بوو.
- دێ: ١-گوند: ٢-بێ.
- دێرسیم: دەرسیم: یەکێکە لەهەرێمەکانی کوردستانی تورکیا.
- دێم: ١-بێم: ٢-دژی بەراو: ٣-دەم: کات.
- دێم نادێم: دەم نادەم.
- دیوەخانشین: ئەوکەسەی زۆر هاتوچۆی دیوەخان دەکا و لەدیوەخان دادەنیشێ.
- دێقوتی: لێیدەدا.
- دێڵ: دەڵ: دێر: مێیە.
- دێڵە: دەڵە: دێرە: میینەی سەگ و گورگ.
- دێوانە: ١-ئەو کەسەی تەریقەتی وەرگرتووە بەرێگای تەریقەتا ئەڕوا و تێکەڵاوی جەزبە و عالەمی مەعنەویات ئەبێ.
٢-وەك نازناوێك بەکاردەهێنرێ.
٣-ناوی کوڕانە. ٤-شێت.
- دێو: بوویەکی خەیاڵییە بەدیمەن وەك ئادەمیزاد وایە، بەڵام زۆر بەهێز و ناشیرین و بەشامە گوایە شاخ و کلکی هەیە.
- دێوجامە: پارچە قوماشێکە بە ئەندازەی چارۆگەیەك پارچەی رەنگاوڕەنگی پیائەدورێ، بە رووەکە یا لەشێوەی چوار گۆشە دابێ دوو داری لەم لا و لەولای ئەبەستن ئەمەیان تایبەتە بۆ راوکردنی کەو بۆ راوکردنی پۆڕ دەبێ شاڵینەی زەردبێ نابێ گوڵ گوڵ بێ.
- دێمکە: لەپارچە کوندەی دڕاو لەشێوەی جۆرێك دروستدەکرێت شوان ئاوی خواردنەوەی تێدەکات.
- دێوەرە: ئەوەیە کابرایەك ولاغێکی باردەکرد لەمت و مۆری و زەنگیانە و بازنۆکە و شووشەوات و گەلێ بابەتی شارستانی لەگوندان دەگەڕا و هاواری دەکرد.
دێوەرەبازن، دێوەرە خەناوکە: دێوەرە... دێوەرە بەهێلکە و خوری و گەنم و جۆی دەگۆڕینەوە. ناوەکەی لە هاوارکردنەوە هاتووەوە.
- دێم کێشان: دەم دان.
- دییاتە: دایکی تۆ: داکی تو:
دییا من: دایکی من.
- دێن: بێن: تێن.
- دێنەوە: بێنەوە: تێنەوە.

# ر

- پیتی (ر) لەزمانی کوردی دوو جۆرە دەنگی هەیە:
١- ڕێی ناسك: ڕێی سڤك.
وەك (دار، بار، کەر).
٢- ڕ: رر: ڕێی گەورە: ڕێی قەڵەو: ڕێی ستویر.
٣-بەپیتی (ل) دەنگ گۆڕکێ دەکات وەك.
دێمەکار: دێمەکال.
گەروو: گەلوو.
گەری: گەلی.
سار: سال.
مار: مال.
خار: خال.
- ڕا: ١-ڕەئی.
٢-ڕێگە: ڕاگـە: ری: ڕێ: ڕێنگـا: ڕێـنگ: ڕێگـا: ڕێگای جۆری زۆرە
١-شوێنی ڕۆیشتنی پیادە.
٢-شوێنی پێدارۆیشتنی ئوتۆمبێل.
٣-مارەڕێ: ڕێگای تەسك و باریك لەدەشتایی.
٤-بزنە ڕێ: ١- ڕێگای تەسك و باریك لە ناوچیا. ڕێ بزن پێدارۆیشتن لە چیادا.

٥-ڕێباز: ڕێگای سەختی ڕێرەوی مرۆڤ.
٦- ڕانەڕێ: ڕێگای ڕان و ئاژەڵ.
٧- کۆرە ڕێ: ڕێگایەك هاتوچۆی بەسەردا نەمابێ.
٨- ڕێ باریك: دژی ڕێی پان و بەرین.
٩- ڕێی ناخۆش: دژی ڕێی خۆش.
١٠- ڕێی دوور: ڕێگای دوور.
١١- پێوەرە بۆ هەر ڕێگایـەك نـاوی ئـەو شـوێنە وەردەگرێ کە بۆی دەچێ. وەك:
ڕێی کۆیە، ڕێی شەقلاوە، ڕێی ڕانیە.
١٢- کاروانــە ڕێ: ئـەو ڕێگایـەی کـاروانی پێـدا دەڕوات.
- ڕائەسپاردن: ڕاسپاردن.: ڕائەسپاردە: ڕاسپاردە.
- رابـاردن: رابواردن.
- ڕابردی: ڕابردوو.
- ڕابوون: ١-ڕاپەڕین: ٢-هەستان: هەسان.
- رابوونی فەرمان: واتـە قـەتل و عـام لـەزەمانی سـولتانەکانی عوسمـانی دەرچـووە بـۆ لـەناوبردنی یەزیدییەکان.
- رابن: هەستن.
- ڕابە: هەسـتە: هەڵسـە: بڵندبـە: ٢- سـووکەڵە ناوی رابیعە.
- ڕابەر: ١-ڕاهبەر: ڕێبەر: ڕانما: پێشەوا: ڕابی: - ڕەبلەل: ڕێ نیشاندەر: ڕێنووین:
٢-ناوی کوڕانە
- ڕابەری: ڕێبەری: ڕێ نوێنی.
- ڕابەری کردن: ڕێ نووێنی کردن.
- ڕابیعە: ڕابە: ڕابۆ: ڕابی: ناوی کچانە.





- ڕاپەڕین: ڕابوون: ڕاچەنین: ڕاچڵەکین:
١-ڕاست بوونەوە لەپڕ.
٢-هەسـتانەوەی جـەماوەر بەرامبـەر ڕژێمێکـی چەوسێنەر و لەناو بردنی.
- ڕاپەڕینی فکری: بزووتنەوەی فکری.
- ڕاتوو: ڕاتووە: ڕاتبە: ڕۆژانە.
بەو خەرجیانە ئەوترێ کە ئەدرێ بەهەژاران.
- ڕاجفرین: ڕاچەنین: ڕاچڵەکین.
- ڕاچاوکردن: ڕەچاوکردن.
- ڕاخستن: ڕاییخستن: ڕاهێشتن.
- ڕادکـانی: ڕێکـانی: هۆزێکـە لـە ئامێـدی نیشتەجێن لەسەرەتادا ناوی هۆزەکـەیان (ڕادکـان) بووە ئێستەش ڕێکانی پێدەڵێن.
- ڕاڕا: دوودڵ: گومـان: دڵاودڵ کـەر: دەمـدەمی: واژی واژی.
- ڕاز: سر: سوڕ: نهێنی.
- ڕازان: نووستن: خەوتن: هەڵاژان: ڕاکـشان: ڕاژان: نڤستن: ڕاکەتن: خەفتن: ڕاژیان.
- ڕازاندن:
نواندن: خەواندن.
- ڕازاندنەوە: خەملاندن.
- ڕازپۆش: سرپۆش: نهێنی نەدرکێن.
- ڕازەر: نوستی: خەوتوو.
- ڕازی: ١- بخەوە: بنوو: بنووە ٢-قایلی.
- ڕازیا: ١- قایلە: ٢-ڕازاوە.
- ڕازیانــە: زیــرەی شــیرین: ڕەزیانــە گیایەکــە گوڵەکەی وەکو چـەترواییە سـپییە بەرەکـەی وردە

سـەوز و بـۆن خۆشـە ڕۆنێکـی بـۆن خۆشـی لێ دەیگیرێت دەکرێتە عەرەقەوە.
ڕازیانە ڕازیانە
هەرگوڵە بەریحانە. (فولکلور)
- ڕازی ناوی: ڕازی نابێ: ڕازی نابێ.
- ڕاژیاگ: ڕژای: ڕژاو.
- ڕاژی: ڕازی: لاواز: زەعیف: ڕەقەڵە: ڕەقە: باریکە.
- ڕاسـت: ١-مەقامێکــە لــە مقامــەکانی ڕۆژهەلاتی و عیراقی و مەقامێکی سەرەکییە ئەم مقامەش وەکو مقامەکانی تـر مقـامی فەسـلی لەگەڵ دەگـوترێ بـە مـەرجێ لـە سـەرەتادا بـە مقــامی راســت دەســت پــێ بکــات لقــە مەقامەکانیش بە دوای خـۆیی دەوتـرێ ڕاسـت و مەقامــەکانی ئەمانــەن (ڕاسـت-مەنـسوری- حیجازی- شەتیانی- جبوری- خانەباد).
٢- بێ پێچ و پەنا.
٣- ڕاستەوخۆ.
٤- دەمو دەست.
اس: ڕاسپاردن: ئەسپاردن.
- ڕاست دەبێتەوە: هەڵدەستی: مەخێزو.
- ڕاست گۆ: ڕاست بێژ: ڕاست کـار: ڕاسـت وێـژ: ڕاست کار: ڕاست ڕۆ.
- ڕاست وەبە: ڕاست بەوە: بڵند بە.
- ڕاستە بازاڕ: ڕاسە بازاڕ: ناوبازارڕاستەوخۆ.
-ڕاستەوڕاست: ڕاستەوڕێ: ڕاستە ڕێ:
١- بەبێ لادان:
٢- بێ گرێ و قۆرت.

- ڕاسقی: گوڵێکە پەڕەکانی سپییە و شەش پەڕ و کۆیە لاسك نەرمە بێ دڕکە بۆنی هەیە ماڵییە.
١-بۆ جوانی بەکار ئەهێنرێ.
٢-عەتری لێ دەرئەهێنرێ.
ڕافدی: جوولەکە.
- ڕاگەیاندن: ڕاگەهاندن: هەواڵدان.
- ڕاگرتن: وەستاندن: ڕاوەستاندن.
- ڕاگا: ڕێگا: ڕێ.
- ڕاکەتیە: دخەو دایە: نوستییە: خەوتووە.
- ڕاکرن: هەڵساندن: هەستاندن.
- ڕالێبون: پەسندکردن.
- ڕاموسان: ماچکردن: ڕامووسین: ڕامیسیان: ڕامیسین:
- چاوڕەش بینە ڕاتمیسم گوناح بەملێ کورێکا.
- ڕامووز: ماچ: ڕامووس.
- ڕامەن: ڕامە: دەسەمۆیە، ڕێگامە.
- ڕان: ١-ڕەهەن: ئەندامی لەشی بوونەوەرە سەرەوەی چۆکی.
٢-مێگەل.
- ڕانك و چۆغە: ڕانك و چۆغەل: لەقوماشی تەنك وەیا لە (کر) دروستدەکرێت، ڕانك ئەگەر (کر) بێت لە (١٢) بەر دروستدەکرێت هەر بەرێك (٠,١٦٥)م بەرینە لەشێوەی هەڵبڕینەوە وەك دەرپێی درێژی زەلامان وایە، (چۆغە) لە(١٠) بەر دروستدەکرێ هەموویان پێکەوە دەدروێن لەبارەی هەڵبڕینەوە پان و پانە وەك کراس پشت ملی کورتە.

- ڕاکە: ١-دەربکە: ٢-هەڵێ.
- ڕاکرن: بێدارکردنەوە.
- ڕاو: ڕاڤ: نێچیر.
هەوڵدان بۆ گرتنی گیاندار یا کوشتنی لەدەشت و دەر، بەپێی وەرزی ساڵ ڕاو جۆری زۆرە وەك:
١- ڕاوی بەتفەنگ.
٢- ڕاوی بەتانجی و توولە.
٣- ڕاوی بەتەڵە.
٤- ڕاوی بەداو بۆ کەو گرتن.
٥- ڕاوی بەتەپکە بۆ کەو گرتن.
٦- ڕاوی بە چریش.
٧- ڕاوی بەدێوجامە.
- ڕوا: ١-شین بوو: ٢- ڕۆژان.
- (ڕواس: ڕێوی).
- ڕاواندن: وڕێنەکردن: هورێنە کردن:
قسەی پڕوپووچ بەتایبەتی لەلایەن نەخۆشەوە.
- ڕاو بەتاڵ کردن: لە گرمەی ڕاودا واز لە ڕاوهێنان.
- ڕاوبەسترای: بەوڕاوە دەگوترێ کەڕاوچی دەچنە ڕاو هیچ نێچیرێك ناگرن.
- ڕاناکا: بڵند ناکا: هەڵنایێ.
- ڕاناکم: ناڕاکم: هەڵێناگرم.
- ڕاناکی: ناڕاکەی: هەڵێناگری.
- ڕاناکە: ١-ناڕاکەت: هەڵێناگرێت:
٢- هەڵ نایێ.
- ڕاناکین: ناڕاکەی: هەڵێناگرێ.
- ڕاونان: ڕاوەدونان: شوێن کەوتن.
- ڕانما: ڕێنوین.





- ڕالێنەبوون: پەسندنەکردن.
- ڕاوچی: ڕاویار: کەژەوان: نێچیروان: نیچیرڤان: ئەوەیە ئەبێ زەلامێکی گورج و گۆڵ و چالاك بێ، نەخۆش نەبێ، توانای گەڕانی زۆر بێت شارەزای ئەو ناوچەیە بێ کەڕاوی لێ دەکات، هێمن و لەسەر خۆ بێت، بەتایبەتی لەکاتی ڕاو و لەپارێزی نێچیر دابێ بێ دەنگ بێ شوێنی نێچیر لە دوورەوە نیشانبکات نیشانچی باش بێت.
ڕاودالەستان: سەرەتای گەڕان لەو شوێنەی کە دیاری کراوە بۆ ڕاوکردن بە دوای نێچیردا.
- ڕاوڕەسم: ڕێی و ڕەسم: عورف و عادت.
- ڕاوکردنی ڕێوی: ڕاوکەر بەتانجی و تولە و سەگ و بەتەڵە دانانەوە بەتفەنگ و بە دەرمانی ژەهراویش ڕاوی ڕێوی دەکرێت.
- ڕاوکردنی گورگ: واتە گورگ ڕاوکردن ئەویش بەم شێوەیەش یەکەم جار ڕاوچی سەی دڕی تێ بەردەدەن تامانەدوو دەبێ ئینجا بەتفەنگ لێی دەدەن چونکە گورگ زۆر چاو قایم و چەپووکە یان کەلاکی تۆپیو دێنن گورگی دێتە سەری ئینجا بە تفەنگ دەیکوژن.
- ڕاوکە: باڵندەی ڕاوی ئەو باڵندەیەی دەخرێتە شوێنی بەرز بۆ ئەوەی بخوێنێت و ڕاوی باڵندەی تر بکات وەکو کەو.
- ڕاوکەر: ڕاوچی
- ڕاوگە: شوێنی خۆحەشاردانی ڕاوچی لە کاتی ڕاوکردندا.
- ڕاوێژکەر: ڕاوێژکار: پرس پێکراو: تونك

- ڕاو لەسەرگێڕانەوە: گەیشتنە نزیك نێچیروبەرووداگەڕانەوە.
- ڕاوو ڕووت: ڕاوەڕووت.
- ڕاوەستان: وەستان: وێستان: هەڵوەستان: ویستان: لاگرتن: هەلوێستە: ڕاگیران: مەدران: مداری: سەنگرانەوە.
- ڕاوەستە: بوەستە: ڕاوە: ڕاوەستێ: بوەسە:
بوەسە جەردە داوییە لەزەوار
(فۆلکلۆری گەرمیان)
- ڕاوەك: تازیە: تۆربەی.
ماستی تێداخەست دەکرێ.
- ڕاوەکەروێشك: واتە کەروێشك ڕاوکردن، لە ئاخری پاییزەوەیە تا هەندەك لە بەهارا ئەروا دەکرێت.
- ڕاوی خۆش: نێچیربە ئاسانی کوشتن.
- ڕاوی شەو: شەوڕاو: شەوارە: ئەم ڕاوە بەشەوی بەهار دەکرێ بەمەرجێك هەور بێت بۆ ئەوەی ئاسمان تاریك بێت دەبێ ڕاوچی چرا یان لایتی بەهێزی پێبێت، جاچرا یان لایت لەبن پنچك و بن بەردان دەدات پۆڕ یان کەو کە رووناکی پێ کەوت چاوی هیچ نابینێت ڕاوچی دەگاتە سەری کەو یان پۆڕەکە دەگرێ یا بە دارێك بڵندەکە دەدرێت و دەگیرێت.
ڕەببی شەوارەو لێ دانێن بە داووبگرن
(تحفە-٢- ل١٣١)
- ڕاوی ناوچە: جۆرێکە لەڕاوکردنی ئاسك لەکاتی بەهاردا ئەبێ، چونکە لەبەهاردا کاتی جووت بوونە

مەستییەك روویان تێ ئەکا هیچ ئاگایان لە خۆیـان نییە زۆر بەئاسانی ئەگیرێن.

- ڕاوی هاوین: واتە ئەو ڕاوەی لەهاوین دەکرێـت، بەڵام لای ڕاوچییان ڕاوی هاوین پەسندنییە.

- ڕاهێلم: ڕاپێچی بکەم.

- ڕایـەل: چـەند هەودایـەکی (فرێتـە) کـە پـۆی مافوری لەسەر دەنرێت فرێتەکە دەزووشی بێت.

- ڕایۆن: ناوچە.

- ڕاناو: زەمیر: کێشك: بۆناو: بەرناڤ.

وشەیەکە لەجیاتی ناوێك بەکار دەهێنرێ.

- ڕای: ڕێی.

- ڕایەخ: ڕاییَخ: ڕاخەر: ڕایخ.

وەکو بەرە و مافوور دۆشەك کەلەماڵەوە ڕاوێخـرێ بۆ لەسەردانیشتن.

- ڕپیە: ڕوپیە جۆرەپارەیەکی هندی بـوو یەکـسان بوو بە (٧٥) فلس.

- ڕجا: تکا.

- ڕجاکردن: تکاکردن.

- ڕجاگرتن: تکا گرتن.

- ڕدێن: ڕیش: رووه: ڕه: ڕهدێن: ڕەه: ری:

مووی دەرهاتووی ڕوومەتی پیاو.

- ڕدێن تراشین: ڕیش تاشین.

- ڕدێن سپی: ڕیش چەرموگ.

- ردێن ماش و برنج: ڕیشی سپی و ڕەش تێکەڵ.

- ڕدێنی ڕەش: مووی ڕیشی ڕەش.

- ڕدێنی قەڵەم کرای: ڕیشی بـاریکی شـانەکراوی سەرورووەمەت دەرهاتگ.

- ڕدێن نەهاتن: ڕیش نەهاتن.

- ڕدێن هاتن: ڕیش هاتن.

- رزگارکردن: دەربازکردن: قورتارکردن.

قورتارکردن: قوتارکردن: قولتارکردن: پەراندنەوە.

- رزد: بنی نهالی: ژێر دۆڵ.

- رزگار بوون: ڕایی بوون: بەرەڵڵا بوون: ئازادبوون: ڕاهی بوون: بەردلان.

- ڕژ: ڕژی: فەقیر: هەژار.

- ڕژیان: ڕژان.

- ڕساوە: بەربوو: وڵاغێك پەتەکەی لەسەری یا لـە پێـی دەکـەلی بێـت: وڵاغێـك لـە شـوێنی خـۆی نەجوڵێ.

- ڕست: قایشێکی دووسێ گەزییە، ئەڵقەیەکی تر، قایشە ئەخرێتە ملی تانجییەکە ئـەم قایـشە درێـژە سـەرەکی ئـەخرێ لەئەڵقەکـە و سـەرەکەی تـری خاوەنەکەی ئەیگرێ.

- ڕستکردن: ڕست خستنەملی تانجی.

- ڕستگار: ڕزگار: ڕسگار: قوتار: قورتار: قولتار.

- ڕستن: ڕێستن.

خوری یان موو یان لۆکە کردنە- داو بـە تەشـی یان خەرەك.

- ڕسم: ١-وێنە: شکل.

٢-جۆرێکە لەبەرد کە بەردوتاتە جووت و دوودە و هەرەکـەی لێ ناکـا، سـەری خاکەبنەکـەی یـەك تەختەبەردە هەڵناکەندرێ.

٣-نەریت: ٤-بریتییە لەجوان.

کچەکە ئەوەندە جوانە دەڵێی ڕەسمە.





- ڕسەر: ناوی سپیانی کوردییە ئەمەش دووجۆرە:

١- ڕسـە ڕشـین: ئـەو سـپیانەی کـە خورییەکـەی هەموو سپییە/ تەنیا لەکاتی ساواییدا دەم و چاو و ملی شینە، بەڵام کە گەورە بوو بە ئاستەم بـۆرایی ملـی دەمینـێ و دەم و چاویـشی مەیلـەو ڕەش دادەگەڕێت-(کەوی).

٢- ڕسەر زەرد: سپیانەی دەم و چاو و مل زەرد.

- ڕشـانەوە: هەڵهێنانـەوە: قـەی: قـەی کردنـەوە: هێنانەوە.

- ڕشت: مکوڕ.

- ڕشتەلەسەر: مکوڕە لەسەر.

- ڕشتن: ڕێشتن.

- ڕشتی گاسن: ئەوەیە کـە (بەرکۆڵـە) (سـەرخە) دەدرێتە بەینی مژانـە و باسـکەی هـەوجار لـەلای پشتەوە، دەمی گاسنەکە زیاتر ڕوو لەزەوی دەبێـت بۆ ئەم مەبەستە ئەبێ وڵاغەکان (دوورەگابن).

- ڕشك: هێلکەی ئەسپێیە.

- ڕفاندن: فڕاندن: ڕافانن.

- رفت: لەنگێزە: لێزمە باران: ڕەهێڵە: ڕەهێڵ.

- ڕفۆك: خۆ لەمردەی بێ هێز.

- ڕك: ڕق: قین: پشم: جەهر: ئالۆزی: دەغەز: پرۆشە.

- ڕك بەرکی: ڕقەبەری.

- ڕك لێبوونەوە: ڕق لێبوونەوە.

- ڕکەگرتن: ڕق گرتن.

- ڕکن: ڕق ئـاوی: ئـالۆزاو: بـەبوغز: قـین لـە دڵ: تورە: جەهرئاوی.

- ڕکەکار: ڕکەگر.

- ڕکێشە: گوڵێکە پەڕەکەی ورد و کۆمەڵە لاسـك نەرمە بێ دڕکە بـێ بۆنـە کێوییـە بـۆ گەیانـدن و دڕاندنی هەمموو جۆرە دوومەڵێك بەکاردەهێنرێ.

- ڕکێف: زەنگۆ: ڕکێب.

- ڕکێب کرن: ڕکێف کردن.

- ڕکێـف لێـدان: ڕکێـف لەتەنگـەی ولاغ دان بـۆ خێراکردن و بە تاوڕۆیشتنی: ئەسپ تاودان.

- ڕم: ڕمب: جۆرێکە لەچەکی شەڕکردن.

- ڕمان: واتا رووخان.

- ڕمای: ڕماو: ڕمبیاگ.

- ڕمبازی: ڕمبازێن: جۆرێکە لەیاری کوردەواری.

- ڕند: چاك.

وانارند: بهیست چ گلی عەلی.

(کۆمەڵە- ل٣٨)

- ڕنۆك: ڕنە: جنجڕۆك:

بەنینۆکی ڕێوی و گورگ و بەراز و پشیلە و سەقەڕ و هی تر دەڵێن.

- ڕنـوو: ڕنـی: کـەوی: ڕەنـی: کلێڵـە: ڕنـدوو: ڕندۆك: کلێڵە: ڕنوو بەفر: بەفری کەلەکە کـردوو باو ستی وا هێنابێتی.

ڕێیـان دەبەسـتێ بەبـەفر هـەموو لەبـەر پەسـاران هەڵدەنی ڕنوو.

(تاریك و رون- ل٧٥)

- ڕوح: ڕەوان: ڕۆح.

- ڕوح چون: ترسان.

- ڕوحال: ڕووناکی.

- ڕوح پەری: ڕوح سووك: ئێسك سووك.

- روح دان: ئاویلکەدان.

- ڕۆحی: روحی: بریتییە لە خۆشەویستی.

- روحەکەم: روحی: بریتییە لە ئازیزەکەم.

- ڕوانگەی گراوێ: جۆرێکە لە ساڵنامەی کوردەواری کە لە گوندی گراوە لەسەر شاخی داری لولکان دروست کراوە (مەلا عومەر) دروستی کەری ساڵنامەکەیە بۆ حسابی سال دایمەزراندووە. بەهۆی ڕێککەوتنی خۆر و ئەستێرەکان لەیەك دەرجەدا بۆ زانینی هەندیك ڕۆژی کاتی گرنگی ساڵ بەکاردێ.

- ڕوزی: ڕۆزی: ڕزق: ڕسق.

- ڕۆشەنبیر: ڕەوشەنبیر: ڕووناکبیر.

- ڕونن: دانیشن: بنیشن.

- ڕونیشتن: دانیشتن.

- ڕوووەش: رووخۆش.

- ڕووەکی شێتی: رووەکی هاری.

ڕووەکێکی ژەهراینە ئەگەر چوار پێ بیخوات تووشی نەخۆشی (شێتی چوارپێ)دەبێت.

- روهنکرن: ڕۆنکردنەوە: رونکردنەوە.

- ڕوی: ڕوو.

- ڕوی هورامان: ڕۆژی هەلاتن: لێرەدا -رو- واتە ڕۆژ+ هۆرامان واتا هەڵاتن.

- ڕۆیسی: چیپ لاق: ڕوتی: جل لەبەر دانەبوون.

- ڕوین: ڕۆن: ڕون.

- ڕۆ: ١-وشەی داخ و خەفەت .

قەسەم بەزولفی چین چینت وەی ڕۆ هەی ڕۆ.

٢-ڕۆژ: ڕۆز.

- ڕۆبون: ڕوبون: دەست دان:

پەلامار دانە شتی بۆ لێدان لەکەسێ.

- ڕۆبیان: کوللەی ئاوی.

- ڕۆچکاندن: ڕووتاندنەوە.

- رۆی: ١-رۆیشت ٢- رۆژی.

- ڕنین: لێ کردنەوەی میوە لەدار و سەوزە لە بڕکەکەی وەك تەماتە ڕنین، شفتی ڕنین، تەرۆزی ڕنین، خۆخ ڕنین.

- رنە: تەڕبوونی دەوار لە کاتی باران بارین تکەی ئەکا.

- ریش سپی: کەیخودا: گەورەپیاو: ری سپی: ریش جەرمگ: پیاو ماقول.

مرۆڤی زانا و دانا پیاوچاك و چاکە خواز کەچارەسەری تەنگەچەڵەمەی خەڵك دەکات.

- رووخان: ڕمان: تەپین: هەڕمان: هەڕفتن: هەرەڤان: داتەپین: تەبق بوون: ڕمین: دارووخان: هەرمین: هەرفتن: هەرەفتن: ڕامیاو: ڕمیاگ.

شوێنی بەرزکە رووخاوەوە بۆ خوارەوە هاتووە.

- رۆچنە: کولاوکە: ڕۆژنە: کلاورۆژنە: کولاوکە: ڕۆژەنە: کولانچکە: رۆزنە: کولانکە: کونێکە لە ناوەڕاستی بانا بۆ رووناکی و دووکەڵ لێ دەرچوون ئەهێلیرێتەوە.

- رۆجیار: ١-رۆژگار: ٢-رۆژ: خۆر.

- ڕۆح بردن: ترساندن.

- ڕۆح چون: بریتییە لە زۆر ترسان.

- ڕۆخە: ١-لێوە: قەراغە.

٢-لای دەرەوە (پێ)ی جەنجەر بە سەری دادەسورێتەوە.





- رۆدان: رادان.

ئەز نکارم بکەڤم ئاڤێ، ئاڤی من ڕۆداییە.

(کۆمەڵە- ل١٤٧)

- ڕۆدە: ڕۆدان: پەنجەرە.

- ڕۆزمز: ئەو بڕە پارەی کە لەیەك ڕۆژ وەردەگیرێ لە بڕی کارکردن.

ڕۆزی: رسق.

- ڕۆژ: ڕۆ: روج.

- ڕۆژانە: ١-هەموو رۆژەك: ٢-جیرە.

- رۆژئاڤا: ڕۆژئاوا: رۆژاوا: خۆرئاوا: خۆرنشین: خۆرپەرش: ڕۆئاوا: هویر ئاوا: ڕۆژ لەسەر زەردەی.

١-کاتی ئاوابوونی ڕۆژ.

٢-بەشێکە لەرووکارە جوغرافییەکان وەك ڕۆژهەڵات: ڕۆژئاوا، باکوور، باشوور.

٣- بۆ کات دیاری کردن بەکاردێ وەك ڕۆژئاوای گەڕامەوە.

لەجێیەکی خەراپ ڕۆژمان لێ ئاوابوو: ئدیۆمە واتە لەشوێنی خەراپ لێمان قەوما.

- ڕۆژبا: ئەوبایەی بەڕۆژ هەڵدەکا.

ڕۆژ بایەکی گەرم لەپاش نیوەڕۆیەوە هەلی کردبوو.

(حەمەدۆك- ل٥٣٤)

- ڕۆژپەرست: بە کوردەکانیان وتووە. کورد ڕۆژی خۆش ویستووە، چونکە سەرچاوەی رووناکی و گەرمی بووە ئەمەش لەسەردەمی زەردەشت پێغەمبەر.

- ڕۆژ کوێری: نەخۆشییەکە تووشی مرۆڤ دەبێ و بە رۆژ چاوی نابینێ.

- ڕۆژەك نارۆژەك: ڕۆژ نا ڕۆژێ.

- ڕۆژنامە: غەزەتە: گازیتە: ڕۆزنامە: ڕۆژنامچە بڵاوکراوەیەکی ڕۆژانەیە دام و دەزگایەکی تایبەت دەری دەکات باس و ڕووداوی دونیا و بەتایبەتی ئەدەبی بەخەڵك رادەگەینێ. گەلی کورد زۆر لەمێژە ئاشنایەتی لەگەڵ ڕۆژنامە پەیداکردووە یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بەناوی کوردستان لەلایەن میقداد مەدحەت بەدرخان لە سالی ١٨٩٨ یەکەم ژمارەی لێ دەرچوو دوای ڕۆژنامەی کوردستان زۆر رۆژنامەی تر دەرچوون لە کوردستان و لەدەرەوە .

- ڕۆژوەرگەڕان: کاتی محەلی چێشتانی.

- ڕۆژەکانی تار: پێنج ڕۆژی تار: بەگوێرەی حسابی گراو بە گوێرەی کەلوەکانی ڕۆژانی ساڵ (٣٦٠) ڕۆژە یانی (٥) ڕۆژ (٤٨) دەقیقە و (٤٦) سانیە لە سالی ڕۆژ (الشمسیە کەمترە کورد بەم (٥) ڕۆژە کەمە دەلێن (ڕۆژەکانی تار) یان (٥) ڕۆژی تار)

- ڕۆژەك: ڕۆژێك: ڕۆژێ.

- ڕۆژەك لەڕۆژان: ڕۆژێك لە ڕۆژان.

- ڕۆژهەڵات: ڕۆژهلات.

- ڕۆژهەڵات ناس: خاوەرناس: ڕۆژهلات ناس.

- ڕۆژی شکاندن: ڕۆژوشکاندن:

بەربانگ کردنەوە لە ڕەمەزاندا.

- ڕۆستەم: ڕۆسەم: ١- پاڵەوانێکی کوردە کوری زال بووە. ٢-ناوی کوڕانە.

٣-ڕۆستەمۆك: بۆ سووك کردن و بچووك کردنەوە بەکەسێ دەگوترێ کە ناوی رۆستەم بێت.

- ڕۆمان: چیرۆکی درێژ.
- ڕۆن: ١- ڕوون: دۆن: ماددەیەکی خواردنە لە گیا دروست دەکرێت یان لەبەربوومی مەڕ دروست دەکرێت.
٢-ڕوون: ئاوێك لێل نەبێ ئاوی ڕۆن: ئاوی ڕوون.
- ڕۆنانە: جۆرێك بوو لە باج کە خاوەن مولّك لە ئاژەڵداری لادێی وەریدەگرت .
- ڕۆناهی: ڕۆنایی: ڕۆناکی: ڕووناکی.
- ڕۆنیشتووە: دانیشتووە: دانیشتییە.
- ڕۆنیشتن: دانیشتن.
ئەمن ڕۆنیشتمە لە مەجلیسی ئەو شێخانە.
(تحفە -٢- ل١٣٧)
- ڕۆنی کوردی: ڕۆنی خوماڵی: ڕۆنی خۆمان: ڕۆنی حەیوانی.
کەرەی چەند جارێك دەقرچێننەوە دۆو سرپاتی لێ دەگرن تاپاك و پوخت دەبێ.
- ڕۆنین: ڕوانین: نوارین: دیقەتدان: سەیرکردن: زەیندان: نۆرین: تەماشاکردن.
- ڕۆهاتن: ماندووبوون: ماندی بوون.
- ڕۆی : ڕوێ: ڕۆژێ: ڕۆژەك: ڕۆیێ.
- ڕۆین: ڕۆیشتن.
میر و مەلا حەسەن هەڵستان لێیاندا ڕۆین.
(تحفە-١- ل١٤٠)
- ڕۆیی: ڕۆی: ڕۆیشت
- ڕوو: ١-ڕووی: دەم و چاو. ٢-سەخت: ڕەق.
- ڕووبارە: چەم: چۆم: شەقە جۆگە: چا: ڕۆ: جۆبار: ڕوبیار.
- ڕووبارۆچکە: ڕووباری بچووك کە هاوینان وشك دەکات.
- ڕووبە: ڕبە: ئامرازێکە دەغڵ و دانی پێ دەپێورێ لە دار دروست دەکرێت دەکاتە (٩) کێلۆ.
- ڕووبەڕوو: بەرامبەر.
- ڕووپەڕ: لاپەڕ: ڕووپێل.
- ڕووت: ڕویت: قووت: زەلووت: ڕووتەلە: ڕووتە: بێ جل و بەرگ: ڕووت و قوت.
- ڕووتاڵ: ڕووگرژ: مچ و مۆڕ: ناوچاوترشاو: نیوچەوان گرژ: گرژ: ئاڵۆز: ڕووترش: تووش: گژ: تورشیاگ: مۆن: ناوچاوترشاو: دژ: دەم و چاو ترشای
ڕووت و ڕەجاڵ: ڕووت و قوت:
بێ جل و بەرگ و کۆنە لەبەر
ئەگەر چی بەڕاستی ڕۆت و ڕەجاڵ بووم
(تحفە-١- ل١٣٠)
- ڕوو ڕەش بیت: دوعایە بۆ سزادان بەکاردێ.
- ڕووخۆش: ڕووگەش: دەم بەپێکەنین: زاربەپێکەنین: دڵتەڕ: مشرەف خۆش: میرەوان: دەم بەخەندە: خەنول: دەڤ لەکەن: لێو بەیزە: ڕوو بەپێکەنین.
- ڕوودان: ڕویدان.
- ڕوورەش: ڕووسیا.
- ڕووس: عەروس: ئوروس: عرووس: وڵاتی سۆڤیەت.
- ڕووسوور: ١-بەوەفا:
٢-ئەمین: ٣-پاك:
- ڕووسەخت: ڕووقەیم: ڕووقایم: شەرم نەکەر.
- ڕووشان: ڕوویشان: ڕویشیان: داماڵان: برینداربوونی بە عاستەم.





- ڕوو شەت: ریشوەت: بەرتیل.
- ڕووکردن: ڕویکرن.
- ڕوولك: ڕویل.
- ڕووما: شکل: ڕەزا: ئێسك: ڕوخسار.
- ڕوومەت: لامچی: لام: ئەلیك: گۆنا: گۆنە: دێم: ڕوو.
لێوئاڵ گۆنائاڵ بۆم وەرە دەرکێ ڕەشماڵ.
(فۆلکلۆر)
- ڕووناك: ڕەوشەن: ڕۆشن: ڕوشە: پڕتیشك: ڕۆناك: ڕوون: ڕووەشن: ڕووناهی.
- ڕووناکی: ڕۆشنایی: ڕوونی: ڕووناهی.
- ڕوونە: ڕوونیشە: دانیشە: بنیش.
- ڕووی گوڵ: ڕوو جوان.
- ڕە: ١-ڕەگ: ٢-بە: (ڕەپێش: بەپێش).
٣-لە: (ڕەگەڵ: لەگەڵ).
- ڕە عەزری دەخشا: لەعەرزی دەخشا.
- ڕەبەن: ١-ڕاهیب: شکستە. ٢-ڕووت.
٣-بێ ژن: ٤-فەقیر.
- ڕەبەنۆك: ١-گیایەکی چیاییە: ٢-بێ ژن.
- ڕەپێش: بەپێش.
- ڕەپێش کردن: سنگ بردنەپێشەوە.
- ڕەپێش کەوتن: بەپێش کەتن: بەپێش کەوتن.
- ڕەپێچکدان: ڕاپێچدان: گرتنی کەسێك و بردنی.
- ڕەپکە: جۆرێکە لەنەخۆشییەکانی دەغڵ و دان باران زۆر دەبارێت زەوییەکە ڕەق و توند دەبێت و لچك و قەفی دەغلەکە دەگرێ و نایەڵێ زیاد بکات و کز دەبێ بەژن و گوڵی بچووك دەبێت.
- ڕەپێم دەنێ: ڕاوم دەنێ: دوام دەکەوێ: (ڕەپێم دەنێ بۆ بەندەنێ).
- ڕەپێنابوو: ڕاونابوو:
دەکەسی ڕاونابوو.
- ڕەپێ نان: شوێن کەوتن: دواکەتن: ڕێ کەوتن: بەدوکەتن: ڕاونان: ڕەتاندن.
- ڕەپێی ناون: ڕاوی ناون.
دەستەیەکی جەندرمە لەچیاکانی حاجین تا چوکوورا وا شکاندوەو ڕەپێی ناون.
(حەمەدۆك)
- ڕەپێنەر: ئەوکەسەی خەڵك ڕاودەنێ.
- ڕەباس: ڕەباز: پارچە زەوییەکی تۆکراو ئاو دەدرێت تا ئاوەکەی لەسەری دەبێت بە گۆم یا خەتە جۆتەکان پڕ ئاو دەبن و لەسەری دەڕوا جارجاریش ئەگەر باران زۆربێت زەوییەکە ڕەباس دەبێت ئەگەر ئاولەسەر زەوییەکە ڕابوەستی و مژینی.
- ڕەتاندن: تاراندن.
- ڕەت بوون: ڕابردن: تێپەرین: تەورین: تێپەربوون.
- ڕەتەبن: ڕەت دەبن: رادەبرن.
ڕەجابڕای: ڕەجال: هەژار: نەبوو.
- ڕەچەڵەك: ڕچڵەك: بنەچەکە: بنەچەك: نەژاد.
- ڕەحم: ڕوحم: بەزەیی.
- ڕەحمەت لە مردیت: دوعای پاداشت دانەوە بۆ مردووی کەسێ.
- ڕەحەت و سەحەت: رحەت و سحەت: دڵنیاوبێ غەم.
- ڕەخ: ڕۆخ: قەراغ: ڕخی گوندی: قەراغ ئاوایی.

- ڕەخش: ناوی ئەسپەكەی ڕۆستەمی زاڵە.
- ڕەزا: ڕوخسار: ڕەنگ و ڕوو.
- ڕەزاگران: خوێن تاڵ.
- ڕەزم: ١-جەنگ:
٢-هەرا.
هەر ئەو بەزم وڕەزمە مابوو.
- ڕەژوو: ڕەژیی: خەڵووز: ڕەژوی: زوخال: ڕەشایی: زوغال: زوخال: زووخال: زعال.
- ڕەژیم: ڕژیم.
- ڕەسیف: شۆست: پیادەڕێ: ڕۆخی جادان.
- ڕەســەن: ڕەگــەز بــاش: خانــەدان: وجــاغ زادە: ڕەگەزچاك: كابۆش: تۆرن.
- ڕەسەن بەدایك و باوك و باپیرانەوە.
- ڕەش: ١-سیاو: سیا.
٢-ڕەشانی مووڕەش.
٣-نازنـــاوی مـــــرۆی ڕەش (جەمالـــــە ڕەش، كەریمەڕەش).
٤- نەهامە تیو ناخۆشی (ڕۆژە ڕەش).
٥-عەلامەتی تازیە و ماتەمینی
ڕەش پۆش.
- ڕەشاد: ڕەشۆ: ناوی كوڕانە.
- ڕەشاشچی: ١-پڕبیژ.
٢-ئەو كەسەی چەكی ڕەشاش هەڵدەگرێ.
- ڕەشان: ئەو ئاژەڵەی مووداره و لەبزنـە: دەبێتـە سێ جۆر.
١-ڕەشـانی مـوو: ڕەشـانی مـوودار: زۆربــەیان شـاخدارن و شـاخیان خـوار و خـێچ و كەوانییـە بەدەگمـەن شـاخ قیـت و ڕاسـت دەبـێ ئـەویش هەورانییە دەبێتە دوو جۆر.
١-شامی یان حەمدانی.
٢-ڕەشۆكی.
٣-ڕەشانی مەرەز. ٤-ڕەشانی دوڕە.
- ڕەشبەڵەك: هەڵپەركێی هاوبەشـی پیـاو و ژنـان بەڵام چوونە ناو شایی دابی خۆی هەیە پیـاو دەبـێ لەپێشەوە بچێتە ناو شایی و ژن لەپشتەوە وا دەبێ بچێتە ناو شایی.
- ڕەشبۆز: ڕەش و سپی.
- ڕەشپوش: قەڵاخی بـوون: ئـەوەی خۆشەویـستی لەدەست داوە جلی ڕەشی لەبەر كردووە.
- ڕەشچونەوە: ڕەشكردن: شوینك ڕەشایی زۆر بێ.
- ڕەشداگیرسان: ڕەش هەڵگەران.
لەبەرهەتاوی ڕەش داگیرسان.
(حەمەدۆك- ل٩٤)
- ڕەشـكە: كاژیلیـا: زیـرەی ڕەش : سـیاولە ١- گوڵێكە پەڕەكـەی ورد و كۆمەڵـە و شـینە لاسـك نەرمە و بێ دڕكە بۆنی نییـە كێوییـە بـەتۆ زیـاد ئەكرێت لە كوردەواری بەكار دەهێنرێ بۆ :
١-ناوپەنیر.
٢-كەشك. ٣-ڕۆن.
٤-بۆ ناونان.
٢-پێكدێت لەلێك پێـچان و تونـد و بەنـد كردنـی داوەمووی ڕێسراوی، بـەڵام بەشـێوەی شـەڵتە وەك شیلیفێكی گـەورە وایـە بـۆ كاكێـشان لەتارمـەی جۆخین بۆ لەو دەوكادین بەكاردێت.





- ڕەشمـە: ڕێـشمە: قەراسـە و سـەركەڵەی سـەری ولاغە بۆ ڕاكێشان و گرتنی ولاغ بەكاردێت.
- ڕەش واش: ڕەش واژ.
- ڕەشـۆلە: ڕیـشولە: سـوێرو: ڕەشـۆكە: سـێروو: ڕەشۆڵی: ڕەشۆكە: سوێرو: گاوانی: هەزاردەستان.
- ڕەشەبا: بارەش: بایـەكی تونـد و بـەهێزە لـە وەرزی زستان هەڵدەكات مـاوەی هەفتەیـەك تـا دە ڕۆژ دەخایەنێ.
- ڕەشەتا: تاڕەشە: تایەكە لـە مێـشك و مـەغزی دەدات.
- ڕەشە چنار: درەختێكـە بەرەكـەی قووچـەكییە، توێكڵەكەی ماددەی ڕەنگی لێ دەردەهێنرێت.
- ڕەشە چوارشەممە: كۆتایی مانگی شـوباتە كـە ڕێكەوتی چوارشەممە ئـەكات لـەم ڕۆژە كوردەكـان ئاهەنگ ئەگێڕن خۆشی و شادی بـڵاو ئەكەنـەوە لەم ڕۆژەدا ئاژاوە و شەڕ نابێت ئەمە پێی ئـەڵێن (ڕەشە چوارشەمە).
- ڕەشە گـۆم: گـۆمی ڕەش: گۆمێكـە لەناوچـەی شەقلاوە خەڵكی ناوچەكە پێی دەڵێن (ڕەشە گۆم).
- ڕەش كێر: ڕەشكێل:
بەهەر كێلانێك دەڵێن كـە بـارانی پـێ نەكـەوتبێ لەدوای كێلانی لەكۆتایی باراندا كرابێ.
- ڕەشید: ڕەشۆ: ڕەشە: ناوی كوڕانە.
٢-ئازا: بوێر: دلێر.
- ڕەعنا: ١-گوڵێكە پەڕەكەی گەورە و ئەستێرەیی و ڕەنگاوڕەنگە لاسك نەرمە بێ دڕكە بـۆنی هەیـە ماڵییـە بـە تۆوزیـاد ئـەكرێت بـۆ جـوانی بـەكار ئەهێنرێ. ٢-ناوی ژنانە.
- ڕەعیەت: ژێردەس: بەردەست: ڕایەت: دێهاتی چینی هەژار و ژێر دەست.
ئیتر بەپێویستی نـەدەزانی هـەر ڕەعیـەتێك هاتـە دیوەخان...
(گەدا -ل١٤٧)
بۆی دەركەوت ڕەعیەتەكان سەرنەرمن.
(گەدا -ل١٤٧)
- ڕەفتەبار: پارە و یارمەتی بۆ كۆ كردنەوە.
- ڕەفش: ساپ: لاك
كەفرەكی پانە زارۆك پی دلیزن.
- ڕفعەت: ڕەعفەت: ڕەفۆ: ناوی كوڕانە.
- ڕەفیق: ١-برادەر:
٢-ڕەفە: ناوی كوڕانە.
- ڕڤاند: بەزاند: شكاند.
من ڕەوشی ڕەڤان: واتە ڕەوشیم شكاند.
- ڕەڤاندن: بەزاندن: شكاندن: ڕاونانی دوژمن.
- ڕەڤیا: بەزی: شكا: هەلات.
- ڕەڤین: بەزین: شكان.
- ڕەڤۆ: ڕەوە:
شاه ڕەڤۆیی هەسپا دابوو خانە..
(كۆمەڵە-ل١٨٧)
- ڕەقەن: ڕەقان: زەویەك: بەشی زۆری كەڤرییت.
- ڕەق هەڵاتم: ڕەق بوومەوە.
- ڕەقیب: هاو چاو: دووكەس.

یەکێکیان خۆش بوێ هەریەکەیان بەرامبەر ئەوی تر (ڕەقیب)ە لەشعری شاعیرە کلاسیکەییەکان زۆر بەکارهاتووە.

ڕەقیب هاری دیاری دا لەچاوی بەسەر یا خۆڵی مردوو بۆ نەبێژم.

(فایز- ئەدەب- ل٤٧)

- ڕەقیتە: پشت ئێشە: ئازارێکی دەمارییە لەبەشی خوارەوەی پشت.

- ڕەگ: ڕێ: ڕا: ڕەه: کوڕك: بێخ: دەمار: دامار: رغیز: کرۆك: بنج: پاتار: پاتاخ: پاتاك: رەك: ڕیشە : تەوەخووز: ڕه: ریشەی رەگی داران.

- ڕەگەز نامە: نەژادنامە: جنسیە.

- رەگەڵ خستن: لەگەڵ دان: وەگەرهێخستن.

شاگردێکی رەگەڵ خست. (تحفە -٢- ل١٥٧)

- ڕەگەل کەوتن: لەگەڵ کەتن

رەگەلی دەکەوتن خزم و براو یارە.

(تحفە-٢- ل٢٠١)

- ڕەگەز: بنچینە و ئەساسی و بن گەه دەگەینی

- رەم کردە: هەڵاتوو.

- ڕەنج: ١-زەحمەت: ئەرك: ٢-ناوی کوڕانە.

- ڕەنجاندن: تۆراندن: توڕەکردن.

- رەنج بەخەسار: سوودنەدیتن لەکارکردن.

- ڕەنجدان: زەحمەت کێشان.

- ڕەنج کێشان: زەحمەت کێشان.

زەحمەت دیتن: ئەزیەت دیتن.

- ڕەند: ئادەمیزادی رووخۆش و قسە خۆش.

- ڕەندی جۆخین: لەدوای پێ هاوێشتنە بن جەنجەر بەلای جۆخینەکە دەڵێن (ڕەندی جۆخین) لەکاتی قرشە هورد کوتیش هەریەکە.

- ڕەنگالە: کاسەڵەشینکە: ئەسپشینە: زەردەواڵە خۆر: کەنەسمە: کەندەسمە: هەنگۆچنە: هەنگە خۆر: خەنجەر باڵاٚ: ڕەنگە و ڕێژە: گروگاڵە: قاشقاژە: هەنگەوچنە: هەنگەچینە.

مەلێکی رەنگاوڕەنگی جوانە بە قەد ریشۆڵەیەك دەبێت.

- ڕەنگاوڕەنگ: نەخشین: ڕەنگین: رەنگدار: نەخشاو: هەمەرەنگ: رەین.

- ڕەنگ پەرین: ڕەنگ تێکچوون: رەنگ گۆڕان: رەنگ هەڵبزرکان: رەنگ سپی بوون.

- ڕەنگ زەرد: مرۆی نەخۆش رەنگی ئاسایی روخساری دەگۆڕێ و زەرد دەبێ.

رەنگ زەرد و هێزلێ بڕام

لەدووریت ئەی هەردووچاوم

- ڕەنگ شین و مۆر بوون: زۆر توڕە بوون.

- ڕەنگە: لەوانەیە: ممکین: مومکینە:

وشەی گومان کردن لەکارێك یاکردەوەیەك کە زۆر روون نەبێ روویداوە یان نە.

- رەوانبێژی: بەلای هەر نەتەوەیەك و لەهەر زمان و ئەدەبێکەوە دەکرێتە سێ بەش.

١-روونبێژی( البیان).

٢-جوانکاری( البدیع).

٣-واتاناسی (**علم المعانی**).





- ڕەوسە: جیز: سەرکۆی دەغل و دانەکەیە لەبەیانکردنی هوردەکە و جیاواز بوونەوەی لەکایە ڕەوسەبڕکردن: بریتییە لە بەشکردنی ڕەوسە بە (٥) بەش جۆ. گەنمیش دەکرێتە (٦)بەش وەك یەك، ئەم بڕکردنەش بۆ دیاری مافی سەپان و تاپۆی زەوی و زەکاتی خوایە.

- ڕەوسە سوور هەڵگەڕان: جێز دەرکردن: جێزسوورکردن: پاك کردن.

تارم دانەبەربا و کا و کۆت و لەگەنمەکە جودا دەبێتەوە تەنها دەغلەکە دەمێنێ.

- رەگەز دۆزی: (الجناس) جۆرێکە لە جوانکاری ئەوەیە کەدوو وشە یا پتر بێنێ لە رواڵەتدا وەکو یەك بن یا بەیەك بچن، بەڵام هەرەیەکەیان واتای تایبەتی خۆی هەبێت کە جودابێ لە واتای وشەکانی تر.

پیرەمێرد دەلێ (بە شەدەی لاروکراسی کەتان.

وەك مانگ (کەتان) جەرگیان ئەسووتان) وشەی (کەتان)ی دووجار هاتووە هەردووکیان لەرواڵەتدا یەك شتن، بەڵام لەبارەی ماناوە هەریەکەیان واتا و گوزارەیەکی تایبەتی هەیە یەکەمیان جۆرە قوماشێکە دووەمیان جۆرەگوڵێکە لەبەهاران دا لە دەشت و دەرا دەڕوێ.

- ڕەواندز: ڕوانز: ڕواندز: ڕواندوز.

شارێکە و ناوچەیەکە لە کوردستانی عیراق

رەەواندز: واتە قەڵای ڕەوان ڕەوان رەنگە لە ڕاوەندەوە هاتبێ بە ناوی ئەو شارەوە کە (ڕاوەندی) گەورەبنیاتی ناوە ئەوسا دەبێتە قەڵای ڕاوەند وێش دەچی (دزی رەوان) بێ ڕو: واتە چۆم، دز، دژ: قەلا: واتە قەڵای چۆمان.

- رەویە: رەوشت.

- ڕەوشت پاك: بەئەخلاق.

- ڕەوە: رەووگ: گەلی چارەوی: دەستە: مێگەل.

- ڕەهبەر: رابەر.

- ریپ: خاپ: فێڵ: حیلە.

- ڕیپکرن: فێڵکردن.

- ڕیپۆ: فێل باز: حیلەباز.

- ڕیچاڵ: بەر و بوومەکانی شیر، وەك ماست و پەنیر و ژاژی و کەرە... هتد.

- ریچ: ددانەچیرە: ددان قرمسان.

- ریس: ڕێس: خوری یان موویان

پەمۆ بەتەشی دەرێسن پێی دەڵێن (ریس).

ریسم لێبووە بە خوری.

(پەند)

- ریشدار: بەڕدێن.

- ریشوە: ریشول: داوی.

بارێکی لێواری دەسماڵ و چەمەدانی و شەدە و مشکی دەهۆنرێتەوە بۆ جوانی

- ڕیخ: ڕێخ: پیسایی چێل و گا.

- ریخە رەشە: جۆرە زەحیرییەکە ڕەنگی ریخەکە رەشە بەزۆری تووشی ڕەشان دەبێت و کوشندەیە کاتی خۆی چارەی نەبوو.

- ریو بیۆ: هۆ ڕێبوار,

- ریوی: ڕێوی: رۆڤی: ڕیڤی: ڕوواس: ڕەواس: رویڤی: هۆریشە: رورواسە: ڕۆڤی: رویڤی: هورێشە.

١-گیاندارێك زۆر ژیر و بەهۆشە، زۆر بەتەڵەكەباز ناوی ڕۆیشتووە، بەرزی باڵای ڕێوی (٣٨سم) ئەبێ و درێژییەكەشی (٩١سم) ئەبێ و كلكی پانی (١/٢م) درێژە ڕەنگی ڕێوی سوور و خاكی و ڕەشە چواردانی گیرەی هەیە، ددانی درێژی لەسەرەوەیە ددانی درێژی لەخوارەوەیە، بەڵام ڕنۆكی پێوەیە بۆ زەوی هەڵكەندن بەكاردێنی خواردنی مێروولە و مۆرانە و ڕاوی باڵداری بچووكیش دەكات كونی بۆ خۆی دروست دەكات (٢) تا (٣)م دەبێ.

٢- لەبەر فێڵبازی بە مەجاز بە پیاوی فێڵباز دەڵێن ڕێوی.

٣-پاڵەوانی چیرۆكی گیاندارانە لە چیرۆكی فۆلكلۆری كوردی.

٤-بووەتە ناوی گوند: گوندی ڕێویە.

- ڕێبوار: ١-ڕۆیار: ڕێرەو: ڕابگاو: ڕێوبار: ڕارەو: ڕێرەو: ڕۆیار: ڕاڕۆ: ڕێبگار: ڕێرەو: ڕێڕۆ: ڕێڤی: ڕیۆینگ: ڕیۆنگی: ڕبگار: ڕاگوزەر: ڕاویار: ڕشێدار: ڕێۆ: ڕیڤینگ: ڕێوەنگی: ڕێوەنگی.

ئەوكەسەی بەرێگا دەڕوات.

دەورێش ژی نانێ دگرەو بەرێ.
خۆد دەگوندەكی دی لەڕێ ڕێویەك.
ڕاستی وتێ (كۆمەڵە- ل١٥٩)
ڕێبوار و ڕێبوارەكەی ئەمنیش ڕێبوارم.
(فۆلكلۆر)

٢-ناوی كوڕانە:

- ڕێبیر: ڕێباز: مەبدا.

- ڕێتن: ڕیشتن: ڕشتن.

- ڕەوینە: جۆرێكە لەراوكردنی حەیوانی كێوی چەند كەسێك لەدەستەڕاستەكان خۆیان مەلاس ئەدەن و هەندێكی تر حەیوانەكان تەنگاو ئەكەن حەیوانەكان ئەكەونە بۆسەی دەستەڕاستەكان و ئەیان كوژن.

- ڕێحان: ١-ریعانە: ژیوان: ئەسپەرم: ریحان :ڕەیحان: رحان: ڕەحان:

گیایەكی هاوینەی بۆنخۆشە بۆ دروستكردنی مەی بەكاردێ، گوڵەكەی سپی یان پەمەیی و بۆنخۆشە.

ڕەیحانە ڕەشەی خۆمی پێ ڕەشكەم
لەدوای باڵای تۆ دڵ بەكێ خۆش كەم

٢-ناوی پیاوانە: ناوی كۆنی ژنانە.

- ڕەیحانە كیولە: گەڵایەكی تووكنە گوڵەكەی پەمبەییە لەدەم ئاوان شین دەبێ.

- ڕەیحانە پیرۆزە: ڕەیحانەی سلێمان.

جۆرێكە لە ڕەیحانە ئاوك و تۆوەكەی دەرمانیان لێ دروست دەكرێت.

- ڕێچكە بزن: توولەڕێ: كوێرەڕێ.

- ڕێخازی: هار.

- ڕێ دور: ١-بەئامانج نەگەیشتوو:
٢-ڕێگال دوور.

- ڕێز: ١-ریز: لەڕۆخ یەك:
٢-ئیحترام: ٣-وردە.

- ڕێزان: ١-ڕژاندیان:٢-وەرانی گەڵا: گەڵا ڕێزان..
٣-ناوی كچانە: ٤-ناوی گوندێكە لەكوردستان.
٥- وەك پاشگر ناوی چەمێكە لە كوردستان چەمی ڕێزان.





- ڕێژەوپیژە: شوشتنی قاپ و هیر بار.

- ڕێك: كۆك: ساز: دروست: تەراز: هنج: باخشت: بەسەروبەر: خنجیلە: لەبار: ڕێك و پێك: چۆیەیەك: پوخت: دروست.

- ڕێكی: خنجی: نەرێتی: شەمام: ڕێك و پێكی: كۆكی: بەسەروبەر: پوختی: دروستی: پوختەیی: دەباری.

- ڕێككەوتن: ڕێككەتن: پێكهاتن: ڕێل: ئاوارە: دوورە ولات.

- ڕێنجبەر: ڕەنجبەر: رینجەبر: ڕەنجەدەر: ڕەنجوور: ڕەنجكێش.

زەحمەتكێش: ١-بەو كرێ گرتانە دەڵێن كە بۆ كەسانی تر كار دەكەن بۆماوەیەكی دیاریكراو بەهەقێكی دیارە وەك(جووتیار، سەپان، بەرخەوان، گیشەكەر، شەغرەكێش، جەنجەڕوان، كارەوان).

٢-ناوی كوڕانی كوردییە.

- ڕێنشتن: لێ نیشتن.

بەرەبەرە تاغییەكان ترس و سامیان ڕێدەنیشت.
(حەمەدۆك- ل٥١٨)

- ڕێنی: ڕوانی: سەیركرد.

- ڕێورەسم: عورف و عادەت: ڕەسم نەریەت: داب: عادەت.

- ڕێواس: ڕێباس: ڕیۆچ: ریڤاس.

- ڕێوان: ڕێناس: ڕێزان: چاوساغ.

- ڕێوی فرۆك: جۆرێكە لەشەمشەمەكوێرە خوێنی ئادەمیزاد دەمژێت.

- ڕێوی بازی: بریتییە لەفێڵبازی.

# ز

ز: بەپیتی (س) جێگۆڕکێ دەکات.
گاسیکە: گازیکە.
- زا: ١- منالّی بوو: فەرخەی بوو.
- زات: غیرەت: جەسارەت.
- زات ناکا: جەسارەت ناکا: غیرەت ناکا.
- زاتدار: جەسور: بەغیرەت.
- زاخ: ١-شەب: ٢-غیرەت.
٣- لیکاوی ناو دەنووکی کۆتری مێیە ئەیدا بە بەچکەی.
- زاخدار: بەجەوهەر: بەغیرەت.
- زاخێر: زاخێران: زەوی قومەلان.
- زاد: ١-نان: ٢-زەواد: تۆشە : تێشوو.
- زادوەڵەو: زاوزێ.
- زارا: ١-زارێ : ناوی کچانی کوردییە.
٢-هەوای گۆرانی کوردییە.
ئەی وەی زارا گیان دیدەم زارا
شاهێدم بۆبدەن لەگولەی خەسارا
- زار:١-دەم: دەو:
٢-مۆر: لە یاری نەردین.

٣-ئامرازێکە وەك پاشگرێك دەچێتە سەر هەندێ ناوان و دەیکاتە ناوی شوێن وەك: گوڵزار: لانەزار: چیمەنزار: میرخوزار.
٤- دەرگە: زارگەلی: واتە دەرکی گەلی.
- زاربچووك: دەم کچکە: خەنچە دەم.
- زارب زار: دەماودەم: زارگوتن.
- زاربلاو: زارشر: بریتییە لەوکەسەی قسەی لەلاگیر نابێت.
- زاربۆگەن: دەم گەنیك: دەو بۆگەنی: بۆونێکی زۆر ناخۆشە وەك بۆنی بۆگەن بوونی خواردنێك لەدەمی هەندێ کەسەوە دێ ئەمەش لەئەنجامی ئاوسانی قورگ یان مەعیدەوەیە.
- زاربوونەوە: دەوکرانەوە: وەقسەهاتن.
- زاغە: زاخە: ژوورێکە وەکو ژێرزەمین وایە، لە ژێر زەویدا لە کوێستانان دروست ئەکرێت بۆ ئاژەڵ حەوانەوە.
- زار قایم: دژی زارشڕ.
- زارك: زار: دەرگا: دەرکە: دەرك.
- زارکی گەلی: زارگەلی: دەرگای گەلی.
- زارکەبۆ: لای والالە کەرخاوی زەوی تووتن کە (بۆوا) ئاوی لەم زارکە والآیە وەردەگرێ.
- زارکی سەرچاوە: شوێنی: سەرەکی کەئاوی سەروچاوەی لیّ هەلدەقولێ.
- زارکی کۆلانی: سەری کۆلانێ.
- زارگەلی: دەرکی گەلی: سەرەتای چوونە ژوورەوەی: زارکی گەلی لەگەلیدا.
- زارنەکردنەوە: قسەنەکردن.





زاروتی: مندالّی: منالّی.
- زارۆ: زارۆك: مندالّ: مندار: منالّ: بەچکە: زارۆلە.
- زارونن: بچووکن: کچکەنە.
- زارنج: زارك: دەرك.
- زارۆتی: منداری: مندالّی: منالّی.
- زاروشك بوون: دەوهیشك بوون: زۆرتینووبوون.
- زازا: ١-زاز: ناوی چەند ئێلەکی کوردە پێشان ناوی وان (دومل-دونبل) بووە بەلاّم لەشێوەی (دوملا) گەلێك پیتی (ز) بەکاردەهێنن ناوی وان بووەتە (زاز-زازا) لەسەرەتادا لەراژۆری کوردستانی ئێران و تورکیا بوون، بەلاّم ئێرۆ لەرۆژئاوای دیاربکر.
٢-بن لەهجەیە لە کرمانجی سەروو.
- زاق و زیق: زاق و زووق: زاق و زریق: زاك و زووك: زاق و زووق: زاق و زیق.
گریان و هاوار کردنی منالاّن.
- زاك و ماك: مێگەلێکە کار و بەرخیشی لەگەڵ دابێت.
- زاری بلباس: بریتییە لەو بن لەهجەیەیەی کە بلباس پێی دەدوێن وەك ئەم عەشیرەتانەی خوارەوە (مامەش، مەنگور، پیران، سوێسنی، پشدەری، ئاکۆ).
- زازۆیی: بەهەموو ئەو کەسانە دەلێن کە بەشێوەی کرمانجی سەروو قسان دەکەن.
- زاخو: زاخۆ: شارێکی کوردستانە: ناوی زاخۆ لەوانەیە لە (ئازیاخۆ) وەرگیرابێ بەم شێوەیەی خوارەوە نووسەری ئارمی (ماریوحنا) لەکتێبی (داسنائی) باسی دەکات دەڵێت زاخۆ (ئازیاخو) کوری (دریاخو) کوری نوحی پادشای زاخۆبووە کورنەوەی بوونە پادشای زاخۆ بووە هەتاکو دەمی نیشابور نزیکەی (٨٠٠پ.ز) واتە زاخۆ لە (ئازیاخۆ) وەرگیراوە.
- زاراوەکانی خزمایەتی: بەو وشانە دەگوترێ کە مانای خزمایەتی دەگەیەنێ وەك.
١- داپیر.
٢- باپیر.
٣- دایك.
٤- باوك.
٥- پوور.
٦- خاتوون.
٧- خالّ.
٨- ئامۆژن.
٩- براژن.
١٠- پوورزا.
١١- ئامۆزا.
١٢- بن عام.
- زاراوەی هۆزەکانی لوری بچووك: بەوزار زمانە (شێوە)یە دەگوترێ کە لوری بنەڕەت پێی دەدوێن و بەمەش لوری بنەڕەت لەوانی تر جیادەکاتەوە.
- زاراوەی هۆزەکانی لوری گەورە: بەو لەهجەیە دەگوترێ کە هۆزەکانی لوری گەورە پێی دەدوێن.
- زالّم: ستەمکار: زۆردار: خوێن مژ: بێ رەزا: جەرگبر: خوێن مژ: چەپگەر: خۆرت: نەپرس.

کەسێ کە زوڵم لەخەڵك دەکات.

- زامەت: زەحمەت: ئەرك.

ماندووبوونی زۆر بۆ ئەنجامدانی.

- زانا: ١-دانا: چازان: زیرەك.

لێ زان.

٢-ناوە بۆ کوڕان.

- زانا پەروەر: زانا دۆست.

- زانج: ژەنگ.

- زاوا: زاڤا: زاما: زەما: زەعڤا: یەزنە: زاڤانگ.

١-کەسێ تازە ژنی هێنابێ.

٢-مێردی ژن دەبێتە زاوای: کەس و کاری ژن.

ئازاد زاوامانە.

زاوا لەبووکی مەدە دەڵێن لەبووکت داو.

- زاوبەندی: ١-زاوا ڕێوی: ئەو زاوایەی کەلەگەڵ ماڵی باوکی بووکدا دەژی.

٢-زاوارە

- زاوا چونەپەردە: کاتی شەوی یەکەم زاوا دەچێتە لای بووك.

- زاواڕە: کاتێك لاوێك دەیەوێ ژن بێنێ، بەڵام نەپارەی هەیە و نە خوشکی بۆژن بەژن لەجیاتی ئەمانە لەگەڵ ماڵێك ڕێك دەکەوێ کە بۆ چەند ساڵێك کاریان بۆ بکات لەجیاتی شیربایی جاکچکەی ئەدەنێ ئەمەپێ دەگوترێ زاواڕە.

- زایەڵە: زایڵە: ١-هاوار.

٢-گریان و شیوەن.

٣-دەنگی کاروان لەدوور.

- زاوزۆ: زاوزێ.

- زانینگەه: زانکۆ.

- زاین: زێدە بوون: زیادبوون.

- زبارە: دەستەوا: دەسەوا: هەرەوەرز: هەرەوەز.

ئەگەر کەسێ لەدورنەکردن دوابکەوتایە خەڵکی گوند دەچوونە یارمەتیدانی بەم یارمەتی دانەیان دەگوت (زبارە).

- زبارەی هاوپەرێزی: واڕێك دەکەوت دووچینە دورنەدەکرا هەریەك بۆ کابرایەك ئەو چینەی کەلە سەرەوە دورنەیان دەکرد چێشتانێ یانیورانێ لە دورنە دەبوونەوە دەهاتنە سەر پەرێز و تەبارەی جیرانەکەیان ئەو ماوەی لەڕۆژەکە ماوە دورنە یان بۆ ئەوان دەکرد بەزبارە.

- زبر: زوور: زڤر: دڕ.

- زبڵدان: زبڵگە: خەرابە: زبڵخانە: مەزبەلە: گۆفەك: سەرانگویلك: سەرەنگوێلك: گووفەك: شوێنی زبڵ فرێدان.

- زڕ: ١-نارەسەن: ٢-زەبەلاح.

٣-مناڵێك باوکی جیاوازبێت.

٤-بیژی: زۆڵ: بەبەچکەی کەمتیار دەڵێن بەمەرجێك کەمتیاری مێ لەگەڵ گورگ جووت ببێت و بەچکەکەیان لەخۆیان گەورەتربێت.

٥-ناشیرین:

- زڕبووە: ناشیرین بووە.

- زرار: ١-زەرەر: زیان: ٢-ناوی کوڕانە.

- زراسك: مناڵ.

- زراو: زەهلك: زیلك: زەندەق: هەترەش.

- زراوبردن: زەندەق بردن: هەترەش بردن: تۆقاندن.





- زراوچوون: زیلك رژان: زەندەق چوون.

- زڕباب: زڕباوك: باوەپیارە.

شووی دایك: مێردی داك: زڕتوو.

- زرێبار: ١-ناوی بەیتێکی کۆنی کوردییە.

٢-مەڵبەندێکە لەکوردستان.

٣-ناوی دەریاچەیەکە لەکوردستان.

٤-لەکۆندا شارێکی گەورەی کوردستان بووە.

- زرێدار: ئەو کەسەی زرێ بەردابێ بۆ شەڕ.

- زرتخانە: یاریگە: شوێنی یاریکردن.

- زرتەجۆ: زاڵم.

- زرتەی چاو هاتن: زەقی زەقی چاوهاتن.

- زڕداك: باوەژن: ژن باب.

- زڕەزڕ: زرنگ و هۆر: کەو کەوڕك.

- زرینگ و هۆر: زرنگە زرنگ: زرزیرە: زڕزڕە زرینگەی یەك لەدوای یەك.

- زرێ: زری: زرە: زرخ:

جۆرەکراسێکی کون کونی مێتاڵی بووە جەنگاوەرانی کۆن لەبەریان کردووە لەلێدانی شیر و تیر پاراستونی.

- زرێی داوی: جۆرێکە لەزرێ چاك کە حەزرەتی داود دروستی کردووە.

- زرگوز: زڕگوێز: دارێکی گەورەیە وەك دارگوێز، بەڵام گەڵای باریکە و بێ بەرە: ٢-ناوە بۆ سێ گوند.

- زریوە: جریوە: دەنگی کۆشکە.

- زرنگ: زرینگ: چالاك: قۆچاخ: گورج: وریا: چەلەپ: گوریزە: گیروفەن: چوست: تەڕدەست: ئازا:گورج و گۆڵ.

- زستان: زسان: جستان: ١-زمستان: زووسان: زسان: زەسان: زۆسان: زمسان: زوسان:زمسو: زڤستان

وەرزی دوای پاییز، وەرزێکی بەباران و ساردە.

زستان هات، بەرگی فەقیری دڕاند. (پەند)

٢-وەك پێوەرێك بۆ کات بەکاردێ پار زستانێ هاتەوە. ئەو ساڵ سێ زستان ڕۆیشتووە.

- زستانە پاوان: بەشوێنێ دەگوترێ کەزستانان لەوەڕی هەبێ بۆ مێگەل لەوەڕاندن.

- زستانە هەوار: زستانەوار: زمگە:

شوێنی خێلە سات لەزستاندا.

- زستانی سەرەوەشین: ئەو زستانەی لەسەرەتاوە دەست بەرهێڵە و باران دەکات.

- زستانی دواوەشین: بەو زستانە دەگوترێ کەلەسەرەتادا باران و بەفر نەبێ لەکۆتایی بەفر و باران بێت .

- زستانی سەخت: ئەو زستانەی زۆربە بەفر و باران بێت.

- زگ: ١-سك: زك: ئور: ئاشك: هوور: عوور: هورگ: ورگ: ئوچك: بەران: لەمە: لمە: لەم: گەهەگ: گەتگ: گەیە: خۆرگە:

ئەندامی ئادەمیزادە لە بن سینگەوە تا سەر میزڵدان.

نانی شوانی چ لەهوری چ لە توری. (پەند)

٢-گژ: دەچمەزگ: هاتە زگم: هاتە گژم.

٣-وەخت: لەزگبو بڕۆم.

٤-خەریك.

لەزگم تەواوی دەکەم: خەریکم تەواوی دەکەم.

٥-نازناوی پیاوی زگ گەورە.

- زگ پڕبوون: ١-تێرخواردن.

٢-بەناشەرعی منداڵ کەوتنە زگی ئافرەتی.

ئاووس بوونی ئافرەت بە ناشەرعی.

- زگ چوون: زکـە شـۆرە: زك رۆیـشتن: ئیزهـالی: تەقەفیرە: پەلەفیرە: ئیسحالی: زگە شۆرە: زگرۆین: زگە شۆڕێ.

- زگەڕۆ: چاوبرسی: زگ پەرست.

- زگ گەورە: هوورگەستوور: هورگن: ورگن: زگن.

- زگهاتك: گدگن: زگ هاتی: زگ گەورەبوون.

- زگ هێشان: زگ ژان کردن.

- زگی برسی: زگی نیز.

- زگی تێر: دژی زگی برسی.

زگی تێر ئاگای لەزگی برسی نییە.

- زلف: زولف.

- زلك: دەنك: قل.

- زلێخا: زولەیخا: زلێخ: زول: زولە: زەخ: زەخـۆك: ناوی ژنانە.

- زللـە: چـەپاڵە: شـەپاڵە: شـەقەزیلە: شـەقازلە: شەپ: شـەپلاخە: شـەپیلاغ: سـلە: سـیلە: شـەق: شەقەزلە: سلاك: شەقەك: بەدەست لەکەسێك دان.

- زمان: زوبـان: زوان: ئـەزمان: زمـێن: هـەزمان: زبان: زو: عەزمان: زمێن.

١-نـاوە بـۆ ئـەو پارچـە گۆشـتەبتەوە کـە لـەناو دەمدایە و دەستێکی درێژی هەیـە لەدروسـتبوونی مەخاریج و ئەو ترپانە کە پیتەکان دروشمی ئەون.

٢-ناوە بۆ ئەو ئاخاوتنەکە لەناو نەتەوەیەکدا بـاوە و ئەو نەتەوەیـە بـەهۆی ئـەو ئاخاوتنـەوە لەیـەك دەگەن وەك (زمانی کوردی، زمانی ئارامی: زمانی سانـــسکریتی، زمــــانی عــــەرەبی و زمــــانی تورکی.....هتد).

- زمان پشکوتن: زمان بوونـەوە: سـەرەتای قـسە فێربوونی منالان.

- زمان توژ: زمان پیس.

- زمــــان دەرکێــــشان: زمــــان هێنانــــەدەر لەبەرماندوویەتی یان تینوێتی.

- زمان زان: وەرگێڕ.

- زمان لەنگ: ئەوکەسەی زمانی باش گۆناکات و دەنگەکان بە دروستی دەرنابڕێ.

- زمان شیرین: قسە خۆش: دڵپاك: خۆشڕوو.

- زمان گیران: بەو کەسـانە دەگـوترێ کـەزمانیان زۆر بەزەحمەت (وشە) دەرئەبڕی پیتەکان ئـەگرێ و پیتی بۆ زیاد ئەکات وەك: ئێئەرری: ئەرێ.

براگگگیان: براگیان.

تتۆ: تۆ: خخخۆ: خۆ.

- زمانەیچك: تۆوی درختی بناو.

- زمان ناس: بەکەسێك دەگوترێ زمـان بناسـێت، لەزمانی خـەڵك بگـات، شـارەزای زمانیانـە یـان شـــارەزای زمانـــە و ئاگـــاداری دەســـتوور و زانستەکەیەتی.

- زمـانی ئـانزانی: بـەزمانی مـاددی ئاوێـستیان وتووە کە ریشە و بنچینەی زمـانی ئاریـایی کۆنـە کەبەباوکی هەموو زمانەکانی (ماد، هیند، پارس، عیلام) ئەژمێری نزیکەی سـێ هـەزار سـاڵ پـێش میلاد ئارییەکان بـەم زمانـە گفتوگۆیـان کـردووە لەپاشدا جیابوونەتەوە جیاوازی پەیداکردووە.

- زمانی بەرایی هینـدۆ- ئـەوروپایی: زمـانێکی کۆنە، کە بە بڕوا وایە لەهەزارەی پێنجـەمی پـێش زایینـدا بـاوی بووبـێ، پـسپۆران ناویـان لێ نـاوە زمـانی بـەرایی هینـدو ئـەورووپایی کـە (زمـانی هیندو- ئەورووپی) لقێکە لەزمانی بەرایی هینـدۆ ئەورووپایی پەرەی سەندووە.

- زمانە ئێرانییەکان: بەشێکە لە زمـانی (هینـدۆ ئێرانی) زاراوەی زمانە ئێرانییەکان مەبەستمان لـە کۆمەڵە زمانێکە، بەڵکو مەبەستمان لەو زمانەیـە کە لە چوارچێوەی کۆماری ئێرانیدا پێـی دەدوێـن، جـالێرەدا کۆمەڵـە زمانـەکانی ئێرانـی بریتییـە لەزمانێکی زۆری وەکو:

(کوردی، بلـوژی، سـوغدیانی، پـشتو، ئاوسـیتا، فارسی کۆن).

زمانی پارتی: زمانی خێلاتی ئاریایی (پارت)ە کـە لە خاکی خۆراسانی گـەورەی ئـەوێ لـە زەمانێـدا نیشتەجێ بوون لە ساڵی (٢٥٠)ی پێش عیساوە.

- زمانی کوردی ئـەدەبی یـەکگرتوو: بـەو زمانـە کوردییـــە ئەدەبییـــە یـــەکگرتووە دەگـــوترێ کـــە لەوشەکانی هەمووبن لەهجەیەکی و زمانی کوردی پێکهاتبێ و هەموو کوردێکیش تێی بگات.

- زانام: ١-دانام:

٢-زانیم.

- زانانش: زانیویە: زانینی.

- زانۆ: ئەزانێ: دەزانی.

- زانوو: ١-ئەزانم: دەزانم.

٢-ئەژنۆ.

- زمە: سەهۆڵ: بەفر.

- زمانی دەری: ١-زمـانی (دەربـاری) سـەردەمی ساسانییەکان بووە.

٢- زارێکە هەندێ پاکستانی و ئەفغانستانی پێـی دەدوێن.

- زمـــانی ئـــارامی: زمـــانی گاورەکانـــە کـــە لـــە ئنجیلەوە پەیدابووە چونکە ئنجیل بەپیتی ئـارامی نووسراوە بەزمانەکەشـیان وتـووە زمـانی ئـارامی کاری لـەزمانی کـوردی کـردووە و وشـەی زمـانی ئارامی تێکەڵ بەزمانی کوردی بووە.

- زمـــانی پەهلـــەوی: (ماکـــەی) ئـــەم کوردییـــە ئیستایە کەبووەتە زاراوەی (کرمـانجی و گـۆرانی و لوڕی و کەلوڕی) لـوڕیش لـەوانی تـر لەپەهلـەوی نزیـك تـرە، چـونکە لـوڕ کـەمتر تخـونی کلـدان و ئاشورییەکان بووە، لەپاش لوری کەلۆری و ئەو جار گۆرانی و لە پاشان کرمـانجی زۆریـان لەئاشـوری و کلدانی تێکەڵ بووە چونکە هاوسای یەکتربوون

- زمانی پارسی کۆن: بریتی بووە لە حەوت بـەش (پەهلـەوی- دوری- زاولی- سـەگزی- سـەگری- هەوری- پاشتوی).

- زمـان پـاراو: زمـان تیـژ: بـەزمان: وتـە ڕەوان: وتەزان: قسەزان: وتاردەر: شەهتووت: زماندار.

- زمانی سانسکریتی: زمانی پیرۆزی هیندوکانـە.

لقێکە لە زمانی هیندو ئەورووپی.

- زمانی کوردی: بەو ئاخافتنە دەوتری کە کوردەکانی کوردستان پێی دەئاخڤن لەلەهجەی جۆربەجۆر پێکدێت ئەو لەهجانەش دەگەڵ یەك فەرقیان هەیە، بەڵام هەموو لەهجەکانی کوردی یەك تاکە ڕێزمانیان هەیە. لەهجەکانیش ئەمانەن:

١- لەهجەی باکوور: ئەم لەهجەیە ورد دەبێتەوە بۆ چەند بن لەهجەیەك وەك (هەرکی- شکاکی- جەلالی (بایەزیدی)- هەکاری- بۆتی- جزیری- عفرینی- دومەلی- بادینی).

٢- لەهجەی ناوەندی: ئەمەش دەبێتە چەند بن لەهجەیەك، وەك (موکریانی- سۆرانی- سولەیمانی- گەرمیانی- جافی- سنەیی- گەرووسی).

٣- لەهجەی جنوبی: ئەم بن لەهجانەی دەگرێتەوە (کرماشانی- کەلووڕی- کولیایی- پیرەوەندی- لەکی و لوری).

- زمانی منالآن: بریتییە لەو ئاخاوتنەی منالآنی تەمەن دووساڵە و بەسەروە پێی دەدوێن وشە بەپێی گۆکردنی خۆیان ناو دەنێن وەك:

ئووفە: شیو: چێشت.

بەعە: ئاژەڵ.

عەعە: پیسایی.

بفە: خەتەر.

چەچە: دەست.

- زمانە: زوانە: ١-سەری دارێکی لەلە کراوی دادڕاوە بۆ ئەوەی (زبانە) بکرێت و بەکونی دارێکی تردا.

٢-ئاسنێکی باریکە لە ئاوزینەدا دەچێ بەکونی قایشا.

٣-بڵێسەی ئاگر.

- زمانە بچکۆڵە: پارچە گۆشتێکی باریکە لە قوڕگدا. لەزمان دەچێت.

- زمانەگا: گولڵزوانە: گاوەزوان.

-گیایەکە بۆ دەرمان دەبێت .

- زمانەوان: زمان ناس: زمان زان: زانای زمان.

- زمانەی هەوجاڕی: دۆندە: لقە کورتەکەی هەوجار گاسنی پێوە دەکرێ.

- زمە: شیشکە: جۆرە شیشێکە لەبن لوولەی تفەنگی ، تفەنگی پێ خاوێن دەکرێتەوە.

- زم هێر: دەسکەهاوەن.

- زمینی: ١-تاقیکردنەوە: ٢-تەجروبە.

- زنار: ١- تاوێری بەرز: ٢- ناوی کوڕانە.

- زنێر: شوێنی ناخۆش و عاسی لەچیادا.

- زنجیرەی جۆخین: بەوپێ هەڵدراوانە دەڵێن کەلە کاتی قرشە شکێن هەڵدەدرێتە وە بەلای دەستەڕاستی جۆخینەکەدا وەك لێوار دیوار دروست دەکات.

- زنجیرەی چیا: زنجیرەی کێوان: بەنی: بەن: ڕێزەچیا: سەفان: سەفین.

- زندان: سندان.

- زندی: زندو: زیندی: زێندی: ساغ: زیندوو: زیندی.

- زوو: زووی: گوژمە:سڤك: لەز.

- زووبن: زووکەن: لەزکەن: خێراکەن.





- زووبە: زووکە.

- زووتر: گوژمەتر: چالاکتر: گورجتر: بەلەزتر: خێراتر:

- زووزوو: خێراخێرا.

- زوحاك: ئەز-دەهاك: ئەژ دیهاك.

- زوورانەوە: برژانەوەی برین.

- زورگ: زۆرگ: زوور: زویرك: شکار: ڕەقەن: گردەلآن.

- زوڕنا: زڕنا: سڕنا: زۆڕنا: سۆڕنا: زورنە: زڕنە: ئامێرێکی میللی کوردەوارییە لوولەیەکی دارە، لای خوارەوەی وەك ڕەحەتییەکی ناوکلۆرە و لای سەرەوەی لوولەکەش پارچەیەکی داری دوو فلیقەی تێدایە پێی دەڵێن (نێرە) ئەم ئامێرە بە (فارسی) (سوڕنای) واتە (نەیسور)ی پێ دەڵێن و (زورنا)ش لەئەسڵدا وشەیەکی (تورکییە) هەر لەسەدەی چوارەدەهەمی (زایین)ەوەش ناوی بە (نەی سپی) و (نەی ڕەش) لەئێراندا بەکارهاتووە.

جۆری زورنا وەك : ١-زورنای عەرەبی: ٢-زورنای کوردی: ٣-زورنای بەسرە.

سیر بخۆ زوڕنای لێدە. (پەند)

- زورنا هەنگێو: زوڕنا ئەنگیو: زورناگێو: زورناچی: زورناژەن: زورنابێژ: زورنا واچ: زورناچی: زورناوات.

١-ئەو کەسەی زورنا لێدەدات کە دەم دەخاتە سەر پێکەی زورنا و فوی تێدەکات بەهەناسەوە دەست و پەنجەی هونەرییەوە، ئاوازی ساز و بەسۆز و بەستەی پڕ جۆشی دێنیتە ئاراوە.

٢-نازناوی ئەو کەسەیە کە دەیژەنێ.

خدر زورنابێژ.

- زویر: زیز: تۆرای: تۆراو: نەبان: نەواوون: ڕووپەڕ: تۆریاو: ئەنگر: دڵماو: سرك: غەیدۆك.

- زۆر: ١-فرە: گەلێك: گەلەك: زەوەند: زەبەند: زەف: زەعف: مشە: زەمەن: گەلە: زیبا: زاف: زەحڤ: زەحف: زەعڤ: زاڤ: زەمە: زەهڤ.

٢-خۆرت: چاڤ سۆری: پێستووری: ستەمکاری.

- زۆرانێ: زۆران بازی.

- زۆرپێ نەچون: زۆر گەڕانەوە.

- زۆرجار: پەریجار: گەلێ جار: گەلەك جار.

- زۆر دار: کەڵەکا: قانـدڕ: زۆرکار: دڵ ڕەق: لەخوانەترس: خوانەناس: کەڵەزەڕ: کەڵەزڕ: بێداد: ستەمگەر: ستەمکار: بێ بەزەیی: خوێنرێژ: زۆرکەر: زاڵم.

- زۆرداری: کەڵەگایی: کەڵەزەری: کەڵەزەڕەی: بێگار: بێدادی: خودرایی: چەوور: خورتی: چاڤسۆری: پێستووری: زۆردەستی: زەختی: زۆرەملێ: زۆرە ملە: زۆر: تۆبزی: گڕسەندن: نوودڵانە: دڵنەخوازانە: زۆرەملێ.

- زۆر زانا: زۆرزان.

- زووکە: زووبە: تالووکە بکە: دەی: پەلەبکە: دەسادەی: خێرابە.

- زۆڵ: ١-بیژی:

٢-زڕ: بیژی: بەبەچکەی کەمتیار و گورگ دەڵێن: گەلێك جار کەمتیار و گورگ لەکاتی بەکەڵ هاتن جووت دەبن.

- زولاڵ: ١-زەلال: بێ گەرد و ساف:
٢-ناوی کوڕانە.

- زۆڵە چەرم: زوێلە چەرم: زووێر: زیوێر: زۆل: پارچەیەکی درێژ لەچەرم.

- زوڵم: زۆر: ستەم: زۆرداری: خورتی: جەور: بێ ڕەزایی: بێ دادی: کەلەزەری.

- زۆنگاو: زۆنکاو: زۆنگ: باتلاخ: لیتە: زناو: زنەك: زەنەك: زێلاق: باتلاك: بەهناڤ: زجاو: قوپی: زەلکاو: ئاوگێر: قوپیە: گەناو: میزاو: مرداو: لۆن.
شوێنی ئاوی پیسی لێ کۆ بێتەوە.

- زەبت و ڕەفت: زەفت و ڕەفت: زاکون: قانون

- زەبرەقون: ئازارون.
نە ئەو نان و روونە نە ئەو زەبرە قوونە. (پەند)

- زەبوون: ١-بێ ئومێد: ٢-لاواز:٣-پەککەوتە.

- زەبەلاح: لەندهۆر: زەها: فێرس: قولّمانی: چەترەفیل: بەقەڵافەت: قەلافەتدار: بەرمۆك: زڕەمێر: شینە زەلام: زرتە زەلام: لۆزەندەر: لۆزەنگەر: مرۆی چوارشانەی بەژن درێژ.

- زەحمەت: زامەت: ناخۆش.

- زەخیرە: ئازووقە.

- زەدە: عەیب: خەوش.

- زەدەدار: عەیبدار.

- زەدارکردن: عەیبدارکردن.

- زەرتك: زەردۆیی: زەردی: زەردەیی: زەردی: نەخۆشییەکە تووشی مرۆڤ و ئاژەڵ دەبێت ناوچاوانی زەردەبێت.

- زەردۆل: زەردێکی ناسك و جوان.

- زەردەڵو: زەردالو: قەیسی: زەردلی: حەمری: شێلانە: مژمژە.
بەری داری قەیسییە میوەیەکی بەتامە وشکیش دەکرێتەوە بە (ترشە) دەیخۆن.
جۆرەکانی:
١- حەمری ئاڵ.
٢- حەمری زەرد.
٣- حەمری مشمش.
٤- حەمری سپی.
٥- حەمری بەگی.
٦- حەمری ئاودار.
٧- حەمری گۆشتن.

- زەردەواڵە: زەرگەتە: چز: شاندە لییك: سیو: زرکتك: - زەرگیتە: زلکیتە: بڤ: دەندە: زەردەزێڕە.

- زەردێنە: زەردێنك.

- زەرزەڤان: سەوزەوات.

- زەرەر: زیان: وەزن: وەزەند: زێون: وەی: خەبینەت: زرار.

- زەریف: ١-جوان: ژنەکی زەریفە.
٢-بەتام و خۆش: شیوەکی زەریفە.
٣-باشە.

- زەرنە قوتە: ساقە سۆر: ساقەتە سۆرە.

- زەردەشت: ئەسڵی وشەکە بە مانا تیشکی ڕۆژە بە زۆر جۆریش باسکراوە وەك زەردەشت: زەرتەشت: زراتەشت: زەراتوشترا: زەرتەشتر:





- زرادەشت: زانایان و دانایان بەناوی پیاوێکی حەکیم و پێشرەوی زانایی و دانایی ناویان بردووە و باسیانکردووە لەناوگەلە ئێرانییەکانا پایەی پێغەمبەرییەتی بووە، هەموو دەم بەمرۆڤێکی هەڵبژاردیان لەقەڵەم داوە ئاگادارییەکانی لەلایەن خوورەوشت و زانست و پزیشکی ئەستێرە ژمێری ئەستێرە ناسی سروشت ناس زۆر بەکەڵك بوو، سەرچاوەی شت لێ وەرگرتن بووە، ئایینەکەی لەئێران بەتایبەتی لەسەردەمی ساسانییەکاندا بوو بە ئایینێکی ڕەسمی لە سەدەی حەوتەم و شەشەم پێش میلاد بووە:

- زەردە خەنەی تفت: بزەی تال.

- زەرگ: ١-جۆرێکە لەچەکی کۆن.
٢-شیشکی نووك تیژە (٢٥سم) درێژ دەبێ سەری تری دەسکێکی خری پڵ پڵەداری پێوەیە دەرویش لە کوری زکرکردندا لەدەوی خۆیان رادەکەن.

زەری: ١-خانم و خاتوون.
٢-کچی جوان.

- زرێچە: زەریاچە.

- زەڕین: زڕین: زرزر: دەنگی کەرانیە.

- زەفت: زەوت.

- زەفت بوون: ڕاوەستان.

- زەفت کردن: زەوت کردن.

- زەفت نابی: ڕاناوەستی.

- زەعفەران: زەحفەران: زافەران.

- زەعیف: لاواز: کەم گیان: بێگریك: لەڕ: کەم داروبار: بێ دار و بار: زایف: بێ تین.

سیرمە: دالگۆشت: پۆت: بێ تووك: باریکە: کەم تین: تەشك: ڕەقەل: ڕەقە: ڕەقەلە: باریکە.

- زەعقی تەرزە: زۆرلاو.

- زەفەربردن: پەی پێ بردن: دەرفەت بۆ ڕەخسان.

- زڤران: زڤرین: گەڕانەوە: چەرخانەوە: بادانەوە.

- زەڤەر: چالاکی.

- زەکات: سکات: بریتییە لەو پارەیەی یان ئاژەڵەی یان دەغلەی کە دەدرێ بەهەژاران لەساڵێ جارێك بەم شێوەیەی خوارەوە:
١-کەئاژەل مێ گەل بێ واتە (٤٠)سەر بێت یەك سەر دەدرێتە هەژاران.
٢-لەپارەی هێشکە و سامان لە (١٠٠)دینار (٢,٥)دینار دەدرێت.
٣-بیستی دوو واتە لە بیست بەش دووبەش لە دەغل و دان دەدرێت بەهەژاران.

- زەل قین: پێوەنوسان.

- زەلام: ١-زل: گەورە: ٢-پیاو.

- زەلزەلە: زلّزلّە: هەوا: جۆرە کێم و ئاوێکە لە برین دێتەدەر.

- زەمانی زوو: قەدیم: کاتی خۆی.

- زەمەند: دەغل و دان یا گیا و گولێکی چڕ و ئاوگری لە پاڵ یەك.

- زەنبیل: زەمبیل.

- زەند: ١-ئەلف بێیەکی تایبەتە (ئازەر بوو مارسو پەند) لەخەتی پەهلەوییەوە دایهێنا (٤٢) نیشانە بوو کە بۆ پاریزگاری هەموو جورە دەنگێکی زۆر لەباربوو و سەرو بۆر وژێری بەپیت

بوو ئاوێستاشی بەوی نووسییەوە و ناونا (زەند) وبەخەتەکەشی دەگوت (خەتی زەند).

٢-ئەزەج: مەچەك: نەرشك: ئەوبەشەی قۆڵ کەلە نێوان باسك و دەستدایە.

٣-ناوچەیەکە لەکوردستان کە کەریم خانی زەند خەڵکی ئەوێیە. ٤-نازناوی کەریم خانی زەندە.

٥-ناوی کوڕانە.

٦-ناوی عەشیرەتێکە کە لە مەڵبەندی زەند دەژیا و کەریم خان سەرۆکی بوو.

- زەند ئاوێستا: زمانی پیرۆزی مەجوسان بووە و زمانی ئایینی کەونی ئێرانییانە و دەگەڵ زمانی سانسکریتیدا کە زمانی پیرۆزی هیندۆکانە خزمایەتی هەیە و زۆر وشەی ئەو دووزمانە لەڕیشەدا یەکتر دەگرنەوە.

- زەندۆر: زەندۆڵ: ئەو چاڵەیە کەباران لەزەویدا دروستیدەکا و ئاوێکی روونی تێدایە.

- زەنقە: زەنج: چەناگە:چەنەگە.

- زەندەق: زراو: جەرائەت: هێزی مەعنەوی.

- زەندەقبەر: بەسام: بەترس.

- زەندەق چوون: زراو رژان: زراو ترەکان: زارەترك بوون: زەرتلاقبوون: زاڵە ترق بوون: شیلاوك رژان: توقین.

- زەنگ: چیینگ: تەواش: زەنگولە: لەملی بەران و بەرخ دەکرێ.

- زەنگوولە: زەنگڵە: چلورە: زەنگورە

دارێکی بەڕوو یان گوێز بەقەد ئەستووری دار جۆت دەبێت و بازنەیەکی پێ دروستدەکرێت و سەرەکانیان تێك دەپەڕێن بەکاردێ بۆ: ١-گوریسی شەغرەی پێ دەبەسترێ: ٢-لەسەر دار زنجیر دەبەستریٚ لەگێرەدا.

- زەنگ و هۆر: زەنگ و قۆر.

١-زەنگولەی گەورە کەلەملی پێشەنگی قەتاردەکرا لەدوورەوە دەنگی دەبیسترا.

٢-لەملی بەرانیش دەکرا بۆ پێش مەڕی.

- زەنگەسۆر: ژەنگە سوورە: شەنگە سوورە: زڤرەك: زەرگەتە: سوورەپیاز: زەنگە زیرە: سوورەمۆز: سینلك: زەنگەزۆرە: زەنگە زیرە: گیانەوەرێکی رەنگ سوور و زەردە ژەهر دارە لەسەر پیسی دەژی.

- زەوال: دژمن و نەیار.

- زەوت کراو: زەفت کرای: داگیر کراو: داگیراو: داگیرای.

- زەوی: زێو: زەمی: ئەرز: دانگ: ئەرد: عارد: هەرد: بووم: خاك: بەژ: گنا: ئاخ زەڤی: عەرد: کاو: حەرد: حەرز: زەمین: زەوین: زەوو: زەمی: کاد: کەلاك: حارد: هارد.

١-کوڕەی زەوی، ئەو ئەستێرەیەی کە ئادەمیزاد لەسەری پەیدابووە.

٢-هەموو خاکی ولاٚتێك.

٣-هەموو زەوی و زاری سەربە گوندێك.

٤-تەختی ژوورەکانی خانوو.

٥- ئەوەندە عاردەی کەسێك هەیبێ لەدێدا بۆ تۆو کردن.





٦-ئەوندە عاردەی کەسێك هەبێ لە شاردا بۆ خانوو کردن.

- زەوی پێو: مەساح.

- زەوی خۆلە پەتان: زەوی نەرم.

- زەوی قاقر: زەوییەك کە هیچی لێ شین نەبێ.

- زەوی دێم: دێمەکار: بەژی: زەوییەك ئاوی نەبێ.

- زەوی بێ برشت: زەوی بەردەلاٚن کە دەغڵی باش نییە.

- زەوی سستەك: زەوی فشەڵ: زەوی فشول.

- زەوی بەراو: عاردی بەراو.

- زەوی فەریك بوون: بەکزربوونی زەوی دەگوترێ کە بارانی زۆر لێدابێت.

- زەوی وەقف: ئەو زەوییانەن کە دەقەبەڵ مزگەوت و قوتابخانە و پیاوە ئایینییەکان کراون و ئەو زەوییانە کڕین و فرۆشتنیان لەسەر نییە و هەرگیز وەستا دەستییان پێ ناکرێ.

- زەین الدین: زێن دین: یەزدین: یێزدین.

- زەهلە: هێزی مەعنەوی: زراو: زیلك.

- زەهلەبەر: ترسێنەر.

- زەهلەبردن: ترساندن.

- زەهلەچوون: ترسان.

- زەهمان: قەبر: گۆڕ.

- زەهی: خەسارەت.

- زەین: هش: هۆش: یاد.

- زەین دێ: تەماشاکە.

- زەین لێبوون: ئاگالێبوون.

- زەین کۆر: زوولەبیرکردن.

- زها: وشك.

- زهاکرن: وشکیان کردووە.

- زی: زەهە: ماڵ: زێ: جێزانی ئاژەڵ.

- زیادە: کورد زۆرجار لە ژماردن لەجیاتی ژمارە (١٣) دەڵێ زیادە.

- زیان: زەرەر.

- زیان کردن: زەرەرکردن.

- زیاندەر: زیانکار: تێکدەر: زیان خەڕۆ: زیانۆ: لەهاز.

- زیپکە: پیزۆکە: زیرکە: تشپۆك.

- زیت بوونەوە: لێ هەڵگەڕانەوە.

- زیخەلاٚن: زیخماڵ.

- زیروبەم: زیروبوم: زیل و بەم.

ناوی دووتێلی ئامیری موسیقا (عود)ە (بوم) ناوی یەکەم تێلی عودە. (زیر) ناوی چوارەم تێلە واتە (زیر و بەم) لە ناو شیعری شاعیرانی کورددا بەتایبەتی (کلاسیکی) زۆر هاتووە و ( زیل وبەم) یان (زیروبەم) گوتراوە.

- زیرەك: ١-ژیرەك: زرنگ: وشیار: ڕیێپێبەر: زێن: تێگەیشتوو: تێگەیشتی.

٢-نازناوی دوو گۆرانی بێژی گەورەی کوردە حەسەن زیرەك و قادر زیرەکن.

٣-ناوی کوڕانە.

- زیڕە: قیژە: زریکە.

- زیرگ: زیرگن: چڵکدار: پیس: بەچڵك: زووخ: گەمار: پۆخل: چەپەڵ: قرێژاوی.

- زیل: سەنج: تاج مەعرف.

سەننوجە: ئامێرێکی موسیقایە لەپۆلا دروست دەکرێت و لەدوو پارچەی وەك قەپاغی سەری مەنجەلّ پێکدێت لەدواوە داوێك یاخود قایشێکی بۆ کراوەتە ئەلقەدەستی دەچێتە ناو بۆ گرتنی ئامێرەکە، هەمیشە دەسکی کانزای هەیە و بەو هۆیەوە دەگیرێ بەکارهێنانی هەردوو پارچە ئامێر (سەنج)یش بەهۆی جوولاندنەوەی دژبەیەکی هەردوو پارچەکە لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەپێچەوانەدەبێ. ئەم ئامێرە یەکێکە لەئامێرەکانی (بەزم) بێ پێست.

- زیندرو: ئەوکەسەی زینی دروست دەکات.

- زیندەوار: زیندەوەر: مۆریان: جروجانەوەر بزۆر: کەزك.

- زیو: زێو: زیڤ.

- زیوان: خەربەند: گیایەکە لە ناوگەنم شین دەبێ گوڵی هەیە پێی دەڵێن (گوڵە زیوان).

دەنکی پەیدا دەکات و تامی تاڵە.

هەزار گوڵە زیوان بەواستەی گوڵە گەنمەکی ئاو دەخواتەوە. (پەند)

- زێد: زەید: نیشتمان: وەڵات: وڵات: مەفتەن.

- زێدە: زیادە.

- زێدەگاڤی: لەئەندازە دەرچوون.

- زێراب: زیراو: نۆین: ژێراو.

زین: ١-رەحال: ئامرازێکە لەسەر پشتی هەسپ و ماین دادەنرێ لەچەرم و تەختە دروستدەکرێت لەم بەشانە پێکدێت:

١-قەلتاغ: داری زین.

٢-قەلپووز: بەشی پێشەوەی زین.

٣-تەکەڵتوو: ئەو لبادەی بەرووی ژێرەوەی زینداەدروێ.

٤-خوانی زین: ئەوەندەی لەزین کەسوار لەسەری دادەنیشێ.

٢-ناوی دلبەری مەم بووە، مەم و زین.

٣-ناوی کچانە.

٤- زینو: زینۆ: ئەو ڕارەوەی بە نێوان دوو شاخی بەرزدا دەڕوات وەك:

١-زینی رایات: ٢-زینی ماخۆبزنان:

٣-زینی ئەستیرۆکان: ٤-زینی سەران، لە هەندێ شوێنی کوردستان لە جیاتی (زین) دەڵێن زینو، زینۆ:

وەکو زینوی شێخ، زینوی خەلان.

- زێ: چەم: لەسەرچاوەی ئاوی شاخەکان و ئاوی رووبارەکان و ئاوی باران دروستدەبێت کوردستان چەند زێیەکی پێدا دەڕوات وەك:

١-زێ گەورە (زێ بادینان).

٢-زێ بچووك: یەکێکە لەو زێیانەی کە لە کوردستانەوە هەڵ ئەقوڵێ و بەکوردستاندا دەڕوات یەکێکە لە لقە سەرکییە گەورەکانی رووباری دجلە لە کوردستانی ئێران هەڵدەقوڵێ بە گوێرەی ئەو شوێنانەی پیا ئەڕوا ناوی ناوچە لێنراوە وەك لەناوچەی سەردەشت (چەمی گەلو) لەناوچەی ئالان (چەمی ئالان) لای گوندی هەرزنە (چەمی هەرزنە) لەناوچەی قەڵادزە (زێی خاس) گوندی سندۆلان زێ





سندۆلان لەناوچەی دۆکان زێ دوکان، لەناوچەی کۆیە زێی کۆیە لەلای پردی زێی پردێ.

- زیڕاندن: ئازاردان: هەراسان کردن.

- زێتر: زیاتر.

- زێرو: زەروو: زارو: زیرۆ: زۆرگ: زالۆ: زیلۆ: مارمژ: زەلوو:

گیان لەبەرێکی رەش سەوزباوە لەناو کانی و ئاوی وەستاودا دەژی زۆرجار لەکاتی ئاو خواردنەوە لەو ئاوانە ئەچێتە قورگ و گەدەی ماڵاتەوە ئەبێتە هۆی کوشتنی ئەو ماڵاتە، چونکە خوێنی ئەم گیان لەبەرە ئەمژی.

- زێرەوشان: ١-زێر بەسەردا هەڵپژاندن.

٢-بەتیشکی رۆژیش دەگوترێ کە بە هۆی پرشنگی رووناك بکاتەوە.

- زێرینگر: زەڕنگەر: زێرگەر: زێرکار: زەڕگەر: زەڕەنگەر: زەرگەر: زێرکەر: زێرینگەر ئەو کەسەی کاری زێر دەکات و دەیفرۆشێ.

- زێلك: زراو.

- زێلکرژان: زراوڕژان: تۆقین.

- زێنەت: ١- جوان:

٢- خۆش و دلگر:

٣- ناوی ژنانە.

- زێوکفت: زیۆکێش: بەزیونەخشێنراو.

# ژ

پیتی (ژ) بەم پیتانەی خوارەوە دەنگگۆڕکێ دەکات و جێگۆڕکی دەکەن.

١-(ژ: چ)

پەرژین: پەرچین، (پرژ: پرچ).

بەربەرۆژکە: بەربەرۆچکە.

٢- (ژ: ز)

(ژێراو: زێراو: زێراب).

ژێر زەمین: زێر زەمین.

ژەهر: زەهر.

٣- (ژ: ش)

دوژمن: دوشمن، پژدەر: پشدەر.

ژوژك: ژوشك.

بەژدار: بەشدار.

٤- بە پیتی لە جێگۆڕکێ دەکات.

ژبیر: لەبیر، ژبیرچوون: لەبیرچوون.

٥- بە پیتی (ج) خۆی دەگۆڕێتەوە.

(ژەم: جەم)، (سووریژە: سوورێجە).

- ژار: ١- لەڕولاواز: ٢- هەژار.

- ژاراو: ژەهراو: ١-فرمێسك

٢- تاڵ.

- ژاژ: دارێکی درێژە قەلـەنگی لێ دەبەسـترێ بـۆ مازوو چنین بەکار دێ.

- ژاکـاف: ژێکـاف: ١- واتـە ژیانـەوەی کـورد: کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد لـە سـاڵی (١٩٤٢) لـە کوردستانی ئێران دروستبوو.

٢- ناوی کچان و کوڕانی کوردییە.

- ژاژك: ١- باوشك: ٢- بنێشت.

- ژاژکە: ژاژك: ژاوین: بنێشت.

- ژاژی: شیرێژ بە تـەڕی دێـنن هەنـدێ گیـاگۆڵی لەگەڵ دەکەن تا بۆنی خۆش بێت و بۆگـەنی نـەبێ ئینجا لـەناو پیـستەی دەکـەن و بیـست ڕۆژی لێ دەگەڕێن دەبێتە ژاژی.

- ژاڵە: ١-دووڵك: کەرکوژە: روول: خەرزانە: رویل: کودان: خەرجێلك: لووریك.

دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵەکـەی بەشـێوەیەکی سپی یان زەرد یان پەمەیی، هەموو بەشێکی ژەهـرە بۆ پەرژین رازاندنەوەی باخچەکان بەکار دێت.

٢- ناوی کچانە.

٣- ناوی گوندێکە لە کوردستان.

- ژاکان: گەچران: گەچلان: سیس بوون: چرچ بوون.

- ژاکاندن: گەچراندن: ژاکـانن: سیـسانن: چرچـان: کرچاندن: گەچلاندن.

- ژاندن: ژەندن: تلەقان: بەدەسـت هێنـان و بـردن وەك راژەندنی مەشکە و لانك.

- ژبلی: بێجگە.

- ژان هاتن: ١-ژان گرتن: وەژان هاتنەوە.

٢-ئەو ژانەی ژنی دووگیان دەیگرێ.





- ژاوە ژاوکردن: دەم پێکدان.

- ژبوچە: چرا.

- ژبەر: لەبەر.

- ژدورڤە: لەدوورەوە.

- ژرۆ: ژار: هەژار: فەقیر.

- ژژە: گۆشت.

- ژدل: لەدڵەوە: براستی: بەڕاستی.

- ژلیوانن: شلوقاندن: شپرزەکردن.

- ژماریار: ژمێرەر: موحاسیب.

- ژمرا: بۆمن: لۆمن.

- ژمژیە: جموجوڵ: ژمەوژۆڵ.

- ژمەڤە: لەئێمەوە: لەمەوە.

- ژمێرکۆ: ئامار.

- ژن: ئافرەت: پت: ژەنك: پتۆ: پێکۆ: پتکۆ ژەنی: کەنێ: کەنی: عافرەت: ژنك: جنی: زن.

١-جنسی مێینەی ئادەمیزاد.

- ژنەکی باشە: ئافرەتەکی باشە.

جاران پەناگەی شەوانم

ئامێزی ئاوەڵای ژن بوو (تاریك و روون)

٢-ناوی ژن دەبێتە نازنـاوی کوڕەکـەی بەمـەرجێ پیاوی ئەو ژنە مردبێ بۆ ناسینەوە وەك:

علـی مـازێ، کـریم خاسـێ، کـەمال عەیـشی، ئاکۆی قومری.

٣-دەبێتە نازناوی مێردەکەی کاتێ مێردەکەی بـێ نمود بێت و سادەبێت.

٤-وشەی نێر دەبێتە نازنـاوی ژن بەمـەرجێك ئـەو ژنە هەڵسوکەوتی وەك پیاوان بێت، خەجەنێر.

٥-بریتییە لەپیاوی ترسنۆك.

هەر ژنێك و خێزان دوارۆژی بـۆ دیـاری دەکـات و لەڕووی کاروبار و هەلس و کەوت و جل و بـەرگ و هەموو شتێك بۆ نموونە :

- ژنە خەیلانی: واتە ژنـانی عەشـیرەتی خـەیلانی شان بەشانی پیاوکاردەکەن و بـەر و بـومی ئـاژەڵ داری دەفرۆشن.

- ژنی شارستانی: شێوەی کارکردنی لەچوارچێوەی ماڵەوە وەیان فەرمانبەرە.

- ژنە بلباس: شان بەشانی پیاو کاردەکەن پێـشتین لەپشت دەکات و هەوری لەسەری دەنێ.

- ژنانە: ژنانی: ژنانییە: وەکو ژنانە.

- ژناڤ برن: لەناوبردن.

- ژنبـاز: مێبـاز: ئـەو پیـاوەی بـەدوای ژنانـدا دەگەرێت بۆ ئارەزووی جنسی.

- ژن باڤ: زڕداك.

- ژن برا: براژن: ژنی برای کەسێ.

- ژن بـە ژن: ژن بەژنـە: ژنـاوژن: ئـالوگۆرکردنی دووئافرەتـە کـە لەبارمتـەی یەکتریـدا ئـەدرێن هەریەکە ئەبێتە مایەی شیربایی بۆ ئەوی تریان بـۆ خوشك بۆ برای بەژن دەدات یا کەسیکی وەك خـاڵ و مام بەژن دەدرێت ژن بەژن دوو جۆرە: ١-گـەورە بەگەورە: واتا هـەردووك لەتەمـەنی مێرکردنـدان: ٢-گچکە بەگەورە گەورەکە دەگوازنەوە ئـەوی تـر مارە بڕ دەکرێت.

ژن بەسەرهێنان: کابرایەك ژنی هەیە و ژنێکـی تـر دەهێنێ ئەمە پێی دەووترێ ژن بەسەرهێنان لەبـەر

ئەم هۆیانەیە، ئیش و کاری زۆر وەك ئاژەڵداری میوان بەری خستن یان منالْبوون لەژنی یەکەم بەو هیوایەی منالْیّ ببیّ.

– ژن بەمز: گەواد: دەویت: مل پان: مل شۆڕ: چاو شۆر.

– ژن تی: دش: بالتوسك: ژنی برای مێرد.

– ژن خالْ: خالْۆژن: خارۆژن.

– ژن خواز: ژنڤیان: داخوازی کەری ژن: ژن خواستن: ژن داخوازی کردن.

– ژن خوشك: خوشکە ژن: خوشکاژن: خوشکی ژن.

– ژن دار: بەژن: پیاوی خاوەن ژن.

– ژن شێخ: واتە خێزانی شێخ لەکاتی بانگکردن و قسە دەگەلْ کردندا.

– ژنك: ژنەك: ژنێك: ژنیّ: ئەم وشەیە بۆ ژنێکی ناسراو دیاریکراو بەکاردیّ.

– ژن مام: ژن ئاپ: ئامۆژن: مامۆژن: ژن ئام.

– ژنمیر: واتە خێزانی میر.

– ژن و مندالْ: مالْ و منالْ: خێزان.

– ژنۆکە: ژنکۆك: واتە ژنی بیّ ئەزموون و بیّ عەقلْ.

ژن هەیە ژنۆکەش هەیە. (پەند)

– ژن وەستا: ئەو ژنەی لە چنین و هەندیّ پیشەسازی خۆمالْی دەست رەنگینە.

– ژنەبی: بێوەژن: ژن بی.

– ژنە تاوسە: ناوی یەکێکە لە ئەستێرەکان.

– ژن بەمێرد: ژنیّ مێردی کردبیّ و خاوەن مێردبیّ جاران لە کوردەوریدا ژنی بەمێرد بە جل و بەرگ لەگەلْ کچ لێك جودا دەکرایەوە ئەویش بەم شێوەیەبوو سەرپۆشی لەسەر (سەربەست) لەسەری دەنیّ، کەچی کچیّ مێردی نەکردبیّ سەرپۆش لەسەر سەری رووت لە سەری دەنیّ و لەو زیاتر هیچکە نا.

– ژنەوتن: ژنەفتن: بیستن: گوییّ لێبوون: ژنەوین: ژینەن.

– ژن هێنان: ژن هاوردن: ژن هینان.

– ژن هەلْگرتن: ١-کچ بەگەلْ پیاوکەتن و رۆیشتن.
٢-ژنی خاوەن مێرد بەگەلْ پیاوێك بکەوێت و بڕوات.

– ژنی: ژنیّ: واتە خێزانی (ژنی ئازاد نەخۆشە).

– ژنێژگە: بۆ خۆشەویستی بە ژن دەلْێن واتە ژنی کچکە.

– ژنی سووك: ژنی خەراپ: ژنی سەلیتە.

– ژنی کچکە: ژنی دووەمی پیاو.

– ژنی گەورە: ژنی یەکەمی پیاوی دووژنە.

– ژنیەن: ژنەوین: ژنەوتن: ژنەوای: ژنەفتن: ئەژنەفتن: گویّ راگرتن: بیستن: گویّدان: گویّگرتن: گویّدێربوون:

– ژوار: بەئێش: بەژان ژۆ: بەسۆ.

– ژوان: ١-لەوان: ٢- مەوعید.
( دەژوانی خۆم دادێم).

– ژۆرین: سەروو.

– ژوور: ئۆدە: هۆدە.

– ژووری دانیشتن: ئەو ژوورەی بۆ دانیشتنی خێزان تەرخانکراوە.

– ژووری نووستن: هۆدەی نوستن.

– ژۆرین: سەرەوە: سەریّ.





– ژووژیان: حەسانەوە.

– ژووشك: ژژوو: ژویژك: سیخەر: ژۆژی: ژیژو: ژێژك: ژێشك: ژووژوو: ژووژیی: شوژی: ژیژك: ژژۆ: ژڤژیی: ژیشك: کۆدۆ: گیاندارێکە بەقەد پشیلەیەکی بچووکە دڕکاوی مارخۆرە پێستی بۆ نەمژینی جوان و ماین و گوێرەکە بەکاردێت.
(ژووشکیش دەلْیّ لەفەرخەی من نەرم و شلترنییە).

– ژوولیاگ: شپرزە: شەپرزە: شلّەژاو: شلّەژای: شیواو.

– ژوولیان: پەریشانی : پەرێشانی: پەشێوی: شپرزەیی: شەپرزەیی: شێواوی.

– ژەك: ژك.
١-بەو شیرە چڕ و توندە دەلْێن کەلەکاتی مندالْ بوونا لەمەمکی دایکا هەیە.
٢- ئەوشیرە خەستەیە کەیەکەم جار، دوای زان لەگوانی مەڕ و بزن پەیدا دەبێت.

– ژەنگ: ١-جۆرە نەخۆشییەکی دەغل و دانە بەم شێوەیە: لەکاتی گولْ و بۆق کردنی دەغل و دان و ئاسمان سوور هەلْدەگەریّ دەبێتە خۆل باران ئەم خۆل بارانە ژەنگ دروستدەکات لەسەرپەلکی دەغل و دانەکە دوای ئەمە ئمە بارانێکی کەمی لیّ دەدات گولْەکە هەلْ دەپڕوکێنیّ نیشانەی ژەنگ لەبارینی باران دیار دەدات ئەگەر ئاوی باران نیشانەی رەشکاوی هەبووایە ئەوە دەبووە ژەنگ.
٢-ژەنگار: خۆرك: خۆسەرە.

– ژەلْم: زەلْم بە توێژێکی سووری لیچق دەلْێن کە لەسەر ئاوی راوەستاودا دەوەستیّ.

– ژاراوی: ژەهراوی.

– ژارماسی: ژەهر ماسی: ماددەیەکی دەیخەنە ناو رووبار ماسی دەکوژیّ.

– ژارۆ: هەژار.

– ژاروو ژەنگ: هەراوهۆریا.

– ژاری: هەژاری: فەقیری.

– ژاکاو: پوچبوو: ژاکیاك.

– ژان: ئێش.

– ژاندار: بەژان: بەئێش.

– ژاندن: ژەندن: ژەناندن.

– ژانکردی: ژانکردوو: ژانگرتوو.

– ژاوەرۆ: ١-رووباری پاك:
٢- ناوچەیەکە لە کوردستان.

– ژەقنەمووت: زەقنەبووت: ژەقنی هەلا.

– ژەنگالی: ژەنگاریی: رەنگی شین.

– ژەنگاوی: بە ژەنگ.

– ژەن: بێژ: ئەنگیو: لێدەر: چی: گێو: پاشگرە واتا لێدانی ئامرازی موسیقای میللی وەك (زورنا ژەن، دۆلەنگیو، زورنابێژ، بلیوژەن، زورناچی: دووزەلە ژەن: بالْەبان ژەن) زەرب ژەن: نەی ژەن.

– ژەنوو: ژەنۆ: ئەژنۆ.

– ژەهردار: بەژەهر.

– ژبل: لەجیاتی: لەبری.

– ژلووقیان: قەرەبالْغ.

– ژەنەکیّ: ژنەکە.

- ژەهر: ژار: زەهر: ژەهر: ئاغوور: ژەحر: ژەر.
- ژەهرك: ژەهریی: ١-دەرد: ٢-ئێش.
- ژی: زی: ییّخە: بەرۆك.
- ژیار: ژیوار: شارستانیەت.
- ژیان: ١-ژین: ژیوار: قۆپیت: ٢-ناوی کچانە.
- ژیاندنەوە: زیندووکردنەوە: زندیکردنەوە: بووژاندنەوە.
گیان وەبەر هێنانەوە: ڤەژاندن: پەرناندن: ڤژاندن: ژیاندن.
- ژیانی پاك: تەبایی و دۆستایەتی ناو کۆمەڵ.
- ژیانی خۆش: رۆژگاری پڕ بەختەوەری و گوزەرانی چاك و تەبایی و کامەرانی.
- ژیانی ناخۆش: ژیانی کولەمەرگی: ژیانی هەجەمەرگی: ژیانی پڕ لە دەردومەینەت و رووت و برسیەتی و چەوسانەوە.
- ژیرکەلە: ژیکەلە: منداڵی بەئاوەزی پاك و خاوێنی خۆشەویست.
- ژیرگین: ژێرگ.
- ژیندارە: بەرخوردار.
- ژینداربی: واتە ساخ بی.
- ژیرەنی: ژیری: عاقڵی.
- ژیی: عومر: تەمەن.
- ژێدەر: سەرچاوە: چاوگ.
- ژیلاوك: ژیلك: شردان: شیلاوك: شیلك: پارچە گۆشتێکی لۆچ لۆچ لە ناو سکی گیانداردا پڕە لە پیسی.
- ژینگە: ناوەند: ناوپارە: ناوچە: دەورووبەر

- ژێی: تەمەنی: عومری.
- ژێی وی: تەمەنی وی.
- ژێر باڵ: بن باڵ.
- ژێ بابۆ: بەو کەسانە دەگوترێ کەبەشێوەی کرمانجی سەروو قسان دەکەن.
- ژێر: بن.
- ژێراو: ژێرئاو: بن ئاو: بناو.
- ژێرپێ: بن پێ: ژێرپا.
- ژێر پیاڵە: بن پیاڵە: تەبلە.
- ژێرچەنە: خشڵێکی ژنانە (٠,٣٨)م درێژە لە مۆروو دەهۆنرێتەوە یان لەزیو دروستدەکرێ سەرەکەی چەنگالێکی پێوەتوندە لەکڵاو گیر دەبێ.
رەبی لێت موبارەك بێت گوڵ و گوارە و ژێر چەنە.
(گۆرانی حەسەن زیرەك)
- ژێر چەپۆك: چەوساوە: ژێردەست.
- ژێر خان: سەرداب: ژێرزەمین: زێرزەمین.
- ژێر خستن: لەعەردی دان.
- ژێردار: بنەتان: داری خوارەوەی سمتەکی ئامێری تەون کە بن ترینەی لێ قایم دەکرێت.
- ژێر کراس: بن کراس: ژن لەبەری دەکەن، نزیکەی (٠,٩٠)م درێژە و کونی جێ قۆڵەکانی و جێ ملی خڕ و گەورەیە لەپێشەوە و لەدواوەی وەکویەك وایە. لەلای سەرەوە (١,٢٠)م بەرینە و لەخوارەوە (١,٧٠)م بەرینە، جا کە ئافرەت بەچوارچمکی دادەنیشی ژێر کراسەکەی لەبەر تەنگ نییە و لەشی ناگوشێ.
- ژێرکەوتن: بەبن کەوتن.





- ژێرلا: ژێللا: ژی: لەخوارەوەڕا: ژێردا: لەبەرەوە. (لەژییەوە بچم: لەژێلا بچم: لەبەرەوە بچم: لە خوارەوەڕا بچم).
- ژێرماڵە: بەوانە دەگوترا کاتی خۆی لەبەرگرانی و شەڕی ماڵ وێران کەری یەکەم، لەلادێدا هاتبوونە شار و، ئەو ماڵەی حاڵی باش بووایە ژێرخانی هەبووایە، ئەیدا بەوانەی بۆ جل شوشتن و بان ماڵین و نان کردن و حاجەت شوشتن بە مانە یان ئەوت(ژێرماڵە).
- ژێر و ژووربوون: سەراوبن بوون:
دنیا ژێر و ژووربێ هەر ئەوان فرۆشیان ببێ.
(گەدا- ل٤٢)
- ژێر خەرە: بن رایەخ: ژێرین: خوارەوە: خوارێ.
- ژێك: لە (ژ+یەك) دروستبووە پێشگرە.
- ژێکری: بڕای: بڕاو.
- ژێکریە: بڕیتی.
- ژێکدی: ژێك: لە یەکتری: لەیەکدی.
ئەم و هوین ژێکدی ناگرین.
- ژێهاتی: ١-ژی هاتی: خورت: بەرێزولایق: ٢- ناوی کوڕانە.

# س

١-بە پیتی (ز) خۆی دەگۆڕێتەوە:
سهراب: زۆراب.
مس: مز.
گاس: گاز.
٢-بە (ش) دەنگ گۆڕکێ دەکات.
مست: مشت.
رست: رشت.
٣-بە (چ) دەنگ گۆڕکێ دەکات.
سرێش: چریش.
- سا: ١-تەخت: ٢-ساف: ٣-سێبەر.
- سائەقل: گەلۆر: بێ مێشك.
- سابڕ: جۆرێکە لەبڕینەوەی خوری هەمووی دەبڕێتەوە لەلەشی مەڕ.
- سابرین: سابروون: ساورێن: تەگە.
- سابات: ١-جۆرە کەپرێکە لەدار و چرو دروست دەکرێت بەڵام پێشەوەی هەیوانە:
٢-کەپر:
٣-ناوی کچانە.
- سابوون: سابین: ساوون: خاوێنەر.

جاران لەکوردەواری دروستدەکرا، ئەو سابوونەی دروستدەکرا ناوی (بەزی) بوو لەم (بەزی)یە گەلێ جۆری لێ بەرهەم دەهات لەم جۆرانە:
١-سابوونی قالب بۆ خۆشۆشتن بەکاردەهات.
٢-سابوونی لاپاروو: دووجۆرە و بۆ جل شتن بەکاردەهات.
٣-وردە.
٤-سابوونی سەرکەف بۆ دەم و چاو شتن بوو بەتایبەتی ئافرەت بەگشتی بەکاریان دەهێنا.
- سابوونچی: بەو بنەماڵانە وتراوە کە کارخانەی سابوونیان هەبووە.
- سابوون کەران: ئەوەیە کە سابوون چییەکان هەموویان لەگەڕەکێك کۆبوونەوە و ناوی گەڕەکەکە یان ناوە سابوونکەران.
- سابوونەرەقە: یارییەکی منالانەیە دوو منداڵ بەتایبەتی (کچ) پشتی خۆیان بەیەکەوە دەنووساند و قۆڵیان لەقۆڵی یەکتری هەڵدەکێشا بەنۆرە یەکتریان بەرز دەکردەوە و دەیان گوت
هەتەق تەقە سابوونەرەقە.
- ساپ: ١-ئەوقەسەلەی لەگەڵ دەغڵ دێتە سەرجۆخین. ٢-بەردی پان و لووس.
- ساپان: ١-سەپان: ئەو کەسەی ساپ دچنی (دەدورێتەوە).
٢-مەلەغان: داسکی مەزنە گیای پێ دەدورنەوە.
- ساپ پەخاندن: گێرەکردن.
- ساپ ساپانێ: ساف سافێن: تول تولێن: یارییەکی کچانەیە بەساپ دەکرێت.





- ساتل: ستیل: سەتل: پەقرەچ.
- سات: ١-کات: ٢-زۆرخێرا: ٣-زۆر.
- ساتمەکردن: رووچوون: هەلەنگوتن: نسکۆبردن: پێ هەڵقرچینەوە.
- ساتوور: قەسەتۆرە: چەقۆی گەورە.
- ساتار: زەوییەکی وشك لەنێوان دوو مێرگ.
ساتوڕ: گێل.
- ساتی: عەجەلە: خێرایی.
- ساج: سێل: سێر: پارچە.
پلێتەکی شێوە بازنەی پشت قۆزە نانی تیری پێ دەکرێت.
- ساچك: جاجێل.
- ساجلکە: جاجێلۆکە.
- ساچکڵە: مێرمنداڵ: پارچەلە.
- ساحێب: ساحێو: خاوەن.
- ساحێب تەجروبە: خاوەن ئەزموون.
- ساحێب قۆناغ: میوان پەروەر.
- ساخ: ساغ: ١-بێ فروفێل: ٢-بێ دەرد.
- ساختەچی: ساختەکار: قەشقە: سەمەندەکرۆژ: فرلداخ باز: سەرەسۆدەرە: زەوتەك: فەنباز: دوغەڵ: ریبۆ: ڕێبۆکار: فێلزان: فێلباز: قۆلبڕ: قۆڵشکێن: قومارباز: کەرسەك: کەیکودا: گزەوون: لەباك: لەپۆك: لەماك: هەڵخەڵەتێن: فریودەر: هەڤان: تەفرەدەر: لە خشتە بەر: فریودەر: هەزارفەند: زانەخۆر: تەشقەڵەباز: خاپۆ: خاپینۆك: خەبۆ: کەڵەباز: چەقەباز: شیپوە باز: داوباز: فریوباز: دەستشکێن.

کەسێ بەقسە هەموو کەسێك فریودەدات و گوایە کار جێبەجێ کەرە و خاوەن بەڵێنی بەدرۆیە.
- سادە: ساویلکە: فەقیرحاڵ: بێفرۆفێل: سافیلکە. کەمهۆش: سەدەڵ: تەخت: قەلەندەر: سادەکار: ساکار: - سادەلوح: نەزان.
- سادەکاری: تازەقەلایی: کەم تەجروبە: بێ ئەزموون.
- سار: ١-سارد: ٢-شوێن:
٣-سەر: ٤-باران.
- سارا: بیابان.
- سارد: سار: سەرد: سۆڵە: چەییگ: چاییك پلەی گەرمی دادەبەزێ و هەوا ساردەبێت.
- سارداو: ١-عەمباری ئاوی: ٢-ناوی گوندێکە.
- ساردەرێژ: بەومەشکەیە دەگوتری کە بۆ مەشکە و دۆدان بێت پەلکە هەناری وردیان پێوەدەکرد ئەمە پێی دەگوترێ (ساردەرێژ).
- ساردەسیر: سەردەسیر: کوێستان.
- ساردۆنیا: ناوی گوڵێکە پەرەکانی کۆمەڵ و رەنگاورەنگە، لاسك نەرمە و بێ درکە بۆنی هەیە ماڵییە و کێوشی هەیە بە قەڵەم و بە تۆو زیاد دەکرێت.
- سارده هەوێن: بەو شیرە کولاوە دەگوتری کەسارد بوبێتەوە ئینجا هەوێن بکرێت ئەو جۆرە ماستە شل دەردەچێت.
- ساردی: ساردایی: ساری: سەری: سەرما: سەرم.
- سارق: بوخچە.
- سارەلوو: چەند قەوم و تایفەن کاکەیینە.

- سارەما: زاوما: کەساوا واتە کارو بەرخ تۆزێك هەراش دەبن و هەوا خۆش دەبێت نیوەڕۆن تادەمەو عەسرێکی درەنگ لەگەڵ ران دەبوون بەمە دەگوترا سارەما یان زاوما.
- ساز: ١- سێز: ئامێرێکی مۆسیقایە:
٢-قایل: رازی: ٣-هێمن: ٤-راست:
٥-ئامادە: ٦-چالاك.
- سازدان: رێکخستن.
- سازژەن: سازنەکچی: سازلێدەر.
- سازکار: ئەو کەسەی لەگەڵ هەموو کەس بسازێ و رێك بکەوێت.
- سازەندە: ١-زۆربڵێ: ٢-گۆرانی بێژ:
٣-مۆسیقا ژەن.
٤-سووك و چرووك: ٥-چاوەش.
- ساسا: لێ راهاتن.
- ساغ: ساخ: ژیندار.
- ساغلەم: ساخلەم: بێ خەوش و عەیب.
- ساغ بوونەوە:١-یەك لابوونەوە: روونبوونەوە. ئاشکرابوون: چالاك بوونەوە.
- ساغ و سەلامەت: بێ بەلا و بێدەرد.
- ساڤیر: چالۆێنیك.
- سافیلکە: ساویلکە.
- ساق: ١-قاچ: ٢-پوزەوانە:
٣-ساغ:
ئاغای ساحێب بەساق و سەلامەتی.
(تحفە -١- ل٢٣٣)
- ساقۆ: قاپوت: پاڵتۆ.

- ساقی: مەیگێڕ: جاران لە کۆڕی خواردنەوە دا کچانی شۆخ مەییان گێڕاوە، لەوەوە (ساقی) بووە بەکینایە لەکچی جوان.
جووتێ ساقی گوارەزێڕن
مەی لە مەیخانان دەگێڕن. (فۆلکلۆر)
- ساڵ: سار: سال: بریتییە لەسووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا لەڕۆژی وەرگەڕانی بەهار را (٢١)ی ئازاردا ئەو سوڕانەش (٣٦٥ ١/٤) رۆژ دەخایەنێت هەرساڵ دابەش بووە بە (١٢) مانگ، خۆر بەیەك ساڵ (١٢) کەلووی جیاواز دەبڕیت.
- ساڵا پار: ساڵی پار.
- سالار: ١-ناوی کوڕانە: ٢-سەرۆکی هۆز:
٣- سەرۆکی سوپا: ٤-گەورەی کاروان:
٥-سەردار.
- ساڵانە: ساڵیانە: کرێی یەك ساڵ : سالۆنە.
- سالت: سات: سەڵت.
- ساڵ دوانزە مانگ: واتە بە بەردەوامی: بەبێ پچڕان.
- ساڵگەڕ: ساڵانە.
- سالمە: گونە رێوی: گیایەکی سەلك دارە، گەلێك جۆری هەیە، سەلکەکەی دەهاڕێت و ماددەیەکی نیشاستەی لێ دەردەهێنرێت وەکو شیر وەکو لێنرێت و دەخورێتەوە.
- ساڵنامە: بریتییە لەو ساڵنامە کوردییانەی کەپێشینانمان بەهۆی تیرۆژی خۆر یا ئاوابوونی هەندێك ئەستێرە و خۆر یان هەڵاتنی خۆرەوە ساڵنامەیان لەنێومزگەوت و سەرچیاکان





سازکردووە ئەویش بۆ زانینی چەند کات و قۆناخێکی گرنگی ساڵ، وەك سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وەرزەکان و چلەی زستان، چونکە چلەی زستان بایەخێکی یەکجار زۆری هەبووە، ئەم ساڵنامە کوردییانەش وەك
١- ساڵنامەی رەنجوری: ساڵنامەیەکە شاعیری گەورەی کورد (عومەر رەنجوری لە ساڵی (١٨١٠)ز دایناوە.
٢- ساڵنامەی باری: یەکێکە لەوانە و زانایەکی کورد بەناوی (مەلانەبی)یەوە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شازدەیمدا واتە نزیکەی (٤٥٠) ساڵ لەمەوبەر بەقوچە بەرد لەسەر چیایەکی بەرانبەر گوندی باری گچکەی داوێنی زنجیرە چیای (سوورکو)ی ناوچەی سیوەیل دروستیکردووە.
٣- ساڵنامەی دۆڵپەموو: (شێخ علی کۆستە) سەدەی هەژدەیەم لەسەردیواری مزگەوتی دێی دۆڵپەموی ناوچەی شارباژێر پێکی هێناوە نیشانەیەکی تایبەتی (ساڵنامەی باری)یش تێهەڵکێش کردووە.
٤- ساڵنامەی کەنارۆی.
٥- ساڵنامەی کوردەواری.
٦- ساڵنامەی چەم پاراوی کوردستانی ئێران.
٧- ساڵنامەی گەرماوان.
٨- ساڵنامەی کەلیخان.
٩- ساڵنامەی کانی توو: لە ناوچەی مەرگە لە شاخی هێلانە قەل کراوە بەساڵنامەی لە سیازدە جێگەی سروشتی پێکهاتووە لەگەڵ هێندێك ئیشارەتی تریش.

١٠- ساڵنامەی گراوی: ساڵنامەیەکە لە گوندی گراوییە.
- ساڵە ئێرانی: لە (٢٠)ی مارتەوە دەست پێ دەکات وە لەسەر حسابی (کۆچی هەتاوی)یە، واتە کوچ کردنی پێغەمبەرەوە دەست پێ دەکات بەڵام بەژمارەی هەتاوی ساڵ (٣٦٥) رۆژ و چارەکە رۆژێکە.
- ساڵی جوولەکە: لە (٥)ی تشرینی یەکەم (٥٧٥١) ساڵ لەمەوبەر پێش باوکی هەموومان(ئادەم) خەڵق کراوە ئەمە بەسەرچاوەی ئادەمیزاد دەژمێرێت ئێستا تەنها جوولەکە لەکاروباریدا ئەم مێژووە بەکاردەهێنی.
- ساڵی زایینی: غریغۆری: رۆژئاوایی: لە (١٩٩٩) ساڵ لەمەوپێشەوە دەست پێدەکات کەلە یەکی کانوونی دووەمدا خوالێ خۆشبو حەزرەتی (عیسا) هاتۆتە دنیاوە رۆژەکانی ئەم ساڵە (٣٦٥) رۆژەو چارەکە رۆژێکە.
- ساڵی کۆچی: لەساڵی کۆچکردنی پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) لەمەککەوە بۆ مەدینە دەست پێ دەکات رۆژەکانی ئەم ساڵە (٣٥٤) رۆژە.
- ساڵی کوردی: سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ماد سەری ساڵی کوردییە کە (٧٠٠) ساڵ پێش زایینی دەگرێتەوە لە (٢١) مارتەوە دەست پێ دەکات شەش مانگی پێشووی لەسەر (٣١) رۆژەوە (٥)مانگیش (٣٠) رۆژە مانگی دوایی (رەشەمێ) (٢٨) رۆژە، چوار ساڵ جارێك ئەبێتە (٢٩) رۆژ ژمارەی رۆژەکانیش (٣٦٥) رۆژ و چارەکە رۆژێکە

سالی پڕ: واته کۆی ڕۆژەکـانی بکاتـه (٣٦٦) ڕۆژ ئەمەش (٤) سالْ جارەك دەبێ لەوسـالەدا مـانگی رەشەمە کە کۆتایی مانگی کوردییە لە (٢٩) ڕۆژ دەبێتە (٣٠) ڕۆژ.

- سالی نەهات: سیاسـالْ: وشکەسـالْ: سـالی بـێ باران و دەغل شین نەبوون.

- سالی هات: بـەو سـالە دەگـوترێ کـە زسـتانی بارانی باش بێت و دەغلْ هاتی بێت.

- سـامان: ١-دارایـی: مـالْ: داهـات: دەولـەت:

٢- ناوی کوڕانە.

- سام: ترس: ٢-هەیبەت.

- سامدار: سامناك: بەترس: سەهمناك.

- سام لێ نیشتن: سام گرتن.

- سامنج: چەنەباز: چەقەچناوە.

- ساموتە: گولنگ: ئەو گولینگانـەی لـە دەست رازە دایە بۆ جوانی.

- سان: ١-واتە دەسەلاَتداری هەورامی:

٢-وەك لەقـەبێك شـا اسماعیـل بەسـەر دارەکـانی هەورامی ئەبەخشی.

٣-ستان:

کوردسان: کوردستان.

٤-ڕێز

- سانەوە: حەسانەوە: پشوودان.

- سنانان: کڕیویە: کڕیتی.

- ساناهی: سانایی: ئاسانی.

- سانۆ: ١-بستێنێ: ٢-بستێنێتەوە.

- ساو: ١-پەژارە: لەتاو.

٢-ساڤا: ساو.

- ساوار: ساوەر: ساڤار: گەنمی کولاوی وردکراو.

- ساوارکوتان: گەنم کوتان بۆ ساوار دروستکردن.

- ساوازی: مەڕ یان بزن درەنگ دەزێن، هەندێکیان دەگەنە دروونەی جۆ بێچوەکانیان پێیـان دەگـوترێ (کۆڕپـە) شـینکە نامێنـێ بۆیـە وەك دابەسـتوو لەمالەوە بەخێو دەکرێت کـە گـەورە بـوو توانـای گەڕانی دەشت و دەری نابێت.

- ساودان: تیژیان کرد.

- سـاورمە: گـزرە داری قەلاشـکەری کـە بـۆ سووتان دەیهێنن.

- سـاوق بـولاق: سـاوجبلاغ: سـابلاغ: سـابلاخ: مەهاباد: مهاباد.

ساوق بولاق: وشەیەکی تورکییە واتە (کانی سارد) جا وشەکە لەسەر زمانان سواوە بووە بە ساوجبلاغ ئینجا بووە بە سابلاخ یان سابلاغ ناوی شارێکە لە کوردسـتان پایتـەختی کۆمـاری کوردسـتان بـوو لەسەرەتادا ناوی گوندێك بووە (بۆ داخ سولتان) بە ئـەمری شاسـولەیمانی سـەفەوی سـالی(١٦٦٧-١٦٩٤) حوکمداری موکری بووە شاری مـەهابادی دروستکردووە دەنالەپێشدا گونـدێك بـووە بـەناوی سـاوجبلاغ سـەر بەشـاری دریـاز کـە ئـەمڕۆ بووەتەگونـد، لەمـەهاباد مزگـەوتی جـامیع و مەدرەسـەی بنیـات نـاوە کـە ئێـستاش مـاوە بەمزگـەوتی سـوور مەشـهورە هـەروەها پـردی سوریشی دروستکردووە.





- سـاویر: سـاو: تارمـایی: رەشـکی شـەڤێیە، لەترسان لەبەرچاوی مرۆڤ دروستدەبێ.

- ساویلکە: ساکار.

- ساوەساو: تەمبەلْ: تەمەلْ.

کارنەکەر و زەغەل.

- ساوەل: بەردکێش

ئامێرێکە لەدار دروستدەکرێت دەخرێتە سەرپـشتی ولاَغ بۆبەردکێشان.

- سـاوەلەوان: کـارەوان: بەرخـەوان: ئـەو مێردمندالەی کار و بەرخ دەلەوەڕێنی.

- ساوە کۆڕپە: بەرخ و کار.

- سـاویان: سـوین: سـاوین: سـوون: سـوونەوە: هەسووان: هێسون: هێسین.

- سوان: تیژکردنی و سوینی تیغ و داس و...هتـد بە هەسان.

- سای: ١-ساو: ساهی: ساوین: سایی: سامالْ: ئاسمانی بێ هەور.

٢-سێبەر.

- سایسە: سواو.

- سایۆ: سایەوە: حەسایەوە.

- سایە:١-خێر: چاکە.

٢-سادە: ساف:

٣-سامالْ

خەفتانی ڕەوش سایەیە (واتە سادەیە).

٤-ناوی کچانە: ٥-سێبەر: سێوەر: سایك

- سایەبان: سەیوان: چەتر: سایەوان.

٢-ئەوەی سێبەر بۆ کەسێك بکا.

- سایەقە: سـایقە: سـامالی شـەوانی زسـتان کـە سەرما و شەختەی لەگەلە.

- سایلی: وەکو: وەکی

ئەمەش سایلی خەلکی

- سبیل: سـەبیل: سـەویل: چـپوخ: لەشـێوەی دار جغارییە دەمەکەی پان و بلند سەرهەورازە پڕتووتن دەکرێ ئاگری دەخرێتە سەر مژی لێدەدرێ.

- سبیل چی: ئەو کەسەی دروستدەکات.

- سبیل کێشەك: پێوەرێکە بۆ کات بەکاردێ واتـە ماوەیەکی کەم.

- سبە: سبەه: شەفەق.

- سبەینێ: ١-بـەیانی سـوبانی: سـەحیی: سـوح: سـبانی: شـەوەکی: سـوحا: ڕۆژەبـوون: سـبیانی: سوبەینی: سبانی: سۆب: سـبەینە: سـبە: سـۆزی: بەیانەکی: سبەحینێ: سەوێ: سارە: سارا.

٢-ڕۆژی داهاتوو: سەبەی: سۆبەی.

سبحەینێ بەبیانی داوە.

(تحفە -٢- ل١٢٩)

- سبەیە: بەیانییە.

- سبەینان: بەیانییان: سبیانان: سبحەینان.

- سپا: سوپا: سپاه: لەشـکر: لەچـەند یەکەیـەکی مرۆڤ پێك هەریەکەیان سەر بەیلوکی دیاری کراون بۆبەرگری کردن لە ولاَت پێکدێت.

- سپاخانە: سەربازگە: سپاگە: ئۆردی: ئۆردووگا.

- سپارتن: سپاردن: ئەسپاردن.

- سپاسی: سوپاس.

- سوپاس بژێر: سوپاس کار: مالیاوا: سوپاسگوزار.

- سوپاس کردن: ماڵئاوایی کردن: پێزانین: ماڵاڤایی کردن.

- سپل: فاتەرەشە: فاتەرەش.

ئەندامێکی ناو هەناوی مرۆڤە.

- سپی: ١-چەرموك: ٢-رەشانی موو سپی.

- سپیلك: ١-خۆلی سپی: ٢-ناوی چیایەکە.

- سپیلکی چاو: سپێنەی چاو: ئەو بەشە سپییەی ناو چاوی مرۆڤ.

- سپی کار: سپی چی.

- سپی کاری: سفیدکاری: گەچ کاری.

- سپی کێل: هەرکێلدراوێك (واتە زەوی کێڵراو) بارانی لیدابێت و سپی هەڵدەگەڕی و خۆی وا پیشان دەدات.

- سپیات: بەشیر و ئەوەی لەشیر پەیدادەبێت دەگوترێت کەئەمانەن: ١-شیر: ٢-ماست:

٣-دۆ: ٤-کەرە: ٥-کەشك: ٦-ماستاو:

٧-دەڵەمە:

٨-لۆر: ٩-پەنیر: ١٠-فرۆ.

- سپیان: ئەوەی خوریدار و لەمەڕە پێی دەڵێن (سپیان) و سێجۆرە:

١- سپیانی کوردی: باڵا بەرز و درێژ و بەتەنگە و دوونگ شۆڕە. خورییەکەی زۆر و تیسکنە، لەڕویشتندا شل و خاوە زۆر بەشیرە.

٢- سپیانی عارەبی: خڕ و گورچ و کەڵەش گچکەیە، کەم خورییە بەڵام لەخوری سپیانی کوردی سپی ترە، لەڕۆیشتندا توند و تۆڵ و خێرایە لەچاومەڕی کوردی کەم شیرە.

٣- سپیانی تورکی: ئەمە لەڕەسەنە مەڕی کوردی و عارەبی پەیدا دەبێ پەل ئەستوورە و بەباڵا هەندێ سپیانی کوردی دەبێت بەڵام وەك ئەو بەتەنگە و درێژ و شۆڕ نییە لە رۆیشتندا توند و تۆڵە، لەشیرداریا مامناوەندیە.

- سپی واژی: سپی واش: مەیلەو سپی: رەنگی کاڵ کەسپی بوویێتەوە یان هەر لە بنچینەدا رەنگەکە تێرنەبێ و بەلای سپییایەتی خۆی نیشانبدا.

- سپەر: سوپەر: مەتاڵ: قەلغان: قەڵخان: مەرتال ئامرازێ بووە جاران لەکاتی شەڕدا داویانە بەرووداو یا بەبەری سنگیانەوە گرتووە بۆ ئەوەی شیروتیری دوژمن بریندار یان نەکات.

- سپەرداش: سپاردی.

- سپەهـ: ئەسپێ: سپهـ: سپهك.

- سپیایی: بەرووبوومی شیری.

- سپیایی هێلکە: چەرمێنەی هێلکە.

- سپێدە: رۆژهەڵات.

- ستار: پشودان حەسانەوە.

- ستارخانی: ١- قایشێکی درێژە واتە فیشەکدانێکی درێژە ئەیخەنە سەرشانی راست و لە ژێر کەمەری چەپەوە بەبەرەزوانە ئەیبەستن یەکی تریش لەسەرشانی چەپ و لەژێر کەمەری راستەوە ئەبەستن: ٢- جۆرێکە لە جل و بەرگی پیاوان جۆرە مرادخانییەکە کەدوو ریز قۆپچەی پێوە بوو لەکاتی زستاندا قۆپچەکان دادەخران و لەهاوینیشدا دەکرانەوە جۆری قوماشی تەنکیان دەکردە ستارخانی.





- ستاناش: سەندی: وەرگرت.

- ستانام: سەندم.

- ستایش: حەمد: پێ هەڵکوتن: هەڵنان: ئەڤراختن: سوپاسکردن: وەس.

- ستران بێژ: گۆرانی بێژ.

- ستراندن: گۆرانی گوتن.

- سترانەك: گۆرانییەك.

- ستران و لاڤژ: لاوك و حەیران.

تایبەتە بە گۆرانی ئێزدییەکان بەهرەی زیاتر ژناوە رۆکی وان باسی سوارچاکی و دلدارییە وەکی لاوکی(میرزا دەروێشی عەڤدی) حەیرانی پیری و سترانا شێخ کالۆی.

- سترانا دبێژی: واتە گۆرانی دەڵی.

- ستێرك: ١-ئەستێرە:

٢-فرمێسك.

- ستێرناس: فەلەکی.

- سترۆ: شاخ: قۆچ.

- ستری: دڕك: دڕو.

- ستێز: توورەیی.

- ستێزا: ئازاریدا.

- ستوور: ئەستوور: قالند.

- ستێر: ئەستێرك: پێرك: هەرزالە.

- ستەم: جەور: جەبر: دەست درێژی.

- ستی و فەرخ: بەیتێکی کۆنی کوردەوارییە گوایە فەرخ هەربەمنداڵی عەشقی خاتوو ستی بووە.

- سجك: ١-ئەو ئاوەیە لەپەنیر دەچۆڕێتەوە لەکاتی دروستکردنی.

٢-ئاوی دۆی گەرم کراو کە سرێش یادۆ وشکەی لێ دەگیری بۆ کەشك دروستکردن.

- سحەت: سیحەت: تەندروستی.

- سحەتێ: ساتێ: دەمێ: دەمەك.

- سحرباز: سیحرباز: جادووگەر.

- سخ: توندوتۆڵ.

- سڕ: ١-رچاو: رچیاو: گود.

٢-نهێنی.

- سراو: سەرئاو.

- سڕبوون: سڕی: رهیان: کاسان.

- سربیل: کورەبیلە.

- سرپات: کە میوەیەك دەگوشی و ئاوەکەی دەگری ئەو پەلك و پارەی دەمێنێتەوە و بێ سوودە و فڕێ دەدرێ پێیدەڵێن سرپات.

- سڕپۆش: ئەو کەسەی نهێنی ئاشکرا ناکات.

- سڕ پۆشین: نهێنی نەدرکاندن.

- سرق: سڵق: بەقل: سەوزەیە.

بەتۆو دەچێنرێ بۆ چێشت بەکاردێ.

- سڕکار: هۆشبەر.

- سرکە: سمك: ئاڤاترش: سهك: لەمانەی خوارەوە دروست دەکرێت:

١- ترێ بۆ چل رۆژ هەڵدەگیرێ دوای ئەوە دەکولێنرێت.

٢- لەهەنار دروستدەکرێت.

٣- لەخورما دروستدەکرێت.

٤- لەدۆشاو دروستدەکرێت.

- سڕگن: سڕگوم: سوڕگوم.

- سونج: سەرنج.
- سروش: غەیب: خورپەی دڵ: پێ راگەیاندن: ئاگایی غەیبی .
- سڕهەڵماڵین: سڕهەرماڵین: نهێنی ئاشکرابوون.
- سڕوکوڕ: کاکە و برالە.
- سرە: سڕە: بەریزەوەستان.
- سزا: ١-شایان: ٢-ئازار: ٣-ناوی کوڕانە.
- سست: شل و خاڤ: سس: فش: خاو.
- ستەك: زەوییەکی خاو.
- سستە پەلە: دەست و پێ سپی: خاو و خلیچ: لەکار و ئیش تەمبەڵ.
- سفت: سخ: چینی زۆر لەپاڵ یەك و بێ نێوان.
- سفتاح: سەرفتاح: پەلیار: بەتۆرە: یەکەم فروشتنی سبینانی دوکان.
- سفت و سۆل: ساف و سۆل.
- سفتە: سووتاو: سووتاوی.
- سفلە: سپلە: ناسوپاس: نمەك نەناس: بێ نمەك: بێ ئەمەك: بێ وەفا.
- سفیدە: سپێدێ: بەیانی.
- سڤۆرە: ئاستانە: ئەستانە.
- سقان: ئێسك.
- سك و زاکردن: سك کردن: مناڵ بوون.
- سڵ: ١-توورە: ٢-کتوپڕ وەستان.
پێچەکی سلم ئەز.
- سڵ بوون: توڕەبوون.
- سڵکردن: ١- توڕەکردن.
خۆی سڵ ناکا.
٢-مەسلەتی کردن.
- سڵا: ئێزن: ٢-پرس.
- سلاخ: قەساب.
- سقان: ئێسك.
- سڵاو: سەلام.
- سلبی: گوڵێکە پەرەکانی بەریزە بەدرێژی ورد و سوورە و مۆرە لاسك رەقە و بێ دڕکە بۆنی نییە ماڵییە بە تۆوزیاد ئەکرێت بۆ جوانی بەکاردی.
- سڵپات: سلپ: تلتە: تلپە: سرپات.
- سلتان ئیزد: وەکو خۆیان (یەزیدی) دەڵێن (ئەزدەی پاکە) دروستکەری شەو و رۆژە و یەکێکە لەناوەکانی خودا.
- سلسلە: بەرە: نەسل.
- سلمانەوە: سلمێنەوە: سەنگرانەوە.
- سرکی: چەموشی: داچڵەکین.
- سڵ کردنەوە: گورگەکردن.
- سلە: سیلە: زلە.
- سلەڤ: سەرەوە.
- سکە: ١-هێڵی ئاسنی.
٢-باقەنۆت: ئەو پارەی لە زێر و زیو دروستدەکرێت.
٣-ئەدەب: ئەخلاق.
بێ سکە و بێ ناووس.
٤-ریش: (سکەم سپیکرد).
- سکەت: تۆپی.
- سکەلێدان: پارە دروستکردن.
- سلیتە: سەلیتە: قاحب: قەحپە: قابە.





- سلێمان: سولێمان: سولەیمان: سولە: ناوی کوڕانە.
- سم: چم: تووك: پاقولاخ: سمی ولاغ.
- سماتە: بەردێکە بۆ تیژکردن و لووسکردن بەکاردێ.
- سمپۆرە: سەمۆرە: سمبۆرە: سەمموورە: سەقوڕی: سڤۆرە: سمورە: گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە پێستەکەی بەنرخە رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە بەبەری بەڕوو و گوێز دەژی.
- سمتاش: ئامرازی سم تاشین: ئاسنێکی کلك ئاسنینە، دەمەکەی پان و کەوانەیی و تیژە وەکو تەورداس وایە سمی وڵاخی پێ ئەتاشن.
- سم تراش: ناڵبەند: نالوەن.
- سمتەك: کالەکە: دووکاڕیتەی ناڕێکی یەك بەژن بڵندە، سەرەوەیان دوولکە ئامێری تەون.
- سمدار: گیانداری سمدار وەکو ئەسپ.
- سم داهاتن: سمکۆڵ: سۆی سم.
- سمکۆڵ: سمکۆ: پێکۆڵ.
- سمڵ: گیایەکە بەسەر زەویدا دەخشێت قەدەکەی لەژێرزەویدا دەنکی رەشی بۆن خۆشی پێوەیە دەکرێت بە ملوانکە.
- سمل: گولەگەنم.
- سمێل: سوێڵ: سمبێڵ: سمێر: سێوڵ:
مووی بن لووتی نێرینەی ئادەمیزاد هەندێ کەس دەی تاشێ و هەندێ کەسی تر گەورەی دەکا و هەندێك قیت دەکات بۆیە جۆری هەیە وەك:
- سمێل بابر: سمێل گەورە: سمێل زل: سمێل قیت: (سمێل رەش) (سمێل سۆر) (سمێل گوگرە: ئەوەی تازە خەتی سمێلی دابێ) (سمێل سوسنی) (سمێل تاشرای): (سمێل سپی).
- سن: سوون: جۆرە گیانلەبەرێکی رەنگ سپی واژە و پنتك و لەدەغل دەدات و شیرەکەی دەخوات قەپێلکەکەی بە بەتاڵی دەمێنێتەوە زۆر جار ناوی لەگەڵ کیسەلە دێ دەڵێن گەنمەکە سن و کیسەڵەی لێدایە.
- سنعەتکار: سەنعەتکار: پیشەوەر: پیشەگەر: پیشەساز.
- سنادژ: سنندج: سنە: کوردستان: شارێکە لە کوردستان، مەڵبەندی فەرمانڕەوای (ئەردەلانییەکان)بوو ئەکەوێتە سەرووی دامێنی کێوی ئاییدەرەوە.
- سنبول: گیایێکە بۆنی خۆشە لەزلفی جوانان دەکا، گوڵاوی لێ دروستدەکرێت بۆ دەرمان بەکاردەهێنرێ، جۆری زۆرە:
١-سونبولی کێوی: گیایێکە خاوەنی لقی سەخت و بەرگی بڵندەو بۆنداره گوڵی وردە، بۆ دەرمان بەکار دەهێنرێ و سونبولی رۆمیشی پێدەڵێن.
٢-سونبولی هیندی: گیایەکە لە جێگەی تەڕ دەڕوێ گەڵای درێژ و گوڵی دورد و بۆن خۆشە بڵندی دەگاتە مەتر و نیوێك دەمارەکانی بۆ نەخۆشی مخفولیا و هیستریا و تێکچوونی مێشك و بێ خەوی بەکاردێ.
٣-سونبول: ناوی گوڵێکە لەسەرەتای بەهاردا دەڕوێ بەتایبەتی لە جەژنی نەورۆزدا دەیکەنە

گوڵدانەوە یالەناو مەرکانا دەیچێنن ویەکێکە لە گوڵە بۆن خۆش و تیژەکان.

٤-بەشی سەرەوەی قەرسیلی گەنم و جۆ کەدانە گەنم و جۆکانی لێ پەیدادەبێ، واتە گوڵەگەنم و گوڵە جۆ هەروەها سونبول بەلاسك و قەدی گوڵە گەنم و گوڵە جۆش دەوترێ.

٥-بەدەمەشێری کێویش دەوترێ لەجێی فێنك و تەڕ دەڕوێ لە کوردستان لەبەهاران شین دەبێ، بەڵام لە وڵاتانی فێنك و ساردی وەکو ناوچەکانی باکووری ئەورووپا لەناوەڕاست و دوایی هاویندا مێرگ و دارستانە چڕەکان داگیردەکا بۆنی خۆشە هەموو رەنگێگی هەیە بەتاییەتی بنەوشەیی، سپی و زەردی زۆرە.

- سندم: زنجیرێکە ئەم سەر و ئەوسەری دوو ئاڵقەی پێوەیە بە کلیلێکی تایبەتی خۆی ئەم ئەلقانە دادەخرێت و دەکرێتەوە، لەهەردوو قاچی پێشەوەی ماین دەکرێت لەکاتی لەوەڕاندنی دەرەوە بۆ ئەوەی ئەم رەوەیە دوور نەکەوێتەوە چونکە ئەسپ و ئێستر دوای ماین دەکەون لەلەوەڕان.

- سنوور: تخوب.

- سنوور دانان: حەددانان: سنوور دیاریکردن.

- سنی: سینە: قاوەسینی: خوان: تەبەق: مەجمەعە: سێنی: خوانجە: مجۆعمە: مەجمەع: سینی.

- سنێل: هەرزەکار.

- سواغ: سواق: سواخ.

- سواغدان: سواقدان: قوڕلە دیواردان یان لەسەربان پانکردنەوە.

- سوار: ١-ئەوەی بەسەر پشتی وڵاخەوە بێت.

٢-لەسەرپێ بۆ تفەنەگ.

٣-ناوی کوڕانە.

- سوارۆ: ناوی لاوکەکی کۆنی کوردییە.

- سوارچاك: شۆرە سوار: بووکاسواران.

بەو کەسەدەوترێ، لەسواری وڵاغا لێوەشاوە و چەپوك بێ، شەمبوزترین و چنگزترین وڵاخ نەرم بکات و سواری پشتی ببێ، رەوشتی سوارچاك خۆراگرتن و بەجەرگی و خوێن گەرمی و بەوەفا و راست گویی و چاو فراوانی نابێ لەپڕ بۆ دوژمنەکەی بچێ، بەڵکو پێشتر ئاگاداری دەکاتەوە تا بەتەواوی خۆی رێك دەخا و ئامادە دەبێ ئەمجا بەرەنگری یەك دەبن.

- سواد: سەواد: خوێندەوار.

- سواڵەت: گۆزەشکاو.

- سوال: سوئال: پرس.

- سوارە: سوالە: سوارە: بەو دەسکە (قامکە) دەغلە درواوە دەڵێن کە سەپان دوریویەتی فڕێی دایتە سەرزەوی.

- سواری تازیانە: بریتییە لەو سوارەی بەولاخی نەرم و زۆر لەسەرخۆ بۆ پرسە لەگوندێك بۆ گوندێکی تر بچێت.

- سواندە: پاسار: شەقرەیی دەرهاتووی سەردیوار.

- سواندوکە: پاساری.

- سواندن: ناو قرتاندن: ناو بچووککردنەوە بابەتێکی زمانەوانییە کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ





(تصحیف) کە بەگۆڕین و جێگۆرکێی پیتەکان و فڕێدانی هێندی پیت پێکدێ.

- سوپەند: گیایەکە لە خۆیەوە ئەڕوێ تۆوێکی وردی رەشی هەیە بۆ چاوەزار ئەیوەرێننە ناو ئاگر.

- سورناتك: سرناتك: زورناتك: سورناسك: سورانك: رووەکێکە لە ئاخیری ئوخرەی وەرزی بەهار دا لە دەشتی هەولێر کەشینکە نەما دەڕوێت بەتاییەتی لەناو وەردشۆدا هەوەل جار زۆر ناسکە و سوێریشە مەڕومالات باش دەخوات، ئەو سپییانەی کەپیستی زۆر سپییە کاتێك ئەو سورناتکەی خوارد هەموو لەشی دەبێتە برین و شەقار شەقار دەبێت بە تاییەتی سەروچاو و گوانی.

- سورناتك لێدان: بەو ئاژەلانە دەگوترێ کە سورناتکیان خواردووە و دەم و لێوی بووەتە برین.

- سوبوك: سووك.

- سوتیان: سینە بەند: سوخمەی مەمك.

- سوخمە: جلی ئافرەتانە.

- سورمە: کل.

- سورمەچن: بەسورمە نەخشێنراو.

- سوجدە: سوژدە.

- سوختە: سختە: شاگرد.

ئەمانە ئەو کەسانەن کە تازە ئەچنە ناو کۆری خوێندنی مزگەوتەکان تێکرا لەسێیەکی ساڵانی خوێندن تێنەپەریوە.

- سوختە دڵ: دڵ سوتاو.

- سوراحی: ئەو شیشەیە شەڕابی لێوە ئەکرێتە پیاڵە.

- سورانە: چەکە خاڵانە.

- سۆربلەتی: رووەکێکە لە گێوژ دەچێ، بەڵام رەنگی سوورە خواردنی بۆ درێژ بوونی پرچ بەکەڵکە.

- سووتای: سۆز یاگ: سوتای: سۆزیاگ.

- سورتك: سرتك: خوێری.

- سورمان: مسڵمان: بوسلمان: موسلمان.

- سوورزانین: لەنهێنی تێگەیشتن: دڵنیابوون.

- سوورکی: سوورچی: هۆزێکە لەسەرووی هەولێرە و تا رەواندوز بڵاوبوونەتەوە.

- سوسکە: سوێسکە: زەڕەکەو: سوێسك: سۆسك: سۆسکە: باڵندەیەکی کێوییە لە کەو دەچێت بەڵام لە کەو بچووکترە وەکو کەو زۆر رەنگی هەیە لە مانگی شوبات بەیەك دادەفسن (٢٤) هێلکە دەکات.

- سوسکەی نێر: دووهێڵی رەشی ئاشکرای لەسەر چاوی بۆلای پشتی سەری چۆتەوە لەلای پاشەوەی قاچیدا رنوکێکی لێ دەرچووە.

- سوسکەی مێ: یەك رەنگە هێڵی وردی لێ هەیە و دەنووکی لەکەو نەختی کورترە دەنووك و پێیەکانی سوورن.

- سوسکەیی: جۆرێکە لەشایی کوردەواری.

- سووك: ١-بێ کێش:

٢-ئاسان: پرسیاری سووك

خوری لەئاسن سووکترە.

٣-سەلیتە: مرۆڤی سووك: ٤-گورج (سووك بڕو: گورج بڕۆ).

- سـولّتان: ١-بەسەرداری دەولەتی عوسمانی گوتراوە: ٢-سەرۆك عەشیرەت.
- سولّی: جۆرە جل و بەرگێکە پیاوی دینداری ئیزدی لەبەری دەکەن.
- سومم: سم.
- سوند: سوێند: سویند: سۆنگ: سۆند: سەوگەند: قەسەم: کیس: درامەتی: سەقامات: سوێن: سوێنگ: پاکانە.

ئەو کۆمەڵەی لەجیهاندایە، هەر لە کۆنەوە سوێندی بەکار هێناوە لەژیانی رۆژانەدا، بۆ پاکانە کردن و خراپە لەخۆدوورخستنەوە بەکاردێ بۆ ئاگالێ نەبوون لەکار و رووداوی دزێو بەکار دەهێنرێت، سوێند لەکوشتن و کوشتار یان لەدەوری دادگا بۆ ساغ کردنەوەی هەموو ئەوانەی سەرەوە دەور دەبینێ و بەسوێندکۆتایی پێ دێت. بۆ گومان لەخۆ دوورخستنەوە بەکاردێت ، هەروەها سوێند خواردن بۆ دڵسۆزی و راستگۆیی کەسێك بەکاردەهێنری کەلە کارەکەی کەم و کورتی نەبێ.

- سوێسنە: گوڵێکە پەرەکانی قەوانی و رەنگاورەنگە، لاسك نەرمە بێ درکە بۆنی هەیە کێوییە، بەسەلك و بەتۆو زۆر دەبێ بۆ جوانی و بۆنیشی لێ دەردەهێنرێ لەکوردەواریدا.
- سونەتکردن: خەتەنەکردن: خرۆ سەبران.
- سوندخۆر: سوێندخۆر: ئەو کەسەی سوێند دەخوات.
- سوندرای: سوێندراو ئەو کەسەی سوێندی خواردووە.
- سوندردان: سوندان: سوێندان: قەسەم دان: قورئان دان.
- سوند خواردن: سوێند خواردن: پاکانەکردن: کیس خواردن.
- سونەت: ١-جاران رێ و رەسم وابوو کە وەرزێر پێش ئەوەی بچوایەتە دەروی گەنم رۆژێکی چوارشەمە لای عەسرەوە داسەکەی هەڵەگرت و دەچوو بۆ سەر گەنمەکە و دووسێ باوەشی دەدوورییەوە و پاشان دەگەڕایەوە بەم کارەش دەووترا سونەت.
٢-خەتەنە.
- سونع: ١-ئاوزە: ٢-تەمەن.
- سونگی: سینگۆ: سنگۆ: قەمە: قەسەتۆرە: قامە: زەرگ: نێزە: سەرەتیرە: سونی: چەکی شەڕکردن: دەخرێتە سەری تفەنگ.
- سۆ: ١-رۆناکی: ٢-قونێری زەرد: ٣-ئازار: ٤-سوێ.
- سۆتەك: سۆتکە: سووتاوی جگەرە: سووتمان.
- سۆتن: شەوتاندنە: سوتاندن.
- سۆچیا: سووتا.
- سۆچیان: سووتاوە: سووتایە.
- سۆخەت: سوخەت: ئەخلاق: هەڵسوکەوت.
- سۆدەرە: فیتنە: گۆبەند.
- سۆر: ١-سوور:
٢-سپیانی خوری سۆر:
٣-رەشانی مووسور.
- سۆراخ: سۆراغ: پرسیار و لێ پێچانەوە.





- سۆرانی : ١-شیر: شمشێر.
٢-نازناوی خەڵکی سۆران: محمدسۆرانی.
٣-فەقیانە.
٤- هەموو ئەو کەسانەی لە باشووری کودستان بە کرمانجی قسە ناکەن.
- سورەبنە: ناوی گوڵێکە پەرەکەی ورد و کۆمەڵە لاسك نەرمە، بێدڕکە، بۆنی هەیە کێوییە بەتۆ و بەسەلك زیادەکرێت.
سوێرقسە: تامەزۆری قسەکردنی دووکەسی هاوەلی زۆر یەکتر نەدیو.
- سۆرەتا: نەخۆشییە تووشی مرۆڤ دەبێ هەموو سۆردەبێتەوە و "تا"شی لەگەل دێتی.
- سۆر هەڵگەران: سۆربوونەوە.
- سۆری تۆخ: سووری تێر: زۆر سۆر.
- سۆرك: ١-سووریژە:
٢-خۆلی سۆر: ناوی دوو چیایە.
- سۆریکە: سوریژگە: سووریژە: سۆرك: سێریژە: سووریچە: سوورکە: مەخمەلەك: سۆرکە: مەخمەلەك: سوورینچە: سوورینچە: هەشینۆك.
نەخۆشییەکە تووشی مرۆڤ دەبێ خالی سوور هەموولەشی دادەگرێت بەم شێوەیە دەبێ سێ رۆژ دەری دەکا، رۆژێ دەمێنێ و سێ رۆژی دوایی رەش دەبێتەوە و نامێنی.
- سۆز: ١-سپی: ٢-بەڵێن:
٣-کلپەی دەروون:.
- سۆزام: سووتام: سۆژیا.
- سۆزانی: ١-سووتاوی: سووتای:
٢-حەشرە ژنی سۆزانی.
- سۆزی هەناسە: کڵپەی هەناسە.
- سۆژان: سووتان: سۆتان.
- سۆژە: کاری بەزۆری.
- سۆژیام: سووتام: سۆزام.
- سوێر: سوور: سۆڵ: شۆر: سۆر: دژی بێ خوێ.
- سۆفی: بەو کەسانە دەڵێن کە پەیڕەوی تەریقەتی نەقشەبەندی ئەکەن ریش بەجێ دەهێڵن پرچ نا.
- سۆفەقیتە: سۆفیلکە: مەلیکە پۆپتەیەکی قیتی هەیە.
- سۆسەنی: سویسنی: هۆزێکە لە ناوچەی سابلاخ دان.
- سۆکر: ئەستۆ: گەردەن.
- سۆل: جۆرێکە لە پێڵاوی ژنان.
- سۆڵ بەند: سۆڵ دروو: ١-ئەو کەسەی سۆڵی دروست دەکرد.
٢-نازناوی وەستای سۆڵ دروو.
- سۆڵە: ئامێرێکە لە ئامێرەکانی کارگەی جۆلایی، دارێکی خڕە نزیکەی (٠,٧٥م) درێژە و کەوتۆتە سەر دوو داری دووگوێ کەتوند لەزەوی قایم کراون، رشایەل بەبن سۆلەدادێ.
- سۆلکەر: سۆلدروو.
- سۆما: رووناکی.
- سۆمای چاو: هەستەکەری بینین: هەستیاری بینین: هەستی بینین.
- سۆنگ: ١-پەیوەند: ٢-هۆ:
٣-سوند: سوێند

- سۆهتم: سۆتم: سوژیام: سووتام.
- سۆهتن: سووتان.
- سۆهتی: سووتای: سووتاو.
- سۆوز: سەوز: کەسك.
- سوو: ١-سوێ: سوییێ: داخ.
٢-سبەینی.
- سووسە: سبەینێ.
- (سووسە سەفەرکەم: واتە سبەینێ سەفەر دەکەم).
- سووتان: گڕگرتن: سۆتەی: سۆتان: سۆتن: سوچیای: سۆزان: سووتن: سووتیان: شەوتان: شەوتین: سووزیان: سزیان: سۆهتن: پرووزیان: جزیان: سۆزیان: داپلۆخان.
- سووتیام: سووتام.
- سووتێنەر: سووتێن.
- سووتییە: سووتایە.
- سووچ: ١-گۆشە: قوژبن: قولنچك: سیلە: قوڕنە.
٢-تاوان: گوناح: خەتا.
- سووخال: ڕەژوو: ڕەژی.
- سووخەت: خەسڵەت: ئەخلاق.
- سووخەت خەراپ کردن: ئەخلاق تێکدان.
- سووخەتی خەراپ: خەسلەتی خەراپ.
- سوود: قازانج: دەست هات: دەست کەوت: کەڵك: دەستگیر: هۆ: بەرخۆرە.
- سوودمەند: بەکەڵك: بارەدەر: خەیردەر.
- سوور: ١-سۆر: قورمز: قرمز: قرمزی: گوڵی.
٢-ڕەوسە: دەغلی لەکاجیاکراوە: ٣-شایی:
٤-بووك.
- سووری تۆخ: سۆری تێر.
- سووری کراوە: ئاڵ: سوورێکی گەش.
- سوورخواردن: سوڕان: گڕخواردن: گەڕان.
- سووەر: ١-گەرم: ٢-سۆر: سوور.
ئاوەگەسووەر.
- سوورەبی: بیەسوورە: کۆڵەبی.
- سوورکراوە: سۆرکراوە.
- سوورێژەی ئەڵمانی: دڕکە: نەخۆشییەکی درمە لەسورێژە دەچێت پەڵەی پەمەیی لەسەر پێست پەیدا دەکات و لوەکانی مل دەئاوسێن.
- سوورێژەی بەراز: نەخۆشییەکی میکرۆبییە تووشی بەراز دەبێت پەڵەی سوور لەسەر گوێچکە و سینگ و سکی پەیدا دەکات.
- سوورەمراوی: جۆرە مراوییەکی سەر زلە، سەروملی خەنەییە پشتی خۆلەمێشییە و سینگی ڕەشە.
- سوورە چنار: درختێکە لە کۆمەڵەی چنار، بەڵام لە چنار گەورەترە، نزیکەی (١٠٠)م بەرز دەبێتەوە لە ناوچە شاخاویە بەرزەڵانەکاندا دەڕوێت، دیمەنەکەی جوانە هەندێك دەڵێن لە کۆمەڵەی سنەوبەرە.
- سوورمە: کل: سوورەمك: ماددەیەکە چاوی پێ ڕەش دەکرێ دەڵێن دەرمانە بۆ چاو چاویش جوان دەکات.
- سوورمەدان: کل دان.
کیسەیەکی بچووکە لە قایش دروستکراوە پڕە لە کل.
- سورمەیی: ١-ڕەنگی شین: کلی.





- سووزەنەك: سووسەنەك: کول بوونی ناوەوەی قەمیشی مرۆڤ.
- سووژاندن: سووتاندن.
- سووژن: گونۆژ: گنۆژ: جەوالدروو: گوونوش: شووژن: بزووژن: گنەدۆش: گرنوش: گوندووش: گونوش: سیزی.
لەدەرزی زۆر گەورەترە و درێژترە درێژی (١٠)سم دەبێ ئەستوورە بۆ جەواڵ و گوش دوورین بەکاردێ.
- سووسن: سۆسەن: سوێسن: سوسەن: سۆسن: گوڵە.
- سووك: بازاڕ.
- سوولاوك: ١-سوولك: سوولی.
٢-ناوی گوندێکە لە دۆڵی سماقولی.
- سوولێ بوونەوە: داخ خواردن.
- سووم تراش: سم تراش: ناڵبەند: نالوەن.
وەستای تایبەتە (ناڵ) لەلاقی کەر و ئەسپ و ئێستر دەدات.
- سە: ١-سەهـ: سەگ: کسۆك: کویچ: سا: تووتە: سپلوك: سپە: سەناتوو: سەو: سەناتۆ: سپلۆت: سپلۆك: کوچك: بەشدار.
١-ئاژەڵێکە مرۆڤ بۆ پاسەوانی بەکاری دێنێ بەتایبەتی مەڕدارەکان.
٢-سەگ لەبەرپیس و ئاوەگلی و بە هەمووکەس دەوەری لەناو کورد بۆ جنێودان بەکار دەهێنرێ وەك سەگباب، سەگ شێر، سەگ داك، سەی لەسەی: سەییێ سەباب، سەگ باوك، سەی لەسەیە، سەیە، کسۆك، سەگۆ.
٣-جنێوی کە بەمناڵان دەدرێ وەك توتکە سەگ، گوجیلە سەگ.
٤-سەی ناندە سفلەی نان مەدە: واتە سفلە لەسەگیش پیسترە.
٥-شت: چشت.
- سەبا: ١-بۆ: ٢-بۆچی.
هۆی چییە: سەبەب چییە: بۆچی.
٣-بایێ سپێدێیە.
- سەباب: سەگباب: جوێنە.
- سەبەت: سەللە: سەبەتە: سەوەتە: تریان:: سەوەت: پان و خڕە لەشوورك دەچنرێ.
- سەبر: ١-بێن فرەه: ٢-لەسەرخۆ.
- سەبیل: سەویل.
- سەبەقە: سێ مالك: سێ نیودێر لە شیعر.
- سەبووری: سێبوری: بێن.
- سەبۆ: سەبا: سەبۆنی: ژبۆ: ژبۆنا: ژبۆنی: لەبۆیە: بۆچی.
- سەبەل: پەردەکە بەسەرچاوادێت.
- سەبوون: سەموم: گرە: هوڕە.
- سەحار: سحەر: بەرەبەیان: تاریك و ڕوونی بەیانی.
- سەربیان: سەرۆك کۆمار.
- سەپان: ١-بەو کەسانە دەگوترا کە بەم کارانە هەڵدەستان دروێنە، گێرە، جوداکردنەوەی کاودان و داکردنیان. ٢-ناوی کوڕانە.
- سەپانی: واتە حەقی سەپان کەدەکاتە شەش یەك لە ڕاستەوە و ڕەوسە وەردەگیرا و دابەش دەکرا بۆ هەموو سەپانەکان.

- سەتل: ستل: پەقرەج: دۆڵ.
ئامرازێکە لەتەنەکە دروستدەکرێ بۆ ئاو کێشان و قورکێشان بەکاردێ.
- سەدری ئەعزەم: لەکاتی دەوڵەتی عوسمانی بەرەئیس وزەرا دەوترا.
- سەدەقە: گاوگەردون: قوربانی: بەلاگێر: سەرگۆر: پێناو: خەیرات: سەیەقە.
- سەدە: ١- ئەو ماوەیەیە کە دەکەوێتە نێوان دەستپێکردنی دێرەجۆت و بادانەوەی جووتیارەکە:
٢- سەدسال.
- سەدەی هێستر: ١-لەسەدەی کەر درێژترە دوو ئەوەندەی سەدەی کەرە.
٢-پێوەرێکە بۆ درێژی بەکاردێ.
سەدەهێسترەك لەمن دوورە.
- سەدەی کەر: لەسەدەی هێستر کورتترە.
- سەرسەدە: سەرسەد.
ئەو شوێنەیە کە جووتیارە جووتەکەی لێ هۆدەداتەوە.
- سەحرا: سارا: بیابان: بەریا.
- سەحکر: دڵنیابوو: لێپیپچایەوە: تەماشاکردن.
- سەحکرن: سەحکردن: پێکەتن: وێکەتن.
- سەحەل: منالۆ: منداڵ: زارۆ.
- سەخت: ١-تووش: هەڵەت: ئاستەم.
٢-گران: ٣-چەتون: دژوار: ناخۆش:
زستانی سەخت.
- سەخڵەت: سەغلەت: تەنگاو: پەشێو.
- سەر: ١-لەشان بەسەرەوەی بوونەوەر.
٢-سەرەتا: لەسەرەوە دەستپێبکەین.
٣-رۆپك: دوند: سەری چیا: ٤-زیادە.
٥-یەکجار چوون یا هاتن چەند سەرم دەدەیی.
٦-سەلك: ٧-روو: بەسەرخاکی ئەگەر نازیش بکەن
- سەرا: دام و دەزگا: خانووبەرە: کۆشکی شاهانە واتە کۆشکی پادشا و شایان ئەم سەرایانەش بەم شێوەیە بووە لەژووری زۆر پێکهاتووە هۆل و دیوەخانی گەورە و پڕ لەباخچە و دەروازەی تایبەتی و کۆشکی بەرز و گەرماو لە ناو، مەیدانی گەورە لە ناوەڕاستدا بۆ جلیت بازی و رابواردن ئەم کراوە وەك قەلا.
- سەر ئاوچون: دەست بەئاو گەیاندن.
- سەرەنجام: ئاکام: ئەنجام: دوایی: ئاخر سەر.
- سەراپا: سەرتاپا.
١-لەسەرەوە تاپێ: ٢-لەسەرەوە تا کۆتایی.
٣-هەموو: گشت: گشتی.
- سەراپەردە: دیوانی خانەدانەکان: سەرای میری.
- سەرئاراو: کەفی سەرئاو.
- سەرازا: بێ لایەن.
- سەراجە: سەرای بچووکی فەرمانڕەوا.
- سەراسە: سنووری پارچەك زەوی.
- سەراسۆی: سەرئێشان: سەراسی: ئازاری سەر.
- سەراسوێ: سەراسو: گۆشەی سەربان.
- سەراك: سەرۆك: سەروەر.
- سەراگوم: ونبوون: سوڕگوم.
- سەران:١-گەورەکان: ٢-گوندێکە لەکوردستان.
- سەرانسەر: سەرتانسەر: سەرتاسەر.





- سەرانە: خووك: گونجە: خوویك.
بریتییە لەو باجەی کە ئاغا لە کرمانجی وەردەگرت.
- سەراودونان: راونان: سەر لەدونان:
- سەراوێر: مەیلەوخوار.
- سەراوێزە: سەری داهێڵراو: شۆڕکراوە.
- سەرای: پۆلیس خانە: قشرەە.
- سەرئێشان: سەرهێشان: سەرێشان: ژانە سەر.
- سەر ئێوارە: سەر لەئێوارە: دانی ئێوارێ.
- سەر ئەڤراز: سەرهەوراز: سەرفەراز: سەرفیراز: سەربەرز: سەربڵند: سەرفراز: رووسپی: رووچەرمك: کلاولار: سەربڵن: تیلاك خوار.
- سەربەرك: ئەوپارچە قوماشەی لەسەر گیرفانی کورتەك دەدروێ گیرفانی کورتەکی پێ دادەخرێ.
- سەر ئەنداز: سەرئەناز: مافووری لاکێشی باریك درێژ.
- سەرباز: عەسکەر: ئەسکەر: سەرواز: گیان باز: ئامادەبۆشەڕ.
- سەربازخانە: سەربازگە: ئۆردی.
- سەربازکاری: خزمەتی سەربازی.
- سەرباس: سەرەتا.
- سەربان: سەبان: سەخانی: سەرخان: بان.
- سەربانی: سربانی: سری خانی: سەبانی.
- سەربردە:بەسەرهات: سەربهورد: سەربوورە: سەرگەوزەشتە: سەرگوشتە: سەربوارد.
- سەربڕ: قەساب.
- سەربڕانە: لەدوای ئەوەی سەپانەکان لەدورنە دەبوونەوە ئاغاکە حەیوانێکی بۆسەر دەبڕین بۆیانی دەکردە شیو یا گۆشتەکەی دابەشدەکرد هەریەك لەگەڵ ماڵ و منالی دەیخوارد. سەپان دووسەر برانەی هەبوو.
١-سەربڕانەی کۆتایی دورنەی جۆ.
٢-سەربڕانەی دوایی کۆتایی دورنەی گەنم.
- سەربڕانەی شوانکارە: ئەو کەسەی خاوەن مەڕ و مالات بوو دەهات پەرێزەکەی دەخوارد دەبوایە مەڕێك بدات بەسەپانەکان بۆسەربڕانە بەوەیان دەگوت سەربڕانەی شوانکارە.
- سەربڕاو: سەربڕای.
- سەربەپۆرد: ئەو سپیانەی کەخوری وەك کلاو لەسەر تەپڵی سەری بەرز بۆتەوە.
- سەر بە جەمەدانی: پیاوی جەمەدانی لەسەر نابێ.
- سەربەردانەوە: سەرشۆڕکردن.
- سەربەرەوژێر: سەربەرەوخوار: بەرەوخوار: بەرەوبەرەوە.
- سەربەستی: سەربەستێتی: ئازادی:
ئازا سەری: سەربەخۆیی: تەرخانی: سەرخووەیی: سەربەس: پایدۆستی:
نەبوونی چەوسانەوە و ئازادی قسەکردن و رادەربڕین.
- سەربەستی بیرورا: ئازادێتی بیروباوەڕ.
- سەربەسەر: وەك یەك: هەندی یەك.
- سەربەسەرانە: سەربەسەرانی: شەڕی تەن بەتەن.
- سەربەش: دابەشکردن: بەسەرئەم و ئەودا: ماڵت ببێتە سەربەشی مالان (دوعای خەراپ).
- سەربەکلاوە:

١-كلاوبەسەر:
٢-بارانی دلۆپی گەورە.
- سەربەرەڵڵا: سەرواڵا: سەرکراوە.
- سەر بەکۆچکە: منالّی کوچکەی لەسەری نابێ.
- سەربەگێچەڵ: سەربەگۆبەن: ئاژاوەچی: سەربەگۆبەند.
- سەربەگۆماکردن: تووشی بەڵاکردن.
- سەربۆر: پیسۆ: رەزیل.
- سەربەن: ١-واتە سەرچیا: ٢- هاوینەهەواری پیرمام لە هەولێر.
- سەربە هەوی: کچێك یان بێوەژنێك مێرد بەپیاوی خاوەن ژن بکات و بەو کچە یان بێوەژنە دەڵێن (سەربەهەوی).
- سەربێر: دووداری دوولق: یەکیان لای سەرەوەی کونکرایە و پێ دەڵێن مێ و سەری دارەکەی تری تێ هەڵدەکێشرێت پێی دەگوترێت (نێرە) لقەکان دبنە پایە و لەکاتی بێرکردندا شوان وەك کورسی لەسەری دادەنیشێت.
- سەربێشکە: وەکو جاجم وایە لەسەر پەردەوە بەسەر بێشکەدادەن تامناڵەکە بای پێ نەکەوێ.
- سەرپاسەوان: ئامر حەرەس: بەرپرسی پاسەوانان.
- سەرپالە: براگەورەی هەموو سەپانەکانە و قسەڕۆی گشتیانە، گاز لێدانی تەبارە کاری سەرەکی ئەو دەبێت (کەس نەبی رەجەب سەرپالەبی).
- سەرپالەی رەوسەبڕکردن: لەکاتی رەوسەبڕکردن یەکێك چەند قسەی جوان و ئایینی بەکەڵك و فەرامۆش بە ئاواز و دەنگ لەگەڵ هەڵس و دانیشتندا دەیگوت: بۆرەوسەربڕکردنەکە.
- سەرپەتی: سەرکۆت: سەرووت: سەرقۆت: کەسێ جەمەدانی لەسەرنەبێ.
- سەپەر: پارێزەر.
- سەرپەڕ: ١-سەرە: ولاغی دەکەوێتە دیوی دەرەوەی خەرمان لەکاتی گێرەکردندا.
٢-کەسێك زۆر بەدیقەت کارەکانی ئەنجام نەدا.
- سەرپڕ: سەرقال: مەشغوڵ: سەرجەنجال.
- سەرپەلك: گەڵاکانی سەرەوەی تووتنی چەنراو لەکۆتایی دەشکێنرێتەوە.
- سەرپەل: ١-فەرماندەی پەنجا پێش مەرگە.
٢-جۆرێکە لەتووتن.
- سەرپەنجە: سەرەتای پەنجە.
- سەرپۆش: پارچە قوماشێکی تەنکە سپی یان ڕەنگاوڕەنگ ژنی بەمێرد لەسەر سەربەست لەسەری دەنێن کەچی مێردی نەکردبێ یەکسەر لەسەر سەری دەنێ لەوە زیاتر هیچی کە لەسەر نانێ.
- سەرپێ شۆڕکردن: سەرپێ نزم کردن سەرپێ نەوی کردن: بەردەست کردن: رامکردن: سەرپێ دانەواندن: سەرپێ چەماندنەوە: هێنانەبەربار
- سەرپێی: ١-بەپەلە: ٢-فرۆشیاری گەڕۆك.
- سەرپەرێز: ئەو شوێنەی لە زەوی دورنەی لێکرایە.
- سەرپێ هاتی: بەسەرهات.
- سەرتا: میوەی سەرەوەی سەبەت.
- سەرتاسمە: سنووری زەوی دیاریکراو: تخوب.
- سەرتەل: زەوییەکە کە بۆ کێڵان دەست نەدات.





- سەرتەریدە: سەردەستەی دزان.
- سەرتو: سەرتوێژ: ئەو چەوارتییەی لەسەر شیری کولاو پەیدا دەبێ لە شیرەکەی دەگرێ و بەجیادەخورێ.
- سەرتەیم: بەقوربانت بم: قوربانەتەیم.
- سەرتەکیە: لێپرسراوی رێبازی حەقەکانی بوو لەگوندەکانی ئابوونەی کۆدەکردەوە تەکیەی بەرێوەدەبرد.
- سەر تێداچوون: سەرتیاچوون.
- سەرجۆخین: ئەو شوێنەی جۆخینی لێیە.
- سەرجەم: کۆکراوە: کۆمەڵە: همی: تێکڕا: گشت: هەمی: هەموو: خڕ: گردە: گرد: کۆ: کۆگرد: گشتی.
- سەرجێ: پێخەف.
- سەرجێی: جووتبوونی ژن و مێرد.
- سەرچاوکە: پەردەیەکی تەنکە بەسەرچاوی منداڵ دادەرێ لەناولانك بۆ پاس کردنی لەمێش و مەگەز.
- سەرچەشمە: سەرچاوە: سەروچاوە: سەرینچاوە: سەرچەمەن: چاوە: چاوگە: چاوکە: کانی: سەرچەوە: چەعقکانی.
- سەرچڵ: ١-سەرلق: ٢-بزێو: ٣-ناوی کوڕانە.
- سەرچەوت: گومڕا.
- سەرچەم: حەدیقە.
باغی بچووکی ناوماڵ و نێو گەڕەك.
- سەرچون: سەردانان: خۆبە کوشتندان.
- سەرخان: کۆشك.
- سەرخۆر: دمۆر.
- سەرخۆش: سەرخوەش: سەرمەست.
- سەرخێل: سەرۆکی خێل.
- سەرد: ١-سارد:
٢-بێمەیل.
- سەری هەڵدا: دەرکەوتن.
-سەرداس: ئەو پارەیە بوو کە پێشەکی وەکو یارمەتییەك دەدرایە وەرزێر، ئەو پارەیە لە بری هیچ کرێیەکدا دانەئەشکاوە لەوسەریشی لێی نەدەسەنرایەوە.
- سەردار: ١-سەرەتان: داری سەرەوەی نێوانی سمەتکەکی تەون : ٢-ناوی کوڕانە.
- سەرداژی: سەرەڕای ئەویش.
- سەرداو: سەراب.
- سەردوور: بەودوورمانە دەڵێن کە دەکەوێتە سەرەوەی کوتاڵ.
- سەردولکە: دەربڕینێکی قووڵ و خەمبارییە دڵتەنگییە بە شێوەیەکی شاکارانە دەگوترێ، بەم هۆنراوانە دەگوترێ کە بۆ لاواندنەوەی مردوو دەوترێت.
زۆربەی لەسەر رابردووی کردەوەی مردووەکەیە.
دیوانە و دیوەخانە
کوڕم لاوی دیوانە
- سەردۆوبن دۆ: ئەونمە ئاوەی کەدەکرێ بەسەر کەفی کەرەی کولاو بۆ جیابوونەوەی رۆن و کەفەکەی بن مەنجەڵ دەکەوێت دوای لێ گرتنی رۆن و کەفەکە.
- سەردەرە: سەردەرکا.

ئەوەی حوشترەوانی بکا دەبێ سەردەرەی بڵندبێ.
(پەند)
- سەردەست: ١-بان دەست: ٢-دەستەڵاتدار.
- سەردەستە: فەرماندەی پێنج کەسان.
- سەرەدیقانێ: سەرەتاتکێ.
- سەردەستەی راوچیان: ئەو کەسەی سەرپەرشتی راوکردن دەکات وەك (ئاغا و براگەورەکان).
- سەردڵ: غایە: مراد.
- سەردەسە: سەردەستە.
- سەردەفتەر: یەکەم کەس لەلیستە.
- سەردەمایەك: سەردەمەك: سەردەمێك: وەختێك.
- سەرلەقاندن: سەرهەژاندن: بڵند و نەوی کردنی سەر: رازی بوون.
- سەرڕاو: چەند زەلامێك شوێن کەروێشك ئەسورێنەوە ئەگەر شوێنەکە لاپاڵ بوو، دەبن بەدوو دەستە ئەو دەستەیەی دەچێتە سەر تۆپەڵکەکە بۆ گرتنی کەروێشك پێیان دەڵێن (سەرڕاو).
- سەررشتە: سەرتاڵ.
- سەر رووت: سەرپەتی: کەسێ جامانەی لەسەر نەبێ.
- سەرڕەش: سپیانی: خوری سپی و سەر و چاو و مل ڕەش.
- سەرڕەش کوور: رەشانێکە کەهەموو لەشی سپییە تەنیا سەر و چاو و ملی رەشە.
- سەرڕەق: مان گرتوو: کەڵەرەق: سەرسەخت: براندۆخ: هەرۆك.

- سەردەرەو: بەغار.
- سەرزێوارە: سەرلەئێوارە.
- سەرزارەکی: تەنها بەقسە و بەبێ کردار.
- سەرزەن: یەکەم مەڕ یان بزن لەمێگەل کە دزی.
- سەرزین: پارچە نمەدرێکە دەخرێتە سەرزین.
- سەرژمێر: سەرژمارە: سەرنووس.
- سەرسپی: ١-سەرسپی: پوورسپی: مرۆڤی پرچ سپی.
٢-ئەو مەلایەی بەپێش برا گەوران دەکەوت کەدەچوونە قۆناغان.
٣-ئەو ژنە گەڕاوەی کە بەپێش ئاغاژنی گەورەدەکەوت لەرێگایان.
٤-دەبێتە نازناوی ئەو کەسەی پرچی سپییە، محەمەد سەرسپی.
- سەرسنوور: سەرحدود: سەرحەد.
- سەرسنوورکراو: شوورەکێشراو: دەورەگیراو: دامەزراو: - سنووردار: سنوور بۆ کێشراو.
- سەرسورمان: شەیدایی: واق: واق ورمای.
- سەرسام: سەرگەردان بوون: کاسی: پەشۆکاوی: پەشۆکی: دووگومانی: هۆت: واقی ورماو.
- سەرسۆر: مرۆڤی پرچ سۆر.
- سەرسەپۆل: بێ مێشك.
- سەرسەخت: رکن: بەرك: رکۆنی: لەنج باز: بنارکار: سوور لە سەر قسەی خۆ: عیناد: رەق: رەقەکار.
- سەرسەر: تەختی سەر.
- سەرسەرم: ١-سەر روحم: سەرچاوم: سەرهەردوو چاوم: بان چاو: بان سەر: سەرچاوان: بۆرێزگرتن





بەکاردێ و ئامادەیی نیشاندان بۆ کردنی کارێکی ئاراستەکراو.
٢-تەختی سەرم.
- سەرسەری: چەتون: لاسار: خۆڕی.
- سەرشار:١-شوێنی چاونوقاندن لە یاری چاوشکانی.
٢-شوێنی هاویشتنی کەلا بۆ تبکەکان.
- سەر شۆر: ئەو کەسەی لە حەمامان سەری خەڵك دەشوات.
- سەرشکان: سەربریندار بوون.
- سەرشۆرگە: سەرشۆرتکە: شوێنی سەرشوشتنە
- سەرشۆڕ: سەرشوور: مل شۆڕ: خەجاڵەت.
- سەرشێت: ١-کەم ئەقڵ: ٢-ئاوی هاڕەهاڕ.
- سەرعەمەلە: سەرکار: چاودێری کرێکاران.
- سەرفترە: ٢ کیلو گەنم بۆ هەر سەر خێزانێك لە مانگی رەمەزان دەدرێت بە هەژاران یان مەلای ئاییی.
- سەرقەنەدار: ئەوکەسەی لەدیوەخان قەنەی بۆ ئاغا تێ دەکرد.
- سەرقژن: پرچ بەگروازە: پرچی لوول.
- سەرقەڵەمانە: ئەو پارەیەی لە جێی نوشتی وەردەگیرێ.
- سەرکار: زاوت: شەعنە:
بەو کەسە دەڵێن کە بە ئیش و کاری ئاغای دێ هەڵدەستێ و لە گشت کاروباری چاندن و کێلان و سەرپەرشتی ماڵی ئاغاش دەکات لە گشت تێکەولێکەیەك.
٢-ناوی کوڕانە.

- سەرکلاو: سەرکراو: لەخوری دروستدەکرێت سەپان لەسەریان دەنا بۆ فێنکی.
- سەرکەل: ترۆپکی چیا: دوند.
- سەرکەند: واتە رۆخ کەند: لێواری کەند.
٢-ناوی گوندێکە.
- سەرکند: سەرشۆڕ.
- سەرکۆت: ١-سەرکۆزەرە: کۆتەڵ: کاوکۆت: بەو کوزر و کوتکەیەی دەڵێن کەلەسەر سەرەکەی بێژینگ یاسەرەندەکە خڕدەبێتەوە لەکاتی بێژینگ و سەرندانی دەغل و دان. ٢-سەرووت.
- سەرکۆمار: سەرۆك کۆمار: سەربیان: سەرەك.
- سەرکەوتن: سەرکەفتن: سەرکەفتن.
- سەرکێشی: کەڵەوەکێشی.
- سەرگران: ناقایل: ناڕازای.
- سەرگردان: سەرگەردان.
- سەرگەرد: قوربان: قوربانی: سەرگۆڕ.
- سەرگوڵ: ١-ئەو دەستەیەی لەیاری گۆڕەوی بازیدا هەوەڵ جار ئەنگوستیلەی بەدەسەوەبێت و لەپێشا جێگیری: ٢-نۆبەرە: ٣-ناوی کچانە.
- سەرگەرم: سەرشێت: کەم ئەقڵ.
- سەرگەلە: ئەو حەیوانەی لەپێشی رانەوە دەڕوا کە سابرێنێکی ریش درێژە.
- سەرگەشتە: وێل.
- سەرگەنجۆر: بازوو.
- سەرگێن: ریخی مانگای پان بووەوەی وشك بوو.
- سەرگەڕ: بەو بەرزاییە دەگوترێ کەلەخوارەوەی نەواریی بێ.

- سەرگەران: ناوی گوندێکە.
- سەرگیندان: ژووری سەرگین کۆکردنەوە.
- سەرلق: ١-فەرماندەی سەد پێشمەرگە.
٢-ناوی کوڕانە: ٣-سەرکەل.
- سەرلوولە: تیرەی لانك.
- سەلتەزەلام: زەلامی بەتەنیا و دەست والآ بەبێ ئەوەی هیچی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبێ.
- سەرلەشکر: سوپاسالار.
- سەرلەدوونان: راونان.
- سەلەفی سوارا: تاخمێ سواران: کۆمەڵێ سواران: دەستەی سواران.
- سەرلێ دەرکردن: سەرلێ دەرچوون: لێزانین: پەی پێ بردن: هەڵهاوردن: هەڵهێنان: تێگەیشتن: دەرهێنان: بۆچوون.
- سەرلێدان: ١-دیدەنی کردنی: ٢-سەرپێ کەوتن.
- سەرمابردوو: سەرمابردیگ: سەرما بردی.
- سەرمابوون: رچان: سەرما خواردن: قەسرین: چایین.
- سەرماوسۆل: سەرماوسرپی: ساردوسەرما: سارما و سۆڵە: سەرداوسولە: ساردوسەرما.
بەو سەرمایە دەگوترێ کە لە زستاندا چەند رۆژێك دەخایەنێ.
- سەرمای پیرێژن: بەفری پیرێژن.
بورجی پیرێژن: ساردی عەجوزەی: بەردەل عەجوزە، بە سەرمایەك دەگوترێ کە لە کاتی هاتنی لە کوردەواریدا بەپێی ئاو و هەوای کوردستان پاش سەرمای زستان هەموو ساڵێك لەم سەرەوەختە بایەکی بەهێز و سارد بۆ ماوەی چەند رۆژێك هەڵدەکات.
- سەرمایە: سەرمیان.
- سەرمووچە: عەلاوە.
- سەرماشکان: سەرمانەمان: هەواخۆش بوون.
- سەرمژانکە: گاینجە: ئامرازی جووت کردنە و پەلەدارێکە خۆش کرایە دەخرێتە ناوکونی لای سەرەوەی مژانە لەدوای تێپەربوونی سەرمژانکە بەناو زەنگوڵەدا دەبێتە رکەی بەر بۆسەکە بۆ ئەوەی سەرمژانەکەی نەترازێ و دەرنەچێ لە کاتی ڕاکێشانی هەوجارەکە.
- سەرمەلا: سەرۆکی ناو فەقیان کاتێك یاری تەقیلە لەسەر تەقلەئەکەن.
- سەروادار: بەشێکە لەجوانکاری: ئەوەیە کەدوو هەڵۆێستی پەخشان یاپتر لەسەریەك پیت یاپتر بوەستن سەروای هەڵوێستەکان وەکو سەروای هۆنراوەوایە ئەوەندەیە لەهۆنراوەدا دەبێ کێشیان یەك بێ، بەڵام لەپەخشاندا مەرجی نییە وەکو (بابی بابی، حەمەدەی رابی، تەقلەی لەسەرچەنددابی)
دوا بەندی ئەم هەڵۆێستانە بە (ابی) هاتۆتەوە.
- سەرمۆر: مۆرکراو: مۆرکرای: دەمۆر: سەربەمۆر: شاتی.
- سەرمەشکانە: ئەو دیارییەی کەلە هەوەڵ شەویدا، زاوا دەیداتە بووکێ.
- سەرمی: دژی گەرمی.
- سەرن: سەرمان: سەری ئێمە.





سەرن دەبرن لێرانە.
(تحفه-ل٢٦)
- سەرنامە: ناونیشان: دەسپێك: سەرەتا.
- سەرناو: لەقەب: سەرنیۆ: نازناو.
- سەرنگیا: بالیف: سەرینا: سەرین.
- سەرنگوون: ١-سەرەوبن: ٢-ون: گوم.
- سەروازە: ناوێ سەربکا.
- سەروالآ: سەربەرەڵا: سەرکراوە.
- سەروبەر: هەندی یەك: نەزیادنەکەم.
- سەروبەردەرچوو: نەزیاد نەکەم بوو.
- سەرپۆت: مێزەر.
- سەروچاو: روخسار.
- سەرگۆلاك: سەروگوێلاك: سەروسەکوت: سەروسیما: روخسار.
- سەروەخۆ: سەربەخۆ.
- سەروەخۆیی: سەربەخۆیی.
- سەروێر: سەروەر: سەرەك: سەرۆك.
- سەروێری: سەروەری.
- سەرۆکی عەشیرەت: ١-سولتان: (لەمیر یان بەگ یان مەزن) پێکدێت سەرۆك عەشیرەت بەسەرهەموو کاروبارێك رادەگات، ئەو دەبێ ئیجازەی ژن مارەکردن بدات و سەرۆك عەشیرەت زەوی لەوەرگەی نییە، بەڵام لە هەمووشتێکدا هەقی پێشکەوتنی هەیە، ئیمتیازی تریشی هەیە وەك ئەوەیە کەبەشتێکی دیاریکراو لە خوری و رۆن و پەنیر و گۆشت و بەرهەمەکانی دیکەی وەرزێری وەردەگرێ.
٢-سولتان: عەشیرەتی جوانرۆ لە جیاتی (سەرۆك عەشیرەت) وشەی (سولتان) بەکار دێنن، لەکۆبوونەوەیەکی ئاشکرادا کەپیرەپیاوەکان پێکی دێنن، هەڵدەبژێرن.
٣-زۆرجار وا دەبێ ژنیش دەبێتە سەرۆك عەشیرەت
- سەروەشین: ١-بەئەسپ و ماین و کەر دەگوترێ کەهەردەم سەر بڵند و نەوی دەکا و ناپەسندییە.
٢-زستانی لەسەرتابەباران.
- سەروپاچك: سەرووپێ.
- سەروهار: شەرمن.
- سەروپۆر: سەرووپۆرت.
- سەرووستا: سەرپەرشتکەری وەستایان.
- سەرووساخت: پەیوەندی.
- سەروەخۆ: سەربەخۆ.
- سەروەدەر: مەشهور: مەنشور: بەناوبانگ.
- سەروەژێر: سەربەرەو ژێر: سەرەوخوار.
- سەروەن: سەربەند.
- سەرووت: سامان: دارایی: ماڵ.
- سەرە: ١-ئەو ولآغەی کەلەلای دەروەی (جۆخین) کە جەنجەر رادەکێشی.
٢-ئەو ولآغەی کەلەلای دەروەی گێرە کوتێندایە.
٣-زۆر پیرنا: بەناو ساڵان کەتی.
- سەرە بزۆت: سەکە بزۆت: چوڵسك: چڵۆسك: داری نیوە سوتاو.
- سەرەپەتکردنەوە: روداو چارەسەرکردن.
- سەرەپێزە: جەژنێکی وەرزییە لەوەرزی زاوزێ مەڕەوە دەستپێدەکات مەڕدارەکان ئەیگێڕن.

- سەرەخۆشانە: جۆرەباجێکە جووتیار دەیدات بەخاوەن موڵك کاتێك کەسێکی خاوەن موڵك بمرێ دەبێ دیارییەك بەناوی سەرەخۆشانە بدەن.
- سەرەوخوار: سەرەوژێر: سەربەخوار.
- سەرەخۆرە: بکوژ: ١-بەمناڵێك دەگوترێ کەلەکاتی لە دایك بوون دایکی یا باوکی بمرێت.
٢-کچێك شوو بەپیاوی بکات و پیاوەکە بمرێت.
- سەرەخۆشی: پرسە: تازیە.
- سەرەخۆشی کردن: دڵنەوایی کردن.
- سەرەڕا: سەربارە: سەربار: دەرق: زیادە.
- سەرەسالّی مەڕ و مالآت: لەوەرزی بڕینەوە (واتە خوری لێ کردنەوە) دەستپێدەکات کە سەرەتای مانگی ئایارە و دروێنەی جۆ لەگۆڕێیە.
- سەرەسمك: نووکی پێ.
- سەرەسۆدەرە: فێڵباز.
- سەرەشوان: شوانی پسپۆڕ و لێزان لەشوانی.
- سەرەمەرگ: گیاندان: کاتی گیانەلآ: کاتی گیاندان: گیان سپاردن: کاتی گیان دەرچوون: سەرەمردن: دواهەناسە: ئاویلکە.
- سەروین: سەرپێچ.
- سەرەند: سەرەد: سەرەن: سرەن:
لەشێوەی بێژینگە بەلام گەورەترە و کونەکانیشی گەورەترن کوزر و بەردی پێ لەدەغڵ جودادەکرێتەوە.
- سەڕەو: سەگ ڕەو: سەگ وەڕ: سەوەڕ: وەڕینی سەگەل.
- سەرەویرك: سەرهەویر: ئەو پەرۆیەیەی بە هەویر دادەدرێت.
- سەرهاتی: بەسەرهات: ڕووداوێك بەسەر کەسێ هاتبێ.
- سەریت: ساقەی گەنم.
- سەری زمان گیران: ئەو کەسەی سەری زمانی دەگیری و پیتی (ك) دەکاتە (ت) (خۆشتێ، مشتێ).
- سەری سەبەبان: کەسێ بێتە هۆی ڕوودانی ڕووداوێك.
- سەری مەیدانی: سەرتای ئەو شوێنەی کەدیاری دەکرێ بۆ تەرادانێی ولاغان.
- سەرین: ١- چوونە سەردانی نەخۆش لە کاتی سەرەمەرگدا.
وەرە سەرینم بێ مەیل تێر بکە شینم.
٢-بالیف.
- سەرینگان: لای سەری مرۆڤی نوستوو یان مردوو.
- سەرێنجە: سەرپشتە: لێزان.
- سەرهاتی: جۆرێکە لە ئەدەبی ئێزدییان و باسی ڕووداوێك دەکات کەبەسەریەکی هاتبێ خەڵك بۆ خۆیان ئاقلی لێ وەردەگرن، ئەم بەسەر هاتانەش هەموویان مەسەلەی ژیانن.
- سەغەل: ساوا.
- سەرهۆبە: سەرخێڵ: سەرۆکی خێڵ.
واتە گەورەترین ردێن سپی، کە هەموو گیر و گرفتەکان دەچنەوە بەردەستی، هەموو ئەندامەکانی هۆبە وەك تەماشا دەکا بەپێی ژمارەی ئاژەڵ خەرجی دەستێنی ئەگەر زۆربەی





هۆبەکە لەعەشیرەتێك بێ سەرۆکی ئەو عەشیرەتە دەبێتە سەرهۆبە ئەگەرنا دەوڵەمەندترین ئەندامی هۆبە دەبێتە سەرهۆبە.
- سەعات: سەحات: کاتژمێر: دەم ژمێر: سەعەت: کاتێژ.
- سەفیر: بالّویێز: بالّیۆز.
- سەرهشك: مێشك وشك: نەزان.
- سەرهەد: سەرحەد: سنوور: تخوب: حدود.
- سەرهەڵێنان: سەربڵندکردن: سەرهەڵبڕین.
- سەربەرزکردن: سەرقیت کردنەوە: سەرهەڵآندن.
- سەفان: سەفین: زنجیرە چیا.
- سەفەر: مەقامێکی کۆنی کوردییە و یەکێکە لەهەوا کۆنەکانی گۆرانی کوردی ئاوازی فۆلکلۆرییە لەرەسەن و ڕەچەلەکی نەغمەی (بەیات)ە، بە هۆنراوەی کێشی کۆن و کلاسیك و عەروزی عەرەبی، نیو دێرشانزدە بڕگەیی دەگوترێ ئەگەر هۆنراوەکە لەسەر ئەو کێشەنەبی هەوای گۆرانییەکەی لەگەڵدارێك ناکەوێ گوێندە ئەگەر بە هۆنراوەی کوردی دە بڕگەیی بیلێ ناچاردەبێ کە بۆشایی ئەوشەش بڕگەیە لەهونراوەکەدا بەوشەکانی (گیانە) و (ئای) (خوایە) (هاوار) پڕبکاتەوە تا (تالتی نەغمەکە) لەگەڵ کێشی هۆنراوەکەدا بگونجێ هۆنراوەی دەروونی پێوەدەگوترێ کە دەربارەی (جوانی) و (سروشت) و (سکالآو) بابەتیتر بێت.
- سەڤا: بۆ خاتر: بەهۆی.
- سەقا: ١-ئاوکێش: ئەوکەسانەی ئاویان لەڕاویە دەکرد و بەهۆی بارگین و گوێدرێژەکانیانەوە دەیانگواستەوە بەکۆلانەکان دەیان گێڕا و راویە ئاوێکیان بە دووعانە دەفرۆت.
٢-نازناوی ئەو کەسانەبوو کە سەقاییان دەکرد:
٣-کەش.
- سەقاقوش: باڵندەیەکی ئاوی گەورەیە دەنووکی پان و درێژە لەژێرملیدا توورەکەیەك هەیە ماسی تیا کۆدەکاتەوە بۆ خواردن.
- سەقاو: ١-ئەو شتەی پاش سوورکردنەوە لەئاگر لەئاو هەڵدەکێشرێ وەك زیوکاری، زێڕکاری.
٢-ئاوکێش.
- سەقەت: سەکەت: سەقڕی: کش و مات.
- سەقەر: هەلۆ.
- سەقلاب: سەگلاو.
- سەکتە: دڵ راوەستان: راوەستانی دڵ لەناکاو.
- سەکرا: گیرا.
- سەکنی: راوەستا: وەستا.
- سەکۆ: سەکو: کۆسپە: دیوارێکی زیادەیە لەتەنیشت ژووروبەرمالآن دەکرێت بۆ دانیشتن.
- سەگانی: بریتییە لەشتی خەراپ و بێ سوود.
- سەگ: سە: سەه.
- سەگباب: سەگ باوك: سەباب: جنێوە: باوك سەگ.
- سەگ خنکێن: جۆرە ڕووەکێکی پزیشکییە لە کۆمەڵەی ژاڵەیە بەرەکەی بارکە تۆوەکەی وردە دەرمانی ڕەوانی و ڕشاندنەوە لە گەلآو تۆوەکەی دەردەهێنرێت.
ریشالّی لقەکانی وەکو گوش: بەکار دەهێنرێت.

- سەگ ڕەو: سەگ وەڕ.
- سەگلاو: سەگاو: سیاق: سەماسی: سەی ئاڤیٚ
گیاندارێکی شیردەری قرتێنەری ئاوییە کلکی پانە لەناو گەڵیدا دووجووت توورەکەی پێوەییە یەکەمیان ماددەیەکی بۆگەن، دووەمیان ماددەیەکی بۆن خۆش دەردەدات.
- سەگ مەگەس: مێشەسەگانە: سەگەمەرگ: سەگ گیان: گیان سەخت.
- سەگوان: سەگبان: سەگڤان: سەگوان: بەوکەسە دەڵێن کە لەدائیرەیەکی گەورەدا خزمەتی تولە و تانجی راوشکاری دەکرد.
- سەگ و سوتە: سەگ و سواڵ: سەگ و سوار: شەلەوقولە: خوێرو توێری: گەجەروگوجەر.
- سەگ وەڕ: سەڕەو.
- سەگەل: چەند سەیەك بەیەکەوە.
- سەگمان: سەگی ئێمە.
سەگمان لەوان تێرترە.
- سەگەناس: سەگەناز: ١-دەردێکی درمە بەزۆری تووشی سەگ دەبێت دەماری سییەکانی و ڕیخوڵەی تێك ئەچیێ. ٢- بریتییە لەنەخۆش کەوتنی کەسێك کە خۆشت نەویێ.
- سەگی بەراز کوژ: سەگی کەلەش گەورە و زۆر درِە کە بۆ راوکردنی بەراز رادەگیرێ.
- سەلا: ١-هاوارکردن: ٢-سروودی دینی.
- سەلار: بەئەخلاق: گران: زەریف.
- سەلاکردن: کە بارکردن: جۆرێکە لە هۆنراوەی کوردی ئایینی کە مەلای مزگەوتەکان لە پێش بانگی نوێژی بەیانی لەسەر ئاوازێکی تایبەتی دەیانلێت.
- سەلتە: کورتەك: ١-ژن لەبەری دەکەن نەختێ لە سوخمە درێژترە قۆلەکانیشی درێژوتەسکن لەبارەی هەڵبڕینەوە پان و پانە و قۆلی بەقەد قالبی درێژە دورمانی سەرشانی و دورمانی تەنیشتی نییە قوماشەکەی بەسیمە و ڕەنگاوڕەنگە، بەری قوولەیە بەینی بەروپشتی بەناواخنە.
٢-پیاو جاران لەگەڵ کەوێ لەبەریان دەکرد دەیان گوت (سەلتەوکەوێ).
- سەلك: سەرك.
- سەلکەپیاز: سەرکەپیاز.
- سەلەف: لنگدان: لێخورینی ئەسپ.
- سەلەم: ئەوەیە وەرزێر داهاتی وەرزی داهاتووی بەبازرگانەکان دەفرۆشی هۆیەکەشی ئەوەیە کە داهاتی وەرزێر ئەوەندە نییە سالێ پێ بەرێتە سەر بازرگانی نرخی بەرهەمەکەی بەشتومەك دەدات.
- سەلکە ڕێشمە: سەرکەلەی کە بەسەری ولاغەوە دەکرێ و پەتی ڕێشمەی تێدەخرێ.
- سەما: ١-جۆرە هەڵپەرکێیەکی ئایینی بەزیدییانە.
٢-لەرزینێکی هونەرییە پارچەیەکە لەهەڵپەڕین هەرکات بزووتنەوەی (لەشی و شان قۆڵ و قاچ) کۆك بوو لەگەڵ هەوای مۆسیقایا گۆرانیدا دیمەنێکی دڵکێش و بەزماوەر پێکدێت.
- سەماگە: گۆبەندخانە: مەلهە: تیاتروخانە.
- سەمان: سەگمان.





سەمان سەرەوی نابەن پیرداك چاوی نییە.
(هونراوە- ل٧٩)
- سەماوەر: سەماوار: سەماڤەر: سەماوار.
لەتووج یان لم دروستدەکرێ پێچکەی نزمی هەیە پڕ ئاوی دەکەن و لەناوەڕاستەوە جەهەندەمێکی تێدایە پڕ پووڕەنگی گەشی دەکەن بۆ ئاوگەرمکردنی چاخواردنەوە .
- سەماوار سازدان: گەرم کردنی سەماوار.
- سەمت: دەر: جێ: جێگا.
- سەمتوور: سەنتوور: سەنتیر:
ئامێرێکی موسیقای ژێدەرە بەهۆی دوو (چەکوچ)ی دار لەتێلەکان دەردێت وشەی (سەنتور-سەنتر) لەڕەچەلەکدا (فارسی)یە میللەتانی دی ناوی ئامێرەکەیان لە وانەوە وەرگرتووە. ئەم ئامێرش وەك گشت ئامێرەکانی مۆسیقای رۆژهەلات پێوەری نەگۆری هەیە.
ئەمشەو دیارە و بانگم لا شەرمەن
زایەڵەی سەمتوور کەللە کەم گەرمن.
- سەموم: سەبوون: گڕە: هەوڕە: وڕە: بای گەرمی هاوین.
- سەمەند: ١-ئەسپی زەردڕەنگ: ٢-سرك: چەموش: سەرگێش.
- سەنتەری: دەرکەوان.
- سەندەویج: لەفە : نەواڵە: بابۆڵە: خواردەمەنی ساردی لەسەر لا.
- سەنگ: ١-بەردی گەورە: ٢-گرانی: ٣-کێش: ٤-عەیار: پارسەنگ.
- سەنن: ١-سەندن: کڕین.
٢-لێستاندن: ٣-وەرگرتن.
- سەننەوە: سەندنەوە: وەرگرتنەوە.
- سەنیار: کڕیار: بسێن.
- سەنگین: گران: سەیین.
- سەوال: دەوار.
- سەوڵ: گوڵێکە پەرەکانی دووردوکۆمەڵە. لاسك نەرمە و بێ دڕکە، بۆنی نییە کیوییە، بەتۆو زیاد دەکرێت بۆ جوانی بەکاردێت.
- سەوقات: دیاری.
- سەودا: ١-کاسبی: مامەڵە.
٢-عەشق: گیرۆدە: ٢-سۆز و ئارەزوو.
- سەوداسەر: عاشق.
- سەوداکردن: ١-مامەڵە کردن: ٢-گۆڕینەوە.
- سەوداگەر: کاسب.
- سەوداگەری: کڕین و فرۆتن: داوبین: دانوستاندن.
- سەور: سەبر.
- سەورگا: مەزبەلە: زبڵخانە.
- سەوز: کەسك: سەونز.
- سەوزەچی: سەوزەفرۆش.
- سەوزەزار: شوێنی سەوزایی لەدەرودەشت.
- سەوس: بەخێو.
- سەونز: سەوزە.
- سەوزە: ١-ڕەش تاڵە: ئەسمەر: ٢-گیاوگۆڵ (کەوەر) کەرەوەز... هتد.
- سەونزکار: مەیلەو کەسك.
- سەونزلایی: سەونزایی: سەوزایی.

- سەنیە: بەوزەوییانە دەوترێ کە سولتان عبدالحمید بۆ خۆی جوێ کرد بووەوە تاپۆشی کردبوو ئەم جۆرە زەوییە لەکوردستان هەبوو بەتایبەتی لەدەشتی هەولێر و کەندێناوە.
- سەیناغ: راوەستانی ئاوولم و پووش و پەراش لەسەر زەوییەکی شێوەی نەوروگۆم هەڵمژینی ئاوێکی زۆر و تەرەشۆ پەیدابکات ئەمە بۆ چاندن زۆرباشە، چونکە شێ و فێنکی زۆر دەمێنێتەوە و قازانجی زۆرە بۆکشتوکاڵ.
- سەوەتە: سەبەتە: سەبەت.
- سەوی: قەرتالە: سەبەتە.
لەشوورکی لەداربەروو یان دارمازوو یان دار بی و هەنار دروستدەکرێ بۆ ترێ گواستنەوە بەکاردێت.
- سەویەت: لەسەرخۆ: هێدی: بەکاوەخۆ.
- سەویل: سەبوو: کوپی ئاوێیە.
- سەویلك: بچووکی سەویلە.
- سەوەتە: سەبەتە: سەبەت.
لەشورك دروستدەکرا بۆ نان هەڵگرتن بەکاردەهات.
- سەهوو: غەلەت: هەڵە.
- سەی دڕ: ئەو سەیەیەی کە دڕە و لە هیچ شتێك ناگەڕێتەوە.
- سەیس: مەیتەر: میتەر.
- سەی خوێری: ئەو سەیەی کە توانای پاس کردن و ئاگادارکردنەوە و گرتنی نامێنی و خاوەنی بەرەڵای دەکات.
- سەیرانگە: گەڕانگە: گەڕانگا: هەوارگە.
- سەید: سەی: بەنەوەی پێغەمبەر دەڵێن:

- سهراب: ١-زۆراب: زۆراو: ناوی کوڕی روستەمی زاڵ بووە: ٢-ناوی کوڕانە.
- سیا: سیاه: ڕەش: رەنگی رەش.
ئەی دایکت خەجاڵەت گیانە باوکت رووسیا.
- سیاچەمانە: ١-بەهەورامی یانی چاوەڕەش: چونکە دڵدارەکەی چاوی رەش بووە، واتە سیاچەم بووە.
٢-ئاوازێکی تر جیدییە لەگۆرانی کوردیدا کە تایبەتە بە زاراوەی هەورامی وەك چۆن حەیران تایبەتە بە کرمانجی خواروو لاوك کرمانجی سەروو هۆرە بە زاراوەی لوڕی سیاچەمانەنەش تایبەتە بە زاراوەی هەورامی، سیاچەمانەش کەف و کۆڵ و داخ و پەژارەوێیداری کە سەری مرۆڤی کوردە بە گریانێکی مۆسیقی دەردەبڕێ.
٣- ناوی گۆرانییەکە لە چاوی رەشەی دلبەرەکەی وەرگیراوە.
٤-مێژووی سیاچەمانە دەگەڕێتەوە بۆ حوکمرانی (خان ئەحمەد خان)ی فەرمانڕەوای خورماڵ و شارەزوور، خان ئەحمەد خان بایەخی بە هونەر و ئەدەب داوە و لە دیوەخانی خۆی خری کردوونەتەوە یەکێك لەو گۆرانیبێژە ناودارانەی دیوەخانی خان ئەحمەد خان (وسوئاسکە) بووە دەنگخۆش بووە کیژوکاڵ شەیدای دەنگ و جوانخاسی ئەو دەبن ئەم شەیدایە ماڵی خانیش دەگرێتەوە بەخان رادەگەیەنن خانیش وسو ئاسکە لە گەچ دەگرێ و بۆ خۆی و سیاچەمانەکەی دڵداری دەلاوێنێتەوە.
٥-جۆرەکانی سیاچەمانە ئەمانەن:





١-سەحەری: ٢-بانگی: ٣-سۆزی غەریبی یان سۆزی وەتەن: ٤-لاوانەوە:
٥-دەرەیی:
٦-بەزمی پەسەك.
٧-میناداد.
٨-لە هەنارگیان.
٩-خاڵ سیاولەیلی.
١٠-ئایشی رۆ.
٦- جۆری گوتنی گۆرانی سیاچەمانە گەروویەکی تایبەتی دەوێ و هەموو گۆرانیبێژێك ناتوانێ سیاچەمانە بڵێت، چونکە لەرینەوەیەکی تایبەتی تێدایە کە هەموو قوڕگێك ناتوانێ دەری بڕێ لەهەورەمانی عێراق و ئێران چەند گۆرانیبێژەك هەن ئەو ئاوازەیان گوتبێ لەوانە: عەلیلە، هەیەر، حەوەحسێن، جەمیل، عوسمان، سەباح هەورامی.
٧-یەکەم کەس کە گۆرانی سیاچەمانەی گوتبێ گۆرانیبێژی دیوەخانی (خان ئەحمەد خان) (وسوە ئاسکە) بووە.
- سیاهژوور: ١-شهرزور: شارەزوور: لەئەسڵدا وشەکە" سبە رژوور) بووە یانی جەنگەڵێرەش لەدوایدا وشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە بووە بە (شهرزوور) ئینجا بووە بەشارەزوور.
٢-ناوچەیەکە لەکوردستان.
- سیایە: رەشە:
ئای لەبەختەی من چەنی سیایە.
- سیە ماڵ: رەشماڵ.
- سیاو: ١-سێ ئاو.

سیاو لەسێ ئاو وەرگیراوە، چونکە سێ ئاوی لێ بووە و ئاشی پێ گەڕاوە لەسەر زمانان سواوە بووە بە (سیاو).
٢-ناوی گوندێکە لەدەشتی هەولێر.
- سیار: سوار.
- سیاربم: سواربم.
- سییار بوون: سوواربوون.
لەهەسپا سیاربوون. (کۆمەڵ- ل٥٢٥)
- سیارکرن: سوارکردن.
- سیایی: سیاه: لستە: قایمە.
- سیاسەت: دەردەسەری.
- سیاسەتکردن: دەردپێ دان.
- سیاگۆش: سیولۆ: جۆرێکە لەپشیلەکێوی تۆپەڵێك موو وابەسەر گوێیەوە سیامەند.
- سیاونە: رەشان.
- سیانزە بەدەر: سێزدەبەدەر: سیزەوەدەر: لەرۆژی نەورۆزەوە دوانزە رۆژی تر ئەژمێرن رۆژی (سیانزە) پێی ئەڵێن سیانزەبەدەر لەزۆر شوێنی کوردەواری ئەم رۆژی سیانزە رۆژی سەیرانە.
- سیپەلك: سی: سییە: لاك: شدوش: پشاسپی: سوی: پیلاسپی.
- سیخور: ئاژەڵێکی بچووکە و ئەوەندەی قەلێك دەبێت چوار پێی هەیە دووپێی پێشەوەی رنۆکی هەیە، دوو پێی دواوە هەروەکو پێی منداڵی ساوای ئادەمیزاد وایە هەموو لەشی دڕکە لەجیاتی پەرەکانی هەردڕکێك هەندی پێنوسێك ئەبێ رەنگی رەش و سپییە زۆر جۆری ئەو دڕکانە وەك نەشتەر، ئەگەر خۆی لە ئادەمیزاد بدات بریندادی دەکا سەری بچووکە و چوار ددانی هەیە

بۆ خواردن. شەو بە دوای خۆراك دادەگەڕێت لە مانگی شوبات بەبادی لە مانگی نیسان دزی (٤-٥) بەچکە دێنێ بەشێری گوانی خۆی بەخێویان دەکات: شەو دەردەکەوێ.
٢-جاسوس: شوفار.
- سیچکە سلاوە: سیچکە سلاو: قنچکە: دگدگە: دۆمەڵێکی بچووکە و لەبێڵوی چاودێت.
- سیخوری: دانوسان: سووسەکردن: قووتەتکردن گەریال: ماشاندن: زیرەوانی: دزنیرۆیی: دیدەوانی: شۆفاری: ژێرزوانی.
- سیر: سەوزەیە لە تیرەی پیاز.
- سیرمە: ١-پێستی مەڕ و بزن لە ئاودا نەرم ئەکرێتەوە زۆر بەبارێکی ئەیبڕن.
٢-بریتییە لەمرۆڤی لاواز و بێ هێز.
- سیرمە: سیرمەکردن: پارچەپارچەکردن.
- سیرمۆکە: گوڵێکە پەڕەکانی ورد و کۆمەڵە، لاسك نەرمە بێ دڕکە بۆنی هەیە، سەلکەکەی بۆناو ترشیات بەکاردێ.
- سیرەکۆڵە: بەردی ساف و لووسی نێو ئاوی خوڕە، لەنێو کوردەواریدا بۆ سواقی ناومال و لووس کردنی بەکاردێ.
- سێرۆکە: ئامێرێکی جەنجەرە لەچوارپارچە ئاسنی پان پێکهاتووە دەخرێتە بن کلچووکە و بەبزمار قەیم کرایە بۆ پاراستنی دارەکەی دەوری کلحووکەیە کەڕووبەرەکەی چوار گۆشەیە لە دەوری (١٠-١٢)سم دەبێت.
- سیفەتی سەگ: سەگ سیفاتی خۆی هەیە بەرگری لە ئاژەڵ دەکا بەئەدەبی، نابێ جوجکە خۆربێ، نانی بێگانە نەخوات، لەکاتی مەڕزان بەدیار مەڕەوە بێت، گەر بەردت بۆ هاویشت نابێ دوای بەرد بکەوێت، نابێ بەدزی خەڵك بگرێ لەکاتی مەڕ لەوەڕاندن بەپێش مەڕی دەهات و دەچو کلکی شۆڕ دەکاتەوە بۆ ئەوەی مەڕ نەترسێ.
- سێرەگرتن: نیشانەگرتن.
- سێرەلێگرتن: نیشانە لێ گرتن.
لەو وەختە کە سێرەی لێ گرتبوو خەریك بوو دەستی لێ بکێشی. (حەمەدۆك-٢- ل٢٧)
- سێران: سەیران: گەڕانی دەرودەشت.
سەیران مانگی نیسانە چونکە وەعدەی گوڵانە.
- سیروان: ١-رووبارێکە لەکوردستانی ئێرانەوە دێت و لەشارەزوور چەمی زەڵم و رووباری تانجەرۆی تێ دەرژێ ئەبێتە رووبارێکی گەورە دوو پردی پاشماوەی ساسانییەکانی لەسەرە بەناوی (کناچان و مەیدان).
٢-وەك ناوی جوگرافی بەکاردێت بۆ گوندەکانی نزیکی کەپێیان دەڵێن ناوچەی ئەم بەر و ئەوبەری سیروان کەپیتی (س) وەکو بن لەهجەی جافی زۆر بەکاردەهێنن. ٣-ناوی کوڕانە.
- سیقە دۆرە: سییقە تۆرە: کوڵە زرك: چڵەدان: چڵان: چیکڵدانە.
- سیسەلە: لاواز.
- سیسارکە کەچەڵ: جۆرە باڵندەیەکی ناشیرینی وەك قەلەڕەشە سەرکی رووتاوەیە: زۆربەی ژیانی لەسەر کەلاکی تۆپیوە.
- سیس عومەر: گوڵێکە پەڕەکانی ورد و زەردەلاسك رەقە و بێ دڕکە بۆنی هەیە، ماڵییە.
- سیکالین: گوڵێکە پەڕەکانی کۆمەڵ و رەنگاوڕەنگە، لاسك نەرمە و بێ دڕکە بۆنی هەیە





ماڵییە و لەکێوانیش هەیە بەقەلەم و بە تۆو زیاد دەکرێت بۆ جوانی بەکاردێ.
- سیك: سویك: بازاڕ.
- سیلح: سیلاح: چەك: بریتییە لەتفەنگ و دەمانچە و ئامرازی شەڕ.
- سیلە: قۆزی: گۆشە: قوژبن: گوھ: کونج.
- سێلە: سێرە: نیشانە: ئامانج: ئارمانج.
سیمرغ: پەلەوەرێکی زۆر گەورەی خەیاڵییە ئەڵێن شوێنی لە کێوی قافە.
- سینە: سنگ: سینگ: ئەندامێکی بوونەوەرە.
سینگت ئەڵماس دووسەر یەك یەك لە جگەرم راچوو.
- سینەباز: یارییە لەیاری کەوشەکدا ئەو کەسەی پشت ئەچەمێنێتەوە بۆ ئەوەی هاوڕێیانی بەسەر پشتی باز ئەدەن ئەو کەسەپشت ئەچەمێنێتەوە کە لە یارییەکەدا دۆڕابێ.
- سینەبەند: لەسینگی ئەسپ ماینی رەسەن دەبەسترا بۆ جوانی.
- سینج: پلپڵەی دەوری کەللەی دەف.
- سینە خەفو: تەنگەنەفەسی.
- سینی: سنی: سێنی.
- سیوسیوە: سەری ئەو دارەی دەرگایە کەلەسەر ریشمەدا دەسووڕێ.
- سێبەر: سێوەر: نزار: نسار: لاسار: سەهەن: نسر: سای: سەهێن: سا: نسرم: دوورەتاو: سەھ: سەها: سێوەر: سێھ: سیھ: سییەھ.
شوێنی هەتاوی وێ نەکەوێ.
- سێ بەرۆ: نەخۆشییەکە تووشی ئادەمیزاد دەبێ دوورۆژ تاو لە دژی تایەتی و رۆژی سێیەم تاو لەرزی دێتی.
- سێدارە: دار: قەنارە: قنارە:
١-سێدارە پەتێکی پیوەمرۆڤی پێ دەکوژن.
٢-لە چەندشیشی تیژی چەماوە پێکهاتووە قەساب گۆشتی پێوەدەکات.
- سێو: سێف: سێڤ: ساو: سۆو: سیوێی: سێوی: سێوێ: ساویی: بەری داری سێوە.
جۆری زۆرە وەك: ١-تەپکانی: ٢-جانگۆلی: ٣-سیلان: ٤-زافەرانی: ٥-شامی: ٦-لاسۆر.
- سێوێ: ١-سێو: ٢-بێ دایك: ٣-ناوی ژنانە.
- سێوەنگ: ١-رەش: ٢-پیوەست.
- سێبەر: سێبەهاردیتو: کەبە گورترین تەمەنی ولاخی یەك سمە.
- سێکوت: جۆرە پێکهاتنێکە لەنێوان جووتیار و خاوەن موڵك ئاووزەوی لەسەر خاوەن ملکە و سێ یەکی بەرهەم وەردەگرێ.
- سێیەکبەری: جۆرێکە لەپێکهاتن لەنێوان خاوەن زەوی و جووتیار بۆ تۆوکردنی زەوی، ئاو و جووت و تۆو، لەسەر خاوەن ملکە و کاریش لەسەر جووتیارە و لەسەر خەرمان بەرهەمەکە دەکرێتە سێ بەش دوو بەش بۆ خاوەن ملکە بەشێکیش بۆ جووتیارە جوتیاردەیبا.
- سیەقە: سەدەقە.
- سیەکەرگ: رەشۆڵە.
- سێبەندی: فێلباز.
- سیەدەس: دەست رەش.
- سێپێك: سێپایە: دێزپا: مەشکەژەن: مەشکەی پێوە دەبەستن بۆ هەژاندن.
لەشەیتانی بشکێ نێك لنگی ببێتە سێپێك .
- سیل: بەرهەنك: دەردەباریکە: نەخۆشییەکە: ئازارە باریکە: ئازارسی: دەخەز: وەرەم: تووشی سینەی مرۆڤ دەبێ.

# ش

١-لەزاری (زازایـی) بـەزۆری پیتـی (ش) دەبێتـە (س) وەك:
شینی تۆ: سینەی تۆ.
شیا: سیا: واتەڕەش.
شەش: سەس:
شەیتان: سەیتان.
٢-بەپیتی (چ) خۆی دەگۆڕێتەوە وەك:
تۆیش: تۆیچ.
تۆیچ ئینسافت: بۆ هەنی وەسەن دەس.
(مەولەوی)
بەندەیش: بەندیچ.
بەندەیچ ئەربابم... (رشتە -٦- ل١١٩)
منیچ: منیش.
پێکێك بۆ منیچ تێکەن. (رشتە- ل١١٩)
- شا: ١-شەه:شاه: شاهنشا: فەرمانڕەوای چـەند مەملەکەتێك.
٢-گەورەی شای ماران:
٣-شابەچکە: بەیەکەم بێچوی سەقەر دەگوترێ ئەگەر سەقەرسێ بەچکەی هەڵهێنا.
٤-لە پارسی کۆندا بەمانای سەروەر یا خواوەند یا دروست کاری جیهان دێت: ٥-شاد.
- شاباڕ: کەوی تەمەن دووساڵە.
- شاباز: ١-یەکەم بازی بازدانی یاری سینە باز و، سێیەم بازی سێ باز: ٢-ناوی کوڕانە.
٣-ناوی شارێك بووە کە دامەزرێنـەری ئـەو شـارە (بازی کوری دۆستەك بووە).
- شاباش: ١-شادباش: شاهباش.
وشەی شاباش لە (شادباش) وەیا لە (شاه باش) وە هاتییە واتە بژی.
٢-پوولە: زەرئەوشان: زەروەشان: شاواش: خـەڵاتی چاوەشان لەکاتی داوەت گێڕاندا.
٣-خـەڵاتی شـایەر و گۆرانیبێـژان لـە کـۆڕی گۆرانی گوتندا.
- شابوون: شادبوون.
- شابن: شادبن.
- شابە: شادبە.
- شابانو: شەهبانۆ: ١-شاژن:
٢-ئەو ژنەی دەبێتە شا.
- شابسك: بسکی گەورەی ژنان.
- چاوت هەڵنایێ لەبەر بیسك و شابیسکان.
- شاپ: پێن: پێلاقە هاویشتن بۆ کەسێ.
- شات: فیز: دەعیە: تەکەبوڕ: شاتوو شووت.
- شاتاغ: تەڕوجوان پۆش.
- شاتاڵ: شاتاوڵ: شالاَو: هێرش: هجوم.
- شاتر: تەتەر: بەوکەسە دەوترێ کەنامەی دەهێنا و دەبرد لەنێوان شوێنە دوورەکان .





- شاتوو: شەتوو.
- شاتی: ئەو زەوییەی کە پاش لافاو و لێشاوی زێ و رووبارەکان پەیدا دەبێ زۆربەپیتە، بەڵام جێگـەی ئەگۆڕی بەگوێرەی ساڵ لەوانەیـە شـاتی ئـەم سـاڵ بێتـە (بەسـت) بـۆ سـاڵێکیتر، ئـەم وشـەیە لەدەوروبەری (زێ)ی بچووك بەکاردێ.
- شاجۆگە: شاجۆگەڵە: شەجو: جۆگـەی سـەرەکی لەشیناوەرد کە ئاوی سەرەکی دێنێ بۆ شیناوەرد.
- شـاجەلاتین: خـۆراکی شـایانە: کـە دەدرێـت بەبێچوی هەنگ کە دەبێت بەشاهەنگ.
- شاخ: ١-لق: ٢-شاخە: چیا: ٣-قۆچ.
٤-ناوی گوندێکە کاتی خۆی هەواری میری بۆتـان بووە لەکوردستانی باکوور.
- شاخدار: بەقۆچ: قۆچلی.
- شاخ و داخ: شوێنێك چیای زۆربێ.
- شاخە: ١-هاڕە: هارە: ٢-چیایە: ٣-قۆچە.
- شاخ سۆزانمەن: لق و پۆپم دەسوتێ.
- شاخی: کێوی: چیایی.
- شادالّ: جۆرێکە لەتەیری دال.
- شادان: ١-کەیف خۆش: ٢-ناوی کوڕانە.
- شادمان: ١-شادومان: بەختیار:
٢-ناوی کوڕانە.
٣-ناوی کچانە.
- شادەکامی: شایەکامی: چاوتێبڕین.
- شادی: شاهی: خوەشی: خۆشی.
- شادی لغ: شایی و زەماوەند.
- شار: شەهر.
- شارانگەڕ: گەڕیدە: گەڕۆك.
- شارستان: شارسان.
- شارستانی: ١-خەڵکی شار: ٢-مەدەنی.
- شاروەدەر: شاربەدەر: بە سووکایەتی دەرکردن.
- شاریحانە: ئەو ریحانەیەکە لەماڵان دەروێنرێت.
- شارە: ئەو تفرەکایەی کە دەبێتە ناوبڕەی بـەینی دەغڵ و دیواری قوری چاڵی گەنم داکردن بۆ ئەوەی مۆرانە لە دەغڵ نەدات.
- شارێگا: رێگای سەرەکی هاتوچۆ کردن.
- شاعیر: هۆنەر: هەستیار: هۆزانڤان.
- شـارەدێ: دێگـەورە: ئـاوایی مـەزن: هێـشەت: گوندی گەورە و قونما.
- شـارەزا: ١-کـارزان: شـەهرەزا: کارئاشـنا: کـاربین: بەدڵـەد: سـاڵۆز: فێـرس: جەرجهـە: کارچالاك: نکوول.
٢-شوێن ناسین: ٣-ناسینی کەسێك.
- شارەگ: شەرەگ.
- شارە مێرولە: مێروستان: کونە مێرولە.
- شاری خامۆشان: قەبرستان.
- شازاد: شەهزاد.
- شاژن: ١-ئەو ژنەی دەبێتە فەرمانڕەوا، فـەرمان دەگرێتە دەست: ٢-مەزن و سەرۆکی عەشـیرەت و خاوەن دام و دەزگای تایبەتی.
- شاسوار: شەهسوار.
- شاش: ١-تووشی هەڵەهاتوو.
٢-لەنگ: خوار: ٣-دژی سفت.
- شاشبوویە: هەڵەی کردووە: خەلەتی کردییە.

- شاشکرن: خەڵەت کردن: هەڵەکردن.
- شاشما: چاش ما: داما: راما: شڵەژا.
- شاش و واش: ددانی کەل.
- شاڤین: دەنگی کەروێشك.
- شاقەل: داوێن: دامێن: دامەن.
- شاقەلەڕەشکە: جۆرە باڵندەیەکە.
- شاقولی بەگ: شەقلاوەی ئاوەدان کردۆتەوە و شەقڵاوە کورتکراوەی ناوی خۆیەتی.
- شاکار: شاکردار: کاری بەرز و پڕسوود: شاهکار.
- شاکەزی: کەزی گەورە و ئەستوور و درێژی هۆنراوەی بەسەرپشتدا شۆڕ بووەوە.
- شاگرد: ١-شاگرت: قوتابی: خوێندکار.
٢-بەردەست: پادەو.
- شاگردانە: رۆژانە: ئەو پارەی لەبری کارکردنی شاگردی وەردەگیرێ.
- شاگرد ئۆغلان: دارێکی دوو گۆییە بەقەدەر دارکلاوەیە، لەدوای چەسپاندنی پێچکەکانی قادەی شەغرە لەزەوی شاگرد ئۆغلانەکە دەدرێتە بەرپشتە کەوانەکەی (قادە) لەکاتی راست کردنەوەی شەغرە هەتاوەکو ولاغی شەغرەدێتە بەرشەغرەکە و باردەکرێ.
- شاگردخانە: هۆبە: پۆل: ژووری فێرگە.
- شاگوڵ: گوڵی گەورە و جوان.
- شارگەردان: هەڵبژاردنی (شا) لەرێگای بازبەردانەوە کە لەسەرکەسێ دەنیشی.
- شاگەشکە: ١-سەرسام:
٢-زۆرشادومان.

- شال و پێتاو: پارچەیەکە جۆلالە بەن دروستی دەکەن نزیکەی چوارپەنجە پانە، لەسەر گۆرەوی بەن دەیبەستن بۆ ئەوەی زەلام گورج بێ لەڕۆیشتن.
- شالوول: شالوور: بولبول.
- شالگەردن: مل پێچ: ملوانکە: لەخوری دروستدەکرا بستێك پانە بۆ پارێزگاری مل بەکاردێ لەسەرما.
- شام: شیڤ: شێو: نانی شێوان: نانی ئێوارە.
- شازولف: زولفی گەورە.
- شال و شەپك: شەل و شەپك: دەلینگ فرە: بریتییە لەجۆرێك لەجلی کوردی پیاوان کەناوچەی کرمانجی سەروو لەبەری دەکەن و جۆری زۆرە وەك (بنەفشی، پشت بەز، خەزالی، خورمەیی، بەکربەگی، بادی، شین خوری، رەش خوری).
- شاخی حەجامەت: ئەو قۆچەی کە کون کرایە و سەری تیژە بۆ خوێن مژین بەکاردێ بەتایبەت مار بەشوێنی وەبدات بەو شاخە خوێنی ئەم دەمژن بۆ ئەوەی ژارەکەی بێتەدەرەوە.
- شاخانە: ١-لەجیاتی خەرج و باجی زەوی بڕێك پارە لەعەشیرەتەکان دەسێنرا کە بۆ هەرتاقە سەرێك بزن و مەڕ هەندێ پارە و بۆ هەر تاقە سەرێك گوێ درێژ و رەشەولاغ هەندێ پارەی تر بوو: ٢-چیایانە (سەیری ئەم شاخانە).
- شامسری: جۆرێکە لەشیری چاك.
شیری وان شامسرینە.
(تحفه -؟-)
- شاموراد: شادموراد: بەئاکام گەیشتوو.





- شامێرو: میری مێروان.
- شامی نۆك: کەلی نۆك: نۆکی کولاو.
- شانامە: شاهنامە: شەهنامە:
١-کتێبە ناودارەکەی فیردەوسی لەمێژووی شاهانی ئێراندا بەشیعر.
٢-بەهەربابەتێکی درێژیش ئەوترێ
- شاند: نێردە: هەناردراو.
- شاندان: نیشاندان: پیشاندن: پیشاندان.
- شاندن: ناردن: هەناردن.
- شاندیی: شوفار.
- شانس: شەنس: بەخت: هیر.
- شانشین: شانشی: ١-پاتەخت: کۆشکی شاهانە:
٣-ژوورلەناوژوور: ٤-ژووری لەسەریەکتر.
- شانۆ: ١-بوەشێنی: ٢-مەسرەح:
٣-ناوی کوڕانە.
- شانە: شە: شونە: شانگ: شان:
ئامرازێکی قژداهێنانە جۆری زۆرە.
- شانەی هەنگ: پوورە شلخە: پوورەی هەنگ: شلغە.
- شانا: هەڵپیدا: وەشاندن.
- شاناز: ئاوازێکی موسیقایە.
٢-ناوی کچانە.
- شاول: شاولی بەنا: تەنێکی لوولەکی بچکۆلەی قورس بەبنەتایەکی قووچەك کۆتایی دێت، ئەم شاوولە بە دەزوویەکەوە هەڵدەواسرێ کەسەری یەکەمی دەزوەکە بەناوەڕاستی پارچە ئاسنێکی چوار گۆشەدا تێدەپەری کە درێژی لایەکی یەك نەبەتیرەی کەیان قووچەکە کە ولەکاتی بەکار هێناندا تەنیشتێکی پارچە ئاسنەکە لەگەڵ رووی لاتەنیشتی دیوارەکەدا جووت دەکرێت و واز لەمەنگەکە دەهێنرێت بۆ ئەوەی دەزووەکە بارێکی شاوولی وەرگرێت.
- شاهوار: ئەوەی ئەوەندە چاك بێ شایانی شابێ.
- شاهۆ: ١-شاخێکە لەهەورامانی بەشی کوردستانی ئێران:
٢-شاهێن.
٣- شینە شاهۆ: باڵندەیەکە رەنگی خۆڵەمێشییە لەحاجی لەقلەق دەچێت، لەناو لقی درەختە بەرزەکاندا هێلانە دەکات بۆق و ماسی دەخوات:
٤- نازناوی شاعیرێکی کوردە: ٥-ناوی کوڕانە.
- شاهەنگ: میری هەنگان: شای هەنگان: گەورەی هەنگان.
- شاهێد: شایەد: شاهد: گەواە: شایەت: ئاگادار لە کارێکی نادیار.
- شاهێن: شایین.
- شایان: شایستە: شیاو: خورەن.
- شایلۆغان: مۆسیقا .
- شایەر: بەیت بێژ و داوەتگێڕ و حیکایەت خوانبوون.
شایەرەکان ژن و پیاوی دەگرتەوە وەك ئەمانەی خوارەوە:
١- شایەری پیاو کە لە دیوەخان و هەموو شوێنێك گۆرانی دەگۆت و حیکایەت خوانیش بوو.

٢- سەرەژنی واش هەبوو لەوەختی ئاسایی بەیت و حەیرانی دەگوت و بۆ مەجلسی ژنان لەشینگایان بەئاهەنگێکی زۆرپرسۆز بەمردوویان هەڵدەگوت.

٣- شایەری ژن هەبوون کە داوەتیان دەگێڕا و دەفیشیان لێدەدا.

- شایەری گەڕۆك: بەو شایەرانە دەگوترا کەبەهار و هاوین و بەشێکی پاییز خەریکی کاسبی و جووت و گابوون کەشەودرێژ دەبوو کاری مەزرایە کەم دەبوو وێ دەکەوتن و بەماڵە ئاغایاندا دەگەڕان و هەرماڵێك چەند رۆژێك دەمانەوە و کۆڕی بەزمیان دەڕازاندەوە و شاباش و خەڵاتی باشیان دەستاند سنووریشییان دەپەڕاند گەرمێن و کوێستنایان دەکرد.

- شایەری شایی: ئەو شایەرەی گۆرانی بۆ شایی دەگوت دەف یان تەپڵیش لێدەدات لەگەڵ گۆرانی گوتن.

- شایەری وەستا: ئەو شایەرەی بە دادەنی و بەیتە کۆنەکانیش دەزانی.

- شانە: ١-بەشێکە لە ئامێری عود: لەکۆتایی دەستەڕاستی رووی ئامێرەکە پارچە دارێکی درێژکۆلەی کون کون کراو بۆ بەستنی تێلەکان هەیە پێی دەڵێن (شانە).

٢- شە.

٣-شانەی هەنگ.

- شایەك: ١-شاهێد: ٢-بەڵکو.

- شایی: داوەت: شاهی: دیلان: گۆوەند: گۆڤەند: چۆپی: زەماوەند: سور: دەوات: هەڵپەڕکێ.

شێوەی نیوە بازنەیەوخڕە، زەلام لەتەنیشت یەك دەوەستن دەستی یەك دەگرن و قۆڵیان تێك هەڵدەکێشن و شان دەدەنە یەك و هەڵدەپەڕن شایی چەند دەستوورێکی هەیە وەك:

١- ئەو کەسەی لای راستی شایی پێی دەڵێن سەرچۆپی.

٢-ئەو کەسەی لای چەپی شایی پێی دەڵێن"گاوان".

٣-ژن دەبێ لەلای پشتەوە بچێتە ناو شایی کەچووە ناو شایی پێی دەڵێن (دۆ).

٤-پیاو دەبێ لەلای پێشەوە بچێتە ناو شایی.

لەهەر ناوچەیەکی کوردستان جۆرەشایەك دەکرێت و ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە وەك ئەمانەی خوارەوە:

١-چۆپەیی: ٢-سوسکەیی: ٣-تەمبولی:
٤-شێخانی:
٥-سێپێیی: ٦-ئایشۆکی: ٧-خانم مەرۆ: ٨-هەڵپەڕینی گەورە: ٩-شەمرۆکە:
١٠-مام هێزدین: ١١-دووپێی:
١٢-فەتاح پاشایی: ١٣-رۆینە:
١٤-لەنجەهەبلەیان:
١٥-پردێ باسن: ١٦-رەقاسە: ١٧-شنگاری:
١٨-سەما کۆچەری: ١٩-گول شێنی:
٢٠-کەمەرە لەرزین: ٢١-دەنانێ: ٢٢-تووسکی:
٢٣-هەرێ گولێ:
٢٤-راستە: ٢٥-چۆك چەمینە: ٢٦-دێکۆ:
٢٧-سنجانی:





٢٨-پەرەورەو: ٢٩-سێجار: ٣٠-بابلەکان:
٣١-گۆڤەند:
٣٢-بێلانتی: ٣٣-سولەتکی: ٣٤-چوخ جانۆ:
٣٥-کەپرۆکە: ٣٦-هەدرۆ.

٥-هۆنراوەی شایی: هەر جۆرە شاییەك جۆرە هۆنراوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە.

- شایی دابەستان: سەرتای شایی دەستپێکردن.

- شایی رەشبەڵەك: کچ وکوڕ یان ژن و پیاو بەیەکەوە هەڵپەرین.

- شایی کەران: ئەوانەی شایی دەکەن.

- شایی گەڕان: نەپسانەوەی شایی و بەردەوام بوونی.

شاییەك ئەوا دەگەڕێ لەمن وابوو گەمەیە.

(هۆنراوە- ل٢٣٧)

- شایی لەدڵداگەڕان: شادومانبوون.

- شایی بەخۆهاتن: کەیف بەخۆهاتن.

- شایەر: شاێر.

- شباب: ئامێرێکی مۆسیقایە و جۆرێکە لەشمشاڵ لای ئێزدییەکان، ئەم ئامێرە لەدار دروست دەکرێت هەندی شمشاڵە ئەم ئامێرە لای یەزدییەکان زۆر پیرۆزە و تەنیا لەبۆنەی ئایینی تایبەتی خۆیاندا بەکاری دێنن.

- شبتی: شەوکوێری.

- شپنە: بیابان.

- شتاق: چتاق.

- شتاقو: چتاقتان: هیچ کامێکتان.

- شتر: حوشتر.

- شتروان: حوشتروان.

- شتل: شوتڵ: نەمام.

- شدیایی: قایم: مەحکەم.

- شتن: شۆردن: شوشتن: ششتن: شویشتن: شوتن: شۆشتە: شۆرین.

- شتی: ١-شوشتی: ٢-کشتی.

- شرك: لیك ئاو: لیکاو.

- شرکتك: گیایەکی شردارە.

- شراپێرك: زریان و باران.

- شراڵ بوون: هێز لەبەربڕان لەبەر ماندووبوون یان زۆر وێکەوتن: شروشیتال.

- شرە: شرەوپرە: کەل و پەلی لەکار کەوتوو.

- شرەنگ: ١-ژار: ٢-هەرچی تاڵ بێ.

- شفتی: شووتی: شتی: شامی: زبەش: ژبەش: خروزە: زیش: شمتی: زەبەش: هەنی: شومی: ژەبەش: زەبەش. بە تۆو دەچێنرێ وەرزییە بەشێکە لە شینایی، لە خواردنا خۆش .

(بەس لە شفتی بەختم سپییە).

(شوتیت بۆ نەخۆش هێناوە (بە عەجەلەی).

- شتر:حوشتر: حێشتر.

- شتروان: حوشتروان.

- شڤ: شیو: نانی ئێوارە.

- شڤدار: داردەست: عاسا: عەسا.

- شقاتە: شەقاتە: شقارتە: شقالتە: شەمچە: کبریت: شخارتە: شقالتە.

- شکا: ١-بەرزی

٢-شکستی.

- شکات: سکاڵا: داد: گازاندە.

- شکاتکردن: شکایەتکردن: سکالآکردن: دادکردن: گازاندەکردن.
- شکاتکەر: سکالآکەر: شکایەتکەر: سکالآچی.
- شکار: ١-کەرە: کوسپار: زەوی بەردەلآن عاسی: ٢-راو: ٣-ئاسك: ٤-ناوی کوڕانە: ٥-زوورگ.
- شکاربەند: پارچە قایشێکە درێژی دووگەز لەپارچە (بدنە) ئەخرێت و سەرەکەی تری ئەبەسترابە و (ترافی) باز لەسەر هەڵنشتن.
- شکارەوان: راوچی.
- شکارت: مەڕ و رەشماڵ و پارە کچ لەگەڵ خۆی دەهێنی لەکاتی مێردکردن لەماڵی باوکەوە بەمە دەڵێن شکارت.
- شکارتە: ١-چاندن بۆ رەنجبەر لەجیاتی سەپانی یان جووتیاری.
٢-چاندن بۆ هەژاران بەخێر.
٣-چاندن بۆ خۆشەویستان.
٤- چاندن بۆ مەلای دێ.
- شکان: بەزین: هەلآتن لەبەر دوژمن لە مەیدانی شەڕ.
٢-لێبونەوە.
٣-لەناوەندی دووکەرت بوون.
- شکاندنەوەی تووتن: لێ کردنەوەی پەلکە پێ گەیشتووەکانی تووتن.
- شکۆ:١-تەنتەنە: گەورەیی: مەزنی: مەزناهی.
٢-سووکەڵە ناوی شوکر.
- شکۆدار: پڕشکۆ: خاوەن شکو: بەدەبدەبە.
- شکۆفە:١-خونچە: ٢-ناوی کچانە.
- شکەفت: ئەشکەوت.
- شکەنج: ١-ئەشکەنجە: ئازار: ٢-چرچ و لۆچ.
- شل: دژی پەیت.
- شلعەت: سەریعەت.
شلکەی ران: نەرمەی ران.
- شلکێنە: جۆرێکە لەخواردنی کوردەواری.
شل و خاو: دژی توند و تۆل.
- شلێر: ١-ناوچەیەکە لەگەرمیان:
٢-ناوی کچانە.
٣-ئاوازی چەند گۆرانییەکی کۆنی کوردەوارییە وەك وەرەوەوە بابچینە ناو شلێران، شلێرەوەی شلێرە.
٤-گوڵێکە پەرەکانی گەورە و درێژە و کراوەیە لاسك نەرمە بێ درکە بۆنی نییە و کێویە بەتۆ و بەسەلك زیاد دەکرێت.
- شلێك: گوڵێکە پەرەکانی وردە و چوارپەرەیە لاسك رەقە و درکی هەیە بۆنی هەیە کێوییە بەتۆو بەرەگ زیاد دەکرێت.
- شلی شۆپ: تەڕوتوشی.
- شلێوە: شرێوە: لێلاڤ: بەفر و باران بەیەکەوە بارین.
- شمشاد: ١-شمشال.
٢-شمشار: درەختێکە و گەلآی باریك و درێژوموو ئامێزن تاسەر زەوی شۆردەبێتەوە.
- شمشال: بلیل: ١-ئامێرێکی میللی کوردەوارییە حەفت کونی هەیە ماوەی نێوان کونەکانی سەرەوەش یەکسانن لەبۆری زەرد یان سپی دروست دەکرێ یان لە دار گوێز دروستدەکرێ.
٢-شمشاد: ٣-بریتییە لەقەدی شوشی و باریك.





قەدی دەڵێی شمشاڵە.
٤-زۆر لەمێژە لە کوردەواری بەکارهاتووە بە تایبەتی شوانانی کورد لەبەرمەڕی لە دەشت و دەر ئاوازی تایبەتیان پێ ژەندووە وەك (ئاوازی قەل و بەل) ئاوازی سەرچیا، ئاوازی هەوارە بەلێ.
- شمشال ژەن: ١-شمشال لێدەری چاك کەزۆر ئاواز بزانێ و بتوانێ بەشمشاڵ لێبدات: ٢-نازناوی ئەو کەسەی زۆر شمشاڵ دەژەنی، ئەحەی شمشال ژەن.
- شمشە: چەمچە: چومچە.
- شملی: گیایەکە لەسێ پەڕەدەچێت، تۆوەکەی بۆن خۆشە و بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت دژی کۆکەیە هەروەها گیایەکە بۆ لەوەڕباشە.
- شمشێر: شیر: شوور: شووشکە: شویر.
ئامرازی شەڕی کۆن بووە رۆلی کاریگەری هەبووە لە شەڕدا.
- شیری پشت کەندوان: یارمەتی دەر.
- شمشێرە: بەودارە بەتینە لە لەکرایەدەلێن کە بەناو کیسەڵەی دەرگای دار هاتوچۆ دەکات دەرگا لەدیوار قایم دەکات.
- شنگ: هێز: تاقەت.
بێ شنگ و تاقەت: بێ هێز و تاقەت.
شنگم لەبەربڕا: هێزم لەبەربڕا.
- شنۆ: ١-شنە:
٢-شارێکە لەکوردستان.
- شنەوتن: شنەفتن: شنەفتەی: گوێ لێبوون: بیستن.
- شنگین: زرنگە: زرینگە.
- شوان: ١-شڤان: شڤێن: چۆپان: شوو.
ئەوکەسەیە کە ئاژەڵ دەلەوەڕێنێت، جا چ خاوەن ئاژەڵەکە بێت یان شوانی کەسێك بێ.
٢-ناوی کوڕانە.
٣-نازناوی هونەرمەندێکی گەورەی کوردە.
٤- ئاوازێکی گۆرانیبێژی گەورەی کورد شەماڵ سائیب.
شوانە هۆ شوانە شوانەی رەنجەڕۆ
- شوانانە: کرێ شوان.
- شوانکارە: کەسێکە بەخۆی، منداڵییەوە مەڕوماڵآتی خەڵك بەخێوبکات.
لە جیاتی کرێ (سپیاتی و نیوە بەرخە نێر و خوری دەخوات) ئەوە ئەگەر شوانکارە کە بە خۆی هیچ مەڕوماڵآتی نەبێت، ئەگینا نیوەی بەرخەمێش دەبات.
- شوانی پسپۆڕ: ١-ئەو شوانەیە کە هەرچەند مێگەلەکەی زۆر بووایە ئەگەر سەرێکی لێ ون بووایە کاتی بەسەر کردنەوە دەیزانی چتۆیەکە.
٢- کە کار و بەرخ بەردەدەدرانە بەردایکیان لەبەر زۆری هەندێکیان بەدایکیان نەدەکەوتەوە شوانەکە کار یان بەرخەکەی لەباوەش دەکرد و دەگەڕا تادایکەکەی دەدۆزییەوە یاخود شوانەکە بەبێ تێ بەردان دەیزانی کام بەرخ هی کامە مەڕە.
- شوانی خراپ: بەو شوانە دەگوترا کە رانەکەی باش نالەوەڕێنی و مەڕی دەکوشت بە (پلاران) مەڕی دەڕۆیی و ئەو دەنووست.
شوان خافیلکە: جۆرە باڵندەیەکە، مەدایەکی کورت دەفڕێ و دەنیشێتەوە.

- شوتك: پشتێن: پشدێن.
- شوارِ: شوورِ: شورِك.
- شولك: مشە: زۆر.
- شواندا: دوای ئەوە.
- شنك: گولێکە پەرەکانی گەورەیە و ئەستێرەییە لاسك نەرمە و بێ درکە بەبۆنە، کێوییە بەتۆ و بەسەلك زیاد دەکرێت.
- شوان هەڵخەڵەتێنە: لەساڵی هات و لەوەرخۆش دا بە دەگمەن وابووە شیر پەرییتە گوانی گیسك بەبێ زان ئەوکاتە پێ دەڵێن شوان هەڵخەڵەتێنەر.
- شوونەوار: شوێنەوار.
- شورقا: هەردوو سپیرینگی ئەم لا و ئەولای فاقی چۆلەکە گرتن.
- شورەت: داب و دەستوور:
عورف و عادەت: رێورەسم.
- شوفێر: شفێر.
- شوقاق: نەخۆشییەکە درمە، تووشی ئاژەڵ دەبێت و پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوە، ئەگەر لەدەماپەیدابوو پێی دەوترێ(تەبەق) ئەگەر لەسمدا بێ پێی دەوترێت(شەلکە) لەهەردوو جۆرەکەدا بلۆق: پەیدا دەبێت و دەتەقێت و دەبێتە برین.
- شولکێن: کشان.
- شوکرانە بژێر: قایل بوون بەکاری خوا.
- شۆ: شۆم: شۆو: شوویم: شۆڤ: شوخم: شوڤ.
پەرێز یان بەیار یابورەی کێڵدراوی لە وەرزی زستاندا.
شەر لە شۆ نەك لە تۆ.
(پەند)
٢-برۆ: ٣-بروا: ٤-مێرد: شوو.
- شۆبرین: زەوی کێڵان، لەزستان دەکرێ لەدوای پەڵەکەوتن یاباران بارینی چاك لەمانگی (١-٣) و هەتا حاجی لەق لەق دێت.
- شۆپ: رێچ.
- شۆخ: ١-جوان: نازدار: ٢-ناوی کچانە.
شۆخونازدار، کۆنە یارم.
- شۆخی: ١-گاڵتە: ٢-جوانی.
- شۆر: ١-خوشەویستی: ئەوین: ٢-دزی گورج: شەرِوالی شۆر: ٣-سوێر.
٤-تام و لەزەت: ٥-هەرا و ئاژاوە.
- شۆراب: پێ بەکوڵك.
- شۆرِێ: ناوی کچانە.
- شۆریاگ: شۆراو: شورای.
- شۆرە: ئەو ماددەیە کە هیربارى سفری پێ سپی دەکەنەوە.
- شۆرەزار: زەویی شۆرەکە: زەوییەك خوێی زۆربێت
- شۆرِەژن: بەو ژنە دەگوترێ کە بەداب و دەستوور و بەمشورە، لەبەرێوە بردن زۆرزیرەکە.
لەگەڵ تۆمە شۆرەژن بالەسەر تۆ بکوژن.
- شۆرەکات: شۆرەزار.
- شۆش: تاڤگە.
- شوعلە: ١-شۆڵە: تیشك: ٢-ناوی کچانە.
- شۆق: شەوق.
- شۆن: ١-شوێن: ٢-دوا.





- شوین خەرمان: جێ خەرمان: جێ جۆخین:
ئەو شوێنەی جۆخینی لێ دادەنرێ.
- شوو: مێرد: شۆ: شوی: پیاو.
- شووبەست: جێگای شوولە لەشی مرۆڤ.
- شووارگە: جێگای دەست لێدان.
- شووارگرتن: شووارۆگرتن.
- شووبرا: هێوەر: تی: برای مێرد: شوورا.
- شوور: گاکێوی: گاکیڤی: فیلەگرد.
- شوورازا: منداڵی شووبرا.
- شوورا: شوبرا.
- شووخ: شۆخ: جوان.
- شوورە: شویرە: شویرەهە.
- شوورهنگف: شیرهەڵکیش.
- شوورەسوار: شۆرِەسوار.
- شووشە: شویشە: شیشە: بلوورە: جام.
- شووشەبەند: مینابەند:
شوێن و جێگای شوشە کرابێ.
- شووفار: شۆفار: جاسوس.
- شووم: ١-دەمۆر: ٢-مێردم: پیاوم.
- شووەڵە: شوعلە: رووناکی.
- شوون: شوێن.
- شوونك: شوینك: کوتك: جل شۆر: داقۆق: تێلا: شۆلك: شۆنك: گەلاکوت: کلارکۆ: کالا کوت: کوتکی جل شوشتنە.
- شوون هەڵگر: شوێن گێر.
ئەو کەسەی بە جێگای پێ دەرۆیشتن و برای دەدۆزییەوە.
- شە: ١-ئامرازێکە لە ئامێری جۆلایی لەدووبەش پێکدێ بەشی سەرەوە کێشکۆکە دەڵێنێ وبەشی بنەوە پۆتاری بن شەی پێ‌دەڵێن شێوە لاکێشییە (٨٩,٠م*٢٩,٠م) لاپێی خستە سەر شەپکەکانی و جولاندییەوە:
٢-شانەی پرچ داهێنان.
- شەباقە: شەبەق: لێك بوونەوەی دیوار کەلێنی دیوار
- شەبدێز: شەودێز: ناوی ئەسپەکەی خوسرەوی پەروێزە بۆیە و ناونراوە چونکە وەك شەوی تاریك رەش بووە.
- شەبکە شەغرە: داری نێوان پێچکە شەغرە.
- شەب خوز: گولێکە پەرەکانی کۆمەڵ و گەورەیە لاسك رەقە درکی هەیە بۆنی نییە ماڵییە بۆ جوانی بەکاردێ.
- شەبەك: ١-گۆمەڵە هۆزیکە کە بە دیالێکتی گۆران دپەیڤن: زمانەکەیان وشەیەکی زۆری فارسی و تورکی و عەرەبی و هەتا ئاسوریشی تێ خزاوە لێ تا نهۆ زوانی ئاخاوتنیان لە ٧٠٪ وشەی کوردی پەتیە چەند بیروڕایەکی جیاواز لەبارەی نیشتەجێ بوونیان هەیە یەکەم ئەوەیە کەشەبەك بریتییە لەپاشماوەی ئەو هۆزە کوردانەی کە لەنیشتمانەکەیانەوە لەچیای سماقە و لەولاتی شامەوە بۆ لورستان کۆچیان کردووە، کەچی هەموویان نەیانتوانیوە لەگەڵ رەوەی هۆزەکەیاندا بۆ لورستان برۆن و هەندێکیان لەرێگا بەجێ ماون لەوناوچەیە نیشتەجێ بووینە.
وشەی شەبەك لە مانای خوارەوە پەیدابووە:

١-شه (شا+بەك (بەگ))= شابەگ: ملك لملوك: شاهنشا.

٢-لەوشەی (شوانكارە: شبانكارە) وە هاتووە كەبە قسەی خۆشیان هەر بەشوانكارەیی و گەڕان بەدوای لەوەڕەوە لە ناوچەكانی نێوان هەورامان و كرمەشانەوە هاتوونەتەوە و لەم ناوچەیەی ئێستادا گیرساونەتەوە.

٣-نازناوی هەمووخەڵكی شەبەكە.

- شەبەگستان: بەو خاكە بیژن كە شەبەكی تیا نیشتەجێیە، كەوتینە نێوان رووباری دیجلە و زێی گەورە لەباكووریش سنووری شەبەگستان لەرووباری دیجلە و گوندی نەوەران دەست پێ دەكات و تێدەپەڕێت و باشیكە و دووبەردان تا دەگاتە ناحیەی كەلەك.

- شەبگیر: دەمەوبەیان.

- شەبەنگە: درێژایی شەو.

- شەپ: بەدەست لەكەسی دان.

- شەپالە: چەپالە.

- شەپرزە: شپرزە.

- شەپڵتە: شافلیتە: تۆپەڵە: شەپڵە: نەخۆشییەكە ئەندامی گیاندار سڕدەبێ و لەكار دەكەوێ.

- شەپە: بەفری خربۆوە.

- شەپەشەپ: پەلكوتانی ناوەئاو.

- شەت: شەد: خواربوون.

- شەتاو: ١-لافاو: ٢-زێگەورە.

- شەترەنج: شترەنج.

- شەتە: جۆرە نەخۆشییەكی ئاژەڵە.

- شەتەك دان: توندكردن: گرێدان: بەستان.

- شەختە: سەهۆڵ: بەیسە: كرە: قاق: قەشا: قر: كاك: رنە: یەخ: رچ: خۆڕسك: بەستەڵەك: جەمەد: بوز: توێژی سەرەوەی ئاوی گۆم و زەلكاو ئەبێ بەسەهۆڵ لە وەرزی زستان.

- شەختە بەندان: شەختە و بەستەڵەك: یەخ بەنان: شەختەبەند.

- شەخس: ١-كەس: ٢-قەبری پیاوچاكان.

- شەخەل: بژوێنێكی چروپڕ، سەوزە گیایەكی سفت و پڕ.

- شەدار: شێدار

- شەدە: قوماشێكی لاكێشییە لێوارەكانی بەڕیشوە لەسەر تیرەكەی دەقی دەكەن و بای دەدەن دەیكەنە لوولەیەكی هێندی باسك ئەستوور لەدەوری كڵاو دەپێچن و لفكی شۆڕ دەبێتە خوارێ پیاو و ژن لەسەری دەنێن.

- شەدەلار: ١-بۆ جوانی و عشیوە فرۆشتنە، چونكە جاران ئافرەتی كورد شەدەی لەسەری دەنا و بۆ جوانی لاری دەكردەوە.

٢-ئاوازێكی گۆرانییە.

شەدەلار مەرۆمەزادەر
جوانی جوان جوانی لای بانە
(گۆرانی زیرەك)
یاری مەزادەر شۆخی شەدەلار

- شەرار: زۆر تینو.

- شەڕ: جەنگ: كێشە: لەج: كۆماند.

رەزم: ژەنین: نەبەرد: نەوەرد:دلگەشە: چەلەسی: شێڕ.





- شەڕاب: شەڕاو.

- شەڕئەنگێز: شەڕهەڵگیرسێن.

- شەڕانی: شەڕخواز: ئەو كەسەی حەز لەشەڕ دەكات.

- شەڕ بەرپاكردن: شەڕ هەڵایساندن: شەڕ دروستكردن.

- شەربك: شەربە: لەقور دروستدەكرێ و سۆردەكرێتەوە و ئاوی تێ دەكرێت بۆ ساردبوون لە هاویندا.

- شەربەس: شەڕبڕ: ئاگر بەس: شەڕ ڕاوەستان.

- شەربەی كەرخ: شەڕبەی كۆن كە زۆر ئاوی تێ بكرێت ئاوەكە سارد ناكا دەڵێن (شەربەكە كەرخ بووە).

- شەرت: ١- ئەو ماوەی كە رەنجبەر لای ئاغا دادەمەزرێ بە زۆری بۆ شوانی و گاوانی ساڵ دووشەرتە.

٢-مەرج: گرۆ: گرەو.

٣-كرێی رەنجبەر.

- شەرتبی: شەرتبێ: شەرتوێ.

- شەرت لە تارداپەڕین: بەشەرتی جووتیار دەگوترێ واتە رۆژی دوای نەورۆز ماوەی شەش مانگ تەواو دەبێ.

- شەرت هەڵاتن: شەرت پەڕین: واتە مۆڵەتی ماوەی كاركردنی رەنجبەر لای ئاغا تەواوبوو، ئەمەش رێ و رەسمی تایبەتی خۆی هەبوو، هی جووتیار پێش ئەوەی وەردانەوە، تەواوبكات شەرتی دەپەری و هی سەپان تا سەری (لەوەدەی) كای سواخ نەدابایە شەرتی نەدەپەری.

- شەرتی جووتیار: وەكو شەرتی شوان شەش مانگ بوو لەناوەڕاستی پاییزدا جووتیار دەگیرا و كرێكەی بەپێی جووتی فەلاحەكە دیاریدەكرا.

- شەرتی شوان: واتە دامەزرانی شوان لای ئاغا ئەوەش ساڵێ دووكەرت بوو.

١-شەرتی زستان: هەشت مانگ بوو لەمانگی ئەیلولەوە تاكوتایی نیسان كرێیەكەش بەم جۆرەبوو دوودینار، دووقەسناخ گەنم، شكارتە، سێ پارچە جلك، نان خواردن.

٢- شەرتی هاوین: چوارمانگ لەئایارەوە تا كۆتایی ئاب كرێیەكەش بەم جۆرەبوو (دەقەزناخ مزاش) نان خواردن.

- شەڕجۆ: بەدوای شەڕا گەڕاو: شەڕانی: حەز لەشەڕ كردن:

- شەڕخڕ: شەڕ فرۆش: شەڕانی: شەڕكەر: شەڕەوان: شەڕپەرست: بجەنگ: شەڕۆك: شەڕەڤان.

- شەڕگە: مەیدانە شەڕ: شوێنی شەڕی لێ دەكرێ

- شەڕمگا: شەڕمگە.

- شەرمەزار: شەرمەسار: شەرمەندە: شەرمەنە شەرەمەشكێنی.

- شەرمن: شەرمێون: شەرمۆك: شەرمەو.

- شەڕنە خێوی: شەرناخێویی (سباق خیل).

- شەروال: شەلوار: پانتول: شەواڵ.

- شەروەت: شەربەت.

- شەڕە: واتە شەڕ هەڵیساوە: ٢-دژی خێرە.

- شەڕە ئاو: یارییكە بە زۆری لە هاوینا ئەكرێت لە نێوان دوو كەس یا چەند كەسێك، ئاو بەیەكتردا دەكەن.

- شەڕەبەق: جۆرێکە لەڕاوکردنی کەو، لەکەژدا، بەهۆی کەو بەق دەکرێت لەئاخری زستاندا ئەبێ ماوەکەی هەمووی بیست ڕۆژە ئەوپەڕی مانگێکە.
- شەڕەبەران: بەزۆری لەلادێکانا ئەکرا دووکەس بەرانی خۆی ئەهێنا دەستیان ئەکرد بەشەڕەقۆچ کامیان ببەزیبایە ئەوە بە دۆڕاو حیساو ئەکرا.
- شەڕەبەرد: دووکەس یاچەند کەسێك بەبەرد لەیەکتری بدەن.
- شەڕەتفەنگ: تەنها بەتفەنگ لەیەکتری دان.
- شەڕەتۆپ: بەتۆپی دوور هاوێژ شەڕکردن.
- شەڕەتۆپەڵ: لەزستاندا لەکاتی بەفربارین دەکرێت، دووکۆمەڵ بەبەفر شەڕئەکەن.
- شەڕەدار: بەدار لەیەکتری دان.
- شەڕەسەگ: چەند سەگێك کە بەشەڕ دێن.
- شەڕەفنامە: ١-نامەی پیروز: نامەی گەورە پیاوان: ٢-کتێبە بەناوبانگەکەی (شەڕەفخان) کە بەناوی شەڕەفنامەی شەڕەف خانی بەدلیسییە.
- شەڕەقسە: ١-شەڕی سارد.
- شەڕەکەڵەشێر: یارییەکی باوە لەنێوان ئەو کەسانەی هەوەستی کەلەشێر بازییان هەبێ، دووکەلەشێر لەگەڵ یەك شەڕئەکەن تا یەکیان ئەبەزێ.
- شەڕەکەو: لەکۆنەوە ئەم یارییە لەکوردەواریدا باوە، کەو بازەکان لەشوێنێك کۆئەبنەوە دووکەو بەرئەدەن بە دەندوك بەرئەبنە وێزەی یەکتری تایەکیان ئەبەزێ.

- شەڕە گورگ: گورگ لەزستان لەگەڵ یەك ئەبن و لەگەڵ یەك شەڕدەکەن.
- شەڕەگورز: لەدوو دەستەپێك دێت بۆ ئەم کارە چەند گورزێك لەپەڕۆ دروستئەکەن لەهەرتاقمێك یەکیان دێتەدەروە دەستئەکەن بەشەڕە گورز لەیەکتری ئەدەن تایەکیان کۆڵ ئەدا.
- شەڕەگەڕەك: جاران دووگەڕەك لەوەختەکی سالّی، مێرمنداڵ و گەنجەکان دەستیان دەکرد بە شەڕ ئەو شەڕەش بەدارلاستیك و بەردەقانی دەکرا!
- شەڕ هەڵبون: شەڕ دامەزران.
- شەڕی چەتەگەری: شەڕی پارتی زانی: شەڕی لێدەو هەڵێ.
- شەڕی دروست: شەڕی ڕەوا: شەڕی رزگاری.
- شەڕی نادروست: شەڕکردن بۆ داگیر کردن و زەوت کردن.
- شەڕی قورس: شەڕی گەورە و خوێناوی.
- شەریك: هاوبەش: بەش بەر: برابەش: بەشدار.
- شەڕی سوارچاکان: لەکوردەواریدا شەڕی سوارچاکان پەیرەوی خۆی هەبوو نابێ لەپڕ بۆ دوژمن بچێ بەڵکو پێشتر ئاگاداری دەکاتەوە تابە تەواوی خۆڕێك دەخاو ئامادەدەبێ ئەمجا بەرەنگاری یەك دەبن، هەر سوارچاکێك لەگەڵ هاوتێن و ئاوزەی خۆی بەشەڕهاتووە شەڕی تەن بەتەنی لەگەڵ عگیدی لەخۆ نزم نەکردووە.
- شەڕی مێردان: بەو شەڕە دەگوترێ کەدوو پاڵەوان تەن بەتەن دەستەو خەنجەر بۆ یەکتری بچن و لەیەکتری بدەن.





- شەڕی براکوژی: شەڕی خۆکوژی: شەڕی ناوخۆ.
- شەڕی سنف: دووبەرەکی چینایەتی.
- شەش ئاگر: دەمانچە.
- شەشخان: جۆرە تفەنگیکی قەدیمە.
- شەشدانگ: ١-مولّکی تەواو: ٢-بەکەسێك یاشتێکیش ئەوترێ کەهیچ ناتەواویەکی نەبێ.
- شەشدەر: شەش لا.
- شەشەلان: شەشەکان: شەشەك:
شەش ڕۆژ بەرۆژو بوون لەسەرەتای مانگی شەوال.
- شەعرو شماق: سەرو پێچ مێزەر.
- شەغرە: شارا: بەو ئامێرە سادەیە دەڵێن کە لەچەند پارچەداری دەسکاری (تیروپەر) پێك هاتووە، لەچەشنی پەیژەی دارە بەکاردێ بۆ :
١-کیشانەوەی قرشە لەپەرێزەوە بۆ سەرجۆخین: ٢-گواستنەوەی خشت و بەرد لەدێهاتەکانی بەکاردێت.
لەم بەشانەپێك دێت: ١-پێچکەشەغرە:
٢-شەپکە شەغرە: ٣-گرگرە:٤-بەستەکی شەغرە:
٥-داربەستەك: ٦-گوریسی شەغرە: ٧-قادە:
٨-بەن قادە: ٩-زەنگوڵە: ١٠-شاگر ئوغلان:
١١-تەپان.
- شەغرە بەست: بەو کەسە دەگوترێ کە شەغرەی لێ دەنێ.
- شەغرە پێ کردن: بەو ولّاغە دەگوترێ کە شەغرەی دەگوازتەوە.
- شەغرەزان: بونەوەی شەغرە لە رێگا داو بەگوڕێ وەربوون.

- شەغرەکێش: ئەو کەسەی کە شەغرە لەسەر پەرێزێ بەولّاغان دێنێتەوە سەر جۆخین.
- شەغرە لێنان: شەغرە بەست شەغرە لەسەر زەوی دادەمەزرێنی و قرشەی لێ دەنێن.
- شەغرەی ئێستر و بەرزە: لەشەغرەی گوێی درێژ گەورەترە هەرلا شەغرەیەك سێ سەبکە شەغرەی لەنێوان پێچکە شەغرە داهەیە.
- شەغرەی گوێ درێژ: شێوەیەکی بچووکی هەیە پێچکە شەغرەکان دووشەپکە شەغرەی هەیە.
- شەفتر: پیرێ شەوێ.
- شەفتور: شەفتول: خوار.
- شەفەلە: بەری بنەکەبەری.
- شەڤان: شەوان.
- شەڤ بهێر: شەورابواردن.
- شەڤرۆنگ: جەژنێکی یەزیدییانە.
- شەڤل: دوگورد: دگورد: بەرماڵ.
- شەڤە: شەوە.
- شەڤە رەش: تاریکە شەو: شەوەڕەش.
- شەقال: بەپێڵاوی کۆنە دەڵێن.
- شەقل: لەشێوەی مالنجی دارە و بەقەدەر ئەو دەبێت بنەکەی قۆڵ و قوول و نەخشرایە بۆ نیشانی رەوسە (شەقلچی بەکاردێنی).
- شەقلچیانە: چەند ڕوبە گەنمێکە کە لە ئاغا وەردەگیرا یا لە کشتیارەکان وەردەگیرا بۆ (شەقل چی).

- شەقلچی: بەو کەسە دەڵێن کە هەموو ئێواران ڕەوسە دەرچووەکان شەقل دەکات و جێی باوەڕ و متمانەی ئاغایە.
- شەقل خستن: شەقل کردن.
- شەقل شکان: نیشانەی ڕەوسە شکان واتە ڕەوسە دزین.
- شەقل کردن: نیشانکردنی ڕەوسەی دەغڵ.
- شەقرە: شەقلە: قسپ: نیرە: داری کورتی: سەرکاریتەی خانوو.

شەقرە ڕانی کردن: شەقلە خستنەسەرکاریتەی خانوو بۆ دروستکردنی بانی خانوو.

- شەقیلە: قایشێك بووە: ئافرەتان بەپشتیانەوە بەستووە و شۆڕیان کردۆتەوە تانزیك ئەژنۆ یان بۆ ئەوە لەکاتی تەشی ڕستندا ئازارنەگا بەلا ڕانیان گولنگی ڕەنگاوڕەنگیشیان بۆ جوانی لێ ناوە.
- شەقە: دووڵە: سەختیان: کەول: چەرم: مێشین: تیمانج: ئاقار: سیرمە: پیستەی خۆشکراو: پێستەی دەباخکراو.
- شەقلی شکای: ڕەوسەی دزی لێ کرای.
- شەك: سپیانی نێری تەمەن لەساڵ و نیو تا دووساڵ و نیو.
- شەك بەران: شەکە نێر کە پێی نایە چوار ساڵ.
- شەکر: شەکەر: ماددەیەکی سپی شرینە و لەگەڵ زۆر شت دەخورێت دوو جۆرە: ١-ورد:

٢-قەند.

- شەکراو: ١-ئاووشەکری تێکەڵاو:

٢-ئەو خواردن و شەربەتەی لەکاتی مارەکردنی کچ لەکوڕ دەخورێت.

بیستومە شیرین شەکراوت دەخورێ.

- شەکراو خواردنەوە: ڕۆژی دیاری کراو بۆ خواردنەوەی شەکراو.
- شەکردان: شەکر دانك: ئەو تەبەقە دۆڵەی شەکری تێدەکەن.
- شەکر شکێن: تەوشوێکی کچکەی دەم تیژە شەکری پێ دەشکێنن.
- شەکرۆکە: نوقل: شرینیات: شرینی.
- شەکەر ئامێز: تێکەڵ بەشەکر.
- شەکەربار: زۆر شیرین.
- شەکەت: شەقی: ماندوو: ماندی: کفت.
- شەکەر خەندە: پێکەنینی بەتام وەك شەکر.
- شەککە: شەکە: شیکە: بەرازی تەمەن یەك ساڵ.
- شەکەمێ: بەردیل.
- شەکەنێر: کاوری تەمەن سێ ساڵی کەخاوەنی یان دەیفرۆشێ یا هەڵیدەگرێ بۆ بەران.
- شەکی کاڵ:: هیشکە بەردیل: بەردیلی نەزاو.

بێوەژنە یان کچە هەر دەڵێی شەکی کاڵە.

(گۆرانی زیرەك)

- شەکەمەڕ: بەردیل زا.
- شەل: شەلە: شل: لەنگ: کوولەك: قلۆب: مقرۆ پێلەنگ: پالەنگ: تۆپال:

کەسێك پێی سەقەت بێت و لەئەنجامی شکانەوە وای لێهاتبێ.

- شەلبك: گۆزە.
- شەڵخە: سەرەنێزە: سەرەڕم.





- شەلکە: تەبەقە: نەخۆشییەکی مەڕ و ماڵاتە ژێرپێی ئاژەڵەکە ئەستوور دەبێت و کەلێنی سمەکانی جەراحەت دەکات جاری وادەبێت سمەکەی فڕێ دەدات کاتی خۆی بۆ چارەسەرکردنی ڕۆنیان دەقرچاندەوە سمی ئاژەڵەکەیان لەناو دەنا.
- شەللم: شێلم: سەوزەیە.

بە تۆ دەچێنرێ بە کولاوی دەیخۆن و دەخرێتە ناو ترشیات.

- شەللاتی: شلێتی: خوێری و سەرسەری.
- شەلماق: شەق.
- شەلروف: حەرام زادە.
- شەلە: ١-ئەستێرەی حەوتەمی حەوتە وانەیە.

٢-پێی سەقەتە: ٣-وشەی بانگکردنی پیاوی شەل.

٤-نازناوی پیاوی شەل (عەلیەشەل).

- شەلەهەڵاتن: واتە ئەستێرەی حەوتەمی حەوتەوانە هەڵات، جووتیار ئەو کاتە ئەزانێ بۆ ئاودانی زەوی باشە ئینجا تۆوئەکات لەزەوی بەراو.
- شەم: ١-شەمسە دلبەری وەلی دیوانە.

٢-دلبەری شەمزین بەشەم شەمزین بەناوبانگن.

٣-ناوی کچانە.

٤-شەمێ.

٥- بە دوای هەندێ ژمارەوە دەنووسێ مانای ڕۆژەکانی هەفتە دەبەخشی.

یەکشەم، دووشەم.

- شەماڵ: ١-بای باشوور.

٢-ناوی کوڕانە.

٣-چرا: قۆتیلکەی چرا: ٤-بای ڕۆژئاوا:

- شەماڵ هاتن: بای شەماڵ هەڵکردن.

یارەب هەڵکەی بای شەماڵێ

بایێ شەماڵێ هاوێنێ (هونراوە)

- شەمام: ١- شەمامە: ٢-ناوی کچانە.
- شەمامك: ناوچەیەکە لە چەند گوندێك پێك هاتووە لە ناوچەی دزەییان لە هەولێر.
- شەمامە: شەمامۆك: شەمامۆ: شەمامۆکە: شەمومە: شەمام.

گندۆرەی ڕەنگ زەردی بچووکی بۆن خۆش.

شیرن و شیرن و شەمامە

شەمامەی چوار بێستانی

- شەمزان: خەجلان: تێك چوون: پەشۆکان.

ناوێرم بیشەمزێنم، بیرەجێنم

وەك ماری بێ ئینجازە

(گۆرانی حەسەن زیرەك)

- شەمزە: بەکار و بەرخی بچووك دەڵێن.
- شەمسی: ١-چەرمی پێڵاو کە تەڕدەبێ لەپاشان وشك دەبێتەوە شێوە و ئەدگاری دەگۆڕێ.

٢-ئەستورك کە هەویرەکەی چاك هەڵنەهاتبێ پۆقژە ناکاپێی دەڵێن شەمسی بووە.

- شەمشەمەکۆرە: شەمشەمەکوێرە: شەمەڵەکۆرە: شەقشەقۆك: چلی چلی: شەقێرەقینگ.

چەکچەکیلە: شەمشەڵە: پارچك: جلیجلی: چەکچە کۆڵە: شەمشە کورەك: شەمشە مەکۆ: چەکچەکێڵە: شەقشەقۆك.

باڵندەیەکی شیردەرە و بەشەو دەردەکەوێت.

- شەمکوڕ: کارمامز: بەچکەی ئاسك : بەچکە ئاهو: ئاسکی دووساڵ تەمەنی بێت.
- شەموو: شەمبە: شەنبی: شەمە: شەمۆ: شەموی: شەمبی.
ڕۆژی دوای هەینی، ڕۆژی یەکەم لەهەفتەدا.
- شەموز: چەموش.
- شەنیار: ئەو باخەوانەی بەدارێکی درێژ گوێز لەسەردار گوێز دا ئەوەرێنێتەوە خوارەوە.
- شەنەبا: تێ هەڵدانی هووردیە بۆئاسمان بەرەو بای شەماڵ یا هەربایەك بۆ لێکردنەوەی دان و کا
- شەنەباکردن: کاودان لەیەکتری جوداکردنەوە.
- شەنە با کۆتایی هاتن: کاودان لەیەك جیابوونەوە.
- شەنەدێر: ئەو کەسەی شەنەبای دەکات. بەشەنەی دار، شەنەدێر کورتەکی شۆڕ و دەرپێیەکی سپی و سەرکراوی لەسەردەکات لەکاتی شەنەبا کردن.
- شەنگۆل: شملی بەرەکەت: قەمت: نووسانی دووئەندامی ڕووەك بەیەکەوە وەکو لەگەڵاو بەردا وەکو لەبەری گوێز و مازوودا.
- شەنەی ئاسن: لەچوارلکی ئاسن پێکدێت کوپەیەکی هەیە بۆ بەندکردنی دەسکێکی دارولکەکانی لەپەنجەی دەست باریکترن بۆ هەر گێرو وەرگێڕی قرشە و بارکردنی بەکاردێت.
- شەنەی دار: بریتییە لەچەند لکەداری نیوە چەماوەی نووك تیژ و درێژییەکانیان زیاتر لە (٣٥)سم کۆتایی لکەکانی دێت بەتێك هەڵکێشانی بەندکردنی دەسکی دار بەسیرمە و پیستە توووند و بەندکرانە بۆ شەنەبای هوردە و تێکە و لێکەی کا بەکاردێت.
- شەو: شەڤ: شێڤ: شێو.
- شەوا: شاباش: ئەو پارەی لە شایی دەدرێتە چاوەش.
- شەوات: شوێنی سوتاو.
- شەوار: شەوگار: درێژایی شەو.
- شەوال بێن: دۆخین.
- شەوبا: ئەو بایەی لەشەو هەڵدەکا.
- شەوبێری: نێوان دووشەو.
- شەوبێری کردن: شەوێك ناشەوێك.
- شەوبێری نەکردن: هەموو شەوێ.
شەوبێریم نەکردییە.
- شەو بەند: بشتێنی شەو.
- شەو بەکێو: شەوەکەژ.
لەنیوەی وەرزی پاییز لەوەڕ لەدەور و پشتی ئاوایی کەم دەبوو، ئەویش لەبەر پێ خوست تامی نەدەما، مەڕ و ماڵات باشیان نەدەخوارد دونیاش ئەوکاتە فێنك دەبوو، لە (٢٤)سەعاتدا جارێك زیاتر پێویستیان بەئاو خواردنەوە بوو شوانەکە بۆ لەوەڕ زۆر دووری دەبردن لەبەرۆژ کورتی پێ ڕانەدەگەیشت شەو بگەڕابایەوە شەوان چەند شوانێك مێگەلەکانیان تێکەڵاو دەکرد و لە نەورایی یەکی پەنابایان ڕادەگرتنەوە ئەمە پێی دەگوترا (شەوبەکێو: شەوەکەژ: شەوین).
- شەوبۆ: شەوبۆن: ١-گوڵێکە بۆجوانی بەکاردێ.





٢-دارێکە گوڵی سپی دەردەکات بەشەو بۆنێکی خۆش بڵاودەکاتەوە.
- شەو بێداری: شەوبێری: شەونشینی: شەونەخەفتن.
- شەو چەرە: ئاجیل: شەوچەرەز: شەو چەلە: بەو خواردەمەنییانە دەگوترێت بەشەو لەدانیشتنی شەو دەخورێت وەك گوێز، مێوژ، باسوق.
- شەوتان: ١-سووتان:
٢-ئەوشەوەی ئێوە تێدان (شەوتان باش).
- شەوتان باش: شەوتان خوەش.
- شەوتاند: سوتاند.
- شەوتاندن: سوتاندن: سۆتاندن.
- شەوتی: سوتا: سۆتا: سوتیا.
- شەوتیە: سوتاوە: سۆتاوە: سوتایە.
- شەوداوەت: لەکاتی شەوا ئاهەنگ گێڕان.
- شەودەستار: جاران ساوار بەدەستاڕلێدەکرا ئەم کارەشیان دەخستە شەوان جاکچ و کوڕی ئاوایی لەو ماڵە کۆدەبوونەوە بۆ شەو دەستاڕ و کچێك و کوڕێك بەیەکەوە دەستاڕیان دەسوڕاند تا ساوارەکە تەواو لێدەکرا ئەمە پێی دەگوترێ شەو دەستار و گۆرانییان لەگەڵ دەگۆت.
- شەودێر: بەشەو شینایی ئاودان: دوانزەی شەو.
- شەوڕاو: شەوارە: ڕاوشەو: لەشەوی تاریك دەکرا بەفانوس بەدوای پۆڕ و کەو دەگەڕان فانوسەکەیان لەچاوی ئەم پەلەوەرانە دەدا و تۆڕەکەیان دەخستە سەری، ئەمە لەشەوی بەهاران دەکرا.
- شەوق: شۆق.
- شەوکۆر: شەوکور: شەوکوێر: شەفرەشکی: زلکۆر: لەشەوانە دەنێن.
- شەوگڕ: چراخان.
- شەوگەرد: مارمێلکە: مارمیلۆق.
- شەوگ: شەوە: کابوس.
- شەوگەڕ: ١-پاسەوانی شەوێ.
٢-ئەو کەسەی بەشەو دەگەڕێ.
- شەومە: مانگە شەو.
- شەونخونی: شەوەخون.
- شەونشینی: ئەوەیە ماڵێك یا کەسێك شەو ئەچێ بۆماڵی دراوسێ یا خزم و دۆستێکی تا درەنگێك لەوێ ئەمێنێتەوە و پاشان ئەگەڕێتەوە ماڵی خۆیان.
- شەونم: شەبنم: خوناو: ئاڵسك: قەراو: ئاوشە: (شەو) واتای بەرامبەر ڕۆژ(نم) ئاویە یان (نیم) واتە. (نیڤ) یانی ئاوی شەوێ یان ئاوی نیوە شەوێ.
- شەوەر: شەوەزگ: سێپەڕە.
- شەوەرە: حەفتە.
- شەوەزەنگ: تاریکەشەو.
- شەوەرەشە: جەژنێکی دیاریکراوی کاکەییەکانە.
- شەوەك: شەوێك: شەڤەك: یەك شەو.
- شەوەمەن: شەوەسارە.
- شەویلاك: شەویلکە.
- شەوین: شەواژۆ: مێگەڵ
لەوەڕاندن لەشەو ڕاشکانەوە تابەیانی.
- شەوی بەرات: بەشەوی (١٥) کوڵە مانگ (شعبان) دەووترێ کە رزق و ڕۆزیی ساڵی نوێی تیا بڕیاردەری لەلایەن فریشتەی ڕۆزییەوە بۆ خەڵك.
- شەوێ دی: دوێ شەو: شەوی ڕابردوو.

- قولّەبنە: قولّەپانکە: بەژن کورت.
- قوللە: بورج: قولخ: لەشێوەی ژوورێکـی بـچووك، جاران لەسەر رۆخی قەلاّ دروستدەکرا بۆ پاراسـتنی قەلاّ و چاودێری کردنی دەورووبەری قەلاّ لەدوژمن.
- قـوش: جورێکـە لەبالّنـدە گۆشـت خـۆرە درِندەڕاوییەکان، ئەگەر لـە هێلانـە بگیرێـت پێـی دەلّێن (قوش) راوی ئاسکی پیّ دەکرێت.
- قولە: ناوی سپیانی کوردییە: واتە سپیانی دەم و چاو سوور و خوری سپی دەبێتە سێ جۆر.
أ-قولەتار: سپیانی دەم و چاو سووری تۆخ.
ب-قولـە سیـسە: قولـەزەرد: سـپیانی دەم و چـاو سووری کراوە.
ج-قولە مس: سپیانی جگەلە سـووری دەم و چـاو خەتی رەش یان زەردی هەبێت.
بە عارەبی(گەرحە)یە.
- قوو: باڵدارێکی مل بـەرزی مەلەوانـە پـەڕێکی نەرم وناسك و رەش و سپیی هەیە.
- قولّەوەیباب: کۆرەوەی باب: جۆرەمارێکە
- قولبین: ئاوابوون.
- قولّپ: قۆلە: دەسك.
- قولّپـە: قولّپـەقولّپ: قولّتـەقولّت: دەنگـی کولاّنی ئاو.
- قولت: سەلّت: سەلت و قولت.
- قولچە: دەسك لەرووەك یان لەگولّ.
- قولخی: کارگێڕان.
- قولّە قوولّ: قولقولّ: قولّدان:
- قولفانگـە: گرێیـەکی بـە قـولفی وا کـە بـە ئاسانی بکرێتەوە.
- قوللە:١-لوتکە شاخ: ٢-بورج.
- قومەقوم: پیلان.
- قومپـانی: قومپاژنـە: قومپانیـە: پاژنـە: قونپانی: قونپێنیّ.
- قـون ئـاگردان: قولنـچکی جێـی کـاو دارو بەردەسێرەی ئاگردانە.
- قونجرك: قونجڕکە: قونجیرکە: گازگرتن بەدەست.
- قونجك: ١-گۆشە: ٢-قونکە جغارە.
- قونك: قونجك: بەشی دواوە.
- قونکە هەوجار.
- قوندە: بیّ کلك.
- قونگرۆکە: قونگرەی بچووك.
- قونکە بۆوا: لای خوارەوەی بۆ والە زەوی تـووتن کە ئاو لەکەرخاو وەردەگریّ.
- قووت: ١-رسق: قویت.
٢-رووت.
- قووچ: بلّند.
- قووچاندن: هەلاّتن.
- قووچەك: ١-مەخروت: ٢-بەرزایی.
- قووچکە: ١-مووکێش: ٢-زەوی بەرز.
- قووخەل: کوخ.
- قووڕە: قووڕە قووڕ: دەنگی سەی ئازاردراو.
- قوو فلین: گرژ.
- قووقە: دەنگی بانگدانی کەلّە شێر.
- قوولّ: قۆر: قۆل.





- قوولاّیی: قۆرایی.
- قوولك: بەرك.
- قوولّکە: قورت.
- قووم: ١-گووپ: چۆر: فڕ: گۆلـپ: گولـپ: گـۆ: قومێك ئاو: فڕێك ئاو:
٢-مژ: قومەك جغارە.
٣-زیخ و چەو.
- قوون: قینگ: قوین: قنگ.
- قووندە: قوونە: بیّ کلك.
- قوونەبان: دیوی پشتەوە.
- قوونپـانی: پانیـە: پـانی: قونپانیـە: قۆمپاژنە: قومپانی.
عـەرەق لەو هەنیـەی دەڕژیّ دێتـەخوار تـەر دەکـا پانیەی کەوشان.
- قونێر: دۆمەلّ.
- قویت: ژیان: حەیات.
- قوین: ژنی مالّەوە.
- قە: قەت: قەد.
- قەبا: قەبە: گەورە.
- قەبارە: ١-حەجم: ٢-مقدار.
- قەبالّـە: سـەنەد: قۆچـانی: کـە زۆر هـات قەوالّە بەتالّە.
- قەبر: قەور: مەغبەر: مەغبـەرە: گـۆر: گلکـۆ: مەزار: قۆور.
- قەبرسـتانی غـەریبان: بەوگۆرسـتانە دەگـوترا ئەمەی لەشاری بمردبا و بیّ کەس بـا، یـا یـەکێك خزم وکەسی حاشـایان لیّ کردبـا، یـا خۆیـان تـیّ نەگەیانـدبا، یـا لـەدیّ بکوژرابایـە حکوومـەت بیهێنابایەوە لەو گۆڕسـتانە دەینیـژران جـا نـاوی گۆڕستانی غەریبان لەوسیّ شتەوە هاتووە.
- قەبرسـتان: گۆڕسـتان: گۆڕسـان: قەورسـتان: گۆرخانە: قەورسان: موغبـەرە: مەقبـەرە: گلکـۆ: قەبرسان: شوێنی ناشتی مردوو. هەر گۆرستانێك ناویّ خۆی هەیە وەك گورستانی چـراغ گورسـتانی سەیوان، گورستانی دەروێش خدر.
- قەبار: قتماغەی برین.
- قەبرخە: قابرغە
- قەبویل کردن: قەبوول کردن: قبوول کردن.
- قەبقاب: دەنگی قاسپەی کەو: قەبۆ قەبۆ.
- قەبیعات: قەباحەت.
- قەپالّ: قەپار: گاز.
- قەپالێدان: قەپارلێدان: گازلیّ گرتن.
- قەپاندن: فڕاندن.
- قەپچاندن: قەپچین: کۆشش.
- قەپگرتن: قەپارلیّ دان.
- قەپۆز: ١-جوجمە:
٢-لووت و دەم.
- قەپوو: قڕ: قات و قڕ.
- قەپێلك: توێکل.
- قەپێلکی چاو: پێلوی چاو.
- قەت: ١-بەهیچ جۆرەك: ٢-بەش.
- قەتار: هەوایـەکی کلاسـیکی گـۆرانی کوردییـە ئـاوازی (کـۆن) و کوردییـە، دانـەری ئاوازەکـەی نـازانریّ کـیّ دایهێنـاوە کەلـەپوورێکی هونـەری

بەنرخە لەگەنجینەی گۆرانی کوردیدا، نەغمەیـەکی سۆز و ئەوین و دڵداری و جـوانی گرتووەتـە خـۆی سکالای (دەروون) و جوانی (ئافرەت) و (سروشـت) و ژانی ناخی مرۆڤی کورد باسدەکات، ئەم مەقامە بـە تـەنیا کـەس دەوتـرێ، بـەڵام کەسـی دووەم (گوێندەیەکی)تر دەتوانێ بەشداری وتنـی بکـات و گۆرانییەکە لە گوێندەی یەکەم وەربگرێ هـۆنراوەی دووباڵی نیودێر دەربڕگەیی ئەم مەقامە تایبەتە بە میللـەتی کوردبـەزاری کرمـانجی خـوارووە قـەتار ئـاوازێکی سـۆزناک و دڵکـێش و گولبانکـە، ئـەم هەوایـە لەسـەر ریـشەی نەغمـەی حیجـاز سـەری هەڵداوە (سەی یا قوودەلی).

خانەبەگ وەوسـەوت وەو رقـەتار) وە عەنبـەر وەو ئاواز سەدای تارەوە.

- قەتار: جۆرێکە لە خشڵی ژنان.
- قەتار بەستان: بەدوای یەك ریزبوون.
- قەتارچی: ئەو کەسەی لەپێش پێشەنگی ئەڕوا، بەماوەی شەش حەوت قاتر قەتارچییەکی تر ئەڕوا.
- قـەتارکێش: بەسـتنەوەی وڵاغێـك بـەوڵاغی پێشەخۆی راکێشانی.
- قەتشك: رووناکی.
- قەتێ: کوڕکوڕ.
- قەتیان: جیابوونەوە: لێك دابڕان: ترازان.
- قەتیس ماو: حەسرمای.
- قەحپە: قاپە: قابە: قاعبە: قەعبە.
- قەحپە خانە: کەللەخانە: کارخانە.
- قەخ: قەخە: پیس بەزمانی منالان.
- قەرانگ: لەشێوەی داسوولکەیە، بەڵام دەمەکەی تەنها شیشە و خوار کراوەتەوە و تیژنییە و، تـەنها نووکی کەمێك پان کراوەتەوە بەکاردێ بۆ:
١-گیشەکەر بۆ خڕ کردنەوەی سواڵە و هـەڵگرتنی باوەش و دانانی گیشەو، گەلاوێژ بەکاردی،
٢-سەپان بۆ لێ نانی شەغرە بەکاری دێنێ.
- قەدەم خێر:
١-قیەم خێر: پێ بەخێر.
٢-ناوی ئافرەتانە.
٣-ناوی ئافرەتێکی کـوردە کـە دژی حکومـەتی ئێران بەشۆڕش هەستا.
- قەرەبەربانگ: تاریك و لێڵە.
- قەدەملك: قەدەعارد دەکرێتەوە دووبەش هەر بەشێك پێی دەووتری (قەدەملك).
- قەدەھ: جامی ئاو خواردنەوە.
- قەد: ١-لا: کن:
٢-قەت.
٢-عـاردی نێـوان دوو کـوزی ئـەو زەوییـەی دەکرێتەوە تووتن.
- قەدەخە: قەدەغە.
- قەدەعارد: ئەو پارچە زەوییەی دەکرێتە تووتن.
- قەدبڕ: نزیك ترین رێگـا لـە ناوەڕاسـتی چـیا و شوێنی تر.
- قەدپاڵ: قەدی کێوان.
- قەدر: رێز.
- قەدرزانین: بەقەدر: بەرێز.
- قەدرگرتن: رێزگرتن.





- قەد و قامەت: بەژن و باڵا.
- قەدیان: کۆتایی.
- قەیدیاندن: کۆتایی هاتن.
- قەدەر: ئەندازە.
- قەدەرگرتن: ئەندازەگرتن.
- قەر: ١-میقدار:
٢-ناوی کورانە.
- قەراج: ناوچەیەکە لەپشت چیای قەرەجوغ هـەتا سەرزێی گەورە.
- قەراچۆ: لەناوبردن: قەلاچۆ.
- قەراخ: قەراغ: لێوار.
- قەراش: ئاشەوان.
- قەراڵ: سوڵتان.
- قەراڵستان: ئیمپراتۆر.
- قەرالیچە: قرالیچە: پادشای ژن.
- قەراو: شەونم.
- قەرپۆز: قۆپکی زین: گرێیەکە لە پێشەوەی زیـن لە کاتی سەرکەوتنی سوار بۆ سەرپـشتی وڵاخەکـە سەردەکەوێ دەست پێوە دەگرێ.
- قەرە: ١-ناوچە: ٢-کن: لا: ٣-نزیك:
٤-نیشانە
٥-رەش بەزمانی تورکی.
- قەرەبینا: قرامینە: جۆرە دەمانچەکە .
- قـەرە بەقـەرە: راسـت بـە ڕاسـت: بەرامبـەر لە تەنیشتەوە.
- قەرەبۆ: قەرەوی: بژاردنەوە.
- قەرەچەناخ: قەرەچناخ: زۆروەر.
- قەرەچوغ: چیایەکە لەنێوان قەراج و کەندیناوە.
- قەرەپلاو: جۆرە خواردنێکە.
- قەرەپووڵ: فلس.
- قەرەقەپ: قروقەپ.
- قەرەخەبەر: خەبـەری نـاخۆش: ٢-بریتییـە لـەو کەسەی خەبری ناخۆش دەداتە خەڵك.
- قەرەواش: خزمەتکاری ژن.
- قەرەهەواڵ: قەرەخەبەر: ئەو کەسەی زۆر حەز لـە خەبـەران دەکـات و خەبـەری نـاخۆش بـە خاوەنی بگەیەنێ.
- قەرد: قەر: قەرز: وام: قەرت: دەین.
- قەردار: قەرزدار.
- قەدری: قەرتی: قەرزی: وامی.
- قەرز کوێر: فێل باز.
- قەرزوقۆڵە: قەدر.
- قەرسان: قرسان: لەسەرمان بەستای.
- قەرساندن: قرسین: رچمان.
بەستی: بوونە سەهۆل.
- قەرسەقول: تەرس.
- قەرسـەل: قەسـیل: قەرسـیل: جـۆی چـێنراو کەشینبووە و گوڵی نەکردووە.
- قەرسین: قەسرین: قەسران: زۆر سەرما بوون.
- قەرف: بێز.
- قەرقاش: سپی.
- قەرماندن: قەرملاندن.
- قەرۆك: سووکەلە ناوی قەرەنی.
- قەری: قەرە: رەش.

- قـــــەڵپوس: قــــەڵپوز: کەڵبـــــەی زیــــــن: کەڵوەی زین: قەرپۆز.

- قەرەپەپاغ: ١- عەشیرەتێکە لە رووسیا هاتن بۆ ئێران لە ناوچەی سلدوز دامەزران.

٢-جۆرە کڵاوێکە:

٣- جۆرێکە لەشایی.

- قەرە خەرمان: دەسکێك لـە گـەنمی رەشـگولی تەڕی شێرتێپەریو دێـنن و ئاگرێـك دەکەنـەوە ئـەم دەسـکانە دەخەنەسـەر ئاگرەکـە هـەتا هەنـدێك خاوەبرژ دەبێت و برژانگەکانی لێ دەسووتێت و لـە دوایدا دەکوترێت گەنمەکە:

١-یان ئەوها دەیخۆن

٢-یا دەیکەن بە شیوی (چێشتی) قـەرە خـەرمان هەمووشـتێکی تێکـەل دەکـەن بـە گـوێرەی هـەر شوێنێك جیاوازییان هەیە.

- قەزا: بەڵا: کارەسات.

- قـەزات لـەگیانم: بریتییـە لـە دووعـاکردن بـۆ خۆشەویستیك واتە بەڵات بێتە گیانم.

- قەزات لە ماڵم: واتە ئەو بەڵایەی تووش بوویت بێتە ماڵی من.

- قەزیا: مەترسی.

- قەرسیل کردن: لەدەور و پشتی ئـاوایی دەکـرا و خەڵکی ئاوایی هەرکەس بۆ خۆی جێی دوو قەسناغ زەوی دەکردە جۆ بۆ ئاژەڵی کارو و بەرخی سـاوا و شیرخۆر بۆ چێل و کەر و ولاغی بەرزە.

- قەڕانان: قارنان: رەزیل: قرچۆك.

- قەرینی: ئاوکزی: ئاوزێم.

- قــەزوان: قەســخوان: قەســووان: قەســقان: قەســوکان: قەســکان: قەسـکووان: قەســقەوان: وەنەتـەق: وەنۆشـك: کـەزوان: کەسـکان: بـەری دارەبەنە دەخورێ.

- قەستەم: قەسەم: سوێند.

- قەساب: ١-قەساو: گۆشت فرۆش:

٢-ئەو کەسەی ماڵاتی دەکڕی و دەفرۆشێ.

- قەسابخانە: قەساوخانە.

- قەش: ١-دەمۆر:

٢-بەرەشانێك.

دەڵێن کە تەنیا نیوچەوانی هەموو سپییە ئـەوەی تری رەشە یاسەر و چاوی هەموو سپییە.

- قەشا: شەختە: قەشەم.

- قەشان: قەش.

- قەشە: کەشە: قاشۆ: رێبەری ئۆلا گاوران.

- قەشەم: پارچەیەك لەشەختە.

- قەشەنەگ: جوان: نەشمیل: رەند: جوان.

- قەشفوس: برین.

- قەشقە: ١-دەمۆر: بەدبەخت.

٢-ناوی گوندێکە: ٣-فێڵ.

- قەشمەر: گاڵتەچی: قەژمەر.

- قەشمەر باش: گاڵتە جاڕ: قەژمەرجار: قەشمەرزار: قەشمەرجاڕ: تیزەجار: ریشقەنەجار: ئیتاڵی.

- قەفەز: قەوەز: قەفەس.

- قەخت: دەسك: چەپك.

- قەفکانی: قەنکانۆك: بەردەقانی.

- قەفلاندن: سەرماکردن.





- قەفیز: کۆتك: ئەندازەیەکە ئاشـەوان گـەنمی پـێ دەپێون بۆ ئەوەی مزی ئاش جیا بکاتەوە.

- قەڤەز: کەولی تەنك.

- قەڤارك: بۆری هەناسە.

- قەل: ١-قەلەڕەشە: قەلا: ٢-عەلەشیش.

- قەڵا: قەڵات: دژ: قلا: کەلا: دز: قەرات: کەلەهی. لەشوێنێکی زۆر بەرز دروستدەکرێت وەکو چـیا بـۆ ئەوەی دوژمن بە هاسانی نـەگاتێ لەسـەر لێـواری (قوللە)ی بۆ کراوە بۆ پاسەوانی کردنی قەلا، سەرا و کۆشك تەلاری قەلاداری تێدا دروستکراوە، خانی ولاغـان و کووچـە و کـۆلانی بـۆ دروسـتکراوە بـۆ خەڵکەکەی جبەخانەی هەبووە، هەرقەڵایەك چـەند دەروازەیەکی هـەبووە ئـەو دەروازانـە دەرگـای زۆر موحکەمیان هەبووە ئێواران گالە دراوە و بەیانیان کراوەتەوە دیواری خانووەکـان بەبـەردی زۆر لـوس دروست کراوە یان سروشتییە.

- قەڵادار: خاوەن قەڵا:

ئەوکەسـەی لەقەڵادایـە و سەرپەرشـتی و بەڕێوەبردنی قەڵادەکا.

- قەڵاشکێن: قەڵاگر: بریتییە لە مرۆڤی زۆر ئازای چاو نەترس، قەڵاگر.

- قەڵانشین: هەموو ئەو کەسانەی لەقەڵا دەژین.

- قەل و بـەل: ئـاوازێکی کـۆنی کوردییـە شـوانی کوردبە شمشاڵ دەیـژەنن تایبەتـە بەشـمشاڵ شـوانی کورد لەکاتی مەڕلەوەڕاندن ژەندویانە ناوەکەی لـە وەوە هـاتووە دوو گــەماڵی هــەبووە بــەناوی (قەلەوبــەل) هــەرکاتێك لەچـۆل و دەشـت ئـەو گەماڵانەی لێ ون بووە بـەئاوازێکی تایبـەتی کـە شوانەکە بەشمشاڵ ژەندویەتی و ئـەو دوو گەماڵـەی پـێ ئاگـادار کردۆتـەوە، ئـەو دووگەماڵـەش کـە گوێیان لە ئاوازی شمشالەوە بـووە یەکـسەر بـۆلای شوانەکە هاتوون، جـا لـەو کاتـەوە ئـەم (ئـاوازی شمشاڵە) بەناوی ئەم دوو گومالەکراوە و بە ئـاوازی (قەل و بەل) ناوبانگی دەرکردووە.

- قیلمقازە: قلیمقاس: قەلان دۆشکان: قەلان قۆچ: قەلاقۆچ: قیلم قاسێ: قەلا دۆشکان.

قەلاندوشکان: شـوێنی منـاڵ دانیـشتن لەسـەرمل لینگێکی بەلای راست و یەکێ‌بەلای چەپ بـەپێش سینەی دێتەخوارەوە بەهـەردوو دەسـتەکانی خـۆی دەستی منداڵە هەڵگیراوەکە دەگرێت.

- قەڵاپارێز: پارێزەری قەڵا.

- قەڵاپەستە: قەرە پەستە.

- قەڵات بەند: قایم: مەحکـەم: سـەخت: کـۆرس: قرار: پکێت.

- قەڵاچۆ: قڕ.

- قەڵاچۆکردن: قڕکردن.

- قەڵادە: قەڵەدە: قەریتە: قەلێتە: قایـشێکی دوو پەنجەپانە لەملی تاژی دەکرێ.

- قەڵاسنج: قەراسنج: ١-واتە قەڵای سەخت:

٢-ناوی دووگوندانە لەخۆشناوەتی.

- قەڵاسنگ: بەردەقانی.

- قەڵاشکەری: داری بـەرووی وشـك هـەڵاتیو بـۆ سوتان ئامادەکراو.

- قەڵافەت:١-هەیکەل: ٢-زەبەلاح.

- قەلاقووچكە: تەقلّە.
- قەلاّنقوچ: قیلم قاچی: قەلاّدۆشكان.
- قەلاّندن: قەلاّنگە: دارێكی دووشاخە واتە دارێكی ئەبەستن بۆ مازووچنین بەكاردێ.
- قەلاویژ: پێشرەوی لەشكر.
- قەلەبالغ: قەرەبالغ: قلابالغ.
- قەلەسابوونی: قەلە بەلەك.
- قەلّەشان: قلّێشان: قەلّێشین: قەلّشان: لێكبوونەوە.
- قەلەفیسك: قەلەفزكین: قەلەقزكین.
- قەلەم: پێنوس: ئالاّ.
- قەلّەمباز: باز: قەلّمباز.
- قەلّەمبازدان: قەلّمبازدان: بازدان.
- قەلّەمبڕ: چەقوی بچووك.
- قەلّەمڕەو: سنووری ولاّت:
قەلّەمنار: قەتل و عام: هەمووكوشتن.
- قەلەموونە: عەلەشیش.
- قەلەن: مارەیی.
- قەلەندەر: ١-ڕووت و قووت: ٢-بێ‌كەس:
٣-خاكی: بەسیت : ٤- ڕوح سووك:
٥- هەژار: ٦-ناوی چیایەكە.
- قەلەن: جهازی بووك.
- قەقنەس: پەلەوەرێكی زۆر جوان و دەنگ خۆشە، ئەلێن دەنووكی (٣٦٠)كونی تێدایە، لەسەركێوێكی بەرز بەرەورووی با ئەنیشێتەوە دەس ئەكا بە خوێندن، ئاوازی سەیر لەدەنووكیەوە دەرئەچێ بۆیە پەلەوەرێك لەدەور خرئەبێتەوە ئەویش هەندێكیان لێ ئەگرێ و ئەیانخوا، هەر وائەلێن هەزار ساڵ ئەژی كەمەرگی نزیك ئەبێتەوە دارێكی زۆر كۆ ئەكاتەوە خۆی بەسەریەوە ئەنیشێتەوە دەس ئەكا بە خوێندن و سەرخۆش ئەبێ باڵ ئەدا بەیەكدا گڕی لەبن باڵی هەڵ ئەستی دارەكە ئەگرێتەوە خۆیشی پێیەوە ئەستووتێ (قەقنەس) نێرەی نییە و هێلكەی یەك لە خۆ لە مێشەكەی پەیدا ئەبێ بێچوی تری لێ ئەبێ.
- قەلەڕەشە: مەلێكی گەورەیە لە قەلەباچكە گەورەترە ئەوەندەی سەقەر گەورەیە لەویش ئەستوورترە هەموویەڕەكانی ڕەشە لەڕەشیدا دەبریقێتەوە هەركە لەئاسامندا دەفڕێ دەنگی دێ و زوو دەناسرێ، چونكە دەنگی لەگەڵ هەموو باڵدارێك جیاوازە، بەگۆشت خواردن دەژیت و ژیانی لەسەر گۆشتە باڵدارێكی گەڕۆكە و زۆر لەشوێنێك نامێنێتەوە. لە(٢) تا(٥) هێلكە دەكات.
- قەلّەو: قەرەو: پڕگۆشت.
- قەلەواژیی: عەكس: بەرەواژی.
- قەلّەوقووتە: ڕەش و ڕووت: گەجەروگوجەر عەلۆ و جەلۆ.
- قەلّەویی: تێرگۆشتی.
- قەلبەزە: تاڤگە: قەلّوەزە: ئاوشار.
- قەلّپ: قەلب: ناڕاست: نارەسەن.
- قەلّپووز: قەلپووزی زینی‌.
- قەلت: قەلەم.
- قەلتاخ: ١-قەلتاغی زینی:
٢-قالتاخ: چەرمەگون: چەرمەكۆن.
- قەلّتەبان: گێل.





- قەلچخ: ١-بژی دەغل: ٢-دڕك.
- قەلّخان: قەلغان: مەتاڵ.
- قەلّداس: قەلّداسوو: قەلّچخ.
- قەلّس: عەسەبی: سەرگەرم.
- قەلّشت: قەلّەش: قەلّەشت: شەقار: قلّێش: لێكبوونەوەی زۆر.
- قەلەوز: ئێشكگر: پاسەوان: قۆلچی.
- قەلوودەل: فەسیح.
- قەلوین: قەلوون.
- قەلیاناوی: نێرگەلە: ئامرازێكی دووكەلی تووتن كێشانە.
- قەلینجەك: قامكەتووتەلە.
- قەم: ١-دۆل:
٢-بۆری ئاوی لە ئاشی ئاو: ٣-قانگ.
- قەمامە: تەقەلّی گەورە لە دورمان.
- قەماندن: وشك كردنەوەی دار.
- قەمە: قەمّە: قامە: نێزە.
- قەمەر: ١-ئەسپی ڕەنگ ڕەش: ٢-مانگ:
٣-ناوی ژنانە.
- قەمتەرە: ١-حدود:
٢-ئاوی سەركەوتوو لەسەر پرد.
- قەمچوور: باجی ئاژەڵ.
- قەمچووك: پاروو: پاری: تیكە.
- قەمچوولە: جۆرێكە لەخشل.
- قەمووشك: مەینی خوێن.
- قەمهین: بزر: ون: گووم.
- قەنات: ١-كارێز: ٢-باڵ.
- قەنارە: قنارە: ١-چەنگالی گۆشت.
٢-سێدارە: هەڵواسراو.
- قەنە: قەننە: قەلنە: قەلۆن.
- قەننەدار باشی: سەرقەننەدار: بەرپرسی قەنەداران لە دیوەخانی ئاغایان.
- قەنتەرە: دوو دەرگای حەوشەی زلن و سەرەكەی بانی بۆكراوە: (لە قەنتەرەی بورهان لە كولیچە و لە دەرمانی).
- قەنج: قنج.
- قەنجی: چاكە.
- قەنج بوون: چاك بوون.
- قەند: شەكری كلو.
- قەندان: قاپێكی تایبەتی بۆ قەند.
- قەنداو: ئاوی گەرم و شەكر.
- قەند شكێن: شەكر شكێن ئامرازێكە قەندی پێ دەشكێنین.
- قەنەوز: جورێكە لە قوماشی ئاوریشم: قەناوێز.
- قەنواتی: ١-گوتە:
٢-چیرۆك.
- قەوارە: ١-بۆشایی برین:
٢-شەقی دیواران.
- قەوان: ١-قاوەن: ئامێرێكی كۆنی دەنگ و گرانی تۆمار كردنە: ٢-قالكی گوللە.
- قەوتین: دەرچوون.
- قەوچە: لەوچە: قەوچەوچ: لەوچەلەوچ:
زار لێكدانی ماكەر لە كاتی جووت بوونی لەگەڵ نێرەكەر.

- قەوزە: خوری ئەجندە: کەسکایی سەر ئاو.
- قەوسەڵە: مەتەڵ.
- قەوال: لەوشەی (قەول) داتاشراوە بەو کەسانە دەڵێن کە بەیتە دینییەکانی ئـولی یەزیـدییان لەبەرە لە موناسبە دینییەکانی بـە گۆرانییـەوە بۆیان ئەگێڕنەوە.
- قەوکانی: بەردەقانی.
- قەول: بەشێکە لەئەدەبی دینی یەزیدییەکان.
- قەولك: قالك: غیلاف: بەرگ.
- قەومان: ڕوودان.
- قەومانـدن: هەڵگیرسـاندن: هەڵایـساندن: کـاری خەتەر ئەنجامدان.
- قەوماندن: کاری خەتەر ئەنجامدان.
- قەومیە: قەومایە: قەوماوە: ڕوویداوە.
- قـەوم و قیلـە: خـزم و کـەس: کـەس و کـار: خزم و خۆیش.
- قەویی: زۆر.
- قەوەت: قوەت: هێز.
- قەهی کەر: کەم عەقڵ: ئەحمەق.
- قەید: یاسا.
- قەید کردن: ١-خستنە ناو لیستە:
٢-دامەزراندن.
- قەیدبوون: دامەزران.
- قەی کردن: دژی قەیناکا.
- قەی ناکا: قەینا: قەیدی نییە: قەیچی ئەکا.
- قەیرە: ١-کوڕ و کچی بەتەمەن:
٢-خاوەن ئەزموون.
- قەیسەری: ١-دووکـانی لەریزیـەك و بەرامبـەر یەك سەری گیراو: ٢-نازناوی پاشای رووس.
- قەیسك: گۆپاڵ: گۆچان گۆپار.
- قەیسی: ١-زەردەلو:
٢-زەردەلوی وشك.
- قەیفە: قەدیفە: ناوی گوڵێکە پەڕەکانی گەورە و بەیەکاچووە لاسك نەرمە بێ دڕکە ماڵییە و بە تۆو زیاد ئەکرێت بۆ خوانی بەکار دەهێنرێ.
- قەیلۆك: داوەڵ.
- قێز: بێز.
- قێزلێ بوونەوە: بێزلێ بوونەوە.
- قیبلە: ڕووگە: بەرەومەککە: قبلە.
- قیتار: فیشەگدان: رەخت: خەریتە.
- قیت: راست.
- قیت بوونەوە: راست بوونەوە.
- قیت کردنەوە: راست کردنەوە.
- قیچێك: قیچەك: برێك: کەمێك: هەندێك.
- قیراندن: قارانن.
- قیر: ١-قیل:
٢-پیسایی ناو قەلنە.
- قیلوقاچ: قیروقاچ: خشت و نیو: کەشوتووش.
- قیرقەنە: قیر: پیسایی ناوقەلنە.
- قیرکەر: هاوارکەر.
- قیروسیا: قیروسی: قیرسی: واتە بـاکم پێنییـە چ دەبێ بابێ.
- قیز: خیسکە: قیسکە.
- قیژاندن: قیراندن.





- قیژە: قیرە.
- قیسکەتەنگ: کەم چکلدانە: بێتەحەمول.
- قیسکەی تەنگە: کەم چکلدانەیە.
- قیل: قیر.
- قیل و قاچ: خوار.
- قیلەتاو: قیرتاو.
- قیم: دڵنیا: ئارخەیان.
- قـەیناغ: سـەپان لـەکاتی دورنـە لەپەنجـەکانی دەکرد، بەرگ یان کیفك یا پەنجەوانـەی پەنجەکانـە لەتەنەکە دروستدەکرێت، تێلێکیش بەسەر گرگرەی پشتی داهاتووە نووکێکی تیژی بەرەو خوارێ هەیە و پۆلیەی بەتەنەکەی پێوە دەخـەن لـەکاتی دورنـە خرینگەی لێ دەهات.
- قەیمە پیاو: پیـاوی تەمـەنی لـە هـەژدە سـاڵی بەسەرەوەبێ.
- قی: شەڕ: جەنگ.
- قەیاسەك: قەیاسێك: چـەردەیەك: پێوانەکـە بـۆ زۆری دەگوترێ: (قەیاسەك پارەی سەرف کرد).
- قەیار: سمی وڵاغی بەرزە.
- قەیتان: ١-شریت: شریتی تۆمارکردن.
٢-لەشێوەی بەنە پێڵاوی پێ قەیم دەکرێت.
٣-بریتییە لەسمێل باریکی جاحێلان.
٤-باریکی لێو.
قەیتانی دوولێوانی.
برنجی  رشت و گێلانی.
- قیسپ: شەقرە: نیرە.
- قیمەتکردن: نرخ کردن.
- قین: بوغز: غەزەب: رك.
- قینەبەری: رك بەرکی: مل بەملە: مل ملانێ.
- قیندار: بەرك: بەڕق: بەبوغز.

# ک

- بەم پیتانە دەنگ گۆڕکێ دەکات:

١-بە(ق) وەك.

کویر: قویل.

لك: لق

رك: رق:.

کەزان: قەزوان.

کوتان: قوتان.

(ك) دەبێتە پاشگرێك لە زمانی کوردی مەیدانیــشی زۆر فراوانــە و بــۆ گــەلێ مەبەسـت بەکاردێ وەك:

١- بــۆ (تــصغیر) و بــچووك کردنــەوە وەك دار:

دارك:{دارکە تۆتن.}

لان- لانك (بێشکە).

دڕ-دڕك، (شۆل-شۆلك).

قۆل-قۆلك.

٢-بۆ (اتصاف و خاوەنایەتی).

وەك: شل-شلك، تەڕ-تەڕك، روخ-روخك.

لاو-لاوك.

٣-بۆ (ئالەت و هۆ) وەك.

زەر-زەرتك ( هۆی زەرکردن).

٤-بۆ میهرەبانی و ناساندن وەك ژن: ژنەکە. پیــاو: پیاوەکە.

٥-بۆ زیادکردنی "**محل**" و جێگاوەك:

ناو: ناوك، (خلیس-خلیسك: شوێنی لوس)

٦-بۆ دیارکردنی "حالەت" وەك:

بزر-بزرك، دامرد-دامرك.

ئالۆز-ئالۆزك.

- کا: کۆ: ١-سەمەری: وردەی قەسەل.

(زەوییەکە شینایی بـەقوڕە سـووڕەی پڕکـا مـالنج کرد) غەوارە.

نەکادین سپیایی کای تێدابوو. (گەدا- ل٣٥)

٢-کاك: (کاحسێن هەم سـەیدبوو، هـەم بەراوێـژی دەمی). (گەدا- ل٤٥)

٣-بۆ ئەمرکردن: کاوەرە.

٤-کوانی: کانی: کانێ: کوانێ: کوا: جێناوی پرسیارە. بۆ پرسیار لەکەس و شت بەکاردێ (کـوا، کوانـێ، کوانی) سەربەدیالێکتی خواروون.

کوانێ سواری دەنازەنین. (تحفە-٢- ل٢١٦)

(کا/کانێ) سەربەدیالیکتی ژووروون.

(کا/کانی): بن لەهجەی هەولێر بەکاری دێنێ.

٥-خۆزگە: کالۆ ئەورۆژی رزگار بایت.

- کابـان: ١-کـەبان: کـەیبانو: کـەیوانۆ: کـەڤان: خانمی ماڵەوە.

...کەیوانۆ کەشی لەو لاوە درووەمانی دەکرد...

(تەنەکە- ل٥٨)

٢-هاوسەری پیاو.





٣-نازناوی گۆرانیبێژی گەورەی کورد قادر کابان.

٤-ناوی ژنانە.

- کابرا: ١-ناوبراو: تاین: فلان: کاورا.

کابرای نەخۆش و برسیش.

(گەدا- ل١٦)

٢-برادەر: ٣-فلانی: ئەوك.

کابرا هەرچەند پێلەقەی لێدا، نانەکەی نەداوە...

(مێژووی کۆیە- ل١٣٥)

- کابرنج: ١-کوانێ برنج: ٢-کای برنجی.

- کابزانم: ئادەی: وشەی ئاگادارکردنەوە.

- کابۆش: نەجیب: شەریف: پیاو.

- کابە: کەعبە.

- کابووس: کـابیس: دێوەزمـە: مۆتـە: مۆتەکـە: مێردەزمە: کامووس: غول: دێوەزمە: دێو: درنج.

- کابین: مارەیی.

- کـاپ: جـگ: هێـسکی چـوار گۆشـە لـەنێوان جمگەکان هەیە.

- کاپك: ١-دەنگ: سەوت: ٢-پەلکی گەنم و جۆ.

- کاپۆل: کاپۆڵك: جومجمە.

قەپێلکی سەری مرۆڤ.

- کات: سات: وەخت.

- کاتبێژ: سەعات: کاتژمێر.

- کاتی: وەختی: وەختێ: کاتێ.

- کاتێك جۆنیانی رووچوو، رووچوو چ رووچونێك.

(غەوارە- ل٨)

- کاتەوار: ئاسار.

- کاتێکی: کاتەکی: وەختەکی.

- کاج: دار سنۆبەر.

- کاچێڕ: کاژێرەی سەرەوە و خوارەوە.

- کاخاشەڕی: مەیدانی شەڕێ.

ئەوشوێنەی شەری لێ دەکرێت.

- کاخۆ: داخۆ: داخوە:

وشەی پرسیارکردنە.

- کادان: کادین: کـەیو: مـەرەك: کایـەن: کـالێن: کۆخ: کێدان: ژوورێکە کە کای تێدەکرا بۆ زستان.

کا ئی خۆت نەبوو خۆ کادین ئی خۆت بوو

(پەند)

بەشی دەرەوەی قەڵاودیواخان و پێشخانە تەویلـە و کادین هێشتا هەر بەپێوە بوون.

(گەدا- ل٣٢)

- کادە: نێوساجی: ناوسێلی.

- کادس: کادز: کاکێشانی ئاسمان.

- کادوو: کادی: دوکەڵ: دوکەر.

- کادی مێش: شانەی مێش هەنگوینی.

- کار: ١-ئیش: پیشە: ٢-ئەمر: فەرمان:

دەچووە ناو بازاڕ داوای کاری دەکرد.

(گەدا- ل١٩)

٣-حادیسە: رووداو:

٤-قازانج: سوود.

٥-بێچوی بزن لەڕۆژی بوونیان تا لەشیر دادەبڕێن و بەگەل مێگەل دەدرێن.

- کارامە: سەیارە.

- کارانە: ١-مزی کار: ٢-باجی کار.

- کاربین: چالاك.

- كارت: بيتاقه: پليت.
- كارتك: تولتيى: توليتى: پرچى پێشەوەی سەری مرۆڤ كە بۆ جوانى دياريدەكەن.
- كارته: ١-كۆتەره: گيايەك كە تۆزێك سەری دەرهێنابێ. ٢-بەشی سەرەوەی توتن.
- كارتۆل: پەتاته.
- كارتێنه: كارتێك: جالجالۆكە.
- كارتيخ: كارتيك: كارتيغ: مەورەد.
- كارچاك: ١-كارزان: ٢-جوامێر.
- كارچڤ: كارچك.
- كارخانه: ١-كارگە: ٢-قەحپەخانە:

خشتێكی زێرە يەكێكی زيوە و وەستا داينـاوە لـە كارخانێ.

(تحفه-١-)

- كارخانچى: گەواد.

هەی مسقۆف: رافزی كارخانچى .

(غەوارە- ل١٤٨)

- كـارد: كێـرد: چـەقۆ: كێـرك:چـەقو: كێردێكـى بەدەستەوەيە. (تحفه-١- ل١٨٣)
- كاردار: ١-مەشغول: ٢-فەرمانبەر.
- كاردانه: زێی ئاژەڵ.
- كاردروست: حەكيم.
- كاردانەوە: دژە كردەوە.

بۆ هەركارێك، كاردانەوەيەك هەيە.

- كاردۆخ: كورد: كاردۆك.
- كاردۆژه: كاكلەگوێز: كاكلەگيز.
- كاردوو: كاردى: زاخ: هاز.

جۆرە گياێكی گەلاپانی زۆر سەوزە، بەلام زۆر تیـژە و بەخاوی ناخورێ دەكرێتە چێشت لەگەڵ گەنمـەكوتا وەيا زەر دەكرێت دەخورێت چوار جۆری هەيە:

١-كاردی گوێى بەرخە.

٢-كاردی ريشه.

٣-كاردی ريخنه.

٤-كاردی شاخی.

كاردی بخۆ بە ساردی.

(پەند)

- كاردوو پەنير: دوودژ دورلەيەك.
- كارِ راست: سادق: راستگۆ.
- كارزان: لێزان: بەهووردە: بەسەليقە: كارشـارەزا: بەڵەد: زۆرزان: زانا: كارناس: وردبين.
- كارزانی: هـووردەیی: سەررِشـتە: سـەليقە: كـار شارەزايی: لێزانـی: ئاشـنايی: بەڵـەدی: زۆرزانـی: كارناسی: وردبين و لێزان.
- كارژەڵە: كـار ژۆڵـە: كـاری بـچوك: كارژێڵـە: كاريله: كارۆك: كارۆكە.
- كارساز: ١-كارێك خەر: سەنعاتكار: ٢-خودا.
- كارڤان: كاروان.
- كارڤان باشی: كاروان باشی:

ئەو كەسەی سەرپەرشتی كاروانی دەكات.

- كارقايم: مەزبوت.
- كارك: كار.
- كارِك: جۆرەپێلاوەكـە، لەنێوچـەوانی پێسـتەی گـا دروستيان دەكرد: جووتيار لەپێى دەكرد سووك و نەرم و نارەحەت نەبوو لەكاتی جووتكردن لە پێ دەكرا.





- كاركەر: خزمەتچی.
- كاركەنار: خانەنشين.
- كاركردە: ١-خەبير: ٢-بەكارهاتوو.
- كاركردن: ئيشكردن.
- كارگە: مەعمەل: كارخانە.
- كارگەر: كرێكار: عەمەلە: فەعەلە.
- كارگێر: مودير: بەرێوبەر.
- كارگەچی: ئەو كەسەی لباد و كـەرك كەپـەنك و قـاپوت و سـەركراو و هێزەدانـی لـە لـوای بـەرخ دروست دەكات.
- كارمامز: شەمكورِ: ئاسـكی دووسـاڵ: بەچـكە ئاهو: بەچكە ئاسك.
- كارمەند: ١-دواكەوتوو لەكاردا: ٢-فەرمانبەر.
- كارن: كارمان: ئيشی ئێمە.
- كارنامە: ١-دەفتر ئەعمال: مەنهەج.
- كاروان: ١-كارڤان: كاڤران:

جۆری ولاغی كاروان (كەر) بووە بۆ شارەكان كراوە (١٠) تا (٣٠) كـەرميوە و رزقيـان لێ بـاردەكرد لەگوندەوە دەيانهێنا شـار بـۆ ئێـوارە دەگەرِانـەوە شوێنی خۆيان: ٢-ناوی كورِانە.

- كاروانـچی: ئـەو كەسـەی كـاروانی دەكـا و خاوەن كاروانە.
- كاروانكردن: هێنانی كەل و پەل بە كەرِەت.
- كارڤان باشی: كاروان باشی.
- كارمسەر: كاروانەرا: كاروان سەرا.

شەوێ لە كاروان سەرا دەخەون.

(حەمەدۆك- ل٨٤)

- كاروان سەرادار: خانچی.

دەی بچين كارون سەرا داربدۆزينەوە.

(حەمەدۆك- ل٨٥)

- كاروانەرێ: رێگايـەك تـەنها: كـاروانی پێـدا بێت و برِوات.
- كاروانەوان: كاروانچی.
- كاروانكوژە: كاروانقران.

ئەستێرەيەكە كاتی خۆی لەكوردستان بەكار دەهات جـا ئـەو (ئەسـتێرەيە) كەبـە دياركـەوتووە كاروانچييەكان وايان زانيوە شـەو درنگـە و دەبـێ برۆن كاتی رۆيشتوون شـەو هێـشتا زۆری مـاوەو، توشی زريان و بەفر و بادەبن و تاريكەشـەو دەبـێ كاروانەكە تێك دەچێ و زۆربـان لەكاروانـچييەكان دەمرن، بۆيە پێيان وتووە ئەستێرەی كاروان كوژە.

- كارە: كار: كارێل: بێچوی بزن.
- كارەبا: كەهرەب.
- كارەدار: دياريكراو بۆ كارێك.
- كارەسات: رووداو: رووشە: كوێست:

بەم كارەساتە خەفەتخان بوون.

(غەوارە- ل٣٥)

- كارِەكارِ: نوكەنوك: گريانی لەسەرخۆ .
- كـارە شـێخ: لـەنێو عەشـيرەتی باڵـەك مەرِدارەكان و زۆربەی خـەڵك بـۆ شـێخەكانيان سەری دەبرِن و گۆشتەكەی دەكەنـە خێـر ئەمـە پێی دەوتری كارە شێخ.

- کارەکەر: کـەنیز: کـەنیزەك: کلفـەت: دەرمـاڵ: بـەرماڵی: تـەیان: کێرکـەر: قـەرەواش: کێلکـەر: خاسەکی: زەرکرپید: زەرخریدە:
ئەو ژنەی لەماڵـە دەوڵەمەنـدان و ماڵـە ئاغایـان کاردەکـات، نانیـان بۆدەکـات و شـیویان بـۆ دروستدەکات و خزمەتی مناڵان دەکـات و کـوڵ و کانیان بۆ دەکات بەپارە:
بـۆ خـۆت بـانگ یەڵـە قەرەواشـان، کـەنیزەکان کارکەران.
(تحفه-١- ل١٣٢)
- کارەگەل: چەندکارێك بەیەکەوە.
کارگەلی وان گەردیان بەرمدایتە ناو هەرمیان.
- کارەما: کارەمێ.
- کارەموو: مووی کار.
- کارەنجام: کارئەنجام: ئەنجامی کارکردن.
- کاریتە: راجە: مەند: داری ئەستووری سەرخانی.
- کارەوان: شوانی بەرخان.
- کاری خراپ: واتە کاری نارەوا.
- کاری چاك: کاری باش: کاری سوودمەند.
- کازیوە: رۆژهەڵات.
- کازییوە ئەنگوت: شەفەقدان.
- کاژ: کاژی مار: کراسی مار.
- کاژاوە: جۆرێکە لەترێ.
- کاژەڵە: جمجمە: کامێرە.
- کاژۆلە: کاژیلە.
- کاژێر: گۆشە: سوچ: قورنە: سیلە.
- کاس: گێژ.

- کاسب: کاری رۆژانەی خەڵك: مزیار.
ئەمن کاسبم دەگەرێم، کە کاری خۆم ببێ تەواوە.
(تحفه-٢- ل٧٥)
من کابرایەکی کاسبم.
(گەدا- ل٢٠٦)
- کاغەز: کاخەز: قاقەز: قاقز: کاغز: کاغەت.
- کاسەلێس: چەلاوخۆر.
- کاسە و کەوچك: زاراوەیە کە بۆ کەرستەی خواردەمەنی بەکاردێ.
- کاسی: گێژی.
- کاش: ١-کاشکی: خۆزگە: ٢-ئاخیر.
- کاشۆ: چەکوش.
- کاشۆبازی: قاشۆانی: قاشۆیانێ: گۆیێن.
- کاشی: جۆرە بەردێکی پانە بۆ بیناسازی بەکاردێ.
- کاشی ساز: کاشی چی.
- کاسبکار: ١-ئەو کەسەی کاری سەرپێیی دەکات.
٢-جاران ئەو کەسانەبوون کە بەکرێکاری و ئیـشە دەستی و سەرپێییەکان خۆیان دەژیاند کە ئەمانـەی خوارەوە دەگرێتەوە:
١-کرێکار: ٢-پینەدۆز: ٣-ناڵبەند: ٤-بیرلێدەر:
٥-ئاسنگەر: ٦-بەقالی و عەتاری و زۆرشتی تر.
- کافرۆش: ١-ئەو کەسەی بەبار لەگوندەنزیکەکان کایان دەهێنا بۆشار بۆ سووتەمەنی بەکار دەهات.
٢- ئـەو کەسـەی لـە دوکـان بـە تەنەکـە بـۆ ئاژەڵ دەیفرۆشت.
- کافرۆشی:
١- عەشیرەتێکە لە ولاتی کۆیی دادەنیشن.





٢-ئەوکەسەی کای دەفرۆشی.
- کافوور: ماددەیەکی بۆن خۆشی سـپییە لـەجۆرە درەختێك وەرئەگیرێ: ٢-بریتییە لەزۆر سپی.
- کافر کوربە: کاتی فەلەکان هێلکە رەنگ ئەکـەن کوردەکانی هەکاری (کافر کوربەی) پێدەڵێن.
- کاڤار: ١-ناحیە: ٢-ناوچە: مەڵبەند.
- کاڤر: کاورِ: ٢-لاپاڵ.
- کاڤشکی: مناڵ بوون: ٢-پێش کاتی خۆی:
- کاڤل: کاول.
- کاك: ١-برای گەورە:
٢-وشەی رێز بەرامبەر کەسی دووەم.
٣-شەختە.
- کاکەمەم: ١-ناوی کورانی کوردییە:
٢-دلداری خاتوو زینی.
- کاکرۆس: پاقلە.
- کاکـەلاو: ١-وشـەی خۆشەویـستییە لەخێزانـدا بەرامبەر بەکورِ یان بەتایبەتی کورِی تاقانەش بێ:
٢-ناوی کورِانە.
- کاکرێ: قەفەزی سینگ.
- کاکە خان: ناوی کورِانە.
- کاك عبداللە: کاکە للە: ناوی کورِانە.
- کاکل: ناوی کورِانە.
- کاکڵ: ناوکە گوێز.
- کاکلە کۆماچ: دووخشتی: کـاڵ لەسـەرەو دەدەن لەیـەك، ژێـرەی بلاوئەبێتـەوە بـۆ زیـاتر وشـك بوونەوەی خشتی کاڵە لەکاتی دروستکردنی.
- کاکلە: مووشان: جالجالۆکە.

- کاکۆ: ١-ناوی کورانە:
٢-کاکە بۆ خۆشەویستی دەڵێن (کاکۆ)
- کاکۆش: کاکەشان: کاکەشین.
- کاکۆڵ: قاقۆڵ: بوکلە:
مووی پێشەوەی سەرکە بۆ جوانی دەهێڵنەوە.
- کاکۆڵ دار: ئەو کەسەی کاکۆلی هەیە.
- کاکۆڵ قیت: قاقۆل قیت.
- کاکـە: ١-کـاك: کـەیان: کـا: کـەیۆ: کـاکۆ: کەین: کریف.
٢-وشەی رێزلێنان بۆ براگەورە:
٣-وشەی رێزلێنان بۆ هەموو کەسێك.
کاکە ناسر دەڵێتەوە کاکە ماڵ ماڵییە.
(تحفه-٢-ل٢٨)
٤-وەك پێـشگرێگ لەگـەڵ رەنگـی پیـاو دەبێتـە نازناوی کابرا یان وەك ناوێك بەکار دێ وەك:
- کاکەسۆر: کاکە+سـۆر، کاکـە رەش، کاکـەبۆر، کاکەشین).
- کاکەشـان: کاکەشـین: کـاکۆش: هـۆك: کـارس: گارس: کەشکەشان.
رێگای کاکەشان لەئاسمانێدا.
- کاکـەیی: ١-ئـەهلی حـەق: عـەلی ئیلاهـی مەزهەبێکی کوردی رەسەنە، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیـە کە ئەم مەزهەبە لەقاڵبێکی ئیسلامی خۆی پیشاندەدا و وەکو مەزهەبێك لەمەزهەبەکانی ئەو خـۆی دەربـڕی خۆیان دەڵـێن (ئـەهلی حـەق) پیـاوی خـوداپێرەوانی مەزهەبەکە خۆیان بۆ خۆیانی بەکار دەهێـنن هەرچـی (عەلی ئیلاهی)یە ئەمە هاوسێکانیان پێیان دەڵێن.

٢-نازناوی خەڵکی کاکەیی.
- کارکێڕك: چەنەگە.
- کاکێشان: ١- کاگواستنەوە: ٢-کاکەشان.
- کاکی: ١-واتە براگەورەی: (کاکی محەمەدی).
٢-نازناوە بۆ ڕێزلێنان لە کوردستانی عیراق بەسێ کەس وتراوە: ١-کاکی زێوەی: ٢-کاکی هیرانی:
٣-کاکی جەلی: (مەلای گەورە- ل٤)
- کاکیلە: گرۆس: ددانی گەورەی پشتەوەی مرۆڤ:
- کاگڵ: خۆڵە سووروکای ورد ئەگرنەوە بۆ سواخی ناو ژوور بەکاردێت.
- کاڵ: ڕەشانێکە دەم و چاوی سوور، یا زەردبێت یا تەنیا گوێیەکانی وابێت.
- کاڵ: ١-پێ نەگەیشتوو:٢-ڕەنگی تێر نەبێ:
٣-کشتیار.
٤-پیر: ٥-خاو: نەبرژاو.
- کاڵا: ١-کەل و پەل: قوماش: کوتاڵ: ٢-کێڵا
کاڵا بەقەد باڵا.
- کاڵات: دزی.
- کالاسە: پند.
- کالك: ١-کاڵك: پێنەگەیشتوو: ٢-باپیر.
- کاڵان: کیفك: کەڵان.
بەشێکە لە خەنجەر لە چەرم و دار دروستدەکرێ.
- کاڵانەی چاو: چاڵی چاو.
- کاڵبوون: ١-پیربوون: ٢-پێ نەگەیشتوو.
- کاڵە: ١-پێ نەگەیشتوو.
٢-پێستی خاوە بە ئەندازەی دووبست پانی و درێژییە پێی تێ ئەخەن و لەسەر پێیانەوە بەسیرمە ئەیبەستن وەکو بەستنی قونگرەی قەیتاندا ئەم کاڵەیە لەناوچەی کوێستانەکان باوە.
- کاڵەمستانە: کاڵەمستێ: کەڵەمستانێ:
یارییەکی کوردەوارییە لەنێوان دوو دەستە دەکرێت ئەنگوستیلەیەك لەدەست دەشارنەوە دەستەی بەرامبەر دەبێ بیدۆزێتەوە.
- کالجۆش: خواردنی هەژاران.
- کالەشین: گیایەکە لەسەر شاخ دەڕوێت قەدێکی دارینی هەیە، بەکاردێ بۆ پالاوتنی بنشتی کوردی کەلە سەرچاڵ دادەنرێت.
- کالەك: سمتەك.
- کاڵەك: گندۆرە.
- کاڵە کەمارانە: گوژالك: زەرەند.
- کاڵەوپێتاو: پێڵاو.
- کاڵە هەڵبەستن: کاڵە دروستکردن.
- کالەدرانە: پێڵاو درانە ...(شەرەف ل١٥٧)
دووسەد هەزار دیناریان کالە درانە بر ببژێری.
(شەرەف- ل١٥٥)
- کالك: ١-کالك: پێنەگەیشتو: کاڵ: ٢-باپیر.
- کاڵ و کرچ: کاڵ و کۆڵ: پێنەگەیشتوو.
- کاڵێ: ١-ناوی کچانە.
٢- ئاوازێکی گۆرانی کوردییە: کاڵێ گیان کاڵێ گیان.
٣-ڕەنگی کراوە: ٤-پێنەگەیشتوو.
- کالیبار: شارۆخ:
بە تۆو دەچێنرێ لە تەرۆزی گەورەترە.
- کالییت: ڕەسەد.





- کالێت: ڕانگە: مەرسەد.
- کالیسکە: عەرەبانە.
- کالیکی: میرات: پاشماوەی مردوو.
- کالیین: کالاندن: قاڕاندن: قاڕەوباڕە: قاڕەی پەزێ
- کام: ١-کێهە: ٢-ئارەزوو:
٣-نەخۆشییەکە لە زمانی ولاغان دێت.
- کامە: کێهە: کیهە.
- کامەتا: کێهان: کێها.
- کامە کامە: کێهە کێهە: دیاریکردنی ئەو شتەی کە دەتەوێ.
- کاملە پیاو: پیاوی بەتەمەن.
- کامباخ: کاوڵ: وێران.
- کامگار: ١-بەئاوات گەیشتوو: ٢-ناوی کوڕانە.
- کامن: کێهانن: کیهانن: کامیان.
- کامەران: ١-شادومان: شادمان: شادمان: شاد:کەیف خۆش: ٢-ناوی کوڕانە
(بۆرە- ل١٣)
بۆ ئاوا لەلاتان خۆشەویست نەبم و بەشادی و کامەرانی بەیەکەوە ڕانەبوورین.
- کان: ١-ئامرازی بەرناسکردنی ناوی گشتییە دوای هەرناوێکی ناوکی و گشتی کەوت و کۆمەڵ بوو ناسراوی دەکات وەك:
گەمییەکان، هێلکەکان.
٢-مەعدەن: کانگا: کانگە: سەرچاوە: لێ وەرگر.
- کانە: ١-ئەستوور:
٢-دڕ: زبر.
- کانبۆرە: ئازا: نەترس: بەزات: بوێر.
- کانج: بێ ئەدەب.
- کاندا: کێوە: بۆ کوێ.
- کانك: بەردەقانی: قۆچەقانی.
- کانکێش: موقناتیس.
- کانگ: داغ داغ:
کراسەکی داغ داغی سپی لەبەربوو.
- کانگای دڵ: دوورِدڵ: ناخی دڵ.
لە کانگای دڵیەوە پەشیمان بووە.
(بۆرە- ل١٣)
- کانگێڕ: بەردی پان.
- کانی: ١-کوانێ: کا.
٢-کانییاو: سەرچاوە: چاوە: چاوگە: چەشمە:
(لام خۆشترە لەشەهیدەوە لەسەد چەشمەیی حەیات)
زەوییکە لەخۆیەوە ئاوی لی هەڵ قوڵێ بۆ هەمیشەیی یا لەبەهاردا لە گوندەکانی کوردستان سەرچاوەی ئاوی بەکارهێنانی خەڵکی گوندە لەگوندەکان دووجۆرکانی هەیە:
١- کانی پیاوان: دەبێ لە خوارەوەی کانی ژنان بێت.
٢-کانی ژنان: تایبەتە بە ژنانی گوند لە سەرەوەی کانی پیاوانە.
٣-هەر کانییەك ناوی جوگرافی خۆی هەیە وەك ئەمانەی خوارەوە بۆ ناسینەوەی وەك کانی ژن و کانی پیاوان.
٤-کانی وەك پێشگرێك بووەتە ناوی زۆر گوند لە کوردستان وەك کانی هەنجیر، کانی بەرد، کانی وەتمان.

٥- كانی لەپەندی كوردی:

كانییەك ئاوی لێ بخۆیتەوە بەردی تێ مەهاوێ:
واتە كەسێ چاكەی لەگەڵ كردی خەراپەی لەگەڵ مەكە.

٦-كانی لە فۆلكلۆری كوردی:

ئەرێ كانی و سەركانی توخوا سەرچاوەی گوڵ بێ.

- كانەبێ: ١-كانۆ: ناوی كورانە.

٢-بەیتێكی لەسەرە (كانەبێ) پیاوێكی ئازابووە شەڕی كردووە.

كانەبێ فەقێ وەیسی
یاللانەمری كانەبێ
كانەبێ خوارزای خاری
یاللانەمری كانەبێ (فۆلكلۆر- ل٨٥)

- كانی با: ١-كانییەكە لەو دیو گردی سەیوانەوە نەزرگەی شەخسێكە دەڵێن چاك كردنەوەی بـاداری گرتۆتە خۆی.

٢-ناوەكەی لەچاكردنەوەی بادارییەوە هاتووە بووە بە (كانی با).

- كانی تەقین: سەرهەڵدانەوەی ئاوی كانی لەبەهاردا.

- كانیس ئەستوور: بریتییە لە بەفیز و لەخۆبایی.

- كانییلە: كانی بچووك: كانیلكە.

- كاو: ١-مراد: ئاوات: ئارەزوو تاسە: ٢-ئەشكەوت.

٣-مەغرور: ٤-بەنرخ: ٥-چیا: ٦-جوان: ٧-یەكجار: ٨-ئێش: ژان.

ناسردڵم لەكاوە
چەندی لە كاوەكاوە (تحفە-٢-ل٣٢)

٩-لوتكەی زۆر سەختی شاخ.

١٠-كاتان: كاودایتە ولاغان.

- كاواتریی: كاواترایی: كۆتر.

- كاوە: ١-ترۆپیكی چیا.

٢-رزگاركەری گەلی كورد لەدەست زۆحاك و دامەزرێنەری جەژنی نەورۆز.

٣-ناوی كورانە.

- كاوە خۆ: لەسەرخۆ: هێدی.

بەكاوە خۆ وەرن.

- كاویا: خەیاڵی خاو.

- كاوت: مانگ.

- كاوڕ: كەهیر: كەهیر:

بەرخی تەمەن ساڵ و نیو
دوو جۆری هەیە:
١-كاوڕی نێر:
٢-كاوڕی مێ.

شەڕی كاوڕان نییەشەڕی بەرانە...
(تحفە-١- ل١٨٥)

- كاوڕانە: جۆرێك بوو لە باج كەخاوەن موڵك لە جووتیاری دەستاند.

... كاوڕانە و خۆری یانە و میوانە و فرووجانە و بێكارانەی خۆیان... دابوو (گەدا- ل١٢١)

- كاول: كامباخ.

- كاولكردن: وێران كردن: تێكدان.

- كاولگە: خەرابە: وێرانە.

- كاول كەر: تێكدەر.





- كاولی: وێرانی.

- كاولە ئاش: كاولاش: وێرانە: كاول: كەلاوەی ئاش.

- كاولاشی خۆتانە: واتە ماڵی خۆتانە.

- كاهو: خاس: گیایەكی گەڵا پانە دەخورێت و دەكرێت بە زەلاتە.

- كاهووەچەورە: كاهووی ڕۆن:

جۆرە كاهوویەكە ڕۆن لەتۆوەكەی دەردەهێنرێت.

- كاهووە مارانە: جۆرە كاهوویەكە شیراوی هەیە.

- كپ:١-بێ دەنگ:

٢-داخراو.

- كپ بوون: بێ دەنگ بوون.

- كپ كردن: بێ دەنگ: كردن و نەمانی هەرا و هۆریا.

- كپی: بێ دەنگی.

- كت: ١-پارچە:

٢-وشەی دەركردنی پشیلە: خت: كتە.

- كتتە: ١-كت: ٢-لە پشتی منالی بچووك دەدرێ ئەگەر منالەكە شتێكی لە گەرووی بێت.

- كتارو: شین و شەپۆڕ.

- كتاو: كیتاب: كتێب: پەرتووك.

- كتۆ: چۆن.

- كتۆیی: چۆن چۆنی.

- كتێبوچكە: نامیلكە.

- كتوو پڕ: كرپ: كوتوپڕ.

كوتوپڕ بە شێنەیی سەری هەڵێنا.
(گەدا- ل١٨)

- كتو كۆر: كتوكوێر: كوێرەمشە: كتەكۆر.

- كتیسك: دەنگی سووتانی سووتەمەنی: لزمە.

- كچ: كناچە: كەنێ: كەنیشك: كیژ: دۆت: دۆتە: قیز: كەچ: دویەت: دوێت: كەنی: كناچی: دوت: كنیك: كەچك: ترە: دوویت: دوێتە: كنێ:

١-مێینەی ئادەمیزاد:

٢-كچێ هێشتا شووی نەكردبێ.

- كەچاقنج: كیژی جوان.

(كەنیشكە چیتەوێ بچكۆڵەی دوێنێ شەوێ قوولت بكە بەسەرین بەجووت خەومان لێ بكەوێ).
(گوڵاڵە- ل١٣٠)

كەنیشكە مەڕۆ، وامن لەدوتم
ناوت نازانم، عەشقی بالاتم (گوڵاڵە- ل١٣١)

باخی بێ پەرژین زینەتی نییە
كچ وەبێ برا قیمەتی چییە
(گوڵاڵە- ل٤٢)

كچا خۆنەدەب كوڕی خەڵكی. (كانی- ل٨٩)

- كیژامن: كچی من.

مەمكێ كنێ لێ لێ سێوكاترشە وای وای.
(فۆلكلۆری- كوردی ل٧١)

ناكیژە جوانەكەم ئەم بەڵایە دووركەوتنەوەی نییە.
(حەمەدۆك-٢- ل١٥٠)

ئاخ، قیزا كورد، بەدەوی، بەدەو وەك حوری.
(كەشكۆل-ل١٨٣)

- كچەك: كەچەك: كچێك: كیژەك: یەك كیژ.

- كچك: كچكە: بچووك.

- كچ و كاڵ: كیژوكار.

- كچۆلە: كیژۆلە: كیژورە: كچی بچووك.

- کچی ماڵەوە: کچێ لە ماڵەوە بێ و فەرمانبەر نەبێ.
- کچێ: ١-وشەی بانگکردنی کچ:
٢-وشەی دواندنی ئافرەت:
هێ کچێ لەبان جادەکە
شانەکم لیٚ مەدە
- کچێتی: ژیانی کچ.
- کچێنی: کچی هێشتا شووی نەکردبێ.
- کچێنی بردن: کچ کردنە ژن.
- کچێنی دار: کچێ هێشتا نەکرابێتە ژن.
- کخ: کخە کخ: بەزمانی منالّ واتە مەخۆ.
- کخس: خسکە: پیازی زۆر ورد کە دەچێنرێ دەبێتە پیاز.
- کخك: کۆخە: کۆکە.
- کدادك: کدارك.
- کوندر: کوندك.
- کدوو: کوولەکە: کودی: کولّند.
- کر: بوزو: شال: لەمەرەز دروستدەکرێت (١٦,٠م) پانە زۆر تەنکە بەجۆلا دروستدەکرێت ودەیکەنە رانك و چۆغەی زەلامان.
- کرچنین: دروستکردن.
- کرار: مەحکەم.
- کراس: ١-کراوس: گچی:
٢-سەنگێکە دەکاتە یەك کیلو.
- کراس قاقانی: ئاوازێکی گۆرانی فۆلکلۆری کوردییە.
- کراس مارانە: کراسی ماریی: توێژی ماری.

- کڕ: ١-بێ دەنگ: هێمن:
٢-مریشکی کورك کەلەسەر هێلکە دانیشێ.
- کڕان: ١- لێکردنەوەی بن مەنجەڵ لە خواردەمەنی.
٢-خاوێن کردنەوەی ئاش لە پاشماوەی گەنم.
٣-کڕانە بەرد: زەوی بەردەلان.
٤-زەوی عاسی.
- کڕاندن: لێکردنەوە
- کراو: ١-کرای: ٢-کلاّو.
- کرباس: قوماشی بەدەست لە لۆکە ڕێسرابێ.
- کرپ: جوولاّنەوەی خێرا و کارکردن.
- کرپە: خورپە: خرپە: تەزووی ناخۆش.
- کرتاندن: دووکەرت کردن: دوولەت کردن.
- کرتە: کرتەکرت: کرپە: دەنگی کرتاندن.
- کرتۆپە: پەتاتە.
- کرتی: لە دەو بەستان شین دەبێ بۆ گسك بەکاردێت.
- کرچە: کرچە کرچ.
- کڕخاو: کڕخەو: نوستنی خۆش.
- کرد: پیشە: کار.
- کردار: ١-کار: ٢-زراعە:
٣-ئەخلاق: تەبیعەت.
- کردە: کردار.
- کردەوە: فعل : کار.
- کردەوەی گەند: کاری گەند:
کردەوەی داخوازی: کاری داخوازی.
- کردەی رابردوو: کاری رابردوو.
- کردەی رانەبردوو: کاری رانەبردوو.
- کردەیی: عەمەلی.





- کردنەوە: والاّکردن.
- کردوکار: کار: ئیش.
- کرژ: ١-گرژ: ٢-خێرا: ٣-عەبوس.
- کرژنگ: قرژاڵ.
- کرژبوون: گرژبوون: کرژهەلاّتن.
- کرس: زبل: کرش وکاڵ.
- کرس کێش: کەناس: مالەر.
- کرس گە: مەزبەلە: خەرابە.
- کرش: ١-کوورش: وشەی بانگکردنی کەر و ئێستر. ٢-زبڵ.
- کڕبوون: بێ دەنگ بوون.
- کڕکردن: بێ دەنگ کردن.
- کڕك: لەفز: نوتق.
- کڕکاندن: کڕاندن.
- کڕکات: قسە.
- کڕکاتی نەکەی: واتە قسەی نەکەی.
- کڕکەفتن: کورك بوون.
- کڕکڕ: وەك دەستاڕ وابوو لە دار دروست دەکرا چەڵتوکی پێ لێدەکرا بۆ ئەوەی پەلکەکەی لیٚ بکرێتەوە.
- کڕکڕا رووك: کڕکڕاگە.
- کڕکەفتن: کڕکەوتن: مریشکی کورك کە لەسەر هێلکە دانیشتبێ.
- کرمانج: ١-کورد: ٢-رەنجدەر
ئاغانییە کرمانجیە: واتە رەنجدەرە.
٣-خەڵکی لادێ: ٤-ئەو لادێیانەی کە عەشیرەتێکی ناسراویان نییە، وەیالەم لاولەولا پەیدابون لەگوندێکدا کۆ بوونەتەوە بەژن لێك هێنان خزمایەتییان پەیدا کردبێ، خەریکی فەلاحەتی و مەڕبەخێوکردن بوونە:
٥-داشی دامەی بەئاغامەخۆ بەکرمانجی بڕۆ:
٦-ناوی کوڕانی کوردییە:
٧-مسکێن و رەعیەت.
- کرمانجی: ١-واتە خەڵکی لادێی:
٢-زمانی کوردی:
٣-شێوەی سەروو لەزمانی کوردی.
- کرماندن: وردکردنی نانی رەق بەددان.
- کرم: کورم: گیاندارێکی بێ بڕبڕەیە گەلێك جۆری هەیە زۆریان مشەخۆرن.
- کرماوی: بە کرم: کرمدار: کرمۆل: کرمژن: کرمن: کرمۆن.
- کرمێ: کرمی
- کرمە:١-کرمە کرم:
٢-دەنگی کرتاندی خواردن.
- کرمکار: چالاك.
- کرمەستە: جۆرە مارمێلکەیەکە بێ قاچە لەمار دەچێت پێڵوی چاوی هەیە.
- کرمدار: بەکرم: کرمن: کرمژن: کرمۆل.
- کرمی ئارد: مێروویەکە دەکەوێتە ئاردەوە.
- کرمی ئاوریشم: جۆرە میروویەکە لەسەر داری توو دەژی ئاوریشمی سروشتی دروستدەکات.
- کرمی ئالقەیی: جۆرەکرمێکە لەشی لەچەند ئەڵقەیەکی چوون یەك پێکهاتووە وەکو کرمی زەوی واتا گلّ خۆرکە.

- کرمی بەفری: کرمێکە لەبەفر پەیدادەبێ.
- کرمی پان: کرمی پانکۆڵە.
- کرمی پانکەلە: وەکو کرمی جگەر.
- کرمی جگەر: پەپوولەی جگەر: کرمێکی مشەخۆرە لە جەرگی مەڕ و ماڵاتدا دەژی و تووشی نەخۆشی دەکات لەگەڵای درەخت دەچێت.
- کرمی دەرزیلەیی: کرمی کۆم: کرمی قنگ : کرمێکی بچووکی سپییە درێژییەکەی (١)سم دەبێت لە ریخۆڵەی ئەستوورە و کۆمدا دەژی دەبێتە هۆی خورانێکی زۆرلە کۆمدا.
- کرمی زەوی: گل خۆرکە: کرمێکی ئەلقەیی سووری باریکە لە ناو زەویدا دەژی، زەوییەکە هەڵدەگێڕێتەوە لەبەرئەوە سوودبەخشە بۆ کشتوکاڵ.
- کرمی خیلاریا: کرمێکی خڕی تەنکی بچووکە بەهۆی جۆرە مێشوولەیەکەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ مرۆڤ.
- کرمی کەوانەیی: مێروویەکی سەوزە زیان بە رووەك دەبەخشێت.
- کرمی لم: جۆرە کرمێکی درێژە لەناولمی قەراغی دەریاکاندا دەژی.
- کرمی ماری: جۆرە کرمێکی بچووکی دەزوولەییە نەخۆشی رووەکی بڵاودەکاتەوە.
- کرمی مێو: کرمی شانەی هەنگ:
جۆرە مێروویەکە لە سەری مێوی ناو شانەی هەنگ دەژی.
- کرمەك: ١-خەناوکەیەکە لەشێوەی کرمە بۆیە پێی دەڵێن کرمەك.

هەر چەندی کرمەك و گوارە و مۆر و ئەنگوستیلەی خاتوون پەریخانێیە.
(تحفە-١- ل٣٨٦)
٢-کرمۆکە: ٣-یەك کرم.
- کرن: کردن.
- کرن هاوار: کردنە هاوار: هاوارکردن.
- کڕندە: ١-کریار: ٢-ئامراز.
- کرۆز: جومجمە.
- کرۆژ: ١-ناوی رووبارێکە لە چیای بەنە باوی دەردەچێت:٢-ناو گوندێکە لە تەنیشت رووبارەکە.
- کرۆش: هاڕین بەددان.
- کرۆسك: هەرمی کێوی.
- کرۆك: ١-ناوەند: ٢-خولاسە: ٣-ئەساس.
- کروور: ملیۆن.
- کرووز: بۆنی سوتانی موو.
- کروزانەوە: پاڕانەوە: کڕووزە.
- کرووژم هەلاتن: گرژبوون.
- کرووس: لال: کرێل.
- کڕووش: کڕش: وشەی بانگکردنی کەر.
- کڕو فرۆش: معامەلە: کڕین و فرۆشتن.
- کڕوو کاش: کۆشش: هەوڵ: تەقەلا.
- کڕووکاشکار: چالاك: چاپوك.
- کرێ: مز: کرا:جەمك: پێمزك: مزە: پارە لە بری کارکردن دەدرێت.
- کرێبار: مزی بار.
- کرێپالە: ئەو سەپانەی بەڕۆژانە سەپانی دەکات.
- کرێچی: ئەوکەسەی بەکرێ دادەنیشی:





١-لە خانوو.
٢-لە دوکان.
- کرێت: ناشیرین: هێسك گران: خوێن تاڵ: بێ ڕەزا.
- کرێژ: قرێژ: چلك: چرك:
پیسی لەش.
- کرێژاوی: چڵکن.
- کرێژك: کرێش: چڵك.
- کرێکار: ١-کارگەر: عەمەلە.
٢-بەو پاڵەیە دەگوترا کە بەپارە دروێنەی دەکرد.
٣-ناوی کوڕانە.
- کرێگرتە: بەکرێ گیراو.
- کرێوە: باپێچ: ناپووك: دف.
- کریا: کرا.
- کڕیار: بسێن: سەنیار: بکڕ.
- کریابۆ: کرابێ.
- کریاس: دەربار: پاشایان.
- کریان: کراوە.
- کریانی: کراوی.
- کریاوە: کرایەوە: کراوە.
- کریشمە: ناز.
- کرێڵە: کلێڵە: بەفرێ کەلایەکی رەش بووبێتەوە.
- کڕین: سەندن: کریڤ.
- کریڤایی: دۆستایەتی: ١-دۆست: ٢-کاکە.
- کریڤی یەکتر: دۆستی یەکتر: چون دەبن بەکریڤی یەکتر؟ : ئەگەر یەکێك ویستی مرۆڤێك بکاتە (کریوی) خۆی هەردوو مرۆڤەکە دەوڵەمەندبوون، ئەوە ئەسپێکی بۆ ئەڕازێنەوە ئەو کەسەی ئەدەنێ و وڵامێکی ئەداتەوە کەبووەتە (کریو)ی وان ئەو دوو مرۆڤەی کریوی یەکترن لەچینی ناوەڕاست یاخود خوارتربوون ئەوە بەراتێکی بۆ ئەنێرن و ئەبێتە کریوی ئەومالە، باوکی کوڕ کاتێك کوڕەکەی خەتەنەئەکات خواردن دروستئەکەن ئاهەنگێ ئەگێڕن رۆژی خەتەنەکردن بانگی خەلك ئەکەن و (کریو)یش بانگ ئەکەن و پاش نان خواردن بلاوەی لێ ئەکەن (دەلاك) دێت منالەکان خەتەنەئەکات و بەخششی دەلاك لە (کریو) وەرئەگرن و هەتاسێ ڕۆژ رۆژی دووجار لە مالی کریوەوە خواردن بۆ منالان دێت.
- کز: ١-مات: مەلول: ٢-نزم : (چرایەکە کزکە):
٣-بێهێز: بێتێن.
- کزان: خەم خواردن.
- کزانەوە: زوورانەوە: هێشانەوە.
- کزاندنەوە: زووراندنەوە.
- کزە: کززە: ١-هێشان: ٢-سوتان.
- کزەبا: بایەکی کەم.
- کزەی بای: ئەو بایە ساردەی کەدێت.
- کزەی دڵ: دڵە کزە: سوتانەوەی دڵ.
- کزەی جەرگ: جەرگ هێشان.
- کزەکز: ١-هێشان: ٢-دەنگی سوور بوونەوەی چەوراتی لەسەر ئاگر.
- کزر: نیوە وشك بوو.
- کزربوونەوە: بەرەو وشك بوونەوە.
- کزکە: کزیلك: چزیلکە: سیزلك: کسکە: شلکێنە

دوونگ لەسەر پشتی سێلی سوورکرانەوە و برژاندن.

- کزمەچی: خزمەتچی
- کزۆك: زۆر بەئێش: زۆر هێشان.
- کزێنکە: شلکێنە.
- کژ: ١-وەرز: فەسل. ٢-کەرەت:
٣-زەوی پاش کەوتنی پشکۆی زەردی.
- کژەباران: بارانی وەرزی.
- کژك: تەزرە.
- کژوومات: کش و مات.
- کژی ماڵ وەدەران: بەوەرزی بەهاری دەگوترێ کەماڵ دەچنە هۆبە و رەشماڵان.
- کسە: کسە کس: وشەی لێخورینی ئاژەڵ.
- کسك: رەنگی کەسکی کراوە.
- کسکس: وشەی هاندانی سەگ بۆ هێرش بردن.
- کسکین: ناڵە.
- کسۆك: ١-سەگ: بەمەجز: وەك جوێن بەکاردێ.
- کش: ١-وشەی دەرکردنی پەلەوەر.
٢-لەیاری شترەنج بەکاردێ.
٣-کش و مات: خامۆش: ئارام: هێمن: بێ دەنگ.
- کشان: درێژبوون.
- کشانەوە: کشانەدواوە.
- کشاندن: درێژکردن.
- کشە: ١-کش: بۆ دەرکردنی پەلەوەر.
٢-هەزارپێ.
- کشپەڵ: قشپڵ: پشقل: کشپل: پیسایی مەڕ و بزن و مامزە کێوی.
- کشپل دان: ژووری قشپلان.
- کشت: ١-کشتوکاڵ:
٢-بەرهەمی ساڵ.
٣-کرژ: بەنەکەی کشتکە.
- کشت و کاڵ: کشت: زەراعەت.

خەڵکەکە لەکاروباری کشتوکاڵی و شتی تردا دەستی یارمەتییان بۆ درێژکرد..

(غەوارە- ل٧٣٠)

کشتوکیاز: باخچە: شوێنی تایبەتی سەوزە چاندن:
کشتگە: کشت زار: کێڵگە.
- کشتوکیار: باخەچە: کێڵگەی سەوزەوات.
- کشتیار: ئەوکەسەی زەوی دەچێنێ.
- کشین: خشینی مار: واتە رۆیشتنی مار.
- کف: بۆگەن: کفکۆ.
- کف بوون: بۆگەن بوون.
- کفە: کفەکف: دەنگی سوتانی کبریت.
- کفت: ماندوو: شەکەت: مانیا.
- کفت بوون: ماندووبوون.
- کفت کردن: ماندووکردن.
- کفتە: خواردنێکە لەبروش و گۆشت دروست دەکرێت: قلی قلی.
- کفتۆکۆ: ئێش و ئازار: کڵ و کۆ: کوڵ وکۆ.

بخوێننەوە تا کۆڵ کۆتان دامرکێ.

(گەدا- ل٨)

- کفتوکۆ دامرکان: کلوکۆدامرکان.
- کفتی: ماندوویەتی: شەکەتی.
- کفکۆ: کف: بۆگەن.





- کفر: جۆرەگیایەکە مەترێك بەرزدەبێتەوە.
- کفر جار: شوێنی کفری زۆربێت.
- کفن: کەفەن: خەڵات.

تۆ کفنی بۆ بکە و شۆردن و گۆڕیشی لەسەر من.

(گەدا-ل١٠٠)

- کڤان: کەوان: چەماوە.
- ککرت: بارووت.

کل:١-جیاواز: ٢-لادەر: ٣-لا: ٤-جۆرە تۆزیکی رەشە چاوی پێ ئەرێژن بۆ جوانیو، بۆ دەرمان.
- کل لەچاوکردن: چاورشتن بەکل.
- کل کردن: ناردن.
- کڵ: ١-ئاگری تەپاڵەکە گۆزە دیزەی دەخەنە ناو بۆ سوربوونەوە لەکاتی دروستکردنی گۆزەودیزە.
٢-تاقی پرد.
- کلا: لادەر: موحەریف: چەواشە: (جاشەکانی چەواشە مردنبۆ ئێوەش باشە).
- کلاش: کراش: کەلاش: کالەش: گیوە: پێتاوی پەرۆ پێتاوێکی کوردەوارییە، سەرەکەی دەزووە و بنەکەی یان قەلتاغەیان لاستیکە و یان پەرۆیە.
١-کلاشی ساقینی: جۆرە کلاشەکە سەرەکەی دەزووە بنەکەی قەلتاغە.
٢-کلاشی پەرۆ: ٣-کلاشی بن لاستیك.

ئێستا داوایانە بەکوردی کەڵاش درێژی لای لایە دەکا بۆ کوڕی کوردییە.

(تحفە-٢- ل٣٠)

- کلاش خوار، رەنجدەر.
- کلاشێن: سەقل.
- کلام: زنجیرەیەك لە سروودی گۆرانی ئایینی لەمەزهەبی ئەهلی حەق کوردەکان پێی دەڵێن کلام
- کلافە: ١-کلاف: کەلەف: دەزووی خرکراوە.
٢-بنەچەورەگەز: ٣-کفتە:
٤-سوڕانی ئەسپ بەدەوری خۆیدا.
- کلامی شینی: بەیتی شین و لاواندنەوەیە دەربڕینکی قوولّ و ناخۆشی خەمباری و دڵ تەنگی کوردە یەزیدییەکانە.
- کلاو: ١-کراو: کولاڤ" تەقلە: تاقیلە: تەقیلە: ئارەق: چین: عارەقچین: چقە.
٢-بەشێکە لەسەرپێچی پیاوان لەکەڵەفی چنراوەیان کەڵەفی ئارموشی رەش و سپییە سەری قیتە و لاتەنیشتەکانی خامەکی مۆرە یان سەری پانە و بەسیم و ئارمووشی رەنگاوڕەنگ نەخشاوە، کڵاوە دەبێ بەتەنیاش لەسەری دەنێن یان جەمەدانی یان هەوری وەیان شەدە بەدەوری کڵاو دەپێچن و پیاوان لەگەڵ جلی کوردی لەسەر دەنێن.
جۆری هەیە وەك :
١-کڵاوی خامەکی سۆر:
٢-کڵاوی دەزی.
٣-کڵاوی سامتینی رەنگاوڕەنگ.
٢-ژنی کورد لەسەری دەنێن، لەلبادی رەشەو لاتەنیشتەکانی نەختێ هاتوو خواری نەتەقەڵی لێ دراوە و لێواریشی بەشیرازەیە و ئەویش هەرڕەشە (٠,١٠م) دەبێ دراوێکی زیوی (٠,٢٠م) دەبێ دراوێکی زیوی لەترۆپکە دەدوورن و دەسماڵی لێ قایم دەکەن.

- کلاو ئاسنین: کلاوزرێ: تاسکەڵاو: خودەی پولادی سەرباز لە کاتی شەڕ لە سەری دەنێن.

- کلاوبۆرە: کلاوێکی سێ سووچە شوان لەکاتی باراندا دەیدا بەسەریدا و تان و شانی دەگرێتەوە ئەمیش هەر لە بەرگن دروست دەکرێ.

- کلاوچە: ئەو کلاوە بچکۆڵەیەی ئەکرێتە سەری مردوو.

- کلاوڕەش: عەجەم.

- کلاو لەسەرنان: بریتییە لە فریواندن: هەڵخەڵەتاندن.

- کلاوکۆرە: سۆفەقیتە: شوان خەڵەتێنە: قاژەلاح: کلاوسوورە:
باڵندەیەکی بچووکە.

- کلاو دەسماڵ: ژنی کورد لەسەری ئەنێ بەتایبەتی شاری سنە، کلاوەکەی لەمقەبا دروستئەکرێ لەچەکی چیت بەدەورەیا لوول ئەکرێ و بەسەر شانا دێتە خوار.

- کلاوە: ١-تەپۆڵکەی چیا: سەری چیا:
٢-پۆپیتەی کەڵەباب.

- کلاوەی زرانی: کلاوەی چۆکی: کەش کەژنۆ: کەشکە چۆك.

- کلاوی سەخرە جن: بیر و باوەڕێکی پروپوچە ئەڵێن هەرکەس ئەم کلاوەی لەسەر بێ نابینرێ.

- کلاوین: کلاوکلاوانێ:
جۆرێکە لەیاری کوردەواری کە بە کلاوە دەکرێت.

- کلپە: هەڵاو.

- کڵپە کڵپ: سوتانەوەی برین.

- کلچووك: کلچێوك: میلچۆك: میلچێووك: کلچۆك: کلچۆڤ: میلی کلدان:
پارچە دارێکی خۆشکراوە (٠,٩٢)م درێژە بۆ چاورشتن بەکاردێ.

- کڵفت: زەخم: گەورە.

- کلك: ١-کلك: ٢-پەنجە:
٣-قەلەم: ٤-کۆتایی شاخ.

- کلك جووڵاندن: ماستاوکردن.

- کلك پێوەکردن: هاندان.

- کلکدار: بەکلك.

- کلچووکە: چوار ئاسنی لووسی خڕە پڕ بە کلدانەن بە حوشترۆکەکان بەندن دەچنە ناو کلدانەکان لە جەنجەردا.

- کلدان: کلتوور: پارووشك: سورمەدان: کلەدان: کلدانك:
تۆربەیەکی بچووکە و ژنان کلی تێدەکەن.

- کلدانە: ژمارەیان چوارە واتە هەر چوار کونی هەردوو تۆپەی جەنجەر کەکلچووکەکانی حوشترۆکەی دەچێتەناو.

- کلۆ: کولۆ: گلمت:
شەکری شەکردان : کلۆ کلۆیە.
(کلۆشەکر: کلۆبەفر).

- کلۆت: کڵوك: کوڵمك:
ئێسقانی سێ بەندە، ئەوەی دەکەوێتە ژێر کەلەکەوە.

- کلۆر: خورقال: ناوخاڵی: هولۆل: قوڕۆل: هلۆل: ناوبۆش: داری کلۆر: کلۆرەدار: داری ناوخالی.





- کڵۆم: داخستن: پێوەنان: بەستن: پێوەدان: وێخستن: دادان: گالەدان.
(دەرداگا داخستن: دەرگا کڵوم دان).

- کللۆ:کوللە:کلۆ:کولۆ:کولە:کولی:ویزەویزە:کولۆ: کلوو: کولپ: زیندەوەرێکە دژی دەغڵ و دانە.
ئەو سالە شارەزوور نەهاتی بوو سن و کوللە هیچیان بۆ نەهێشتبووە.
(گەدا- ل١٧)

- کلووك: کوولیك: گلوك: گوڵ: گوڵی بەهاران

- کلێنجە: کلێژە: کلێنجە: کلێنجك.

- کلێسا: کلێسە: کەنیسە: دێر:
جێ عیبادەتی گاوران.
لەدێریش بوو لە مزگەفتیش بوو.
(تەنەکە- ل٦٨)

- کلیل: کلید: کلیت:
ئەم کلیلەش بگرە بچن بۆ ئەوخانووەی لێی بووم.

- کلیلە و پشکە: قفل و کلیل.

- کلیلدان: داخستن: قەپاتکردن.
هەر کەسە دەرکەی خۆی کلیل دا!...
(تەنەکە- ل٧٩)

- کم: ١-عەمامە: ٢-کێم.

- کن: جەم: ئال: ئالی: ڕۆخ: تەك: لا: بنپاڵ: رەخ: نك: پال: تەنیشت.

- کن ئەمن: لای من.

- کنتو: کنەتو: لای تۆ: نك تە.

- کنتان: لاتان.
لەکنتانە: لەلاتانە.

- کنت: لای تۆ.
لەکنتە: لەلاتە.

- کنم: لام.
لەکنمان: لامان.
لەکنمان نییە: لەلامان نییە.

- کنیان: لایان.
لەکنیانە: لەلایانە.

- کنا: ژن.

- کنج: ١-مەهك: بێ نوێژی ژن: عادە:
٢-جل و بەرگ.

- کنا چە: کچ.

- کنا چڵی چەم: کنا چڵەی چەم: بیل بیلەی چاو.

- کنارە: پەرژینی خانوو: شوورەی خانی.

- کناوە: لە کار وەستان.

- کنە: لێ کۆلینەوە.

- کنە کردن: لێ کۆڵێنەوە بەنهێنی.

- کندڕ: کەندڕ: کەندیر: رشتە:کەندییڵ: گوریس: وەریس پەت: کەندر: تەناف.
پەتێکی خڕی درێژە بۆ شەغرە و جەنجەڕ و بەستنەوە بەکاردێ.

- کندۆس: حەسوود.

- کنر: بەن.

- کنك: کورتەی خریلە: بەژن کورتی خریلە.

- کنووس: ١-بەخیل: حەسوود: ٢-سفلە: سپلە.

- کنیا: کەنرا: هەڵکەنرا.

- کنیابۆ: هەڵکەنرابێ.

- کنێر: ١-کنێرە: دارێکی کێوییە دێمەکارە خۆرسکە لەسەر چیا بڵند و بەفرینەکان شین دەبێ.

٢-ناوی کچانە.
- کنێرە: ١-کنێر: ٢-قەتماخەی برین.
- کنی: ١-لای: ٢-قەتماغەی برین.
(لەکنی بوو: لەلای بوو) دایکی خاتوون ئەستی
هاتە کنی گوتی. (تحفە- ل٧٠)
کۆ:١- پیرۆو: ٢- خڕخال: ٣-کەو: ٤-کا
٥-کۆلان: ٦-لا: ٧-چیا: کێو: ٨-ترس:
٩-کێندەر (کۆ باشە بچین).
- کۆبوونەوە: کۆم بوون.
- کۆبە: ١-خاشیە: ٢-پول.
- کۆپانە: خوری بەجێ ماو لەسەر پشتی مەڕ.
- کۆپەل: بەردی پر بەدەست.
- کۆپیان: چونە ژورەوە.
- کۆپەڵان: کۆپەران: بارینە: ئامرازێکی جوتکردن
و جەنجەرە.
بابۆلەیەکی لبادە یا گوشە خراوەتە ناو کیفکێکی
قایشی چەماوە
دەکەوێتە بەر سینگ و پێش پیلەکانی ولاغی
دابەستراو بۆ ئەوەی دار کراوەکان و نیر سینگ و
پیلەکانی ولاغەکان نەجەمێنن
- کۆت: ١-رووت: ٢-مل بەند: سەرکۆت:
٣-قەلات: ٤-کوندە ئەگەر کون بێت و بەداوە
بەنێك کولەکەی وشککراوەی لێ دەدورن ئەمە پێی
دەڵێن (کۆت).
- کۆتا: ١-بەژن کورت: ٢-بەکورتی.
- کۆتاکەر: کورتی کەرەوە: بیبڕەوە.
- کۆتر: کەمووتەر: کەمووتر: گۆگەچین
کاوترایی: کەڤۆك: کاموتری: بەهیڤ: کەڤۆك:
تڤیل: کەڤۆکی: تفتیلك: کاپەڵ: کەبووتەر.
باڵندەیەکی ماڵی و کێوییە، نێرە (٢٠) رۆژ
جارێك بەسەر مێیەدا دەفسێ، واتە جووتدەبن،
مێیە دوو هێلکەی دەکات مێیە لەسەر هێلکەکان
دادەنیشێ تا هەڵیدێنی و بێچوەکان بە خۆراکێك
بەخێودەکات پێدەڵێن (زاخ) لەڕووی رەنگ جۆری
زۆر چەشنی هەیە.
بازباز و کوموتر باکەموتر: واتە هەرکەس لەگەڵ
هاورێ خۆیا. (پەندی کوردی- ل٣)
٢-جۆرەکانی کۆتر: کۆتر جۆری زۆرە
لەڕووی رەنگ و پەڕوباڵ و ماڵی و کێوی جوێی
دەکرێتەوە وەك ئەمانەی خوارەوە:
١- کۆتری تەقلەباز: ئەم کۆترە لە ئاسمان تەقڵە
لێ ئەدات.
٢- کۆتری هاقوو: ئەم کۆترە ناوەکەی لە دەنگەکەی
وەرگیراوە، چونکە ئەم جۆرە دەنگەی لێوەدێ.
٣- کۆتریی پەڕەیی: ئەم جۆرە کۆترە سەروچاو و
ملی و قاچەکانی بەپەڕداپۆشراوە.
٤- کۆترە پەڵە: گاکۆتر: ئەم جۆرە کۆترە
شێوەیان گەورەیە.
٥- کۆتری نامەبەر: ئەم جۆرە کۆترە لە زەمانی
کۆندا بۆ نامە هێنان و بردن بەکارهێنراوە
٦-کۆترە کێویی: کۆترە شینکە: کۆترە کیویی:
رەنگەکەی شینی تێرە و بەزۆری لەشاخەکان دەژی.
٧- کۆتری پەڕلەپێ: قاچەکانی ئەم کۆترە هەمووی
بەپەڕداپۆشراوە.





٨-کۆتری کلاو لەسەر: کۆتری قەپلاغی: کلاوێکی
بەسەرەوەیە بۆیە وای پێ دەڵێن.
٩-کۆتری عنوانلی: ئەم کۆترە کلکی
بلاوەدەکاتەوە و ئەیدا لەسەری.
١٠- کۆتری قەلاج: ئەم جۆرە کۆترە پەسندنییە و
تەقڵەباز نییە و ماڵی نابێ.
١١- کۆتری ماڵی: ئەو کۆترانەی ماڵینە و
لەماڵەوە بەخێو دەکرێت.
١٢-کۆتری گرگن: کۆتری بچووك.
١٣-کۆتری چەترباز: کۆتری چەتردار: کلك باوەشێن.
کۆترێکە کلکەکەی وەکو باوەشێن بلاودەکاتەوە.
١٤-کۆتری دەف: جۆرێکە لەکۆتر.
١٥-کۆتری بەردەلانی: جۆرێکە لە کۆتری کێوی
خۆڵەمێشی هێڵی سپی و سەوز و بنەوشەیی تیایە.
٣- کۆتر لەپەندی کوردی:
کۆتر لە دەماخی ئەفرێ: واتە لووتی ئەوەندە
بەرز، کۆتر هێلانەی تیائەکا. (خاڵ)
٤-دووپارچە دارن لەم سەر و لەو سەری
دەوارەکەوە لەو شوێنەی کەئیتر کۆماج نامێنێ
قەیم ئەکریت.
- کۆتك: ١-بادیە داری گەورەیە بۆ ئاو
خواردنەوە بەکاردێ: ٢-سەپان بەکاریان دەهێنا
بۆ دۆ خواردنەوە لەشار دروستدەکرا کۆتك فرۆش
دەیانفرۆشت هاواریان دەکرد (کۆتکی سەپانان
حەولا لۆك).
- کۆتە: ١-کەوتو: ٢-کۆتەرەدار: ٣-مل بەندە.
٤-بێ پرچك.
- کۆتەل: ١-ئەوەیە کەیەکێ دەمرد خزم و کەسی،
ئەسپێکیان بۆ دەرازاندەوە جل و بەرگی و
کەرستەی جەنگیان پێوە دەکردن و لەسەر
ئەسپەکەیان دادەنا لە حەوشی دیوەخان ئەو
ئەسپەیان رادەگرت یان لەسەر زەوییەك دەیان گێڕا
خزم و کەسی بەدەنگی خۆش دەیانلاواندەوە و
بەکردەوەیان هەڵدەگوت.
٢-پەیکەر:
- کۆتی: ١-ڕووتی: ٢-بێ کەڵك: ٣-مل بەندی:
(کۆتی لەمل بوو): (پیاوێکی سەرکۆتی لێ بوو).
- کۆتە: ١-کۆتەرە: ٢-پارچەی بچووك:
٣-ملبەند
- کۆتەرە: کۆتە: قەدی داری بڕاو.
- کۆتەفر: هەنگوین: هەنگین: هەنگفین.
- کۆتەك: موشکلیە: ئاریش.
- کۆتەکی: هێز: قوەت.
- کۆجیلە: کۆتك.
- کۆچ: رۆیشتن بۆ شوێنێك.
- کۆچبار: کۆچماڵ: کۆچ و بار: کۆچ و ماڵ.
- کۆچخانە: ١-مەنجەڵی بچووك: ٢- قۆناغ.
- کۆچك: ١-کۆچەك: زانای ئایینی یەزیدییان.
٢-ئاگردان.
- کۆچکار: ئەو کەسەی کۆچ دەکات لەشوێنێك بۆ
شوێنێکی تر.
- کۆچك دوان: کوشك و دیوان: کوشك و تەلار:
خانووی پیاوی گەورە.
- کۆچکە: کۆچك.

- کۆچکردن: ١-مردن:

٢-رۆیشتن لە شوێنێك بۆ شوێنێك.

- کۆچمێش: شانەی هەنگوین کلوری دار.

- کۆچەر: کۆچکەر: ٢-ناوی کوڕانە.

بەڵێ ڕاستە ئێمە کۆچەرین.

- کۆچەری تەواو: بەو رەوەندانـە دەگـوترێ کـە زستان و هاوین لە ژێر خێوەتا دەژیـن و کاریـان تـەنیا مـەڕومالات بەخێودەکـەن و دەسـت لـە کشتوکاڵ نادەن.

- کۆچەرات: کۆی کۆچەر.

- کۆچێڵ: هەردوو کونی دەوار بۆ هاتوچۆکردنی با.

- کۆخ: ١-کوخ: ٢-کادین: ٣-تەوێلە.

- کۆخا: ١-کێخوا: کێخا: کوێخا: کەیخا: کـەیخوا: قێخا: کیخا.

کۆخاپێی داگرتبوو دەیگوت. (تەنەکە- ل١١١)

١-سەرکاری خاوەن گوند لەدێدا.

٢-خاوەن گوند کە بەرەگەز ئاغانەبێ.

٣-سەرۆکی عەشیرەتی بچووك:

( بریاریـان دا لەگـەڵ کوێخـا هۆمـەری سوێـسنی وتوێژ بکەن). (گەدا- ل٤٤)

٤-نازناوی ئەو کەسەی کاری کوێخایی دەکا.

کوێخا حەمکو، کوێخا هۆمەر، کوێخا مەمەند.

- کۆخك: کوخی کچکە.

- کۆخە: کۆخین: کۆرك: قڵخە: کۆخك: قۆزە: نەخۆشـییەکە لەسـەرما تووشـی دەبێـت سـنگ هەوەدەکات کۆخەی پێ پەیدادەبێ.

کۆخە شیرزەی کرد. (غەوارە- ل٧٩)

- کۆخەرەشە: قۆزە رەشە: کۆکە رەشە.

- کۆخە کۆخ: زۆر کۆخین لەسەریەك.

- کۆخین: کۆکین.

- کۆد: ١-قفلێ: ٢-بەرمیل:

٣-کێشەکە دەکات ٢٥ کێلو.

- کۆدك: ١-کاسە: قاپ: لەگەن: کاخ:

٢-بۆ پەسندی ئەسپ بەکاردێ لەگەڵ(سم) (سم کۆدك).

- کۆدۆ: ١-ژوژك:

٢-چیای بەرز:

٣-ناوی چیایەکە لەلای حاجی ئۆمەران.

٤-ناوی کوڕانە.

- کۆدە: ١-باجی ئاژەڵ: ٢-قەبالە.

- کـۆر: ١-کـوور: ئێتـون: شفرەشـکی کەسـێ چاوێکی نەبینێ یان هەردوو چاو هیچ نەبینی.

چـبکەم: لـە عەیبـەت میرمـەمێ کـوێر بـوون هەرتك چاو:

(تحفە -١- ل٣٣١)

٢-دەبێتە نازناوی ئەو کەسەی کە کۆرەیە .

(کەمالە کوێر): (ئازادەکۆر).

٣-کۆرە لەپەندی کوردی:

(کۆرە چـتدەوێ دووچـاوی سـاغ: واتـە هەرکـەس ئاواتی خۆی ئەوێ) (کوێر تائەمرێ بەتەمای چـاوە بەیەکێ ئەوتری کەهەمیشە بەتەمای شتێکبێ).

- کـۆرەوەی بـاب: کۆڵـەمار: کۆڵـەوەبیاب جـۆرە مارێکی ژەهراوییە بەرۆژ کەم دەجولێت کلکی لـە جگەرە دەچێت.





کۆرگوان: مەڕ و بزنێکە چیلکەی گوانیـان نارێکـە واتە جوان نییە.

- کۆڕ: ١-چەند سـپیانێك لـەتاو گـەرما بـەخۆی سەردەبەنە ژێر سەری یەکتر، ئەو کاتـە دەگوترێـت مەڕەکان یان بەرخەکان کۆڕییان کردووە.

٢-مەجلیس:

٣-گۆرەپان: ساحە.

- کۆرایی: کوێرایی:

بەکۆرایی چاوی دوژمنان.

- کۆر بان: ١-کوێرەبان:

ئەنگوکۆربان: ئێوە کوێرەبان.

٢-کەنداو.

- کۆرپە: مەلۆتکە: کۆرپەلە.

- کۆرتك: کۆرت: قۆرت: چاڵ.

- کۆردەرە: دۆڵێ ئاوی بەدائیمی پێدانەڕوات.

- کۆردوندان: قوندە: بێ کلك.

- کۆرس: موحکەم.

- کۆرکردنەوە: کوێرکردنەوە:

وەجاخم کوێر مەکەوە. (تەنەکە- ل١٢٥)

- کۆرك: کوورك.

- کۆرگە: شوێنی دانیشتنی کۆڕ.

- کۆرنۆش: کڕنوش: سوجدە.

- کۆرە: کوێرە: نابینا.

- کۆرە ئاو: کۆراو: ئاوێك لەبەهار پەیدادەبێ و لە هاوین وشك دەکات.

- کۆرە ئاوان مەکە باغ، لە دوو چوان مەلێ ئـاخ، ناکەس بەچان مەکە وجاغ. (پەند)

- کۆرە برین: کوێرە برین: برینی کۆن.

- کۆرەخەت: کەسێ نووسین باش نەزانی.

- کۆرەرێ: ١-رێگای ناسەرەکی.

٢-رێی بچووکی تەسك.

- کۆرەکانی: کوێرەکانی.

ئەو کانییەی کـە لەبـەهارا دەتـەقێ و لـە هـاوین وشك دەکات.

- کۆرەگونـد: بـە گونـدێك دەڵـێن لـە دوو سـێ مـاڵ پێکهاتبێ.

کـۆریس: ١- سـپیانی گـوێی کـورت وەك تەبـەش کوریس.

سەررەش کۆڕیس.

- کۆریی: کوێری: نابینایی.

- کۆز: ١-پشکۆ: ٢-کۆتان: ٣-قشلاخ.

- کۆزی ساوایی: واتە منالی وردە.

- کۆزەوشەش: واتە زۆر چاکە، زوربەسوودە.

- کۆزەرە کوتان: کوزرکوتان.

- کۆزەئەسپیندار: چەند ئەسپێندارێك چێنرابێ.

- کۆزپە: کۆسپە.

- کۆزلۆك: تەرزە.

- کۆزەك: شوێنی خۆ پاراستن.

- کۆزەگە: کۆزك.

- کۆژیی: گۆشە: سوچ.

- کۆسار: کۆهسار: کێوان.

وادیارە لەم وڵاتی کۆهسارە عاجزە.

(دیوان ئەحمەد- ل٥٦)

- کۆسپاو: زەوی بەردەلانی ناخۆش.

- كۆسپە: عەتەبە.
- كۆست: كۆس.
- كۆست كەوتن: ١-زاوای كەسێ مردن:
٢-بێ بەختی: ٣-منالێ مردن.
- كۆسە: ١-كۆستە: كوسە:
ئەو كەسەی سمێل و ردێنی نەیەت.
٢-دەبێتە نازناوی ئەو كەسەی كەمووی لێ نایێ:
عەلی كۆسە، ئەحمەد كۆسە.
- كۆستی: گەردەن بەندی پیرۆزی زەردەشتییەكان دەیان كردە گەردەنیان لەو باوەڕەدان ئەم گەردن بەندە پیرۆزە لەماوەی شەودا روح و گیانیان دەپارێزێت بەزێندوویەتی دەیانهێلێتەوە.
- كۆسەوەویی: كۆسەبەبە: كۆسەمەمە: ئەمە كاریك بووە بۆباران بارین بەكارهاتووە، زەلامێك رەش كراوە و جلی سەیری لەبەر دەكرد كوتكی بەدەستەوە دەگرت و لەدەرگای مالانی دەدا و خاوەن مالێش ئاوی پێ دادەكرد و بۆ ئەوەی باران ببارێت.
- كۆسەر: ١-پەرژین: ٢-بنمچ.
- كۆسەوریش: بریتییە لەدوو دژ.
- كۆستە بووكە: كۆسەوەویی:
ئەو تەمسیلانەی بۆ پێكەنین دەیكەن.
- كۆ: ١-چیا: ٢-كۆمەڵ.
- كۆش: ١-بەرد: ٢-عەورەت: (كۆشت داپۆشە).
- كۆشان: خەباتكردن.
- كۆشش كردن: تێكۆشان: هەوڵ و تەقەلا.

- كۆشك: ١-ژوورێك لە قاتی دووەمی خانوو:
٢-قەسر.
- كۆشك و سەرا: دەرباری پاشایان.
- كۆشیار: خەباتكەر: خەباتچی.
- كولكەی شالەباقی: جۆرێكە لەكولكە.
- كۆشین: تێكۆشین: هەوڵدان: تەقەلادان: كۆشەوە تێكۆشان: كۆشش كردن: هەوڵ: خەبات: تەقەلا.
- كوشتی: ١-ئاژەڵی بۆ سەربڕین ئامادەكراوە.
٢-حەیاتی لێ بڕی.
- كۆفرۆش: دەستە فرۆش: رستە فرۆش.
- كۆڤان: ١-برین: ٢-ناوی كوڕانە.
- كۆڤاندار: بریندار: زامدار.
- كۆڤنگ: بۆگەنی.
- كۆڤی: كێویی.
- كۆك: ١-دەوڵەمەند: ٢-قایل: ٣-پڕ: دارماڵ: ٤-عاقل: ٥-چالاك: ٦-راست: ٧-جوان: ٨-یەك گرتوو: تەبا: ٩-ئەسل: ١٠-رەگ: ١١-دوورینی لەسەر خەتی راست.
- كۆك بوون: یەك گرتن.
- كۆكە: كۆخە: نەخۆشییەكە تووشی قورگ دەبێت.
- كۆكی: ١-كۆخی: ٢-یەكگرتوویی.
- كۆكین: كۆخین.
- كۆگا: ١-مەجلیس: ٢-مەخزەن.
- كۆگە: شوێنی دانیشتن و حەسانەوە و نان خواردنی چەند كەسێك و ئەو شوێنەی چەند كەسێك كە گشت كەل و پەلیان لێ دادەنێن.
- كۆگەوان: مەئمورمەخزەن.





- كۆڵ: ١-جل شۆردن.
- كۆڵ: ١-لەدار یا لە گەچ دروستدەكرا بۆئاودانی ئاژەڵ بەكار دەهات:
٢-ئاخوری پەلەوەر.
٣-لەدار دروستدەكرێت بۆ پێوانی دەغل و دان بەكاردێ: ٤-ئامرازێكی جۆلاییە لەدار دروست دەكرێت كری بەشەپكەوە دەخەتەناو: ٥-بار:
٦-پشت: ٧-غەشیم: نەزان:
٨-غولام: ٩-دۆخین.
- كۆلارە: كۆلارەمارە: دالەسوورە: كۆڕكۆڕە:
كۆلارە مار باڵندەیەكی گۆشت خۆری زیان دارە.
- كۆڵان:١-كووچە: كۆ: كیچە: ٢-گوزەر:
لەو كۆڵانەوە ڕۆیشت بۆ كۆڵانێكی دیكە.
(گەدا- ل٢٠)
-كۆلاندن: قوركردن.
- كۆلاو: كارەسات: رووداوی چاوەروان نەكراو.
- كۆڵوانە: ١-لەقوماشی جورجێت دروست دەكرێت شێوە لاكێشەیە (٠,٩٦م*٠,٩٦) دوولای بەرامبەر یەك هەریەكە بەرێز (٢٧) گولنگی پێوەیە بە كۆڵێدا دەدەن. لایە بە گولنگەكانی بەسەر پشتدا شۆڕ دەبنەوە خوارێ.
٢-ئاوازی گۆرانی كوردییە.
كۆڵوانەی سوور تۆبەبێ
فرێ تاولە هۆبەبێ
- كۆڵخۆز: مەزرای بەدەستیاوی: گەلەكێل.
- كو لوچ: كولیچە.
- كۆلوس: كلاو: كۆم.

قیزی كۆمی خوە ژسەری خوە دەرخست.
- كۆڵ و كانی: كول و كانی: شیووكۆل: كۆڵكانی.
- كۆلكەر: ئەو ژنەی كولّی مالان دەكات.
- كورە بژ: ١-جاشە ئێستر چووە سالّی دووەم هەر سالێ بەسەردەسورێتەوە.
٢-جوانەماین سالّی دووەمی هەتا تەواو دەكا.
٣-جاشە ماین كە پێی نایە سالّی دووەمی تەواوكرد.
- كۆل لبەند: مەعەبد.
- كۆل پێ دان: بەزاندن.
- كۆلدان: بەزین.
- كۆلدانان: ئەوبارەی لە پشتی لەعارد دانان.
- كۆڵدران: ١- قۆركراو: ٢-بەزیو.
- كۆلك: ١-كۆلكەدار: ٢-ئامانج: ٣-عەلامەت.
- كۆلكە: فەخر: شانازی.
- كۆلكە خوێندەوار: نیوە خویندەوار.
- كۆلكە مەلا: ئەو مەلایەی تۆزێك خوێندەواریی هەبێ.
- كۆلكەدار: كۆلكە.
- كۆلكە زێرینە: كۆڵەزیرینە: كەسك وسۆر: پرچی عەیش و فاتمان.
- كۆلكێش: حەمبال: كولّهەلگر.
- كۆڵكەر: ئەو ژنەی جلی خەڵك بە پارە دەشوا.
- كۆڵنج: تۆوی پێ نەگەیشتوو.
- كۆلندەر: كۆمەڵەدار.
- كولنكە: شەربە: لەگڵ دروست دەكرێ بۆ ئاو سارد بوون.
- كۆڵووەدەژین: پژمین: پشمین.

- كۆله: ١-بەندە: عەبد: ٢-خزمەتكار: ٣-تەیان.
- كۆڵە: پێنەگەیشتوو: ٢-منداڵ.
- كۆلەر: لێكۆلەرەوە.
- كۆڵەكە: عەمود.
- كۆڵەكەی پشتی: كاریتەی پشتی.
- كۆلەگە: بەو دار و كاریتەیە دەڵێن كە دەدرێتە بەر پردی كاریتەكان وەیا دەدرێتە بەركاریتەیەكی شكاوی خانوو.
- كۆڵەوار: نەزان: فەقیرۆكە: نەخوێندەوار.
- كۆڵەوەس: ١-منداڵی زڕ:
٢-تۆوكردنی پێش باران.
- كۆلێنانی: ساحر: جادووگەر.
- كۆلیت: خانووی مریشكان: كۆلیتە: كولانە.
- كۆڵین: حەفر: قوركردن.
- كۆماج: ئەو رێگا تایبەتییەی كە لە گوندی قەدتەلاندا بۆ بەسەركەوتن و هاتنە خوارەوە دەیبڕن.
- كۆمەڵە: ١-پێشمەرگە: كاتی خۆی لەسالانی (٦٠)بەپێشمەرگەیان دەوت.
٢-یەكگرتنی چەند كەسێك بۆ ڕاپەراندنی كارێكی سەرەكی لەسەرەتای چەرخی نۆزدەوە چەند كەسانێكی رەوشەن بیر لەنێو نەتەوەی كورد بۆ پێش خستنی نەتەوەی كورد ئەو كۆمەڵانە یان دامەزراند.
- كۆن: ١-دەوار: رەشماڵ: ٢-كەون: ٣-لەكوێیە.
- كۆناكۆ: لەڕادە بەدەركۆن.
- كۆندڕ: كەندڕ.
- كۆنە قڕقاڵ: مرۆی پیری وشك رەق هەڵاتوو.
- كۆنەپیاو: پیر: كال: بەساڵاچوو: ئختیار: پیاوی پیر.
- كۆنەژن: ژنی پیر.
- كۆنەساڵ: بەسالاچوو.
- كۆنەكار: شارەزا و لێزان لەكارێك.
- كۆنی: كەونی.
- كۆنینە: كەلەپوور.
- كۆوە: بەران.
- كۆه: چیا.
- كۆهسار: شاخاوی: كۆسار: كێلی.
- كۆیلە: ١-چیایی: كێوی.
٢-عەبد: بەندە.
- كوا: ١-كوانی: كا: كوانێ: ٢-رووبار.
كوالۆ ئەو رۆژە كە ئەو قەرزەم لەسەر نەمێنێ.
(غەوارە ل٦٠)
- كوتاڵ: قوماش:
لە كوردەواریدا قوماشێك ناوێكی تایبەتی خۆی هەیە وەك:
١-قەنەوز: ٢-خامەك: ٣-خاراو: ٤-تافتە
٥-هەریر: ٦-ئاگربارانە: ٧-خانم مەڕۆ:
٨-ئەتلەس: ٩-كیمخا:
١٠-داوماسی:
١١-مەخمەر: ١٢-شێلە: ١٣-هەوری:
١٤-مشكی:١٥-چیت.
١٦-ئەنگۆرە: ١٧-چاپان: ١٨-كودەری.
- كوارك: قارچك: كارگ: ڤێڤاز: خارچك: كڤارك: كوولاڤك: چێلۆوكا: هەڵچ: هەلچی: لەسەر پنجی





گیای كەمایە پەیدا دەبێ دوو جۆری هەیە یەكیان ژەهرە.
- كوت: ١-پارچە: ٢-زبل: ٣-كەم:
٤-كوتان: وردكردن.
- كوبار: زل: گەورە: مەزن.
- كوتان: ١-لێدان: ٢-وركردن.
- كوتران: وردكران.
- كوتراو: كوترای: وردكرای.
- كوتكە: گۆڵێكە لەناو دەغل و دان شین دەبێ.
- كوتك: كوتەك: لەئاسن و دار دروستدەكرێت و جۆری زۆرە.
هەریەكە كوتكێكی دەستی....
(بۆرە- ل١٧)
وەك ئەمانەی خوارەوە:
١- كوتكی بەرد شكاندن: ئەو كوتكەی بەردی پێ دەشكێنین:
٢-كوتكی جل شوشتنێ: ئەو كوتكەی جلی پێ دەكوتن بۆ جل شوشتن:
٣-كوتكی هەلاجی: هەلاجی پێ دەكەن:
٤-كوتكی دار: لەدار دروستدەكرا بۆ ساوار كوتان بەكار دەهات:
- كوتە مێگەل: مەڕ و ماڵاتێك ژمارەیان لە چل (٤٠)سەر كەمتربێت.
- كوتكوت: ١-پارچە پارچە: ٢-كوچ كوچ.
- كوتەك شكاندن: كردنەوەی رێگا لەكاتی بەفر بارین و كوتانەوەی بەفربەپێ و رێگە كردنەوە بە تایبەتی رێگای نێوان گوندەكان.
كوتكێش: كەناس: زبل كێش.
- كوتلك: كوبەی ساواری.
- كوتن: گۆتن: وتن.
- كوتی: گۆتی: گوتی: وتی.
كوتی كوڕە. حوكمی خاتون پەریخانێیە.
(تحفە-٢-ل١٦١)
كوتی( تێكرا بەچوار ریاڵان). (تحفە-٢-ل١٦٣)
- كوتەبڕ: كورت و كرمانجی.
- كوتووپڕ: لەناكاو: لەنكاو.
- كوتومت: عەینەن.
- كوتیار: گۆتیار: قسەكەر.
- كوچاگر: بەردی دەوری ئاگر.
- كوچك: ١-بەرد: ٢-ئاگردان: ٣-سەگ.
- كوچكتاش: بەردتاش.
- كوچ كوچ: وشەی بانگكردنی سەگ.
- كوچكانی: ١-بەردەقانی: ٢-ئاگردان.
- كوچكاور: ئاگردان.
- كوچكەبەرد: بەردی ئامال: خڕ.
- كوخ: لیر: كۆختە: كۆخ: كەوێل: زنج: كووخ
- كودۆ: ژووژك.
- كودوو: كودی.
- كودادچی: كێوە دەچی: بۆ كوێی دەچی.
- كوڕ: كوڕك: لاو: قلووس: پز: پسر: وەچە: بەچە: وەند: رۆلە.
١-نێرینەی ئادەمیزاد.
- كوڕ ئاپ: كوڕەمام.
- كوڕانی: كچێ هەڵس و كەوتی كوڕانەبێ.

کوڕان: کوڕگەل: کوڕ گەلی دێ بەپیریەوە چوون.

(تحفە- ل١٣٦)

- کوراڤ: سێل:

ئەو شوێنەی لەقەد تەلان خۆشی دەکەن و شتی وای لێ دەچێنن.

- کورت: قوت: قول: دژی درێژ.

- کورت بوون: قوت بوون: دژی درێژبوون.

- کورتان: کۆپان: سەرکار:شبری: پالاَن:

لە پەڕۆ و قەسەل دروستدەکرێ دەخرێتە سەر پشتی کەر و بارگین.

- کورتان دور: ١-ئەو کەسەی کورتان دروست دەکات و دەدورێت: ٢-دەبێتە نازناوی ئەو کەسەی کاری کورتان دورینە:

٣-ناوی گوندێکە لە کەندیناوە

- کورتان کردن: کورتان خستنە سەرپشتی ولاَغ توندکردنی و بەستانەوەی کورتانەکە بە تەنگەو پالوو.

- کورەتیمە حەیران: دلَداری کچەتیمە حەیرانی.

- کورترژن: ١-دلَە کوتە: لێدانی دلّ. ٢-وەحی.

- کورتی: قوتی: ژی: درێژی.

- کوڕتی: کوڕێتی: کوڕیتی.

- کورتە: قوتە.

- کورتە بالاَ: بەژن کورت: کولَە: کۆلَەبنە.

نەختێ کورتە بالاَیە

ئەویش نەخشی خودایە

- کورتانی قەجەری: نەکورتانە و نەزینە زین نەبوو، چونکە تەختە و قەلَپووس و خانەی نەبوو کورتانیش نەبوو، چونکە پێش و پاش و پووشی نەبوو، بەدرێژی ولاغەکەیە لەسەر ملەوە تا کەفەلی لبادێکی چاك و دوای ئەوە بەڕەی کلکە بەسەر ئەوەوە پارچە قالییەکی جوان بەسەر هەموویان بەیەکەوە دروان.

- کورتیلە: کورتەلە: کورتی بچووك.

- کورتەك: ١-سەلتەی ژنان.

٢-بەشێکە لەجلی پیاوان لەگەلّ شەروال پیاو لەبەری دەکەن.

- کورتەك و شەروال: کۆنترین مۆدەی جلی پیاوانی کوردییە: کورتەك لای چەپی دەخرایە سەرلایی راستی هیچ قۆپچەی پێوە نەبووە. ناو بەلۆکە و کەمێك کورتەکەکە ئەستوور و قەبە دروستدەکرا.

- کورد: ١-نەتەوەیەکی ئارییە و کۆنە لەکوردستان دەژی: (مەزنێکی کورد کە کەوتۆتە بەشی عوسمانی).

(تحفە-١- ل١٤٣)

٢-ئازا: ٣-سەخی: چاوتێر.

- کوردایەتی: خەبات کردن بۆ کورد.

- کوردپەروەر: کوردپەرست: کوردێك نەتەوەی خۆی خۆش بوێت.

- کوردەواریی: ١-نیشتمانی کوردان:

٢-زمانی کوردی.

٣-کۆمەلّگەی کوردی.

- کوردستان: ١-ولاَتی کوردان:

٢-بۆ یەکەم جار وشەی کوردستان لە سەدەی چاردە لە رۆژگاری فەرمانڕەوای سەلجووقییەکاندا بەکارهێنراوە:

(کوردستان و کورد- ل١١)





٣-ناوی یەکەم رۆژنامەی کوردییە کە لەقاهیرە سالّی (١٣١٥)ە لەلایەن مدحت بگی نەوەی بەدرخان بەگەوە دەرچوو.

٤-ناوی کچانی کوردییە.

- کورد مانج: کرمانج: کورد: کورمانج.

- کوردۆ: ناوی کوڕانە.

- کوردە: ناوی کچانە.

- کوردی: زمانی کوردی.

- کورژە هەلاَتن: گرژبوونەوە و خۆ وێك هێنانەوە لە سەرمان.

- کورسەی: سابت.

- کورسی: ١- ئامرازی دانیشتنە: ٢- پلەو پایە:

٣-لە کوردستانی ئێران لەناو هەندێ هۆز سالّی پێ دەپێورێ (چەند کورسیە لێرەن).

- کورسی زستانی: بۆ خۆ گەرم کردنەوەی زستان بەکاردێت تەختەکە دەیخەنە سەر ئاگردان و بەڕەیەکی بەسەردا هەلّدەکێشین و هەموو کەسانی خێزانەکە پێی خۆیان لەژێر کورسی درێژ دەکەن.

- کوڕش: کووڕش: کڕش: وشەی بانگکردنی کەر.

- کورشە: بەفری کەلەکەبووی بەسترای.

- کورك: ١-مریشکی سەرهێلکە بۆ هەلّهێنانی:

٢-نەخۆشییەکە تووشی گەنم و جۆ دەبێت دنکەکانی نیوەی رەش هەلّدەگەرێت.

- کوڕك: کوڕ.

- کوڕکوڕ: وشەی بانگکردنی کەر: کوڕش.

- کوڕگەل: کوڕەل: کوڕان: کۆی کوڕ.

- کوروور: میلون: کولووڕ.

- کوڕووزانەوە: پاڕانەوە: لالانەوە.

- کوڕك: رەگی رووەك.

- کوڕووکالّ: کوڕ+ (کال: پیر).

- کوڕۆ: کورە: وشەی بانگ کردنی کور.

- کوڕە: وشەی بانگ کردنی کوڕ.

- کوڕە باڤ: ئازا: عەگید: رەشید.

- کوڕە بەشە: کوڕیی: بەچك: کوڕیی بەشك.

- کوڕەك: ١-کوڕێك:

کوڕەکم دیت: کوڕێکم دیت:

٢- چەق: ناوەڕاست:

٣-ناوی چیایەکە لە دۆلّی ئالاَنە.

- کوڕەلاو: کوڕە جاحێل.

- کووڕە: وشەی بانگکردنی ئەسپ و ماین.

- کوری: دیلك: کللك.

سێبەرا کوریا خۆدیتی

(کانی- ل٧٣)

- کوڕیژگە: ١- کوری کچکە لە کاتی بانگ کردن بەکاردێ.

کەس باوەر ناکا ئەم کوریژگەیە مەزلوومە.

(حەمەدۆك- ل٣٤)

- کوڕیی: کووڕیی: کووڕە.

- کوڕین: کەر.

- کوریناس: وردبین: زیرەك.

- کوڕیهێ: وشەی لێخورینی ئەسپ.

- کوزر: کوێزر: ئەو نیوە: گولّە یان چاریەکە گۆلاَنەی دەغل کەورد نەکراون.

(قوونم دەوێ کوزری بکوتێ واتە کاری زۆرگران ئەنجام دان). (پەند)

- کوزیرە: تەمام: تەواو.
- کوژانەوە: دامرکان: خەفەبوون: دامرانەوە: خامۆش بوون: ڤەمرێن : کوژیانەوە.
- کوژ: قاتیل: کوژیار: کوژندە.
- کوژاندنەوە: داکوژان: دامرکان: دامرگیان: وەمراندن.
- کوژتار: کوشتار.
- کوژتارگە: کوشتارگە.
- کوژتکار: قەساب: ئەو کەسەی مەڕوبزن و مانگا سەردەبڕێ.
- کوژتن: کوشتن.
- کوژراو: کوژرای: کوژیاگ: کوژیان.
- کوژکە: لەپکە: هاژیلە: کووژەکە: بەردێکی شینە لەگەڵ مازی بۆ چاو زار بەکاردێ.

قایمقام چاوی وەك کووژەکەی شین کرایەوە.

(تەنەکە- ل٦٥)

- کوژیانەوە: کوژانەوە.
- کوسکێش: ماستاوچی: لەگام.

کوسکێشی کردن: ماستاو سارکردنەوە: مەدەلایی کردن.

... مەدەلایی "کوسکێش" زۆر لەبەربکەین...

(بۆرە- ل٣٥)

- کوسی: کیسەل.
- کوشەنگە: شەڕ: جەنگ.
- کوشت: کوشتی: ئەو ئاژەڵەی بۆ سەربڕین رادەگیرێ.
- کوشتتان: لەناوتان برد.
- کوشتمتان: منتان کوشت.
- کوشتی: ١-کوژراو: ٢-حەیاتی لێ بڕی.
- کوشتیە: کوشتوویە.

دەڵێن بابیشی هەربە خۆی کوشتووە.

(حەمەدۆك- ل٣١١)

- کوشتیار: قەساب.
- کوشتت: تۆ کوشتوتە.
- کوشتیتان: ئێوە کوشتوتانە.
- کوشتیتی: کوشتوویەتی.

ژەهری بۆ سولەیمان بەگ لەقاوە کردووە و کوشتوویەتی.

(تحفە -١-ل١٤١)

- کوشین: گوشین.
- کول:١-بریندار: ٢-بەئازار: چاوکول.

٣-کۆل: جل شوشتن: ٤-قوژبن: ٥-کۆڕ: تیژ نەبێ چەقوەکە دەمی کولە: ٦-خەم: ٧-کاریگەر: بەسۆز: بەکۆل: بەکۆل دەگریا: بە سۆز دەگریا.

- کولافە: بەئێش: بەئازار.

کوڕمردن زۆر بە کولافەیە.

- کولاڤ: کلاوقۆڕی: کڵاوبۆرگە: کولاو: کلاو.
- کولاك: رەشەبا.
- کولالەمار: هەڵۆ.
- کولام: ١-کول: دەرد:

٢-کولاّم.

- کولان: هاتنە کول: بەکوڵ هاتن: کوڵێن: پژان: کوڵیان.





- کولانە: کولانکە: رۆچنە: کولاوکە.
- کولانەوە: هێشتانەوە وەئازار کەوتن.
- کولاندنەوە: برین هێشاندن.
- کولانگ: کولینگ.
- کولبال: کولەبال: کەبەن: لەبەرگن دروستدەکرێت لەبابەتی فەرەنجیە تا پشتێنەدێت و زیاتر لەبەردا چەسپ دەبێ قۆڵی نییە.

لەسەر هەردوو شانییەوە دوو گوێچکەی قوتی بۆ دەکەن.

- کولبە: ژووری بچووك.
- کولخان: کولخانە: ئاتوون: توونی : کولخەنە: شوێنی ئاو گەرم کردنی گەرماوان.

(توونجی: براله توونی حەمام پاڕانەوەی بۆ چییە).

(گەدا- ل٢١)

براکەم ئەمەتوونی حەمامەکاری من ئەوەیە ئەم توونە تاودەم.

(گەدا- ل٢٠)

- کولخانچی: توونچی: توونەوان.

ئەو کەسەی تونەکە خۆش دەکات و ئاوەکە گەرم دەکات.

(لە حەمامچیاتی بوویمە کولخانچی واتە زۆر شارەزا لە کارێك).

- کولك: قونێر: کوان: دۆمەل: کولکەبا.
- کولکە پیرۆزە: جۆرێکە لە قونێری پیس.
- کۆلکەران: موولێکردنەوە.
- کولکن: بە موو: تووکن: تووك ئاو: موینە: بە تووك.
- کولگیر: مقەس: ئامرازی برینی پێ دەکرێ.
- کوللە: کلۆ.
- کوللەی رەش: بەبزن: دەڵێن چونکە زیان بەرەز و باغ دەگەیێنی.
- کولم: ١-مست: مشت: گوێل:

٢-سەرروومەت: ٣-نەزان: لەم کارانە کولم.

- کولم نەخشاندن: واتە کولم جوان کردن.

بسکان دابێلم، چاوان برێژم، کولمان بنەخشێنم.

- کولمن: کەسێك کولمی پربێ.
- کولنگ: کولینگ: قازمە: پاچ.
- کۆلۆ: کلۆ: پارچەشەکری بچووك.
- کولۆش: کلۆش.
- کولەجە: کولێجە: (هێندێکیان کولێجەی بۆ کردن).

(تحفە- ل٨٨)

- کۆلینك: کولانکە: دەلاقە.
- کۆلۆل: کلۆل: دەست و پێ سپی.
- کولوو: پارچەی بەفرکە دێتە خوار: کولوە بەفری گێژ و خۆل دەدا و دەیکرد بەکونی توونەکەدا.

(گەدا- ل٢١)

- کەلزوچمار:گوڵی بچووك.
- کلووفچار: جۆرێکە لەمار.
- کۆڵەفتنە: سیخور: شۆفار: خەفیە.
- کولۆڤان: خەم بار.
- کولەگرووی: گریان لەقورگ مان.
- کۆلۆم: ١-کولم: ١-داخراو: ٢-قفل.
- کولۆمدان: کلیل دان.
- کولە چوارشەمە: چوارشەکە کولە:

ئاخیر چوارشەکەی مانگی سەفەر، لەناو کورددا مانگی سەفەر مانگی شومە کاروانی تیاناکەن سەفەری تیا ناکەن و جا ڕۆژی چوارشەمە زۆر بە پارێز دەبن.

- کولی: ١-ئازاری: ٢-برینداری.

(چاوکولی).

٣-کلۆ: کوللە.

- کولێن: حەشارگە.

- کولێرە: ئەستورك: ئەستورك: سەوك:

لەکولێرەیەکی گەنمە شامی داخ بەولاوە هیچی تری بە خەیاڵدا نەهاتایە. (گەدا- ل١٦)

- کولیك: کولیلك: کوریك: گوڵوك: بەو گوڵانە دەوتری کەلە وەرزی بەهار شین دەبێ و لەکۆتایی بەهار وشك دەبێ و نامێنی و زۆر چەشنی هەیە و هەریەکەیان ڕەنگێکی هەیە و هەریەکەیان ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە وەك:

١- کوریکە نیسان: گوڵە مێلاقە: گوڵێکە لە بەهارا دەڕوێ ڕەنگی سوورە ناوی گوڵەکە ڕەش و پرتەقاڵییە

٢-کوریکە غەزیمە: گوڵێکە ڕەنگی زەردە لەبەهارا دەڕوێ لەشێوەی خەزیمە.

٣-کوریکە حاجیلە: لە بەهاردەڕوێ ناوی گوڵەکە زەرد و پەڕی سپییە، کوریکە زەردە: گوڵێکە لە بەهاران دەڕوێ.

٤-گوڵەباغ: گوڵێکە لە بەهارا دەڕوێ.

٥-کوریکە هێرۆ: لەبەهارا لەدەشت و دەر شین دەبێ ڕەنگی گوڵەکەی پەمەیی و سپییە.

٦-دۆبەسەرە: گوڵێکە لەبەهارا شین دەبێ گوڵەکەی ڕەنگی سپییە.

٧-گاگرۆ: گوڵێکی بەهارییە ڕەنگی گولەکەی ئامال پەمبیە و لەسەرەتای بەهار دەڕوێ.

٨-جۆتیارە: ڕەنگی پەمبەیە و لە پاییز دەڕوێ.

٩-شمری شاق: گوڵێکە لەبەهارا دەڕوێ.

١٠-قیزبەلە: قیزبەلۆك: لە بەهارا دەڕوێ گوڵێکی پەمبە دەردەکات بەرێکی شێوە بامیەی هەیە پێ دەگوترێت بەرە قیز بەلۆك.

١١-سووسن: لە بەهاردا پەیدا دەبێ.

١٢-شلێر: لەبەهاردا دەروێ.

١٣-هێرۆ: لەبەهاردا پەیدا دەبێ.

١٤-نێرگز: گوڵەکەی پەڕی سپییە و ناوی زەردە.

- کولینگ: کولێك: قازمە: کورینگ: دوودەو: پاچ دەستیان دەدا خاکەناز و پێمەرە و کولینك و بێڵ و دەچوونە گژکاری خۆیان.

(غەوارە- ل٧)

- کولینك: کولانکە: ڕۆچنە: کونەباجە.

- کولێو: کولای.

- کولێن: گۆشەیەکی ناو دەوارە چیغ ئەگێڕن ناوەکەی هۆڕی زەخیرەی لێ دائەنێن.

- کونا: کونە.

- کوناودەر: تونێل.

- کوندە: لەپێستەی سپیان دروستدەکرێت بەخڕی دەیگروون و دەری دێنن بۆ ئاو تێکردن بەکاردێ.

خاتوون ئەستی چۆکوندەی پڕکرد هاتەوە.

(تحفە- ل٨٠)





- کوندە بۆ: ١-کوندە بەبۆ: کوندبوو: بایە قوش: بوو: کونە بۆ: باوەقۆش: بوو: شابوو: کونە بۆ: باوەقوش" کوکوکنەك: کوند.

ئەحمەد شاهبازی دیوە تا ئەمرۆ بەچنگی بوومەوە (کوندی لەسەرسوندی، لە شرعان ناپرسی).

٢-بریتییە لە مرۆڤی دمۆر و نیگبەت.

پێش چاومان چۆل کە قەڵپە دمۆر بەدیۆم: گای قەش: سێزدە: کوندەبوو.

- کوندەڵان: کونەلان: کوندەران.

لەماڵەوەیە دوو دیواری بەقەدبەژنێك دروستدەکرێت دەبێتە دوو نهۆم و سەری دەگرن لەناو کوندەی لەناو دادەنێن بۆ ساردبوون دیوار پوش و پەلاش رایەل دەکەن.

- کوندەلانی پەرێزی: کوندەرانی پەرێزی: لەچەند باوەش قرشە پێکدێت و بۆ لەناونانی کوندەی ئاو و دۆدانەی دۆ بۆ سارد و فێنکی بەکاردێت.

- کوندەکێش: ئەگەر یەکێ لەسەپانەکان نەخۆش و لەڕ و بێهێز بوایە ئەوا ئەویان دەکردە کوندەکێش لەدوای سەپانەکان چەند کوندە ئاوی لەبیر یا رووبار دەهێنا و دۆدانە دۆیەکی لە ماڵی ئاغا دەهێنا و بۆ سەر پەرێزی دەبرد.

- کون: ١- لانەی هەندێ ئاژەڵ و زیندەوەر و پەلەوەر.

٢- لانەی ئاژەڵ وەك:

کونە گورگ: کونە ڕێوی: کونە کێروشك.

٣- لانەی زیندەوەر وەك:

کونە زەنگە سۆرە: کونە مێروو: کونەمار: کونە مشك: کونەسە.

٤- لانەی پەلەوەر: کونە کۆتر.

٥-قون: ٦-کون

- کۆیەك: کۆمەڵەك.

- کوندڕ: ١-کۆنڕ: ٢-کودی.

- کوندینی: بەخیل: حەسوود:

- کونەمشك: ١-هێلانە مشك:

٢-ناوی گوندێکە.

- کونگەه: ١-کۆگا: ژووری ئازووقە.

- کونە ڕەش: سیاچاڵ: ژووری تاریك و نوتەکی بەندیخانە.

- کونە دەرزی: گولەزێو: سەبەتەزیو: گیایەکی دەشتەکییە گوڵەکەی خۆلەمێشییە.

- کونوو کاژێر: کونووکەلێن.

- کونووکۆ: کۆشش.

- کوێخا: کۆخا.

- کوێخادەرك: کوێخادەرگا: دەرگاوان: دەروازەوان: قەرەوڵ: قاپچی.

دەرکەوان کوێخا دەرکێکی ریش سپدی بوئی پیرۆزخانە.

- کوو: چۆن: چلون.

- کووا: کا: کانێ.

کووا لۆئەو ڕۆژە کە ئەو قەرزەم لەسەر نەبێت.

(غەوارە- ل٦٠)

- کووارگ: قارچك: رووەکێکە سەرکی هەیە دەخورێ.

- کووبین: چۆنبین.

- کوونە: چۆنن: چلۆنن.

- کووی: چۆنی: ١-وشەی چاك وچۆنی.
٢-وشەی راستی گوتن.
پێم بڕوابکە کووی گوتم وایە.
(غەوارە- ل٦٢)
- کووان: ١-قونێر: دۆمەل.
٢-لەکێن: لەکوێن.
- کوانگ: کووانی: ئاگردان.
- کوانیٚ: ١-کانی: لەکوێیە: ٢-ئاگردان.
- کووپان: رمان: رووخان.
- کووپە: کووپەی ئاو خواردنەوە.
- کووپەڵە: کووپی بچووك.
- کووپك: گرد:
کووپەی گاسن: لای پشتەوەی گاسنەکە لەشێوە نیوە زمانەی هەو جاری بازنەیە تێداگیر دەکریٚ.
- کوتاڵ: قوماش.
- کوتاڵ فرۆش: بازرگان.
- کووت کووت: کوچ کوچ.
- کووچە: کۆڵان: کۆ.
- کووەك: چونێك: کووێك.
هەرکووێك بێت پێویست ناکات تفەنگ بە تاریکییەوە بنێن. (غەوارە- ل٦٧)
- کوور: قووڵ: قۆر.
- کووز: ١-جووت جۆگەی: بچووکی لەم سەروئەوسەری زەوی تووتن: ٢-لەت: قاش.
- کووڤی: کێوی: کیوی.
- کووکە: ١-نەخۆشییەکە تووشی مریشك دەبیٚ.
٢-کۆخە.
٣-تێکدەر.
- کووکوو: ١-دەنگی قومری. ٢-چۆن چۆن.
- کووکووکەڵەك: پیلان: موئامەرە.
- کوولە: ١-خوری شوراو بۆ رستن.
- کوولەك: پارە: پول: دراو.
- کوولەبا: قونیر: کوونێر.
- کوڵووکۆ: ئازار: ئێشی مەعنەوك.
- کوویٚ: کێندەر: کامەشوێن.
- کووی: چۆنی: چلۆنی.
- کووێرا: کێرا: چ زوو: کوێرا.
- کووێرە وەریی: ئازار و ناخۆشی.
- کوێستان: ئێلاخ: ئیلاخ: زۆزان: زوزان: سەردەسیر: سەرسیر: هاوینەهەوار: هاوینەگەهـ: کیستان: کووستان: کێوسان: کیفسان:
ناوچەی شاخاوی کە بەبەفر و بارانە هەوارگەی مەڕ دارانە و هەر کوێستانێك ناوی تایبەتی خۆی هەیە وهی عەشیرەتێکە وەك:
ناوی کوێستانەکان: هەر هەوارێك ناوێکی هەیە
١-چارچەڵیٚ هەرکییان: کوێستانی خێلی هەرکییان دەکەوێتە سەرسنووری عیراق و تورکیا.
٢-شیشان: کوێستانێکە بەرامبەر خواکورك.
٣-کانی خاسکیٚ: دەکەوێتە ناوچەی برادۆست.
٤-کاتوناژێری.
٥-مێرگەزەر: کوێستانی خێلی هەرکییە لە کوردستانی ئێران.
٦-هەوارمامز: کوێستانی خێلی هەرکییە لە کوردستانی ئێران.





٧-هەوار خاتون: کوێستانی خێلی هەرکییە.
٨-سپی ریٚزی خەیلانییان.
٩- سامرەند: کوێستانی مەنگورانە.
١٠-بس لەگە (مەولا ناوا) لەبانە هەواری عەشیرەتی جافە.
١١-گاگەش باوۆمەر.
١٢-دۆرە تەنگ: کوێستانی باڵەکایەتییە سەر بە چۆمانە.
١٣-مێرەکین.
١٤-کیفاراوی.
١٥-هەوشین.
١٦-لەند.
١٧-کرند.
١٨-هۆرنا.
١٩-رشکین.
٢٠-دۆلەمەیدان.
٢١-بەربەزین.
٢٢-مێرگەمیر.
٢٣-کێلەشین.
٢٤-سەری ئاوی.
٢٥-قەجە.
٢٦-کونە قاژ.
٢٧-مێڕەش.
٢٨-باشۆرتی: کوێستانی هۆریی باڵەکیان.
٢٩-گۆڕەپانی خانزادی سۆران لەچیای سەفین.
٣٠-قەندیلی مەنگور و مامەشان.
٣١-کێلەشینی برادۆستان.
٣٢-کانی شمش الدین.
٣٣-وارگرگۆ.
٣٤-بنلیس.
٣٥-بەردەقەل.
٣٦- گەد.
- کووێن: ١-تەختەی رەشماڵی: لەمووی رەش دروستدەکرێت: ٢-پیستە: ٣- جلی رەش کە بۆ تازیە لەبەر دەکریٚ.
کووێندەریٚ: کێندەریٚ.
- کووخ: کەوێل.
- کووخك: کۆخە.
- کووداندن: لێخورین.
- کوودە: کەوچکی گەورەی لەدار دروستکراو.
- کوودەلە بەراز: گوجیلە بەراز: بێچوە بەراز.
- کوور: قور: قوول: کووڕ.
گیسکی نێری تەمەن دووساڵ و نیو.
- کوزبوونە: کەوتە خوارەوە.
- کوورە: ١- شوێنێکی تایبەتییە بۆ سوورکردنەوەی ئاسن و گەچ و کەرپوچ بەکاردیٚ: ٢-لەکۆیە: لەکێیە.
- کووز: ١-لەت: قاش:
(کووزە شفتی: قاشەشووتی).
- کووزك: گۆزە: لە قور دروست دەکرا بۆ ئاو هێنان بەکار دەهات (گۆزەی سوورو ئاوی شەویٚ).
- کووس: تەپل.
کوانیٚ ناڵەی جەنگ کوانیٚ دەنگی کووس.
- کووشی: وشی: هووشی.
- کووف: چەماوە.

- کووفتە: کوبە.
- کووڤان: غەزەب: بوغز: خەم.
- کووڤاندار: خەمبار.
- کـــە: ئامرازێکـــە لـــەم شـــێوانەی خـــوارەوە بەرچاو دەکەوێت:

١-بۆ پەیوەنـدی (عطـف)ی سـادە لـەم حاڵەتـەدا دووڕیستە بەیەکەوە دەبەستێ وەك:

من نەم بیستووە، کە تۆ شاعیر بیت.

٢- بۆ پەیوەندی (عطـف) لە شـێوەی ئاوەڵکـاری کاتـــدا: (ظـرف زمـــان) کەلەوێـــشدا دوو رســـتە بەیەکەوە دەبەستێتەوە:

کەمن گەیشتمە جێ، ئەو ڕۆیشتبوو.

٣-بـــۆ پەیوەنـــدی (عطـــف) لەشـــێوەی ئـــامرازی مەرجدا وەك:

کلکی شێرمەگرە، کەگرتت بەری مەدە.

٤-وەك راناوی لێکـدەریش بـەکاردێت کـە دەوری پەیوەندی نێوان دوورستە دەبینێت وەك:

ئەو کەسە کەسە، کەئەلفێکی بەسە.

ئەو قەسپەی کـە تـۆ خواردووتـە دەنکەکـەی لای منە.

٥-ئامرازی بەرناس کردنە دوای ناوی گشتی و تاك دەکەوێ ناسراوی دەکا.

ڕێگاکە، گوارەکە، درەختەکە.

کـــەباب: کـــەواو: گۆشـــتی قیمـــەکراوی لەشـــیش دراوی برژاو.

کەبابچی: ١-ئەو کەسەی کەباب دروستدەکات.

٢-دەبێتە نازناوی ئـەو کەسـەی کـەبابی دروسـت دەکات (شێرەی کەبابچی).

- کەبابکردن: کەباب لێدان.
- کەبابی: عەشیرەتێکی کوردە.
- کەبات: لەتیرەی پرتەقاڵە تامی ترشە.
- کەبانی: خۆشەویست.
- کەبەر: رووەکێکە لەبەهاران شـین دەبـێ گـەورە دەبێ بەری دەگرێ بەرەکەی پێی دەڵێن (شـەفەلە) بەتینی گەرما دەگەیی ناوی وەك شووتی سۆرە.
- کەپچاندن: کەپچین: موناقەشە: گفتۆگۆ.
- کەپر: سابات.

لەدار و چرو دروستدەکرێ

مـــاڵی وەرزی هاوینـــە و لـــە ناوچـــیا لەشـــوێنی هەرکەس ئیش و کاری دەکرێـت وەیـان هەرکـەس ئیش و کاری لە کوێی بێت لەوێ دروستیدەکات.

ئۆقچی ئۆغلی لەچاخانە کەپرە

سەر بەدرکە کونار گیراوەکە بوو

(تەنەکە- ل٤٤)

- کەپرە شینە: جەژنێکی جوولەکانە.
- کەپك: ١-کەپوو: ٢-لووتکەی چیا

هەرکەپکێك ناوێکی جوگرافی خۆی هەیە وەك:

١-کەپکی حەمەداغە لەچیای هەریر.

٢-کەپکی خانزاد، کەپکی شیلانە لەچیای سەفین.

- کەپلە: ئەسپێی مریشك.
- کەپوو: ١-لووت: کەپۆ: دفـن: دم: پـووز: پـۆز: کەپك: پت: لیـت: کـەپ: کـەپی: لوویـت: دەڤـن: کەپی: بهڤل: فرنك: تفنك: دڤن: کەپووی.





ئەو کەپۆیەم بۆ پەروەردەکر مەگەر هـەر هەیاسـی دانا مەعنای بزانی. (تحفه-١- ل٣٤٠)

ئەنـدامێکی هەناسـەدان و هەناسـە وەرگرتنـە و بۆنکردنە.

- کەپووبڕای: ١-کەسێ کەپوی برابێ.

٢-دەبێتە نازناوی ئەو کەسە.

- کەپو بـڕین: بڕینـی کـەپووی کەسـێ بـۆ ئـەتك کردن.
- کەپوو درێژ: دژی کەپووی کورت.
- کەپوو بڵند: لووت بـەرز: بریتییـە لـەمرۆی روح گەورە و بەفیز.
- کەپوو شکاو: ١-کەسێ کەپووی شکابێ.

٢-بریتییە لە ترساو.

- کەپوو شکاندن: ١-کەپووی کەسێ بشکێنی.

٢-ترساندن و تەمبێ کردن.

- کەپووفش: کەسێ ناوکەپووی گەورەبێ.
- کەپوو گەورە: دژی کەپوو کچکە.
- کەپووڵە: کەپیلە: ئامرازێکە ئاشەوان ئاردی پـێ وەردەگرێ لەجیاتی مزی ئاش.
- کەپەر: ١-لەکار کەوتوو:

٢-زەین کۆر لەخوێندن.

- کەپەك: کەپەك: پاشماوەی ئاردی بێژراو.
- کەپەنەك: کەپەنە.
- کەت: ١-کەوت: ٢-قەتێ: ٣-چارپایە: تـەختی نوستن هی هاوین بەدەوریا بلوری دەگێڕن.
- کەتان: ١-جۆرە رووەکێکە:

٢-جۆرە قوماشێکە: ٣-ناوی کچانە:

٤-ئاوازی گۆرانی فۆلکلۆری کوردییە وەك:

١-کەتانەوکەتانە:

کەتانەو کەتانە عومرم کەتانە

کلی لەچاوانە عومرم کەتانە

٢-کەتان کەتانە:

کەتان کەتانە ئەی هاوار

عومرم خاڵ دانەدانە

- کەترە: ١-ئاژەڵی زۆر لاوازو بێ هێز:

٢-مرۆڤی لاوازو بێهێز.

- کەتری: کتلی: تلکی: تکری.
- کەتکەتە: تاك و لۆك: تاك تاك.
- کەتن: ١-کەوتن: کەفتن: کەڤتن.

٢-تاوان: پۆت: ٣-روودان: ٤-خەسارەت: ٥-پیلان ٦-خیانەت: ٧-دەسەڵات.

- کەتنکردن: پۆتشکاندن.
- کەتە: ١-مـرۆی درێـژی چوارشـانە: ٢-شـینە: نەڕە: زەبەلاح: کۆن:
- کەتنە: کەوتۆتە
- کەتی: ١-کەوتی: ٢-کلۆل.
- کەتەدووی: کەوتەدوای.
- کەتیرە: بەری داری گۆینە دەکرێتە سمغ.
- کەچ: ١-لار: ٢-کیژ.
- کەچباز: ئەوەی کردەوەی خراپ بێ.
- کەچبانو: خاتوون: دتمە: کناچە.
- کەچـــە: ١-کـــەون: کـــۆن: لەکارکـــەوتوو: زۆربەکارهاتوو.

(کەچە تەنەکەت بەکلکیەوە کرد) (غەوارە- ل٥٣)

٢-لباد.
- کەچەڵ: ١-کەچەر: سەرداقناو: سەرقۆق: یاڵگەنیك.
نەخۆشییەکە تووشی سەری مرۆڤ دەبێت مووی سەری دەوەرێ .
جۆرەکانی کەچەلی: ١-سمیرسە: ٢-نوینەدنگ.
٣-پشتیی گەیلانی: ٤-شوکرئەللاهی.
٢-دەبێتە نازناوی ئەو کەسەی سەری کەچەلە.
هەیدەرە کەچەل: گۆرانیبێژێکی کورد.
- شەریفە کەچەل (کەچەل حەکیم با چارەی سەری خۆی دەکرد).
٣-کەچەڵ کەچەڵ قاقا سەری بەسماقا (یاری منالآنە).
- کەچەڵ بوون: رووتانەوەی مووی سەری مرۆڤ.
- کەچەڵ کردن: وەراندنی مووی سەری مرۆڤ.
٢-بریتییە لەهەراسان کردن.
- کەچك: ١-کەوچك: ملاك: ٢-کیژ: کچ.
- کەچکاچاڤ: بیلبلەی چاو.
- کەچگەرد: ئەو خراپ هەڵئەسوورێ.
- کەچی: لاری.
- کەچین: لارین: خوارین.
مل کەچین: مل خوارین.
- کەخسە: خیسکە.
- کەد: ١-ئیش: رەنج: ٢-ئەمر.
- کەدکەر: کرێکار: عەمەلە.
- کەدخودایی: کۆتخایی.
- کەدوو: کودی.

- کەدینە: مەرکان.
- کەر: ١-رەوە: ٢-ئامرازی کارایە، بەلآم بەتەنیابەکار ناهێنرێ: کارەکەر، نانکەر، کۆلکەر.
٣-بکە: ٤-گوێ دریژ: هەرِ: بەنەری: خەر: کەهرِ:
ئاژەڵێکە لەمێژە مرۆڤ ماڵیی کردووە بۆبارگواستنەوە بەکاردێ و بۆ سواربوون.
بێ عەقل.
لەدنیادا رەفیقی پیاوی کەر هەرگیز مەکە.
- کەرا: بکەن.
- کەرافی: شووم: دمۆر: نیگبەت.
- کەرانە: ١-کەرهی: جۆرەباجێك بوو جاران لەکەر وەردەگیرا کە دەهاتن بۆ شار.
٢-نازناوی ئەوکەسەیە کەباجەکەی وەردەگرت:
ئەحمەد کەرانە:
- کەراوکۆش: کردوکۆش: رەنجدان:
- کەربانە: لەخەفەتان.
- کەر بەشە: کەرتەشی: شەکرۆك:
جۆرە رووەکێکە لەکنگر دەچێت لەلاکەی پان و درکایە گوڵەکەی بنەوشەیی یان شین دەخورێت.
- کەرب: ١-رق. ٢-ددان.
- کەرپووچ: ئاجۆر: خشتی سوور: خشتی برژاو.
- کەرت: ١-کەرتك: کەرك: کەرد: کەر.
٢-کارت.
- کەرخ: ١-کن: قەراغ: ٢-تیراسە: ئیتجاە:
٣-کولێ، کۆر: نەتیژ: ٤-بۆ گەن: ٥-لەکارکەوتنی شەربە و جەرِە کە ئاو سارد نەکات.
- کەرخان: تەویلە.





- کەرخاندن: بۆگەنی کردن.
- کەرخاو: تاکە جۆگەی بەینی کووزەکانی زەوی تووتن ئاو لە کووزەکان وەردەگرن و بلاوی دەکەنەوە.
- کەرخین: بۆگەنی.
- کەرخنکێنە: جۆرە رووەکێکە.
- کەرد: ١-کەرت: ٢-قەرد.
- کەردار: ١-قەردار: ٢-خاوەن کەر.
- کەردز: ١-ئەو کەسەی کەری دەدزی:
٢-ناوی گوندێکە لە دەشتی هەولێر دەڵێن کەریان لیّ دزراوە.
- کەردرِەقەم: نووسی.
- کەردش رِەد: لای دا.
- کەردن مەیل: خواردیانەوە: ئارەزوویان کرد.
- کەردەبێ: کردبوو.
- کەردیم: کردمان.
- کەردوو: کەرەك: کەردوکێش: کەرت گر:
پێمەرِەیەکی گەورەیە بەدووکەس ئیشی پێ دەکەن جۆگەی پێ هەڵدەبەستن.
- کەر زۆرِ: ١-ناوی گوندێکە لە دەشتی هەولێر:
٢- ناوەکەی لەوەوە هاتووە لەکەردزی کەریان دزیوە لەو شوێنە (کەر زۆر) کەرەکە زەرِیە ناوی گوندەکەیان لیّ نایە کەر زۆر.
- کەرسەگ: فێل باز.
- کەرسەك: تۆپە قوری زل.
- کەرسەلە: غەریب.
- کەرستە: کەرەستە.
- کەرسمەر: نەخۆشییەکی ولآغانە.

- کەرك: کەرت.
- کەرکاش: شەیتان: بزێو.
- کەرکردن: بریتییە لەهەڵخەڵەتاندن کەرم کرد: بێ عەقلم کرد هەڵم فریواند.
- کەرت نەکا: هەڵت نەفریوێنێ.
- کەرکۆل: کەرکۆڵك: رووەکێکە.
- کەرکوتین: ئەحمەق.
- کەرکوولان: کەری وەحشی: کەرەکێوی جۆرێکە لەکەر سپییە و هێڵی رەشی پێوەیە.
- کەرکووك: کرخا:
بێت سلوخ: کەرکووك لەکرخ سلوخ هاتیە شاری سلوقییەکانە کەلەسالآنی (٣١٢-١٣٥) پ-ز سلۆقی بنیاد شوورەی بۆ دروستکردووە شوێنەوارناس (باهر) دەڵێ لەوانەیە وشەی (کەرکووك) لە (گرگر) وە هاتبێ، چونکە جێگەیەکی نزیك کەرکووك و کلپەی ئاگری لێوە هەڵدەستێ.
- کەرژکە: دیواری نێوان قاناتی بیری ئاوێ.
- کەرە: ١-خەرە: گوێدرێژ:
٢-زەوی بەردەلان: ٣- مەجاز واتە بێ عەقڵە:
٤-ماستاو لە مەشکە دەکەن و دەیژەنن و گژنێژەی چەوری لەسەر ماستاوەکەپەیدادەبێ و ئەو گژنێژانە دەکەنەیەك و پێ دەوترێ (کەرە).
- کەرِە: ١-مرۆڤی گوێ گران:
٢-سپیانی پێ گوییی.
بەڵەك کەرِە، قولە مس کەرِە.
- کەرِەت: ١-جار: ٢-کاروان: چەند کەرەتم پێ گوتی: دووکەرِەتم بارهێنایە.

- کەرەسپ: کەرەوز.
- کەرەستە: کەرستە: کەرەسە: کەل و پەل.
- کـەرەدان: کەرەشـاخ: شـاخی گیـان لەبەرێکـە هەنـدێ کـەرەی تێدەکـەن سـەپان بـۆ سـوینی داس بەکاردێنن.
- کەڕسیسە: ١-قەرەبالغ: ٢-کۆبوونـەوەی ئـاژەڵ یان باڵندە لەسەر خەرمان یاهی تێنو لەسەر ئاو:
٣-پرووشە: پەلەتاتە:
وردە بەفری ڕۆژی زۆر سارد دەباری.
- کەرە کێویی: کەری وەحشی.
- کەڕەکیفە: کەڕوو: ئەو مـاددە سـەوزەی لەسـەر نان و خواردن بۆگەنی پەیدادەبێ.
- کەڕەنا: بووقی گەورە:
ئامرازێکی موسیقایە لەعەسکەری بەکاردێ.
- کەڕەنسۆر: لاسار: گوێ نەدەن.
- کەڕەوالێ: کەڕەوالە: ١-فەقیر حال:
٢-مەلێکە لەتیرەی کەوە و لەو گەورەترە.
- کەڕەوان: کەڕەوالی.
- کەرەول: خوری ئەجندە: کەڕوو: کەڕەکیفە.
- کەرکولان: گۆر: کەرەکێوی.
- کەرکە: مریشك.
- کەرکەرە: بەمەجاز واتە زۆر بێ عەقڵە.
- کەر کەریی: ١-جۆرێکە لەترێ:
٢-بەمەجاز واتە زۆر بێ عەقڵی.
- کەرکەدەن: کەرگەدەن: گەرگەدەنگ: یەکشاخە: گیانلەبەرێکی بەهێزە لە چەشنی بەراز لەگا گەورەترە، پەلەکانی کورتن هەریەکە سێ پەنجەی هەیە.

ئەگەر شێر هەبێ، کەرکـەدەنیش هەیـە. واتـە لـە ئازای ئازاتر هەیە.
- کەرگراف: نیوە جزیرە.
- کەرەگەل: هەرکەلە: چەندکەرێك بەیەکەوە.
- کەرگوهـ: کەروێشك.
- کەر لەوەڕێن: ئەوەکەسەی کە کەری دەلەوەڕێنی.
- کەرەوان: کەرلەوەرین.
- کەرملاندن: تێکەڵاو.
- کەروو: ئەکەم.
- کەرو: بکەم.
- کەروێـــشك: کـــەگوهـ: کێروشـــك: هەرۆلـــشە: کووێریـــشك: خۆشـــبەز: کەڤروێـــشك: هەوریـــشە: قولەشـــین: هەورۆشـــە: خـــەرگوش: هەورێـــشە: کەوریشك: کێڤروشك: کەڤرۆشك:
گیان دارێکی زۆر جوان و نەرم و نۆڵە لە ڕاکردنـدا گورج و گۆلە، لـە زۆربـەی گیانـدران خۆشـبەزترە (٧-٨) لە مانگی شوبات بەفالدێ، یانی بـەبادێ، بەچل ڕۆژ (١٢) بەچکە دینێ و بەشـیری مـەمکی بـەخێویان دەکـات (٢٠) ڕۆژ شـیریان دەداتـێ لەپاشان فێرە لەوەڕیان دەکات لـەناو دەغـل و بـن پنچك و بەردا دەژی و لەکاتی ئاوسی لەو شوێنانە کات بەسەر دەبات لـەکاتی بەچـکەکردن قۆرتێـك لێدەدا و بەچکەکانی تێدا دەشارێتەوە،
بەڕۆژ دەنوون بەشەو دەگەڕێن.
٢-جۆرەکانی کەروێشك:





١-کێوی: ڕەنگی سووروسپی و بـۆرە و خاکیەیـەك ڕەنگە و بەڵەك نییە گەورەترە لەهی مـاڵی درێـژی لەشی ٤٠-٧٠سم و بڵندی ٢٥-١٤٠سم.
٢-کێروشـکی مـاڵی: لەماڵـەوە بـەخێو دەکـرێ ڕەنگی لەگەڵ کێوی جیاوازە، سپی و سوور و ڕەشە و بەلەکە لەهی کێویش بچووك ترە.
برایم لە دەمت دەربـێ کەروێـشکی ماڵیـت لێ ون بووە لەژێر بێگارد دەتپروکێنم.
(گەدا- ل٦١)
حکوومەت کێروشکی بەعارەبانەی دەگری.
واتـــە حکوومـــەت زۆر باڵادەســـت و بـــەهێزە و بەتوانایە دەستی دەگاتە هەمووشوێنێك.
ڕەشید ئاغا تـاژیی تـێ بـەردا، بـەڵام کەرویـشك هەڵنەستا. (گەدا- ل٦٠)
- کەروێشکە: ١- کێروشکە.
٣-جووڵانەوەی لاسکی ڕووەك لەکاتی باهاتندا.
- کەڕی: ١-گوێت گرانە: ٢-مێگەل: ران.
- کەڕی نێریان: ئەو بەفرەکەمەی لەپاییز دەباری.
- کەری: ١-هەری: گوێدرێژی: (کەری دەکری)
٢-بکەی: ٣- بە مەجازی واتە بێ عەقلی دەزانـی زۆر کەری.
- کەری پەز: مێگەل: بڕ.
- کەری پشت کرای: ئەوکەرەی یەکـەم جـار بـاری لێ بنرێ.
- کەری ڕەهوان: کەرێك لەبناری ڕێچەکەی شـاخ و دەوەنەکان خۆش بەزبێت.
- کەریك: تیشەك: پارچە: (کەریك پەز: پارچەمەڕ).

- کەری خوێری: ئـەو کـەرەی لەبـەر پـیری و بـێ تاقەتی بەرەڵاکرابێ.
- کەری سوریا: مێگەل: رانەمەڕ.
- کەری کرد: مەجاز واتە هەڵی خەڵەتاند.
- کەر گولە: کەری بەژن کورت و بووردەلە.
- کەریم: کەرۆ: کەریمۆك: ناوی کوڕانە.
- کەری هیشکەڕۆ: زەغـەل: ئـەو کـەرەی لـەڕێگا خەراب بڕوات.
- کەز نەچی: کزمەچی: پاسەوان.
- کەژ:١-وەرز: ٢-چیا: کێو: ٣-هەوا:
٤-دوورەنگ: بەلەك: ٥-ئاژەڵی مەیلەو خەنەیی.
٦-داری ئاوریشم کە جۆرە حەریرێك دەرئەکا.
٧-ڕەشانی موو سپی و شینی تێکەڵاو.
- کەژاڵ: ١-مەیلەو شین:
٢-ناوی کچانە:
٣-ئاوازێکی گۆرانی کوردییە.
کەژال کەژال پشتم چەماوە.
- کـــەژاوە: چـــوارپایەکی پێـــچەوانەی بـــچووکە کەجێگای زەلامێك بەدانیشتنەوە و هەنـدێ شـتی تێدائەبێتەوە چـوارداری درێژبـەلای پێـچکەکەیەوە درێژئەکرایەوە دوو داری درێژ لە تەنیشتەکانی دایە و دەخرایە سەرپشتی ولاغ. ژنانی ماڵە گەوران لەم شاربۆ ئەو شار هاتوچۆیان پێ ئەکرد.
- کەژۆك: جۆرێکە لـە هـەریر کەلـە زینـدەوەرێك وەردەگیرێ کە بەداری (کێورك) دا هەڵدەگیرێ.
- کەژیی: کەژوو: قەیاسە: کژك: کرژوو.
پەتێکی چوار پەنجەیە بۆ باری ولاغ بەستان بەکاردێ.

- کەس: ١-کەست: خەراپ: بێ بایەخ:
٢- شەخس: کەسێك: ٣- خزم خۆێش (کەسم نییە).
- کەسم نەدیت: کەسێکم نەدی.
- کەسابەت: مزیاری: دانووستاندن.
- کەساد: بێ پارە و پوول.
- کەساس: فەقیر: مەزلووم: کلۆل.
- کەسایەتی: شەخسیەت.
- کەستەك: کەرسەك: کلۆگل.
- کەسەر: خەم.
- کەسەك: کەسێك: یەك کەس.
کەسێك بۆم بەخێوبکا شاری داودیەم بۆوی داناوە.
(تحفە-٢- ل٦٦)
- کەسەگ: فێڵ باز.
- کەسپك: رەنگی شین.
- کەسداندن: کەسدین: تەئید.
- کەسك: کەعسك: سەوز: رەنگێکە.
- کەسرەوان: قوماشی حەریری.
- کەسکان: قەوزان: قەسوکان.
- کەسمە: ١-نەخۆشییەکە تووشی کەر دەبێت زیادە گۆشتە لەدەم و چاوی کەردێت، بۆ چارەسەرکردنی ئەو زیادە گۆشتە دەبڕن.
٢-شیرمالێ: کولێرەی بەشیر دروستکراو.
- کەسم نەما: گۆرانییەکی تایبەتی بەمردوو هەڵگوتن لە ناوچەی دزەییاندا.
(کەسم نەما مارە مێرێ)
(کەسم نەما دەرکەی گیرێ)
(فۆلکلۆری کوردی)

- کەسکوسۆر: پەلکەزێرینە.
- کەسناو: کونیە: دۆسیەی کەسی.
- کەس ناس: شەخس ناس.
- کەسنەزان: ١-کەس نەناس:
٢-ناوی دوو گوندە لە کوردستان.
- کەسنەزانم: زۆربەنهێنی.
- کەسی: ١-خزمی:٢- شەخسی: (کەسی نییە).
- کەسێتی: ١-کەسیتی: خزمێتی:٢-شەخسیەت.
- کەسیب: هەژار.
- کەسیرە: سربوون لەسەرمان:
٢-سربوون لەزۆر دانیشتن.
- کەسێکە: کەسێکی تر.
کەسیف خراپ و پیس.
- کەسیوەن: کەسێکە: کەسەکە.
- کەسێ: کەسەك: کەسێك.
کەسێ نەگوت پیڤازاتەب چەندێیە.
(کانی- ل٨٦)
- کەش: ١-ئاوهەوا: ٢-وەرز: ٣-چیا: کەژ.
- کەشتی: گەمێ: گەمیە: گەمی.
- کەشخە: ١-جوانی بەسەرسوڕمانەوە:
٢-نازناوی ئەو کەسەی خۆکەشخە دەکات:
٣-فەخر.
- کەشخەکردن: جوان کردنی سەرسورهێنەر.
- کەشخەبوون: جوان بوون.
- کەشخە لێدان: فەخرکردن.
- کەشك: ١-کەشکەك.
٢-پەنجە خوارکردنەوە و لەسەری کەسێ دان.





- کەشکە زەنگوڵ: کەشکەزرانی: کەشکە ژنۆ: کـلاوەی چـۆکی: کەشـکەلان: کەشـکەلە: کەشکۆی زرانی.
- کەشکەشان: کاکێش.
- کەشك: کەشك: کەشکێش: جۆرە خواردنێکە.
- کەشکۆل:
١-دەفرێکی دەروێشی بووە لە گوێزی هینـدی، کـە ناوەکەیان هەڵکوڵیوە و سەرەکەی تر لەلە کراوە بـەن یان قایش وەیا پەتێکی پێوە بەستراوە و دەروێش و دێوانە و خواپەرستەکان ئازووقە و ئاویان تیا بردووە بۆ ئەشکەوت و شوێنە چۆلەکان بۆ خەلوە.
ئەگەر هەڵنەگرم کەشکۆڵێکی دەروێشان.
(تحفە-١-ل٢٣٧)
دەستی دا کەشکۆلێ چووە کن شوانی.
(تحفە-١-ل٣٧٣)
٢-رەنگ و جۆر:
- کەشمەکەش: ئیختلاف: کەشماکەش.
- کەشم و نەشم: ناز: دەلال.
- کەش و فش: خۆهەڵکێشان.
- کەشەنگ: ماندوو: کفت.
- کەشیش: قەشە.
- کەف: ١-زبدە: ٢-سابووناو.
- کەفت: کەوت: کەت.
- کەفتن: ١-کەوتن: کەتن: ٢-کەوتووە: کەتییە.
- کەفتە: ١-کەوتوو: کەتی: ٢-پەك کەوتوو.
- کەفتەنان: کەوتووم.
- کەفتەو بەر: دەرکەوت.

- کەفك: مەنجەنیق: کەنکانی.
- کەفکی: کەڕوو.
- کەفگیر: کەوگیر.
- کەفلاندن: کەول کردن.
- کەفلووڕ: گیایەکی بڵندە لەناو لێران شین دەبێ.
- کەفمال کردن: ١-تەنکـە قـورەی دوای سـواغی قور بۆ ناومالێ دەکرێت: ٢-ئەوتەنکە گێچەی دوای گێچ کردن دێت.
- کەفەل پانی مامزی: بۆ پەسندی ئەسپ دەڵێن.
ئەمان ولاغی وی کە قەل پانی مامزییە.
(لاوك- ل٣٠)
- کەفیل: دامان: دەستەبەر.
- کەڤ: قەراغ: لێوار.
- کەڤان: قەوس: چەماوە.
- کەڤانە: ١-کەڤان: ٢-شانۆ.
- کەڤاندن: ئازاردان.
- کەڤانژەن: هەلاج.
- کەڤانۆ: غولام.
- کەڤر: کەور: بەر: بەرد.
- کەڤرکانی: بەردەقانی کەڤکانۆك.
- کەڤل: کەڤەل: پیست: کەول
- کەڤن: کەون: کۆن.
- کەڤنار: دێرین.
- کەڤنەدار: پیاوی پیر.
- کەڤنە ژن: ژنی پیر.
- کەڤنە شۆپ: چیرۆك: گوتە.
- کەڤۆخووێ: ساحبی گوند.

- کەڵ ئاهورا: ١-کەڵهور: کەلور.
کەڵهور لە(کەڵ ئاهورا وەرگیراوە) کەلوریشی پێ دەڵێن ناوی تیرەکە لەکوردستان (کەڵ ئاهورا)ش ناوی خوای هەرەگەورەی نەتەوە کۆنەکانی کورد و چیای زاگرۆسە.
٢-گورانی کەڵهوری کوردیش هەر پاشماوەی ئەو مەقام و سروودەیە کە هەزاران ساڵ لەمەوبەر لەبەردەم (کەل ئاهورا)دا نیازی خوازی پێ کراوە.
- کەڤۆك: کۆتر.
- کەك: کاك: کێچ.
- کەڵ: ١-نێر: فەحل: نێرەی گامێشی.
٢-یەك داو لەدەرزی: ٣-کەڵك:
٣-کەڵەکێوی: کەڵەکێڤی نێرەی بزنە کێوی: نێری.
- کەڵ هەرز: لەپاییزدا کەڵ و بزن جووت ئەگرن بەوە دەڵێن و کەڵ هەرز).
- کەل: ١-کەم: ٢-لق: ٣-چیا: ٤-ئاسۆ.
رۆژ لەو بەروە لە کام کەژ و چیاوە سەری لەکەل دەرهێناوە. (گەدا- ل١٦)
- کەلا: هەڵمات: مات: تەبەل: موشین:
شێوەخرە لەشوشە و بەردومز دروستدەکرێت بۆ یاری پێ کردن و شێوەکەش: ١-کەلا شوشە:
٢-کەلا بەرد: ٣-کەلامز.
٢-کوڵ.
- کوڵات: قەڵات.
- کەلاخ: کەلاك.
- کەڵاش: کلاش: چم چم-گیوە.
- کەڵاشدوم: دووپشك.

- کەلاف: کەلەف.
- کەلافەت: قەلافەت.
- کەلاك: کەلاخ: لەخت: کەلەش.
- کەڵان: بەقیافە.
- کەلانە: نانی بە گۆشت و پیازی لەڕۆن سوورکراوە.
- کەلەپچە: کەلەمچە: پێوەندی دەستی بەندیان.
- کەڵانتەر: ١-موختاری گەڕەك:
٢-مدیرشورتە.
- کەلاندن: ١-کولاندن: تەخریب.
- کەلایانێ: مووشین: ماتانێ: هەڵمات.
- کەلاوە: کاول.
- کەلبەتین: کەربەتان: کەڵبەتان.
ئامرازێکە وەك گاز و پلایس بۆ دەرکێشانی ددان بەکاردێت.
- کەڵبەزە: تاڤگە.
- کەلپ: ١-دەنگ: ٢-پەلکی تەنك.
- کەڵپ: ١-ددانی سەوبەراز: ٢-کەڵبە.
- کەڵ ڕفێن: بریتییە لەئاوی زۆر بەتەوژم.
- کەڵپەشەکر: کەڵبەشەکر: کلۆشەکر.
- کەلتوور: کولتوور: کەلەپوور.
- کەڵك: سوود: قازانج: قازانج: فایدە.
کەڵکی هیچی پێوە نامێنێت....(غەوارە- ل١٥٠)
- کەڵك بردن: سوودکردن.
- کەڵکی نییە: سوودی نییە.
- کەڵکیت: ئەو زارێکە بۆ تەون کردن بەکاردێت.
- کەل شکاندن: بەو مەڕە دەگوترێ کەلەکاتی مەڕ لەکەلدان یەکەم جار کەل بشکێنێ.





- کەڵکەڵە: ١-خەیاڵ: ٢-عەشق.
- کەڵکەڵەدار: ١-عاشق: ٢-ئارەزوو.
- کەڵکەوان: شێت: دێوانە.
- کەلکەل: گەرما بەتین: زۆر گەرما.
- کەلکگر: بەسوود.
- کەللە: ١-سەر: ٢-چیوە.
- کەللە با: مەغرور: بەفیز.
- کەللەیی: مەغرور: غلور: غرور.
- کەللەڕەق: عیناد: بێگوێی: لاسار.
- کەللە کەر: بێ عەقل: دەماغ سز.
- کەڵوەز: تاڤگە: قەلبەز.
- کەڵوەزان: شوێنی عاسێ لەشاخ.
- کەل و پەل: شتومەك.
- کەلۆر: دەرکراو.
- کەلۆس: کەل: کەلووت: کەسێ دانی کەوتبێ.
- کەلوو: بورجی ئاسمان.
- کەلووکلوم: کەرو کرۆم: بێ زەوەر: زۆریشمان لێ کەل و کولوم بکەن. (بۆرە- ل٢٠)
- کەلووپوور: کەل و پیل: کەل وپەلی ناوماڵ.
- کەلە: ١-ئاسۆ: ٢-چیا: ٣-کولایە.
- کەڵە: ١-ئەنگوستی گەورە.
٢-گەورە: بەشان و باهوو: ٣- ئاسکی نێر.
- کەڵەبەرد: بەردی گەورە.
کەڵەبەردێ لەوێ بوو. (تحفە -١- ل٣٧٢)
- کەڵەباب: کەڵەشێر: دیکل: دیقل: کرۆسك.
کەرەباب: کەرەشێڵ: کەلەشێر: کەڵەکوك: دیك: کەلەشین.

چوەکن کەڵەباب گوتی. (تحفە-١-ل١٩٢)
- کەڵەپیاو: پیاوی ئازا و چاو نەترس.
- کەڵەزەڕیی: زۆرداری.
- کەڵەباب خوێندن: ١-پێوەرێکە بۆ کات زانین:
٢-بەکاردێ لەکاتی بەیانیان.
- کەڵەکە: کەلاکە: هەردوو تەنیشتی راست و چەپ لەژێر قەفەزی سینگ.
- کەلەکە گۆڕین: تل دان: ئەم دیو ئەودیو کردن.
سەدحەیف و مخابنم دەمینی
کیژان دانشتنە لەماڵەبابان
کەلەکان دەگۆڕن بەتاقی تەنێ
گۆرانی حەیران
- کەڵەقالونچە: جۆرە قالۆنچەیەکە زیان بەگەڵای درەخت دەبەخشێت.
- کەلەلا: ١-نەخۆش: ٢-ماندوو.
خۆزگە منیش وا پیر و کەنەفت و شەکەت و کەلەلا نەدەبووم.
(گەدا- ل٧)
- کەلەملە: ١-چیای نزم: ٢-ئاسۆ.
- کەڵەگەت: بەژن درێژ: باڵابەرز.
سەیران کەڵەگەت بوو عەیز کورتەباڵا.
(حەمەدۆك -٢-ل١٥٩)
ئافرەتێکی کەڵەگەت و سپیلکە و دەم و چاو نارێك بوو.
(غەوارە)
- کەڵی مەیدان: ئازای مەیدانی شەڕ.
- کەلەن: کەلێن: کەلەبەر.

- کەڵەمەشکێن: یاخی.
- کەڵەمێروو: مێرووی گەورە.
- کەڵك: سوود: فایدە: فەیدە.
- کەم: ١-تۆزەك: ٢-حەقیر.
- کەم تین: بێهێز: بێتین.
- کەمدوو: کەم بڵێ: کەم دوێ: کەم دوێن.

... زۆرکەم دوێ بوو... (حەمەدۆك-٢- ل١٤٧)

- کەمرەوت: لەرۆیشتن لەسەرخۆ: سست رەوت.
- کەم هۆش: گێل: هێڕ.
- کەمەرە: جۆرێکە لە خشڵی ژنان پێکهاتووە لـە هەندێك ئەڵقەی زێڕ و بە تەنیشت یەکەوە لکاون.
- کەلکیت: پشك: ئامرازێکی تەونـە: شـەنەیەکی ئاسنەو وەکو پەنجە وایە و دەسـکێکی داری هەیـە تێوەریخی لەتەون چنیندا پێ دەکوتن.
- کەلیمە: وشە: واژە.
- کەلەپۆ: ئەوکەلەی خۆری لێ ئاوا دەبێ.
- کەمرە: ئازاڵە: تەپاڵە: گەرمە: گەمرە: پەگڕ.
- کەم زان: ١-کەوە: ناوی گیایەکە.

پشتم شەقبو چەماوە هەروەك کەمای نۆچن.

- کەماسی: کەمایەتی: نەقس: کەمایی.
- کەمانچـــە: کەمانـــچە: روبـــاب: جـــۆزە: ئامێرێکی مۆسیقایە.

کەمانچە ژەن: کەمانچە ئەنگێو.

- کەمە: ١-کێمە: ٢-داری چیوەی بازنەیی، دۆڵو بێژینگ و لانك لە داری مێو دروستدەکرێت.
- کەمەر: ناوقەد: کەمبەر.

خشڵی خاتونی دەیدا لەکەمبەری برایمی..

(تحفە-ل٣٧٦)

- کەمەر بەرستە: ئامادە: ساز.
- کەمەك: کەمێك: تۆزێك:

دوای کەمێك بێ دەنگی سێودین هەڵیدایە.

(غەوارە- ل٥٧)

- کەمەن: کەمەند.

جۆرەتەنافێکە جاران لەجەنگدا بەکاریان دەهێنـا بۆ خـستنە مـل و بـەکێش کردنـی جـەنگاوەری بەرەی ئەولا.

- کەمباخ: رماو: رووخاو.
- کەمبەر: کەمەر.
- کەمتەرخەم: گرنگی پێ نەدان.
- کەمتیار: کەمتار: حەفتیار.

ئاژەڵێکە وەکـو گـورگ وایـە لـەگورگ گـەورەترە بەرزایی (٧٠-٩٠)سم دەبـێ درێـژی مـەترونیوێك دەبێ کلکی کورتـە سـەری گەورەیـە، چـواردانی (کەلبەی) درێژی لەپێشەوەی دەمـی هەیـە دوانـی سەرەوە دوانی خوارەوە خواردنی گۆشتە بەتایبـەتی ئاژەڵی تۆپی و شـەوکارە بەشـەو بـەدوای خـواردن دەگەرێ (٥-٦)بەچـکەدەکات بـە شـیری گوانیـان بەخێویان دەکات.

- کەمتین: لاواز لە هێزدا.
- کەم خەو: بێخەو.
- کەمدەست: کەمدەس: بێدەسەڵات.
- کەمر: بەرد.
- کەمڕوو: شەرمەزار: مەحجوب.
- کەمك: ١-کەمێك: ٢-ترۆپك: ٣-مەندیل.





- کەم کەم: کەمکەمە.
- کەمکۆڵەوەز: پەلکی فەریکە گوێز.
- کەموەر: کەمخۆر.
- کەمۆ: مەفتوق: مەکرۆ: فێل باز: چاژان: ژیر:

زۆر مەفتوق و کەمۆو مەکرۆ و فێڵ باز.

(بۆرە- ل٣٤٠)

- کەمووتەر: کەموتر، کۆتر: پەلەوەرێکی مـاڵی و کێوییە.
- کەموکورت: کەم و کورت.
- کەمووله: کاسی گەورەی دار.
- کەمین: ١-خۆداگرتن لەدوژمن: ٢-ئامانج:

٣-کەم: حەقیر.

- کەمینگا: شوێنی کەمین.
- کەمۆڵە: گومگومە: سوراحی.
- کەن: ١-پێکەنین: ٢-کەند.
- کەناراو: ئاودەست.
- کەنارە: کناری: بولبلێکە.
- کەناری: ١-بێ لایەن: کەنارەگیر.

٢-باڵندەیەکی بچووکی دەنگ خۆشی زەردە.

- کەنەفت: زەلیل: پەرێشان: پەرپوت:

پیر و کەنەفت و کەلەلا.

- کەنەفت بوون: زەلیل بوون: رەزیل بوون.
- کەنەفت کردن: زەلیل کردن.
- کەنەك: ١-هەڵەت: ٢-بەرد.
- کەند: کەنەلان: کەندەڵان: کەن: شیو:

کەندە "شیو"ی قەپلان لقێکە لە کەندی کەندیناوە.

(بۆرە- ل٦)

- کەندەك: خەندەق: چاڵ.
- کەندر: کندر: گوریس: پەت: تەناف.
- کەندەکار: نەقار: نەقش: نەخش.
- کەندەکاری: نەقاری.
- کەندوو: کەنۆڵە: کەنوو: کوار: یەك بەژن بلنـدە لەسەر پێچکەیە شێوەی خڕە یان چوارگۆشـەیە ژن لەماڵەوە بە قورەسـۆرێ خوسـاوە دروسـتیدەکەن سەری ناگیرێ بەڵام وادەبێ قەپاغێکی بـۆ دەکـەن جاچ قوڕ بێ و چ داروشتی تر جالەسەرەوە دەخڵـی تێ دەکەن بۆ دەرهێنانیش کونێکی خڕی لەخوارەوە هەیە ئەگەر بیانەوێ دەغـڵ دەربێـنن لـەو کونـە دێتە خوارەوە.
- کەندووی مێش هەنگوین: شانەی هەنگوینی.
- کەندو کۆسپ: هەڵەت پەڵەت: کەنووکۆسپ.
- کەندیر: کەندییل: کندر.
- کەندیناوە: کەندێناوە.

ناوچەیەکە لە هەولێر کە کەوتۆتە نێوان زورگە زراو چیای قەرەچوغ زۆر گوند دەگرێتەوە.

لەباکوورییەوە بۆ کەندی کەندێناوە شۆر دەبێتەوە.

(غەوارە- ل٦)

- کەنگر: کنگر: قنکر: کنگر.
- کەنگرۆك: دەندەرۆشك.
- کـەنگی: کـەنگێ: کـەنگینێ: کـەی : کـەینێ:

کەنگێن: جێناوی پرسیارە.

کەی تۆم دیوە، کەی ئەتناسم کەی کەی
دڵداری چی پەیانی چی حەی حەی هەی

(گۆران)

- کەنن: کەندن.

- کەنێ: کیژ: دۆت- کەچ.

- کەنی: ١-ئافرەت: ٢-پێکەنینی
کەنی ژدلێ خوەش بیت.

- کەنیز: کەنیزەك: قەرەواش: خزمەتکاری ژن.
گوتی "ئەو قەرەواشە لە کوێیــە؟" قەرەواشــی دی گوتیان (تحفە -٢- ل١٦٠)

- کەنیشت: کەنیشتە: کەنیسای یەهوودییان.

- کەنیشك: کچ.

- کەو: ١-شین: ٢-بێژینگی کون زل.

٤-کەو: کـەکڵ: ژەرەژیـی: ژەرەژ کـەکڵی: چـێل: کۆوك: کەکڵ.

١-پەلەوەرێکــە بــەژن و بــاڵا بــچووکە و (١٥-٢٠)سم درێژدەبێ، سـەری کـەو (١-٢)سـم دەبـێ چـاوی سـوور و خریـشە دەندووکـەکانی سـوورە و قاچـەکانی سـوورن کـەو لەکوردسـتان زۆرە، کـەو بەگوێرەی ناوچە شاخەکانی کوردستان زۆر کەو بـە گوێرەی ناوچە هەیە ئاوهەوا رەنگیان دەگۆرێت ئەو ناوچەیەی کەوی لێ بێ بەتایبەتی ناوچەکان رەنگی بەردەکە چۆن بێت کەوەکـە ئـەوها دەبێـت ئەگـەر بەردەکان سپی بێت کەوەکە سپی دەبێت، بەردەکان رەنگی بۆربێت کەوەکە رەنگی بـۆر دەبێـت، بـەڵام شـاخەکانی بـەردەکانی رەش و سـوور بێـت ئـەوا کەوەکەی رەنگی ئاسمانی دەبێت،
لە(١٠/١٥)مانگی، بەیەکدا دەفسن کەوی واهەیە (٢٤)هێلکە دەکات.

٢- جــۆری کــەو لــە رووی تەمەنــەوە نــاوی تایبەتی هەیە:
١-بارەکەو: واتە کەوی یەك ساڵی.
٢-شابار: کەوی دووساڵە.
٣-خرتەکەو: کەوی سێ ساڵی.
٤-سەرەکەو: کەوی (٤-٥)ساڵ.
٥-پیرەکەو: کەوی تەمەن لە (٥) ساڵ زیاتر.
(راوشکار- ل٧٢)

- کەوا: کـەوێ: جللـی ئافرەتانـە لەسـەر کراسـی کوردی لەبەر دەکرێت.

- کەواتە: کەوایە: مانای وایە.

- کـەوان: ١-ئـامرازی موسـیقاژەندنە، درێـژی (٦٢)سم مووکلکی ئێـستر لـەم سـەر و ئەوسـەری داری (کـەوان)ەکـە دەخـرێ جـاران (٢٠-٤٠) موو دەبێت.
کەمانچەی پێ لێ دەدرێت.
٢-کەوانـە: قـەوس: ٣-ئـامرازی شـەرکردن بـوو لەگەڵ تیر.
٤-ئـامرازی هەلاجییــە: شــێوەکەی چــەماوەیە ژێ هەیە.

- کەواندن: کەتاندن.

- کەواسە: کەواتە.

- کەواو: کەباب: کواو: گۆشتی قیمەکراوە لەشیش دەدرێ و دەبرژێندرێ.

- کەوایی: رەنگی شینی.

- کەوباز: بەو کەسە دەڵێن کەکەو رادەگـرێ و بـۆ شەرەکەو بەکاری دەهێنێ.





- کەوبەردار: تشرینی دووەم.

- کەوبوار: لەبەهاردا پۆلەکەو بەکۆمـەڵ لەناوچـە گەرمەکانەوە بەرەوبەرزایی شاخەکان کـۆچ ئەکـەن رێگاکانیان دیارە راوکەرەکان لەسەر رێگاکانیان دا لەناوحەشارگە دائەنیشن و بەکۆمەڵ راویان ئەکەن.

- کەوت: کەت: کەفت.

- کەوتاندن: کەتاندن.

- کەوتن: کەتن: کەفتن.

- کەوتنەخۆ: خۆئامادەکردن.

- کەوتوو: ١-ساقیت: ٢-شەرمەزار.

- کەوچەر: زۆروەر.

- کەوچك: ملاك: کەفچك: مراك: کۆچە: کەڤچی چەند کەوچکی شۆربا لەجامێك کرد.
(حەمەدۆك)
ئـامرازی چێـشت پـێ خواردنـە لـەدار دروسـت دەکرێت.

- کوچێر: کەوچکی داری گەورە.

- کەودەن: غەبی: گێل.

- کەور: ١-بەرد: ٢-ئەشکەوت:
٣- عاسی: ٤-پێست.
٥-ناوی گوندێکـە لـە ناوچـەی هـەولێر مۆڵگـەی عەشیرەتی شێخانە.

- کەور: کەورك: کەور:
١-بەرد: ٢-عاسی: ٣-پێست.

- کەورۆژ: مێ رۆژ: هەتاوی وەرزی زستانی هـەور بەری گرتبێ.

- کەورێشك: کەروێشك: کێروشك.

- کەوژ: مەیل: ئارەزوو.

- کەوش: ١-پێڵاو: ٢-نەعل: ٣-بیابان.

- کەوش کرن: عەتەبە: ئەستانە.

- کەوشاندن: کەوژاندن.

- کەوشە دارینە: قەبقاب.

- کەوشەکێن: کەوشەك: یاری سێ باز.

- کەوش کەوشێنە: یارییەکی کوردەوارییە بـە دوو کەس دەکرێ.

- کەوشدروو: پینەدۆز.

- کەوشدروێتی: پینە دۆزی.

- کەوکورت: باروت: کبریت.

- کەوگیر: ئامرازی چێشت لێنانە.
ئەوەی خاوەنی دووژنە جەرگی وەك کەوگیر کون کونە.

- کەومار: شڵەمار: مارێکی پنك پنکەیە.

- کەوگیری پلاوی: پارزونگی پلاوی.

- کەوگیری چای: پارزونگی چای.

- کەون: کۆن.

- کەونینە خانە: ئەنتیکەخانە.

- کەوورك: ئەشکەوت.

- کەونەبرین: کۆنە برین:
١-برینی سارێژ نەبووی:
٢-چورتم و بەڵای بەسەرکەسێ هاتبێ.

- کەوناس: بەوکەسانە دەڵێن کەراوی کەو دەکەن و شارەزایی زۆریان لەکەوی راوێداهەیە.

- کەوە: ١-رەنگی شین: ٢-چەق:
٣-دارە چەماوەکەی دەف کە جاران دۆمـەکان لـە دارمێو دروستیان دەکرد.

- کەوەت: داری کەوەت.

- کەوەر: کەرەو: گیایەکی قەدپانە لەتیرەی کەرەوز و تەرە دەخورێ.
- کەوەڕۆژ: کەو رۆژ.
- کەوەڕێ: ١-بێزار: ٢-قەلق: رارا.
- کەوڕێ بوون: ئیزعاج بوون: ماندوبوون.
- کەوەمار: کەومار.
- کەوو: شینی ئاسمانی.
- کەوێ: ١-کەوەك: ٢-کەوا.

نازیلێ لێرە لەوێ
بارێکی خاسە کەوێ
(گۆرانی عەلی مەردان)

- کەوێن: بەڕێوەبەر.
- کەوێنگە: بەڕێوەبەرایەتی.
- کەویی: ١-کەو: (کەویی دەکرم: کەوئەکرم).
٢-کەیی: ماڵی: دەستەمۆ.
٣-کلێڵە: رنوبەفر.
- کەوی رەبات: کەوی ڕاو:
مەبەست لەو کەوانەیە کە راوەکەوی پێ دەکرێ.
(راوشکار- ل٧٤)
- کـەوی سـەردار: لەگـەڵ کـەوی رەبـات بـۆ راو دەبردرێ لـەکاتی ڕاوکـردن (٣)م لـەدووری کـەوی رەبات دادەنرێ بڵندتر دەبێ لەکەوی رەبات.
(ڕاوشکار- ل٧٤)
- کەویی سار: سپیانی رەنگ شین و سپی.
- کەوی قەرەجوغ: بـەڕەنگ لەکـەوی ناوچـەی تـر جیادەکرێتەوە، رەنگی کەوی قەرەچوغ سپی و بۆرن لای راوچـی پەسـندە، چـونکە شـەڕکەر و نەبـەزن زۆریش دەخوێنن.
(راوشکار- ل٧٤)
- کــەوی کۆچــکەر: کەزســتان دەســتپێدەکات، کوێستانەکان بەفر دایاندەپۆشێت و کەو ناچار دەبن بۆ ژیان بەسەربردن کۆچ بۆ ئەو شوێنانە بکەن کە گەرمـە و تاکاتی بەهاردێت ئەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان.
- کەوی کێوی: واتە کەوی چیا و چۆل.
- کەوی مـاڵی: بـە بەچـکەیی لەماڵـەوە بـەخێو دەکرێ قاچەکانی وەکو کـەوی کێـوی سـوور نییـە دەماری سپی لێ پەیدا دەبێ خاڵی رەش لەگەردەن و سەروچاویدا هەیە.
- کەوی مەست: بەو کەوە دەگوترێ کە ئـارەزووی بەسـەردا فـسینی سـەر مێیـەی هەیـە، لەفیتـەی ئەدات لەوەرزی پاییزو زستان دەبێ جێی گەرم بێت ، هەروەها بۆ ئامادە بوون بۆ شەرەکەو.
- کەوی ناوچـەی سـەفین: کـەوی ناوچـەی سـەفین رەنگی کەوەکانیان شینی ئاسمانییە لەجووت بـوون جیاوازی هەیە لەگـەڵ کـەوی قەرەچـوغ یـەك رۆژ درەنگتر نێرە بەسەر مێیە دادەفسێ.
کەویــە بــەفر: لــە بــەهاران بــەفری چــیاکان رشدەبێتەوەو قان قـان بـەفر دەمێنـێ بـەو قانانـە دەگوترێ کەوی.
- کەوییبەرخان: کۆزی بەرخان.
- کەوێ: کەوا: ١-بەشێکە لەجلی ژنان.
٢-جـاران پیـاوی گـەورەی کـورد وەك سـەرۆك عەشیرەت و برا گەورەکان لەگەڵ سـەڵتە لەبـەریان دەکرد و عەبایان بەشانی خۆیاندا دەدا.





٣-وەك دەســتوورێك عەشــیرەتی داودە بەســەرەوە لەگەڵ سەڵتە لەبەری دەکەن.
٤-کەوەك: واتە یەك کەو.
- کەوی کردن: کەیی کردن: ماڵی کردن: رامکردن.
- کەویژ: پێوەرێکە بـۆ پێـوان بـەکاردێت دەکاتـە (٨٠)کیلو دەغل.
- کەهانەت: وەعز.
- کەهبڕ: کاوڕ.
- کەهر: کەر.
- کەهرك: بێچوی بزن.
- کەهنی: بەردەقانی.
- کەهیر: کەڕ.
- کەی: ١-کەنگی: ٢-چۆن: ٣-وشەی رێزلێنان بۆ برا گەورە یان پاشا و برا گەوران وەك:
(کەی قوباد، کەی خوسرەو).
- کەیار: مەحکەم: باش.
- کەیان: ١-براگەورە: ٢-جیهان: عالەم.
- کەیاندن: ژاندن.
- کەیبانوو: کەی وانوو: کەڤانی.
- کەیخودا: ئەعیان.
بەشاهێدبن کەیخوداو ردێن دارە.
(تحفە-١-ل٣٤٥)
- کەیحوداژن: ماقوولە ژن.
- کەیس: ماوە: فورسەت.
- کەیف: خۆشی: حاڵ.
بەکەیف: بەختیار.
- کەیف نەخوەش: بێ کەیف: غەمبار: عاجز.
- کەیف خۆش: شادومان: کەیف خـۆش: بـەزەوق: شاد: بەدەماخ: بەکەیف: کامەران.
کەیفی زۆرم بەم قسەیە خۆش بووە و گوتی.
(غەوارە- ل٢٣)
- کەیکووا: ١-یارمەتیدەر: ٢-فێڵباز.
- کـەی قوبـاد: ١-فەرمانڕەوایـەکی کـورد بـووە (٨٥٣) پ.ز فەرمانڕەوەایی گرتە دەست و سەر لە نوێ دەوڵەتی مادی زیندووکردەوە.
٢-ناوی کوڕانی کوردییە.
- کەیل: پڕ.
- کەیلان: خوشەویست: جوان.
- کەیلە کۆن: کاول: کەلاوە.
- کەین: عیلاقە.
- کەین و بەین: پیلان.
لە هەموو کەین و بەینێکدا لووتیـان بـە لووتییـە کادەتەقی. (تەنەکە- ل٦١)
- کە یۆ: کاکە: برای گەورە: کەیین.
- کەییل: ئاودەست.
- کێ: ١-کا: وردەی قەسەل: ٢-ئاوایی:
٣-کێ: کێ: جێناوی پرسیارە.
بۆ پرسیاری ئەوکەسەیە بەکار دەبرێ کـە کـارێکی کردبێ یان بیکا.
کێ بێت حەزنەکات؟
(غەوارە- ل٦٠)
(کێ کردی، کێ خـواردی). کەسـێ زۆر مانـدوبێ بەکارێکەوە یەکێکیتر خێرەکەی بخوات.
(پەند خاڵ- ل٣٥٦)

٤-پاشبەندی ناسیاوی بۆمێ لەشێوەی هەورامی بەرامبەر بە (کە)ی شێوەی سۆرانییە.

ژنەکێ: ژەن+کێ.

- کناچەکێ: کناچە+کێ.

- کێچ: ١-کەك: کەکەپی: قێچ: کەکی: قێچولە: کێك،

لەپیسی پەیدادەبێ لەئەسپێ بچووکترە گەرای پێی دەگوترێ رشك.

٢-کێچ لەپەندی کوردی:

کێچ کەوتە کەولی: واتە تەنگاو بووە کارێك جێبەجێ بکات.

کێچی هەڵهێناوە: کەسێ کە زۆر دانیشتبێ و بێزار بووبی لەدانیشتن.

٣-کێچ لەناوی جوگرافی: بۆتە ناوی گوندان.

... ئەو وەختە کە لە (کیچ ئاوا) بوون...

(گەدا- ل١٣٧)

- کیچ ئاوا: گوندێکە لەکوردستان.

- کێدان: کاوین.

- کێر: ١-کیر: کییل: زەکەر: قەمیش: ئامرازی نێرینەی بوونەوەر.

کێر لە پەندی کوردیدا:

کێری ئەمڕۆ بەقوونی سبەینێ

(پەند خا- ل٣٥٥)

واتە حازر مەدەیە قەرز.

٢-زنجیرە چیا: ٣-کێرد: چەقۆی گەورە.

- کێردۆکە: کێردی بچووك.

- کێڕا: کێڕان: کوێڕا: چ زوو:

کوێڕا ڕۆیشتی و کوێڕاهاتییەوە.

(گێلە- ل٥)

خۆت بەوەلی دانابوو کێڕان بوویت بە پیاو کوژ.

(غەوارە- ل٢٢٥)

- کێرك: کارد: کێر: کێرد: چەقۆی گەورە.

- کێرۆکە: کەژۆك: دارێکە جۆرە درەختێکە.

- کێس: ١-مناسب: ٢-فورسەت.

- کێسر: داوی هەوراز گورد کە لەناو رایەڵەکان دەخرێ لەتەون کاری دا .

- کێش: سەنگ.

- کێشا: دەرگایەکی بچووك لەناو دەرگایەکی گەورە دابێ.

- کێشك: ئێشك.

- کێشکۆکە: لای سەرەوەی شەی ئامێری جۆلایی:

٢-چۆلەکەی بچووك.

- کێشکە: کۆشکە: کێژکە: کیژووڵە: کێشولە: چۆلەکە: چوێلەکە:

باڵندەیەکی بچووکە نێرەی لە مێیەی گەورەترە رەنگی باڵەکانی پەڕی رەشی تێدایە.

کێشکە خۆی هەیە هەتا چەلاوی هەبێ.

(پەندی کوردی)

واتە پیاوی بێ نمود و بێ دەسەلات چی پێ دەکرێت.

کێشکەکی پێ سەرنابڕێت؛ واتە زۆربێ دەسەلاتە.

رۆڵە ئەوە تۆڵەی کێشکە بەستەزمانەکەبوو.

(غەوارە- ل٥٥)





(کێشکە لەئاونەکردن). بەمرۆی بێ زیان دەڵێن.

(پەند)

- کیشگە: کێشگا: قورسگە: چەقی: قورسایی.

- کێف: ١-کێو: چیا: ٢-حاڵ.

کێڤژاڵە: قرژاڵ.

- کێل: ١-هەردوو بەردی سەرینگان و پێنگانی قەبری مردوو.

هەندێك ولاخیان دەبرد و ئەلحەدوکێل پەیدابکەن...

(غەوارە- ل٧)

٢-ئەو بەردانەی لە یاری کێلەبەردانێ بە قیتی دایدەنێن.

٣-قالب: کێلەك بەفر.

- کێلان: ١-زەوی بە گاسن قۆرکردن.

٢-زەوی قووڵ کردن: ٣-کالان: کێلان.

- کێلانە: کەلانە.

- کێلەر: زەوی کێڵ: جووتیار.

- کێلەبەردانی: یارییەکی کوردەوارییە بە بەرد دەکرێت.

- کێلەبەردینە: کێلە بەردانێ.

- کێلکەر: کێرکەر: کارەکەر: ژنی لە مالان کار دەکات.

- کێڵراو: کێڵرای.

- کێڵگە: مەزرا.

... لەناو کێڵگەی خەرمان... (بۆرە- ل٢٦)

کێل گەردەن: گەردن درێژ.

خاتوونی کێل گەردنی.

(تحفە -١- ل٢٣٣)

- کێلۆ: ١-ژنی دیان: ٢-کیلو.

- کێلەك: ١-دەورویشت:

٢-قالبەك: یەك کێل

- کێلی: ١-چیا:٢-چرکە.

- کێم: ١-کیم: هەوا: چڵك: زووخ: کیماو: زەردئاو: خوزاو: کێماو:

ئەو ئاوە زەردەی لەپیس بوونی برین پەیدادەبێ.

٢-کەم:

- کێلەشین: بەردێکی شینە بەرزایی (٢م) ئەبێ چەند نووسینێکی گرنگی لەسەرە ئەگەڕێتەوە پێش زایین.

٢-ناوچەکە بەناوی ئەو بەردەوە ناودێرە بەناوی ناوچەی کێلەشین لەسەر سنووری عیراق و ئێران:

٣-حیسابێك هەیە بەناوی حیسابی کێلەشینێ کە وەرزی بەهار و هاوین و پاییز و زستانی پێ دیاری دەکرێ... هتد.

٤-کوێستانە: بەناوی کوێستانی کێلەشینێ.

٥-بریتییە لە زۆر فێنك.

کە گوتیان دەڵێی کێلەشینە، واتە زۆر فێنکە.

- کێم بها: هەرزان: ئەرزان.

- کێماسی: ئیحتیاج: کەموکورتی.

- کێماهی: کێمایی: ١-نەقس: ٢-کەم.

- کێمجاڵە: قرژال.

- کێمتر: کەم تر.

- کێن: جێناوی پرسیارە ئەوانەی کارێکیان کردبێ ئێوە کێنو دێ دەهانایە.

(تحفە-٢- ل٢٦٨)

- کێندەر: کویّ: کیّ: کوێندەریّ: کێندەریّ:
کوێدەریّ: کوو: کیندەر: کۆ: کیریّ: کیدەر.
نەی دەزانی رووی تەکبیر لەکوێندەر بکات.
(غەوارە- ل٢١٥)
جێناوی پرسیارە بۆ پرسیاری شوێن و جێگە بەکاردێن.
تەئەو ژکیدەریّ ئانییە. (کۆمەڵە- ل٩٦)
دەوڵەمەند پیروزت بێت، فەقیر لە کێندەرێت بوو.
(پەند)
ئەڤ ری دچن کوو (کومەڵە- ل٩٦)
- کێندەرێن: کوێندەرێن: واتە خەڵکی کام شوێن و جێگان.
- کێندەرێت: کام شوێن و جێگات: کوێت:
...کێندەرێت دێشیت.... (بۆرە-ل٢٢)
- کێو: ١-چیا: ٢-کێتان.
- کێواچن: کێوەدەچن: بۆ کویّ ئەچن.
- کێواچی: کێوەدەچی: بۆ کوێی ئەچن.
- کێوی ئاورپژێن: کێوی ئاورین: بورکان.
- کێوە: ١-بۆ کویّ : کاند:
٢-چیایە:
کورە بەو شەوە کێوە دەچیت.
(غەوارە- ل٦٤)
- کێوەچو: کێوە رۆیی: بۆ کوێی رۆیشت.
- کێو پارە: کێوسان.
- کێومال: ١-شاخ و کێو پاکردنەوە لەبەفر.
٢-بەوردی گەڕان بەدوای کەسێ.
- کێوگەل: زنجیرە چیای شێوەبازنەیی.
- کێویی: چیایی.

- کێها: کیهە: کیهان: کێهان: کامە کیها: کێهە:
کیژان: کیشك: کام: چکاکێ: چکانە.
ئەودەستەیە جێناوە یەك واتا دەبەخشن و بۆ پرسیاری جوداکردنەوەیە بۆ کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێت.
(گۆران- ل١٠)
کام بەرزی جوانە وەك بەرزی باڵای.
ئەز نزانم کیژان مامربوو.
(کۆمەڵە)
بەنگین بگەڕێ، بزانە، کێهەی بێ خەرجە.
کێهەی خەرجی پێ ماوە.
(تحفە -١- ل٢٦٤)
- کیانی: واتە گەورە و خاوەن شکۆکان کەبە فەرمانڕەوایانی مادی پێ ناودێربووە.
- کیهایان: کێهایان: کامەیان: کامیان.
کامیان پووش خۆر و بێ زیانە...
(بۆرە- ل٩٣)
- کیباسەی: کیباستەی: کیبانەی: کیباندن: ناردن.
- کیخمە: رەنگی شال و شەپکی مەیلەو سوری تێکەڵ بەقاوەیی تێر.
- کیریّ: لەکیّ: لەکوێی:
ماڵاتە کیرێیە.
- کیژ: ١-کچ: ٢-دۆت:
٣-کیها: کام.
- کیژان: ١-کیهان:
٢-کۆی کیژ:کچان.
کیژان دەچنە مێرگوڵان.





تێکرا دەچنە هەڵاڵان.
- کیژی کافرۆش: ١- کیژێکی زۆر جوان بووە کای فرۆشتووە ئینگلیزەکان بردوویانە ئەویش خۆی کوشتووە:
٢-بریتییە لە کچی جوان: (دەڕێی کیژی کافرۆشە)
٣-ئاوازێکی کۆنی کوردییە: کیژەکەی کافرۆش چاردە ساڵییە.
- کیژکۆك: کیژۆرە: کیژۆڵە.
چەندم گاز کردی کیژۆرە ئەسمەریّ.
(حەیران)
- کیژوکار: کیژوکاڵ: کچی کچەکە و گەورە.
کیژی بابان شێواوکە بە خۆت ئابرووت...
(غەوارە- ل١٨٨)
- کیژیّ: کچیّ: وشەی بانگ کردنی کچ.
- کیس: ١-ئاوسان:
٢-سوێند:
٣-جۆرکی پارەی.
- کیس کردن: ئەستوربوون: ئاوسانی پدوی دانی مرۆڤ.
- کیسە: کیسك.
- کیسەبڕ: دز.
- کیسەڵ: کیسۆ: کویسەل: کوسی:
گیاندارێکی وشکانی-ئاوییە.
- کیسەڵە: جۆرەگیان لەبەرێکە لەدەغل دەدات و شیرەکەی دەخوات و قەپێلەکەی بەبەتاڵی دەمێنێتەوە لەشێوەی کیسەڵی ناو، ئاوە بەڵام رەنگەکەی بۆرە و رەشە و زۆر بچوکترە.
- کیف: غیلاف.

- کیفی ماری: کراسی ماری.
- کیفك: جۆرکێکە لەگوانی بزن و مەڕ هەڵدەکێشرێت، تابێچوەکانیان نەیان مژن.
- کیفاندن: کیفە: دەنگی رۆیشتنی ماری.
- کیلا: کێهە لا: کام لا: کامەلا.
- کیبلە: ئامرازێکی پێوانە.
- کیلەندی: درەوەتی: داس.
- کین: کینە: قین: رك: رق: بوغز: حەقد: غەزەب.
- کیفە: کیف کیف: کیڤاندن:
دەنگی مار لەکاتی رۆیشتن.
- کیملەك: ئەو کراسەی لەگەڵ شاڵ و شەپك لەبەر دەکرێت.
- کێوی: کوڤی: کێوی.
- کییی: کێیی.

# گ

بەم پیتانە دەنگگۆڕکێ دەکات:
(گ- ك)
گوتم: كوتم.
كورەگە: كورەكە.
ئانگو: ئانكو.
زگ: زك.
٢-بە (واو) دەنگگۆڕکی دەکات:
(گ: و).
(گوریس: وەریس).
(گوتن: وتن).
(هاتگە: هاتووە).
- گ: گشت: هەموو: هەمی: گرد: گردین: گشتی:
گشك: گر: گش.
- گرۆژی: هەموو رۆژێ.
- (گـــش چـــاوە نۆربـــون میرزادەبـــێن)..
(شەرەف- ل٧١٩)
- گا: ١-جار: ٢-كات:
٣-گاو: بۆغ: ٤-جێگا: محەل.
٥- گەورە:

گای بەقرانەكی بناسە: (پەند) واتە پیـاوی گـەورە بە شتی كەم بناسە و تاقیبكەوە.
- گابڕ: رووەكێكە كاغەزی لێ دروستدەكرێت.
- گابنێسی: گابەلسك.
- گابۆڕ: بۆراندن.
- گابەرد: ١-بەردی گەورە.
گابەردەكان شنێ و سەریان پڕەلە خەنەتیلكە..
(حەمەدۆك- ل١٠)
٢-جۆرێكە لەچۆلەكە.
- گابەڵەكـــە: ١-نـــاوی گوندێكـــە لەناوچـــەی كەندیناوە: ٢-گای رەنگ بەلەك.
- گاپەل: گاكۆتر: گاوكە بوتـەر: جـۆرە كـوترێكی گەورەیە.
- گات: ١-قسەی یەزدان: ٢-پاژە: فەسل: گای تۆ گات بزربووە.
- گاتوو: جۆرەتوێكـە دەنـگ گـەورە لەسـەرەتادا رەنگی سوورە و تـامی ترشـە دوایـی رەش دەبێـو تامی شیرین دەبێ.
- گاتەگات: رۆیشتنی بەبێ نیزام.
- گاجووت: گاوە: ئەو گایەی جۆتی پێ دەكرێ.
- گاچاڵە: بیری زۆر قۆر.
- گادار: گاوان.
- گادۆشە: مەنجەڵێ شیری پێ دەدۆشن.
- گار: ١-خاوەن: ٢-كات: ٣-زاڵم:٤-قورقوشم.
- گـارام: دارێكـی درێـژە سـەری بـە نەقیزەیـە بـۆ لێخوڕینی وڵاغی جووت و قرشە كێشان بەكاردێت.
- گاڕان: گایەل: گائەل: گاگەل: گاگەلی دێ.





گاڕان بەگردەوە ئاودەبیرد، پیرێژن لەگۆلكە سۆری خۆی دەپرسی.
(پەند)
- گارە: ١-گارەگار: دەنگی مریشكی كورك.
٢-ناوی چیایەكە لەناوچەی بادینان.
٣-ناوی كچانە.
- گارس: گاڕووس: جۆرەگیایەكە وەك جۆ.
- گارگارە: كاریتەی پشتی: بڕبڕەی پشتی.
- گارەگار: گالەگال: مشتومڕ.
- گاریسۆك: تەزرە: تەرزە.
- گاز: ١-ئامرازێكە بزماری پێ دەردێنن:
٢-غاز:
٣-بانگ: ٤-هێز:
٥-پاروو: ٦-بۆ دابڕینی بەری دوورنەیە، سـەرپاڵە هێڵێكی راست دەدوری و قەد و بـەری پـێ دیـاری دەكات بەرەكە جیـاواز دەكاتـەوە لەتەبارەكـە بـۆ دورین.
- گازاندە: لۆمە: عیتاب: گازندە.
- گازەرەی پشت: گارگارە: بڕبڕەی پشت.
- گازەگاز: ١-گازە: ٢-بڵاوبوونەوە.
- گازكردن: ١-بانگكردن: ٢-تێ هەڵكردن.
- گازكەر: هاواركەر.
ئەحمد گازی كرد فاتم. (هونراوە-ل١٧٨)
- گازكەن: بانگ كەن.
هەموو بەیەك دەنگ گازكەن.
هاوار غەوسی بە غدایێ (هۆنراوە- ل٣٠)
- گاز گاز: گازەگاز: هاوار هاوار.

- گازگر: قەپال لێ دەر.
- گـــازگرتن: قـــەپاڵ لێـــدان: قەپارەلێـــدان: قەپگرتن: گەزەلێدان.
- گازلێدان: دابڕینی بەری دوورنـە بـۆ دیـاركردنی قەد و بەری دورنە.
- گازلێدەر: ئەو سەر پاڵەیەی قەد و بـەری دورنـە دیاری دەكا بۆ درونە كردن.
- گازندەر: داواكار: سودەعی.
- گازمالوك: دارێكی بچووكی دوو شاخە دەدرێتـە بەر هەردوو لای فاقی چـۆلەكە گـرتن و دانەكـەی پێوە دەكرێت.
- گازۆر: هێزی سروشتی.
- گازی كەن: بانگی كەن.
- گازیان كەن: بانگیان كەن.
- گازی كرن: بانگ كردن: گازكردن.
- گادڵ: دڵ رەقی.
- گاسك: ١-مقاش: ماشە: ٢-ترۆپك.
- گاسكە: ١-بانكە: ٢-تێ هەڵكە.
- گاســن: گــیس: ئێــسن: گاواســن: گاوەســن: هێسن: گێسن:
ئامرازێكی ئاسنی نووك تیژە لـە سـەری هـەوجار قەیم كراوە و زەوی دەكێڵێ: لەم بەشانە پێك دێت.
١-نـووك: نووكەتیژەكەیـە، ٢-كـووپ: جێگـەی زمانەی ئامووره:
٣-پەڕ: ئەملا و ئەو لای دەمی گاسنەكەیە خـەتی جووت بەرین دەكات.
گاسنی وەسەر دەندەخست و بەرولەی دەشیلە راكرد.

(شەرەف- ل٧١٣)

- گاسنی تەختە: نۆژەن: گورە.

ئاسنەکی خۆشکرایە لەبەشی پشتەوەی لەچەشنی نیوەبازنەیی خوار کراوەتەوە کوپەی گاگاسنی تێدا گیر دەکرێ.

- گاشە: ١-گابەرد: ٢-گێچەل: ٣-موجادەلە.
- گاشەدەم: دەوگەورە.
- گافارە: لانك: بێشکە.
- گاڤ: ١-گاو: گا: کات: گاھ: ٢-زەمان: ٣-ئان:

گاڤا مرۆڤەك داخوازەکی ژنێکی بکت...

(مشتاخ- ل٦)

لەوکاتەدا: ٤-هەنگاو:

هەرگاڤێکی: هەرکاتێك.

- گاڤا: دەمێ: کاتێ.
- گاڤادیی: گاوادیی: پاش کاتێکی تر.
- گاڤان: گاوان.
- گاڤ قەلیش: غەریب: غەریو.
- گاڤیین: نیاز: ویست: ئارەزوو: قوم: دڵ کەوتنە سەر شتێ: حەز لەشتێ بوون.
- گاڤڕ: گاڤران: گاقران:

پەتای گا: نەخۆشی مانگا و چێل.

- گاڤۆر: مانگی کۆتایی پاییز.
- گاکووڤی: گاکێوی: دژی گای ماڵی.
- گا کۆتر: گاپەل.
- گاگا: جارجار: جاربەجار.
- گاگەل: گاران: چێڵ و مانگای بەیەکەوە.
- گاگلدان: تەوێلەی گا.
- گاگۆڕ: گلکۆ: قەبر: قەور.
- گاگۆڵە: گاگۆڵکێ: گاوڵەکێ:

قنگەخشکێ: بەقونەوە رۆیشتن: گامۆلە.

بەگامولکە نەرۆم هەستم بکەومە. (کەشکو-ل٤١)

- گاگێرە: ئەو گایەی لەدەورەی گای بنە دەسۆڕێ و کلۆش ورد دەکات: گاهولە.
- گاگیرە: ئامرازێکی جووتکردنە پارچەدارێکی بچووکەبە نیرەبەسترێتەوە.
- گاڵ: ١-گەلوو: کاریش: کاریس: کزن: رەمدانە: زوراتی سپی: کاڕووش: رەسەدانە: رەشەدانە:

رووەکێکی کشتوکاڵی گەڵاپانە تۆوەکەی خڕ و سپییە لە دەنکی برنج دەچێت، جۆرێکە لە دەغل لە گەنم هەرزانترە قەد و گەڵاکەی دەکرێت بە گەسك.

٢-قۆزاغەی پەمۆ: ٣-گاڵە: قیرەقر.

- گاڵ دان: دنەدان: هاندان.
- گاڵە دان: کلیل دان: داخستن.

دەرکەیان لەسەر گاڵەدان... (شەرەف- ل٧٢٦)

- گاڵە دراو: کلیل دراو: داخراو:

لەدەرگایەکی زەلامی گاڵە دراومان دا.

(مجێور- ل١٩)

- گاڵەپێ کردن: ریسواکردن.
- گاڵەگاڵ: عەربەدە: گارەگار: مشتومڕ: هەراهەرا: هەرەهار.
- گاڵتە: گەپ:جەفەنگ: قەشمەری: گەنجفە.

ئەو گاڵتەی بەهەموو شتێك دێت.

(ئاشتی- ل٢٦)

- گاڵتەپێ کردن: قەشمەری پێ کردن.





- گاڵتە خەنجەر: شەڕەخەنجەری توند.

ئاوڕوەدە، گاڵتە خەنجەر بۆ سەری من و تووە.

(تحفە-٢- ل١٨٤)

- گاڵگاڵ: قسە.
- گام: ١-عیلاقەم کرد: ٢-گای من.
- گامێش: ١-مادەك: ٢-بریتییە لەزۆر خۆر:

٣-زۆر قەبە و گەورە( بەمەجاز).

- گامێشەوان: ئەوکەسەی گامێش بەخێودەکات.
- گامێشی دەریا: جۆرە نەهەنگێکە.
- گامێش قڕان: کاتی ساڵە لە حەوتی نیسان دەست پێ دەکات.
- گامیزە: خەتی حەلەزونی.
- گان: ١-عیلاقەکردن:

٢-عیلاقەمان کرد: گامان.

٣-گای ئێمە: (گان بزربووە).

- گانگاز: ئاسان: هاسان.
- گانگازکردن: ئاسان کردن.
- گانگاوك: مێلاقە.
- گاو: ١-گا: جوانە گای تەمەن (٥)ساڵ: بۆغ گایەکانی لە کوێی بەرەڵا کردەوە...

(حەمەدۆك-١- ل٣٢)

٢-گاتان: ٣-شەقاو: هەنگاو:

٤-ماوە: مودە: ٥-گای ئێوە (گاو هەنە):

- گاوان: گاڤان: گالو:

ئەو کەسەی دەچێتە بەرگاڕانی ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە:

١-لەهەندێ ناوچەدا خەڵکی گوند بەنۆرە هەریەکە رۆژێك دەبێتە گاوان.

٢-یان گاوان دەگیران بۆ ئەوەی بچێتە بەرگاڕان.

٣-گاوان: ناوی کوڕانە.

٤-هۆزێکی کوردە.

٥-دژی سەرچوپی لەشایدا.

دەڵێن: ئەوە شوانە یا گاوانە.

(تحفە-١- ل٢٢٧)

- گاوان گرتن: وەکو شوانی دوو شەرتە؛ واتە ساڵێ دوو کرێی هەیە بەزۆری وا دەبێ شەرتی هاوینان بەدەغلە و شەرتی زستانان بەپارەیە گاوان سەڕباری شەرتی خۆشی کەهەر رەشە ولاغێك ئەندازە دەغل یان پارەیەکی تایبەتی دەوێ داوای نانیش دەکا.
- گاوانە: ١-رەشۆلە: گاوانی.

٢-واتە گاوانی دەکا.

- گاوانی: ١-کۆتایی ریزی شایی کە دژی سەرچۆپییە.

٢-رەشۆلە: ریشۆلە: ٣-کاری گاوان.

- گاوەخان: گاوخان: دۆم.
- گاوە زوان: گیایەکە لە بەهاردا شین دەبێ.
- گاوەس: گاوس:

مەشکەمەشکەی گاوسی

(کابان لەبەر دەفسی).

(هۆنراوە- ل٢٥)

- گاوەسن: گاسن: ئامرازی جووت کردن.
- گاوەناس: مل ئاوسان: ئەسکورد ئەستوربوون.
- گاور: دیان: فەلە: فلە: گەبر: مەسیحی.

لەسەر دینی (عیسا)پێغەمبەر و لەعالەمی گاوردا
(٨) دەرجەی دینی هەیە وەکو ئەمانەی خوارەوە:
١- شماس: وشەیەکی سریانییە بە واتای خادم، مجەوەر.
٢-قسیس: سریانییە واتا پیاوی پیری موبارەکی دینی و خزمەتی کاروباری کلێسا ئەکا.
٣-(اسقف): دەرجەیەکی دینییە لەژوور (قسیس).
٤-مەتران: واتە سەرۆکی کلێسە لەژووری (اسقف) وشەکە لە (میترپیولیس)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە واتاکەی شاری ئەسڵی و شاری بناغەیی.
٥-حاسلیقی: یۆنانیی ئەو (اسقفەی) لەهەموو (اسقفەکان) پێشکەوتووترە.
٦-بتریرک: سەرۆکی هەموو سەرۆکەکانی (اساقفەیە) لە ناوچەیەکی تایبەتیدا لە تایفەکی گاوردا.
٧-(کەردێنال) وشەیەکی لاتینییە واتە پلەی هەرەبەرزی کلێسە.
٨-پاپا: وشەیەکی لاتینییە بەمانا پایەی هەربەرزی عالەمی گاوری و لەو بەرزترنییە.
- گاو گۆتال: مانگا: چێل: چێر.
- گاوگەردون: قوربانی: سەربرینی حەیوان بۆ پێشوازی.
جێژنی شایان گاو و گەردوونی دەوێ خوێنی گەش
و فرمێسکی روونی دەوێ.
(تاریك و روون- ل١٧٩)
خۆکردنە گاووگەردون: قوربانی دان.
گاوگەردونیان دەپێشداکرا.
(شەرەف- ل٧٢٤)

- گاه: گاڤ: گا: گاو: کات: وەخت.
- گاهگاهێ: هەندێ جار.
- گاهێ: جارێ.
- گای: ١- عیلاقەی کرد: ٢- گای ئەو (گای دەبەخشی).
- گایار: جووت: جۆت.
- گایاری: جووتکردن: زەوی کێڵان.
- گای بنە: ١-ئەو گایەی فێری دەکەن لەجیاتی داربنە بچەقێنن بۆ خۆی لە ناوەڕاستی جوخینەکەدا دەسوورێ.
٢-بریتییە لەپیاوی دووڕوو و تێکدەر.
- گای سەرپەر: گای سەرە: دژی گای بنە.
- گایەل: گاران: چەند سەر گولك و مانگا بەیەکەوە.
ئێوارە وەختە گایەك ئەفرۆشێ.
- گپن: شەمولە: بەژن کورت: کورتەبالاّ.
کەمێ کورتە بالاّیە ئەویش نەخشی خودایە.
- گجك: رق: رك: بوغز.
- گجوور: گشت جۆر: هەموو جۆر.
- گجوولە: گوجیلە: توتەڵە: کۆڵە.
دوو گوجیلەی پوزەی پێیە.
دەری تورگ: لەکێیە (هونراوە- ل١٧٤)
- گجی: کراس.
- گچکە: کچکە: بچووك: چووك: بچکۆل: هالی هەرشتێك کە لە خۆ گەورەتر بچووك بێت.
- گچکەڵە: گچکۆکە: کچۆکە: بچکۆڵە: زۆر بچووك.
- گخ: گخە قخ: قخە.





- گدرانە: بەرازی کێوی.
- گدیی گدیی: گدە: وشەی بانگکردنی کارویزن.
- گر: ١-گشت: ٢-گڕ: دڕ: زبر.
٣-خەمبار: حەزین:
٤-کەژ: وەرز: مەوسم
گڕ: ١-بلێسە: ٢-زبر: دڕ.
٣-ددان شاش واش: ٤-دەنگی تەپە.
٥-چاو تاریکبوونی نێرومێ بۆ بەیەك گەیشتن.
٦-دیتنەوە لەیاری چاو شارکێدا.
- گرا: ١- گەورە: ٢-گرد: ٣-گێرا: ٤-گەرا.
- گرانەتا: گرانەتێ: نەخۆشییەکی درمە بەهۆی میکرۆبەوە بلاّو دەبێتەوە، تاو پەیدابوونی پەڵەی سووری لەسەر پێستی لەگەڵ دایە.
- گرتن: کەسێ بگیری.
- گرتی: ١-گیراو: ٢-گیرایێ.
- گرتنی: ١-گرتیانی: ٢-گرتتانی.
- گرد: ١-گر: لاپاڵ: تەپە: گردۆڵکە: گردۆڵك: گووپك: گرا: تەپۆکە: تەپۆڵکە: تەپۆڵە: لەشاخ و چیا نزمترە بارستایەکی هەیە لەدەشتاییەوە هەرگردێك ناوێکی خۆی هەیە لەشوێن و ناوچەی خۆی وەك ئەمانەی خوارەوە:
١-رەنگی گردەکە بوەتە ناوی گردەکە وەك گردەڕەشە، گردەسۆر: گردەسپی: گردە شینە.
٢-جێ نەزرگەی پیاوچاکان بووە و ناوی چاکەکەی وەرگرتووە وەك گردی ئۆمەر مەندان.
٣-ئەوداری لەگردەکەوە شین بووە و بووەتە ناوی گردەکە: - گردی داربەرو: گردی گێوژان.
٤-گردی غەیبەتان: گردێکە لەنزیك شاری کۆیە لەنزیك گۆڕستانی دەروێش خدری، ناوەکە لەوەوە هاتووە کەژن چوونە سەرقەبران لەو گردە دانیشتینە دەستیان بەغەیبەتان کردووە.
٥-چاکێك یان پیاوێك لەسەر ئەوگردە نێژراوە گردەکەی بەناوی لێدراوە وەك:
گردی پیرداودی: گردی مامەیارە.
٦-کارەسات و رووداو ناوسێتر بووەتە ناوی گرد وەك گردی شەهیدان، گردی گزیران، گردی قالەڕەشی.
- گرار: شیو: چێشت.
- گراڤ: دوورگە: جزیرە.
- گراڤە: نیوەدوورگە.
- گران: ١-قورس: سەنگین: نرخدار: گرانمایە: بەهادار: پڕ بەها: هۆگ: ناگۆرە: گرانبەها: بەنرخ: بەسەنگ: بەقیمەت.
٢-لەکێشان بەتەرازوو قورس.
٣-سەنگین: حەلیم: بەرێز: لەسەرخۆ: موحتەرەم: خۆشەویست: مەحبوب: لەبەردڵان: پەیت.
- گڕان: سەختی سەرما.
- گرانایی: قورسایی.
- گرانبار: بارگران.
- گرانجان: گران فرۆش.
- گرانڕوو: بەویقار.
- گرانمێرد: لە هەستانەوە بەزەحمەت.
- گرانی: ١-قاتی: ٢-سەنگینی: بەرێزی.
- گراو: ١-چێشت: ٢-حەپس: ٣-دلّبەر.
- گڕاو: ١-گەناو:

٢-ناوی گوندێکە لە دۆڵی هەنارەی کانییەکی لێیە ئاوەکەی بۆ گەڕی باشە ناوەکەی لەو کانییە وەرگیراوە.

- گراوی: عشق.

گراوی منیان داوە بە کوردێکە کەلاش درێژی شارەزوریە. (تحفە -٢- ل٣٠٠)

- گرپە: ١-گرپە گرپ: ئاوسان.
٢-دەنگی مەشخەڵی ئاگری لەپڕ.
- گرتەك: ١-شقاتە: شەمچە.
٢-زگ ئەستوربوون.
- گرتە کوویا: شێرپەنجە: سەرەتان.
- گرتەمر: قەلادە.
- گرتەیەر: داگیرکردن.
- گرتك: ١-گردۆڵکە: گردك:گردی بچووك:
٢-ناوی گوندێکە لە دۆڵی روستێ.
٣-پارچەیەك لەگۆشت.
- گرتمان: ١-گریمان: ٢-رابردووی گرتنە.
- گرتن: ١-گرتەی: ژێر دەست خستن:
٢-حەبس: ٣-تەقدیر.
- گرتنەمل: ١-لە ئەستۆگرتن.
- گرتنەناو: ئابڵوقە.
- گرتە: گرتن.
- گرتوو: بەندی.
- گرتووخانە: گرتی خانە: حەبس خانە: بەندی خانە: شوێنی بەندکردنی مرۆڤ.
- گرداڤ: دەرد: ئافەت: گرداو.
- گردە: ١- تا: ٢- جوملە: کۆ:
٣-جۆرێکە لە برنج: ٤- خڕکەلەی بچکۆڵە.
- گردەبڕ: لەناوەڕاستدا شکان.
- گردەوەبوون: کۆبوونەوە.
- گردکردنەوە: کۆکردنەوە: خڕکردنەوە.
- گردووکۆ: گردووکۆ.
- گردیی: موجموع: کۆی.
- گردیلە:١-خڕ: ٢-زۆرورد.
- گرزە: ١- قرچۆك:
٢- ناوی گوندێکە لە دۆڵی رۆست.
- گرژ: ١-عەبوس: ٢-دژی خاو.
- گرژبوون: ١- تەشەنوج: گرژهەڵاتن:
٢-تووڕەبوون.

مەجید بەم قسەیە راچڵەکی و گرژبوو.
(غەوارە- ل٦٢)

- گرس: حەزین: غەمبار: مەلوول.
- گرسان: گرسەندن: ئاگرگرتن.
- گرفە: گرفەگرف: ئاوسان.
- گرفت: ئینتەلا: هەرس نەکردن.
- گرفتار: گیرۆدە: پاگیر: تێوەچوو: تووش هاتوو.
- گرك: ١-گەرمایی جەستە:
٢-چەڵتووك.
- گرکاند: پەلك لێ کردنەوە برنج و دانەوێلە: پەلکۆکردن.
- گرکە: ١-گندۆرەی کاڵ و پێ نەگەیشتوو.
٢-نەخۆشییەکی پێستییە، بەزۆری تووشی سپیان دەبێت و پێستەکەی سپیانەکە رەق دەکات و سپیانەکە لە تاو خوراندن دەم لەلەشی خۆی دەدات





بۆ چارەسەرکردنی هەندێ دارکەتووتنیان لەناو ئاو دەکوڵاند و ئاوەکەیان پێدادەکرد.

- گرمە زەوی: زەوی کرێن: زەوییەك گیای لێ شین نەبێ.
- گرگر: ١-گەڕانەوە: (گرگر هاتەوە).
٢-لەشێوەی دەستاڕە بەڵام لەدار دروستدەکرا بۆ چەڵتووك لێ کردنەوە و برنج پەلکۆکردن.
- گرگراف: نیوە دورگە.
- گرگرە: ئامرازی شەغرەیە.
- گرگرتن: بەبن دانەوەی برین و ئاوسان.
- گرگرۆك: عەرەبانە: دووچەرخە.
- گرگن: بەژنە کورت: کورتە باڵا.
- گرماندن: ١-دەنگی هەور: ٢-گرمە.
- گرمەگرم: دەنگی بەقەو.
- گرمژە: گەرمەژنە: گرمژنە: گەرمەژن: گەرمژ: گەرمەژۆ:

نەخۆشییەکە لە ئەنجامی گەرمای زۆرەوە پەیدا دەبێ زیپکەیی ورد لەلەش و دەم و چاو پەیدا دەبێ.

- گرمۆلە: قانگلە.

چووە نێو جێیەکەی و خۆی قانگلە کرد.
(حەمەدۆك -١- ل٢٢)

- گرمۆچە: گرمۆڵە: گرموولە: خڕ.
- گرم و هۆر: گرمەگرم.
- گرنج: گرنج گرنج: گرنجاوی: گرنی.
- گرە: شەرا: هورە: ورە:

بایەکی ناسازی گەرمە لەوەرزی هاوین پەیدادەبێ پەنجا و چوار رۆژ دەوام دەکات میوە و مەرەز وشك دەکات.

- گرنگ: گرینگ.

بیهەوێ نهێنییەکی گرنگ بدرکێنی.
(حەمەدۆك-١- ل٢٨٢)

- گرنك: گەرمای لەش.
- گرەگرێدە: دەم راست و گەورە.
- گرنی: زبر: گرنی گرنی.
- گرێسە: لاواز: لەڕ: دژی: تێر گۆشت.
- گرۆ: گرەو: مەرج.

گرۆی بکەین.

- گرواز: سوورانەوە: گەڕان و سووڕان.
- گروێر: گردەلە: گرۆلە: گرفۆلە: پارچە پەرۆیەکی چوار گۆشەی بچووکە لەژێرهەنگلی کراسی دەبردرێتەوە.
- گرۆفك: کوبە.
- گرۆز: غرۆر: غلور.
- گرۆزبوونەوە: غلۆربوونەوە.
- گرۆڤەر: خڕ: گرد.
- گرۆڤ: نیشانە.
- گرۆڵ: ١-سەی گروو: ٢-تیرێژ.
- گرویف: کون فەیە کون: ماوەیەکی کورت.
- گرووگاڵ: سەرەتای قسە فێربوونی منالێ: دغەوبغە.

(گروگاڵتم کرد بە قسەی خاوێن و چاك).

- گروێ: گرو: گوری: گەڕ.
- گروێ بی: ئاولە: خوریکە: خرویکە.
- گروێتی: گرویی:
١-نەخۆشییەکە تووشی مرۆڤ دەبێ.
٢-نەخۆشییەکە تووشی ئاژەڵ دەبێ.

- گرِوون: گروان: گرواندن.
پێست لێ کردنەوەی ئاژەڵ بەبێ دووپارچە کردن.
(گا گروایە کلکی مایە: واتە کارەکە زۆری نەماوە تەواو بێت). (پەند)
- گرێ: ١-گرە: گرێ دەزوداو.
٢-عەرقەلە: کۆسپ: ٣-یەکەیەکی پێوانە.
- گرێچوو: گرێچك: گرێنچك: مەفسەل.
- گرێدان: بەستان: بەستن: شەتەك.
- گرێژنە: دارە ئەستوورەکەی دەرگا کە لەسەر سیوسیوە دەسورێت.
- گرێکۆرە: ١-گرێ پووچکە: گرێڤوتك: گرێکوێرە
٢- کاری ئالۆز.
علی ئاغا... گرێ کوێرەیەکم هەیە بە دەستی تۆ دەکرێتەوە... (حەمەدۆك- ل٣٠٥)
- گرێل بونەوە: گرۆزبوونەوە: غلۆربوونە.
- گرێن: ئاوسانی خەراپ.
- گرێو: گرەو: گرۆ: مەرج.
- گرێوکردن: گرەوکردن: مەرج کردن.
- گرێوان: گرێوە: گریان.
- گرەو: گرێو: مەرج: گرۆ.
- گرِە: ١-گورِ: بلێسە: شوعلە: مەشخەڵ.
٢-هوورِە: پاسور.
٣-کەسێ ددانی پێشەوەی لەدەرەوە بێ.
- گرەوای: گریان.
- گرپی: زبر: درِ.
- گریان: ١-گـرەوەی: گرەونـای: گرێـوان: گرێـوە: گرەوای: - گری: گرین: گرینای: گریا.

دەمەگری مەگری گریان گرانە
هەرچەند تۆ دەگری ماڵم وێرانە
(پاشان زۆر زۆر دەستی کردە گریان)
(حەمەدۆك -١- ل١٥)
٢-بریتییە لەخەم و پەژارە.
- گریشمە: ئیشارەت.
- گریمان: دامانا.
- گرینۆك: ئەو کەسەی زوو دەگرێ.
- گز: بوختان.
- گزاڤ: حەسوود: رژد.
- گزە: ١-گێسك: ٢-گرژی: فێڵ.
- گززەگز: گززە: دەنگی سوتانی ئێسك و گۆشت.
- گزەون: فێڵ باز: گزی کار.
- گزر: داری کۆکراوە.
- گزرك: گرکەتال.
- گزك: گێسك.
- گزی کردن: ١-فێڵ کردن:
٢-هەڵمات پاراستن لەیاری هەڵماتێن کە نەکوژرێ.
- گزگزای: دۆ یان ماست مابێتەوە لە بەرهەتاو رەنگ گۆڕاوبێ.
مەمکت دۆدانەی دۆیە
دۆی لەناو گزگزایە
- گزنی: ١-درۆ:
٢-ناوی گوندێکە.
- گزۆریی: تەمام: تەواو.
- گزیی: ١-گێسك: ٢-غەش: فێڵ.
- گزین: غلور.





- گـزینگ: گـزەنگ: گـەزەنگ: یەکـەم تیـشکی هەتاوی بەیانی.
- گژ: ١-نیزاع: ٢-فتنە: ٣-خەریك.
لەگژ: مەشغول: بەگژداهاتن: بەرنگاربوون.
- گژك: تەزرە.
- گژمراندن: وردکرن.
- گژوگیا: گیاوگۆل.
- گژوویژ: خەریك.
- گسك: گێسك.
- گسکە: خەندە: بزە: زەردە.
- گشت: ١-گ: گش: هەموو: ٢- ئەنگوتك.
- گشکە: چەمۆڵە.
- گفت: بەڵێن.
- گفتار: قسە.
- گفتوگۆ: ئاخافتن.
- گفت دان: بەڵێن دان.
- گڤە: دەنگی با.
- گڤەگڤ: گڤەگڤ: دەنگی بابەدوای یەك.
- گڤن: عەبوس.
- گڤنی: عەبوسی.
- گل: ١-ئێش: ٢-یەکجار: ٣-مردن:
٤- چاو هێشان.
٥-عەشیرەتێکی کوردە لەکەرکووك.
- گل دانەوە: ١-رەتکردنەوە: گێرانەوە.
- گلّ: خۆڵ: خۆر.
- گلادە: قەریتەی ملی ماین.
- گلار: دەنکی ترێ: قلی ترێ.

- گلارە: گلارك: گلارکە: گلێنەی چاو: کەنیشکی چاو.
- گلاراو: ماندووبوون.
- گلاربوونەوە: غلوربوونەوە.
روبەنەمان گلاربوونەوە (شەرەف- ل٢٦١)
- گلاڵە: ئامادە: گەلاڵە.
- گلکێش: ئەو کەسەی گل دەکێشێتەوە.
- گلکن: گەلەکن: زۆرن.
- گلان: پەرِین.
- گلە:١-شەکوا: ٢- دەنکەترێ: ٣-شتی جوان لە زمانی منالان.
- گلە خانێ: ١-گلجان: ٢-گوفەك.
- گلەسەر: جۆرەخولێکە ژنـان لـە سـەری دەنـێن دەڵێن بۆ ژانە سەر باشە.
- گلمەند: شکاتکەر.
- گلەیی: گلە: گازاندە.
برا لەسەرکێت هەیە، ئەو ناز و گلەییە.
(تحفە-٢-ل٣٢)
- گلەیی کردن: گازاندەکردن.
(گلەیی مەکە لەبێ دەماخیم
گلەیت هەقە نووری بیناییم)
(مەلۆ- ل١٨٣)
- گلەرەش: خۆڵی رەش.
- گلەرِەشی نەزۆك: ئەو گلەرِەشەی لەسواخ کردن یەکتری ناگرێ و توند نابێ بۆ سواخ کردن باش نییە
- گلەسپی: جۆرێکە لەگەل بۆ ناومال سپی کردن بەکار دێت.

- گله سۆر: ڕەنگی سۆرە بۆ دیـوار دروسـتکردن و سواغی سەربان بەکاردێ.
- گلته و فلّته: دەسیسە: قسەی بێ مانا.
- گلخواردن: گەڕانەوە.
- گلدانەوە: ١-خڕکردنەوە: ٢-قبوول: ٣-حەبس.
- گلگیر: سەرەند: سەرەن: کەو.
- گلك: پەنجە: ئەنگوست.
- گلکەند: گلەجان: گلێنجان: گلنجان.
- گلکۆ: قەبر: گۆڕ: قەور:

جگە لە قەبری نایب هیچ گلکۆیـەکی دیکـەی لێ نەبێ.

(حەمەدۆك- ل٣٤٢)

- گلمت: کلۆ.
- گلمتە شەکر: کلۆر شەکر.
- گلواز: گروازە: قژن.
- گلەوزە: قەوزەی سەربەرد: قەوزەی گوێسەبانە، ڕووەکێکی سەرەتایی ساکارە لەسەربەرد و دیوار و تـوێکلی درەخـت دەڕوێـت بـەرگری گۆڕانـەکانی سروشت دەکات.
- گلوان: گروان: جۆرێکە لەبەری مازوو.
- گلۆر: ١-ئەنگوتك: ٢-غلور.
- گلولّە: گرۆلە: ١-خوری ریسراو.

٢-پلیتەی رێسراو.

- (گلۆلّەت کەوتەلێژی کەس چاکت پێ نایژی).

(پەند)

- گلوو: گلە: دەنکەترێ.
- گلووك: کوریك: گوڵی بەهاران.
- گلوول: قەلەو.
- گلویی: گەرو.
- گلە: گلەیی.
- گلیاس: گێلاس: گەلاس.
- گلیر: غلور: باغر: لەخۆبایی.
- گلێران: گلور بوونەوە.
- گلێنە کاری: گلێنە دروستکردن: قورکاری.
- گلّێنە: ئەو دەفرە هەڵسووراو و هەڵنەسـووراوانە دەگرێتەوە لە قور دروستدەکرێت.
- گلێنە: ١-ڕەشایی چاو: گلیسك.

هەرتك گلێنەی هەڵکۆلن.

(شەرەف- ل٧٢٩)

- گلێنجان: گلنجان: گلکەند:

شوێنی گلی لێ دەبردرێ.

- گلیرە: وردەبەفری پێش بەفربارین.
- گلین: گلەیی.
- گم: گمە گم: دەنگی کۆتر.
- گمەگم: ١-گم: ٢- گازاندە: پۆرەپۆر.
- گن: منگن.

ئـەو کەسـەی قـسەی بـاش دەرناکـاو وا بـەدیار دەکەوێ کە قسەکە لەکەپووی داماوە.

- گنج: پیسی جلك: قرێژی جل.
- گنجاوی: گنج گنج.
- گنجی: تیسکە خوریەکە لەژێر دوونگ و ئەملاو ئەولای پاشەلی سپیان ڕیخی پێوە وشـك دەبێتـەوە ئەمە پێی دەوترێ وردە گنجی.
- گنخ: بۆگەنی.





- گنخـــان: گلخـــان: ١-کەلوپـــەلی تـــەڕی لەژووردامای هەتاوی لێ نـەدابێ دەڵـێن گنخـان: ٢-خافلاندن

بێ خۆ - گنخانـدن (خافلانـدن) بیبـە نـە ئەوبـەر ڕووبارەکە- (بۆرە-ل٥٦)

گنـــدۆرە: کاڵـــەك: گونـــدۆر: خرپـــزە: خـــەربزە بەتۆدەچێنرێ وەرزییە.

هەتا گندۆر، گندۆربوو خزمی مە گەلـەك زۆربـوو گندۆر هاتە بڕانێ، خزم هاتە قڕانێ.

خەربزە بەرەنگ نییە. (مجێور-ل٥٦٨)

- گندۆش: سووژن: کنۆژ.
- گۆ: ١-خڕ: ٢-گێ: ٣-چیلچیلەی حەمل.
- گۆبەرۆك: خشلێکی ژنانـە لـە لێـواری مـەمك سوخمە دەدوورن کە زریزەیەکە و ٠,٩٧م درێژە.
- گۆبەنك: فەوزا: هەرا.
- گۆبـەن: گۆبەنـد: ١-کـەیف: بـەزم: ٢-ڕووداو. ٣- کێشە.
- گۆبەخانە: مەلها.
- گۆپال: ١- گۆچان: عاسا: چۆماخ: گۆپار: چەوگان: کوپال دەستی دا گۆچانی ملی لەبیابانی ناوە.

(تحفە- ل٧١)

ئەو کانییەکەی لەکەنداری
بەخۆم لێدا بە گۆپاری. (هونراوە- ل٢٠٧)

٢-ئاوی گوندێکە لەبەڕانەتی.

- گۆپکە: گۆپیتە: ١-خونچە: شکۆفە: ٢-چرۆ.

هەندێکیان بەریان گۆپکەی کردبوو.

(دم دم- ل٢٥)

- گۆت: گۆد: گۆج.
- گوتار: وتار.
- گوهدار: گوێ گر.
- گۆتە: ١-چیرۆك: ٢-گوێتە: گوتیە: پێی گوت.
- گۆتـەگۆت: ١-دۆرودەنـگ: دمگـۆ: پروپاگەنـدە: شایعە.٢-دمەدم: دەمەقالێ: منگەمنگ: پرتەوبۆڵە.
- گۆترە: ١- بێ کێشان:

٢- بێ ژماردن: ٣-هەرەمەکی.

- گۆتن: کوتن: وتن: گوهتن: بێژان: گوتن.

حەشیمە تەکە بەهەژانێکەوە گوتیان.

(حەمەدۆك -٢- ل٣٧١)

- گۆج: شەل.
- گۆجی: شەلی.
- گۆچ: گۆ: گوێی.
- گۆچەر: کۆچەر.
- گۆد: گۆت: تەزینی ئەنـدامی لـەش، سـڕبوونی ئەندامی لەش.
- گۆدراز: کەر: گوێ درێژ.
- گۆر: ١-ڕاو: ٢-کەری وەحشی: ٣-قوربانی.
- گۆڕ: ١-قەبر: ٢-تۆلە: ٣-ڕاستایی زەوی. ٤-تەختایی سەر شاخ.
- گۆران: ١-بەشێکە لە چوار بەشی کورد. ٢-چەتە: ڕێگر: ٣-نازناوی شاعیری گەورەی کورد عبداللە گۆران: ٤-ناوی کوڕانی کوردییە.
- گۆڕاندن: گۆڕین: تەبدیل.
- گـۆرانی: مقـام: قـام: مـەقام: نقـام: موقـام: ئیستران: ستران: قەید: گۆرانی: هونەرێکە و بنکـە

و فەلسەفەی خۆی هەیە و جۆرێکە لەجۆرەکانی هەڵچوون و داچوونی مرۆڤ، چ بە وشە و رستە، چ بە هەست و خوست و نەست و چ بە خەون و ئاوات و ئازار و گرفت و سۆزی مرۆڤانەوە بێت و بریتییە لە: کۆمەڵە ئاوازێ کەلەسەر بناغەی پلە و پەردەی دەنگ پێك دێ و خراوەتە نێو قالبی یەك ئاوازەوە، جالە شێوەی مەقام دابێ یابەستە.

دەستی بەموقامان کرد داوەتی گێڕا.

(تحفە-٢- ل٢٥٤)

- گۆرانیبێژ: ئاواز خوان: ئستران بێژ: ستران وان: ستران بێژ: گۆرانی چڕ: گۆیندە.

- گۆرانی کوردی: هەوا و هۆنراوەیەکی بێ خاوەن و کەسنەزانن لە نێوخەڵکی ساکار و نەخوێندەواردا، لە رۆژگارێکی رابردوو دانراون و داهێزاون تەواو بە ئیمرۆی ئێمە گەیشتوون بوون بە گۆرانی لەگەڵ باویان و ناویان نامرێ هی هەموو خەڵکی کوردستانن گەنجینەیەکی گەورەی پڕ لە (هونەریی ئاواز)ە گرنگیان بووە لەپێکهێنانی ئەم گەنجینەیە پڕ گەوهەرەی هونەر و هۆنراوەی کوردی.

- گۆرانی ئافرەت: بریتییە لەو گۆرانییانەی کە ئافرەت دەیڵێن، بەزۆری مەقامە خەمناکەکان و لاواندنەوە و بالۆرەبوون.

- گۆرانی ئاهەنگ: ئەو بەستە بە جۆش و پڕ خرۆش خۆشانەن کە: ١- شادی و دڵخۆش: ٢-شەکراو و شرینی و خەنەبەندان: ٣-شەوارە: ٤-لەشایی (بووکانەدا): ٥-گۆوەند و داوەت: ٦-خەتەنە سووران: ٧-بەزم و رەزمدا دەوترێت لەگەڵ چەپڵە و سوڕوسەما و لەرزین و هەڵپەرکێ و رەشبەلەك و داکۆك دەکرێت کە ئاوازی ئەو بەستانەن سامانکار و چەپڵە ئامێز و خاوەن رەزمی گورج و خێوان و کە خەمپەرین شادی هێن.

- گۆرانی ئاینی: بەر لەئاینی ئیسلام و بەر لەوەی کورد موسڵمان بووبێ کورد گۆرانی تایبەتی خۆی هەبووە بۆ پیاهەڵدان و رێزلێنانی (ئاهورامەزدا) ئاگر و خۆر و رووناکی و.. هتد، لەو دەمەشەوە کورد چووەتەژێر ئاڵای ئیسلامەوە ئاوازی جۆراوجۆری ئایینی بەزمانی خۆی داناوە لەشێوەی پیا هەڵدان بەشان و شکۆی یەزدانی مەزن و دەربڕینی رێز و خۆشەویستی بەرامبەر پێغەمبەر(د.خ) هتد.

- گۆرانی چەمەری: بریتییە لەو گۆرانییانەی کەلە دەمەی کۆست و کارەساتدا دەوترێت خەماوی و تەماوین داماوییان تێدایە کە لەگەڵ شین و شەپۆر هاودەنگ دەکرێن کەکۆتەل کردن و (لاواندنەوە) گڕی گریان و خەمەکە زیاتر هەڵدەگیرسێنن لەئاوازی بەیتی (ئەستی و بەخدان) دا بەسۆزترین و خەماوی ترین هەستی کۆست کەوتوو و ئازیز مردووی تێدایە.

- گۆرانی جووتیار: ئەو ئاوازانەن کە رەنجبەر لە کاتی کارکردنی زەوی کێلان و درونە و گیشەدانان و گێرە و مازوو چنین و دێراو لێدان دەوترێت کە ئیقاعی ئاواز و هەوا و بەستەکان لەگەڵ باری





ژیان و گوزەران و کاری رۆژانەیاندا کۆکن و دەگونجێن ئەرك و ئازار و خەم و ماندوویێتی خۆیان پێ دەرەوێننەوە.

- گۆرانی دورنەی بەکرەیی: ئەو گۆرانییانەن کە شێوەیەکی رێکیان هەبوو کە لەگەڵ دەنگ و سەدا و غرینگەی داس و زرەی پۆیلەکانی قەیناغ و شێوەی وەشاندنی داسی سەپانەکان بۆ ناخی تەبارەوە خۆ وەرگێڕانی سەپان بەلای راست و چەپدا دەگونجا.

هەدرونە درونە وەی وەی دەسکێ داسی بەرونە

- گۆرانی جەنگ و جوامێری: ئەو ئاوازانەن کە بۆ پیا هەڵدانی خاك و پارێزگاری کردنی دانراون بۆ دلاوەر و سەردار و پاڵەوانەکان خۆیان بەخت کردووە ئازایەتی و هونەری خۆیان لەمەیدانی جەنگدا نواندووە لەو گۆرانییانەدا باسی شەڕانگێز و شۆڕە سواری تێدایە.

- گۆرانی شوان: لقێکی کۆنە لە فۆلکلۆری گەلاندا و لەگۆرانی کوردیدا زۆرلە (بەستەو) (بەیت) مەقامەکان زادەی بیروبەرهەمی قورگ و پەنجەی شوانن، زۆرلەئاوازە کۆنەکانمان بەیات و سێگا و کە ئەم مەقامانە لەگەرووی شمشاڵی شوانەوە زۆر بەسۆز دەردێن لەو دەمەی مەڕ لەبێردان و هاوێر و ران لەوەڕاندن و مێگەل و بەرخەل بەخێوکردن.

- گۆرانی گەپ و گەمێك: چ ئاوازەکان و چ هۆنراوەکانی بۆ پێکەنین و برێکیان تەشەر ئامێزن.

- گۆرانی ڕاو: هۆنراوە و هەوای خۆی هەیە لە راباوردن و راوی ئاژەڵ و پەلەوەر و ماسی دەوترێن.

گۆرانی منالآن: ئەو ئاوازە سادە و سووکانەن کە منداڵان (سەرپێیی) بۆ یارییەکانی خۆیان کە لەهەڵبەستی تایبەتییان هەیە دایان ناوە هەروەك هەڵبەستەکان سادە و سانانان بەو شێوەیە ئاوازی گۆرانییەکان (کەم کورتە تەنیا لە چەند نەغمەیەك پێکهاتووە کە (ئیقاع=رەزم)ێکی خێرا و خۆشیان بۆ راگرتنی کێشی هەواکە.

- گۆرت: قەبری گاوران.

- گۆڕەپان: راستایی: ساکەگۆڕ: گۆڕەسات.

لەگۆڕەپانی نێودێ دا بەرۆکی گرت .

(حەمەدۆك -١- ل٥٢٤)

- گۆڕخانە: گۆڕستان: گۆڕسان.

بۆنی گۆڕخانەی لێ دێ جێ ژوان.

- گۆرڤ: گۆریە: گۆریی.

- گوردیی: ١-قوەت: هێز: ٢-گۆل.

- گۆردیی: رەشانە گوێی گەورە، بەلآم وشەی گۆردی لەگەڵ رەنگەکانی دێ وەك گۆردی پۆش.

- گورك: گۆڕکە: ئاگردان.

- گۆڕگان: جنێوە بە مرۆ دەدرێت.

فەرخ گوتی "لەوەی پتر بێتە پێشێ گۆڕی بابی دەگێم".

(تحفە -٢- ل٩٣)

- گۆرم: دش: خوشکی مێرد.

- گۆڕهەلقەندن: قەبرلێدان.

- گۆڕهەلکەن: قەبر لێ دەر.

- گۆڕهەلقەنە: گۆرەوێرك: دەعبایەکە لەچەشنی جورجە کۆرەیە و گەورەترە دەچێتە ناو قەبر و

كونى گەورەى تێدايە هەڵدەقـەنێ بـە ئـاو بـارانى
قەبرەكە وێران دەبێت.
- گورپى: ١-قوربانى.
٢-ئەزگورِى تە: ئەمن بەقوربانى تۆم.
- گۆرمزە: گيايەكە لەبەهارا دەروێ گوڵێك دەكات
رەنگى زەردە دەخورێ بۆ مێشك حەسانەوە باشە.
- گۆريـان: گـۆڕان: لـە دۆخێكـەوە گـۆڕان بـۆ
دۆخێكى تر.
- گۆريـە: گۆرڤـا: گـۆروا: گـۆريى: گـۆرە:
گۆرەوى: گۆرڤ: گۆرەبى: گۆريا: گورمى:
پێپۆشێكە لەبەن وەيان لـەداوى تايبـەتى دروست
دەكرێت و لەگەڵ پێلاو لەپێ دەكرێت.
دەستيان دەكرد بە چێشت لێ نان و گۆرەوى چنين.
(حەمەدۆك -١- ل٤٨٧)
- گۆريچنە: گۆرەويى چنە: جۆرە باڵندەيەكە.
- گۆرين: تاين: ناوبراو: گۆرين: گۆهرين.
شارۆستەمى گۆرِيينش لە خۆ گۆرين وازى هێنا.
(شەرەف- ل١٠٨)
- گۆرِين: گوريان.
- گۆرە: ١-گۆلك: ٢-شار.
- گۆرەبەند: گۆرەوى بەند: گۆرەوبەند: بەندى گۆرەوى.
- گۆرەكە: گۆلك: گوێرەكە.
- گۆرەلەوان: گۆلكەوان: گۆرەوان: شوانى گۆلكان.
- گۆزانەوە: گوێزانـەوە: گواسـتنەوە: گواسـتنەوە:
رۆيشتن لەشوێنێك بۆ شوێنێكى تر.
- گۆزە: گۆز.

بە قەبارە لە نيمە سەرەگەورەترە لـە قـور دروست
ئەكرێت لە بنەوە تەسكە لە ناوەراسـتەوە فرەوانـە
تـا دێـت بـە لاى سـەرەكەيەوە تەسـك و باريـك
دەبێتەوە لەلاى دەميەوە قولفايەكى هەيە بـۆ ئـاو
هێنان بەكاردێت.
دەستى دا گۆزان، گوتى عاجزم دەچمە سەراوێ.
(تحفە-٢- ل٩٨)
- گۆزەبانە: گوێزەبانە.
- گۆزەڵە: گۆسكە: گۆزكە: گۆزەيەك بە قەبارە زۆر
بچووك بێت.
گۆزەڵە ئاوەكەى لە دايكى وەرگرت.
(حەمەدۆك -١- ل٥٧)
- گۆزەگەر: ١-گۆزەكە: گۆزەچى:
ئەوكەسەى گۆزە دروستدەكات.
٢-دەبێتە لەقەبى گۆزەكەر.
- گۆزەهەنگ: شانەى مێش هەنگوين.
- گۆزەك: پەلكى پەموو: قۆزاخە.
- گۆزيانەوە: گواستيانەوە.
- گۆزينگ: گۆزنگ: گوێزنگ:
كۆتايى بەلەكى ئادەميزاد.
لمبۆزى گەياندبووە سەر گوێزينگى.
(حەمەدۆك- ل٥٦)
- گۆژگيرە: باليف: گۆشگيرە: سەرين: پشتو.
- گۆستنەوە: گواستنەوە: راگوێزان.
- گۆسرمە: كارەسات: رووداو.
- گۆش: گۆيى: ئامرازى بيستن.





ئاوە و گۆشيش دا: ئاوى گوێ دا.
(ئيديوم- ل٢١)
- گۆشاوگۆش: لەگوێوە بۆگوێ.
گۆشاوگۆش سەرى دەبڕى. (خاك-١-ل٩٤)
- گۆشە: كوشە: قوژبن: سوچ.
- گۆشەگير: گۆشە نشين: كەنارەگر.
چۆلبر: پەناگير: تەريك: دەركەنار: كپ: كلا: دەمگر.
- گۆشپارە: گۆشەوارە: گوارە:
خشلى ژنانە لەزێر يـان لـەزيو دروسـتدەكرێت لـە
گوێى دەكەن.
- گۆشت: هێت.
(گۆشتى ناخوا، گۆشتاوى دەخوا). (پەند)
(گۆشتى بۆتۆ، ئێسقانى بۆ من). (پەند)
- گۆشتاو: چەلاو: چەلاو.
(كوێشكە خۆى چييە و گۆشتاوى چييە.) (پەند)
- گۆشتال: ئێسك گران.
- گۆفل: ئەو كەسـەى مـەرەزەى خـاوەن مـەرەزە
زۆرەكان بەخێودەكات.
- گۆڤ: هۆڵى مەرێ.
- گۆڤار: كوڤار: مجەلە.
- گۆڤەند: گۆوەند: شايى: شاهى: هەڵپەركێ
گۆوەندە زەماوەند.
- گۆگـەم: گيايـەكى بـەرزە گـوڵى زەرد دەكـا و
وشكەڵى بۆ ئاوردوو دەبێ.
چەندم گازكرى لەبنكى گۆمان. (حەيران)
- گۆ گرد: ١-كبريت: ٢-شقاتە.
- گۆنگەل: گێچەل: كێشە و هەرا:

بەسەر هاتێ چاوەروان نەكراو.
- گـۆل: حـەوز: گـۆلاو: ئەسـتێر: چـاڵ: رڤكـە:
مەهسەر: پەنگاو: ٢-نێرەى سەگ گەمال:
٣-خێرا: ٤-نەخۆشييەكە لە زمانى چێڵ دێت.
- گۆڵەبارگين: بارگينى خراب.
حەيفە بۆ ماينى كەحلان سوارى بێ گوڵە بارگين.
- گۆڵە سەك: گەماڵ: گەمبۆل: گاورە: گۆل.
پێـنج گۆلەتـەگ پـەلامارى ئـەو توكگەچـكۆلە لـە
دەدەن. (ل٤٥٥)
- گۆلك: گوسال: گوێرەكە: گوێلك: گوێر: كوويك
بيچوى چێڵ تەمەنى لە (٦) مانگ زياتر بێت.
زۆريان مانگا و گوێرە كەشيان سووتاون.
(حەمەدۆك -١- ل٣٥٩)
- گۆلكەوان: شوانى گۆلكان: گولكڤان.
- گۆلكى شيرە خۆرە: بێچوى چـێڵى تـازە زاو تـا
شەش مانگى بەسەر تێ پەربێت.
- گۆلكى هەراش: (تەمەنى لە ساڵێك زياتربێت).
- گۆڵم: لامەشت: لاگوێل:
رووى لادەستێكە بە وێك هێنانەوە وەكو رژكردنەوە.
- گولێينە: ١-كونى ژێـرەوەى تەنـدور: ٢-كـونى
لاى خوارەوەى كەندو دانى لێ دەردەهێنرێ.
- گولێژە: موشكيلە: ئاريش.
- گۆلى گولى: وشەى بانگ كردن گوێرەكە.
- گۆميلكە: گۆمى بچووك.
- گۆم: ١-ئەستێرك: گۆماو.
شوێنێك نەورايى بێ و ئاوى لێ راوەستابێ.

٢-شوێنێك گلەكەی بردرابێ شوێنەكەی بەقۆری دەمێنێتەوە ئاوی باران یان ئاوی تری لێ كۆدەبێتەوە.
٣-هەرگۆمێك ناوی جوگرافی خۆی هەیە:
(گۆمەگرِو، گۆمە تاڵ، گۆمەشین).
- گۆن: رەنگ: لەون.
- گۆنا: گۆنە: كۆڵف: كولِم: خرِی سەر رроومەت.
- گۆنائاڵ: گۆنای سوور و سپی و جوان.
چاوكاڵ گۆنا ئاڵ بۆم وەرەدەركێ رەشماڵ.
- گۆناسیس: گۆنای مرۆڤی لاواز و ناشیرین.
- گۆنا گۆن: رەنگاورِەنگ: جۆراوجۆر.
- گۆنە: ١-گۆنا: ٢-رەگ: ٣-بێ دەنگ: كرِ.
- گۆنەر: وەرز: كەژ.
- گۆنەری جوانی: هەرِەتی لاوی: تۆغیان.
- گۆنەڵ: كۆنەر.
- گۆنج: رەگ: رێ: بێخ.
- گۆنگەل: ١-فس: كەژ: ٢-هەرِەت:
٣-خەتەر: ٤-پیلان.
- گۆنگرە: كەلو: بورج.
- گۆوان: گوان: بلِ بوون.
- گۆهتن: گوتە.
- گۆیا: گوایا: گوایە.
(گوایە: جارێك عارەبە سوارێك...)
(شەرەف-ل٣٢٨)
- گۆیژ: گۆشك.
- گۆیش: لەهجە: زار: شێوە.
- گۆیی: ١-خرِی: ٢-عەشیرەتێكی كوردە.

- گۆی مەمك: شاقوت: چلِی مەمك: چیچە: چیچیلە.
- گوو: پیسایی: گی.
ئەو هەتیوی كون بە گۆووچیە بەملان دەگێری؟
(تحفە-٢- ل٩٨)
- گوازنامە: لیستی گواستنەوە.
- گوارە: گۆشپارە: گۆشەوارە: گۆشوارە: گوهار.
- گوان: گواندێن.
- گواو: گوئاو.
- گووپ: گۆنا.
گووپی پرِ لە ئاودەكرد بەسەروچاویدا دەكرد..
(گێلە- ل١٠)
- گووچك: گوێی.
- گووراسن: گوئاسن.
- گوورت: شخاتە: شقالتە: شقارتە: شەمچە.
- گووزان: گوێزان: ١-چەقۆی سەرتاش:٢-مووس.
- گوژاڵك: گووژك: زەرەند: خەیاری دێمی: كاڵە كەمارانە: گوژاك: گێژەڵۆك: كوژارك.
زەرەنگ: گوندەمنە: ژووژالك: تاڵكە: كەكرە: رووەكێكی خشۆكی بەهاری سالآنەیە لەبرِكی شووتی دەچێت بەرەكەی بەقەدەر شەمامەیەك بێت سەوزی خەت خەتە بەكاڵی وەكە گەیشت وەك شەمامە زەرد دەبێت زۆر تاڵە بۆ دەرمان بەكاردێ.
- گووفەك: زبڵخانە: خەرابە: مەزبەلە: سەرانگویلك.
- گووفتوگۆ: گفتوگۆ: وتووێژ:
- گوولی: خشل: چەك: زێر و زیو و مۆریو مەرجان





گەلەكی چەك و زێر بەخۆوە نەكا نەوەك لەشایێ چۆكی بچەمی.
(حەیران)
- گوولیفك: چەكی ژنان: گوولی خشڵی ژنانە.
- گووێ: ١-گۆ: گێ: گوێچكە: گوش: گێچووك: گوچك: گووش: گوه: گۆ ه:
ئەندامێكە لە یەكێك لە پێنج ئەندامە هەستیارەكانی بوونەوەر، ئامرازی بیستنە.
كە ئەمەی بە گۆێی خۆی لێ بیست.
(غەوارە- ل٦٢)
دەروێش... گوێت بێنە پێش.
(حەمەدۆك -١- ل٤١٩)
٢-گوێ بە مەجازە وەك ئەمانەی خوارەوە مانا ئەبەخشێ.
١-گووێی راكێشا: بریتییە لە تەمبێ كردن.
٢-گوێ برِین: بریتییە لەهەتك كردن.
- گوێدان: گوێ گرتن.
گوێ گرە لەوبەرزەكەو بارِ ئەخوێنی.
(مەلۆ- ل١٨٢)
- گوێ نەدان: ١-گوێ نەدان: ٢-ئیهمال.
- گوێ لێ بوون: گووێ دان: بیستن.
- گوێ براو: گۆبرِای: كەسێ گوێ برِابێ.
- گوێدەر: گوێ دێر: مل كەچ: گوێرایەڵ: گۆرایەل: گوێدێر: گەردەن كەچ: مل كەچ.
- گوێرایەلی: ملكەچی: بەفەرمان.
- گوێ رەپە: گودێرەپانە.
- گوێرەكە: گۆلك.

- گوێ هەڵخستن: گوێی راگرتن.
دەچمە لای چوكوراو، نەختێك گوێ هەڵدەخەم و دوایە دێمەوە. (حەمەدۆك -٢- ل٣١٢)
- گوێز: گووز: گیز: گردەكان: جووز: وەزیی: گێز: گۆز: وەز: جیز: گوویز:
درەختێكی گەورەیە نزیكەی (٢٥م) بەرز دەبێتەوە گەڵاكەی دەوەرێت لەناوچەی بەرز و سارد دەروێت بەرەكەی گوێزە و بەنرخە لە خواردندا، چونكە چەوری و پرۆتینی تێدایە، تەختەكەی دارگوێز بەنرخە، كەل و پەلی ناومالی لێ دروستدەكرێت، چونكە زۆر قایمە دارەكەشی بەبەرەكەیەوە دەناسرێت بەناوی (دارگێز)
گوێزی لەباری خۆی دەژمێری، گوزی لەهەمبانەی خۆی دەژمێری.
- گوێزان: ئامرازی ریش تاشین.
- گوێزانەوە: گواستنەوە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنك بردن.
- گوێزینگ: گۆزینك: سەرەوەی پێ.
- گوێی سووك: دژی گوێی گران كەسێ زوو هەست بە قسە بكات.
- گوێگر:گۆگر: ١-مل كەچ: ٢-گویەر: گوێدێر: بیستەر: گوێ راگر.
- گوێی گران: كەرِ: گۆگران: بێ گوێی: كەهیر: نەژنەوا: كرووس: كرێل.
كەسێك بەدرەنگی گوێی لێ بێت.
- گوێلاك: گۆلاك: لەگەڵ سەر دەگوترێ واتە روخسار.

- گوێلك: گوێرەکە.
- گوارە: گوارە: گۆشوارە: خشڵی ژنانە.

ئامینێ گوارەکانت مەلەگێنە.

(مەلۆ- ل٥٧)

- گۆتمێ: پێم گوت: پێم وت.
- گـوتی: نـاوی کـۆنی شـاخی ئـارارات بـووە:

٢-ناوی چەند هۆزێکە کە بە ناوی کۆنی شـاخی ئاراراتەوە نراوە

- گوڕ:١-هێز: ٢-خێرا: ٣-هەڕەت:

٤-بڵێسە: کلپە: گلپە.

- گوجیلە: گجولە: تولە: بیچوی سەگ و تاژی

گوجیلە سەگ: گجولە سەگ.

- گوراج: روخسار: رەنگ روو.
- گوراج خۆش: روخسار خۆش.
- گوراز: بەراز.
- گوڕاکردن: بەگوێ کردن: بەقسە کردن.
- گـوڕە: گوڕەگـوڕ: هـاوار هـاوار: گوڕەشـە: هەڕەشە: گەڤ.
- گوڕاندن: هاوارکردن:

نایب گوڕاندی. (حەمەدۆك -١- ل٥٦)

- گوربز: چەپوك: چالاك.
- گوربە: پشیلە.
- گورت: شقاتە.
- گورج: ١-چالاك: گوربز.

زۆر گورج و گۆلانە دەوی میری خۆیان گرت..

(شەرەف- ل٢٨٦)

٢-دژی خاو.

- گورچـەوێلە: گورچـوو: گورچـیلە: گورچـیلك: کلیە: گورچك.

ئامرازێکی گرنگی بوونەوەرە.

- گورد: ١-کورد: ٢-ئازا: ٣-ناوی کوڕانە:

٤-چینی پشتەوەی رایەڵی چنین.

- گورزە: چەپکی گەورە لە گیا و گوڵ.
- گورزك: باقەکی کچکە.
- گورك: گور: وەرگ: گۆر: گۆریی: کاتە: گورگ جانـەوەرێکی زۆر گـورج و گـۆل و زۆر چـاوقایم و نەترسە گەورە و بـچووکی هەیـە وەك سـەگ وایـە گورگی گەورە و بلندی یـەك مـەترە بـەبێ درێـژی یەکەی (٢م)، بەڵام گـورگی بـچووك بلنـدی ٢/١م کلی (٥٠-٦٠)سم رەنگی لەشی زۆر جـۆرە (بـۆز، رەش، سوور، بەڵام زۆریان (بۆرە) لەمانگی شۆبات بـــەبادێت (٧٧-٧٩) رۆژ دەترەکێــــت (٧-٨) بەچکەی دەبێ بەشیری مەمکی تا (٤٠) رۆژ هـەر شیردەخۆن گەرمیان و کوێستان دەکات .

(لەوانەشە گورگ خواردبێتی).

(حەمەدۆك- ل٣٦)

تۆبە و وەرگی مەرگا.

(ئیدیۆم- ل١٠٨)

- گورگ خنکێن: زیادە گۆشتی پێ پێشوەی سەگ.
- گورگانەشـــەوێ: گورانییـــەکی تایبەتـــە بـــە نواندنی منالان.
- گورگ نەخۆرە: ئەندامێکی لە هەناوی ئاژەڵ.
- گـورگی دەم رەش: ئـەو گورگـەی سـەرلووتیان؛ واتە سەر لموزیان رەشە.





- گورێز: بەزین.
- گوریزە: گروازە: قژن.
- گوریس: وەریس: گورێس.

گوریس هوبالت بۆبدەم بەشانا
کۆل کێشیت بۆ بکەم لە مەریوانا

(مەلۆ- ل١٨٢)

- گورپی: ١- گەڕ: گڕوێ:

٢-بڵێسەی.

عەلی پیاوێك بوو زۆر کەلەگەت گڕوێ و داڵەگۆشت.

(حەمەدۆك-١- ل٢٣٥)

- گوریژن: لەناکاو بانگ کردن.
- گوریسە جوو: کرمێکی درێژی ناو زگی مرۆڤ.
- گۆرێن: بروسك: گرمە.
- گـۆریین: ١-گـەڤ: ٢- بروسـك. ٣-شـتێك یـا کەسێك جارێك بینیبێتن کابرای گۆرییێ.
- گوزیریی: تەواو: تەمام.
- گوژ: ئێستا: هەوکە: هەنووکە: نوکە: نها.
- گوژم: گوژمە: ١-توانا: ٢-عەجەلە.
- گوست: ئەنگوست: هەنگوست: تل: قامك.
- گوستاخ: چالاك: گورج.
- گوستان: ناوی ژنانە.
- گوستك: گوستیلە: گوستیلك: ئەنگوستیلە.
- گوشاد: پان بەرین: هەراو: پان و پۆر.
- گوشت: ئەنگوتك: هەنگوتك: گونك.
- گوشراو: گوشراوی: گوشیاگ.
- گوشین: کوشین.

پەنجەم گوشی لەگەڵ رانی.

(هۆنراوە- ل٥٩)

- گوفت: گفت: قەول: وەعد.
- گول: گرو: گەر: دووزام: گرۆوبوون.

هەی رۆ: بایەزین گول بووە.

(تحفە-١- ل٢٨٨)

- گوڵ: ١-لەزمانی کوردیدا ناوی جنسە بابـەتی زۆرە وناوی تایبەتیان هەیە لەوشەی (گـوڵ) گـەلێ ناو و سیفەتی تازە دروستکراوە وەکـو (گوڵـستان، گوڵشەن، گوڵزار، گوڵازو، گوڵۆنگە، گوڵەباغ).

٢-چەکێکی ئافرەتانە بریتییە لە دوو ئاقیقی پان و هێلکەیی سووری زەردباوی لـەزیو گـیراو تیرەکـەی (٠،٠٣)م پوولەکە و دراوی ئێرانـی پێوەیـە وەکـو ئاقیقی خەناوکەی منداڵان بۆ چاوی پیس باشە.

٣-شێوەی وەك مانگی یەك شـەوی بـچووك وایـە سێ پوولەکەی بـچووکی وەکـو دڵـی پێـوە کـراوە لەپێشەوەی سەری منداڵان قـایم دەکـرێ و بەسـەر هەنیەیدا شۆڕ دەبێتەوە.

- گوڵابەتوون: جۆرە قوماشێکە.
- گولاڤ: گولاو.
- گولاڤێژ: گەلاوێژ.

گوڵان: ١-مانگی دووەمی کوردییە:

٢-گوڵ+ئان:

٣-ناوی کچانی کوردییە.

گوڵاو: ١-کوراو: کولاڤ.

٢-ناوی کچانە.

- گوڵـە ئەسـتێرە: شەوچـراخ: بیـسبوك: جـۆرە مێروویـەکی رەنگاوڕەنگـە بەشـەو دەفڕێـت،

لەشانەکانی لەشیدا ماددەیەکی تێدایە پێی دەوترێ (لۆسفیرین) کە هەناسە وەردەگرێت نەماوەیە دەسووڕێت ( بەبێ گەرمی) و ڕووناکی دەداتەوە.

- گوڵ ئەندام: ١-ئەندام جوان وەك گوڵ.

٢-ژنێکی زۆر جوان بووە وەفایی شیعری بەسەردا گوتووە: ٣-ناوی کچانە.

- گوڵە: ١-ریولە: بێ نمود: گەندە: چکۆڵە.

- (گوتی: گوڵە، ئەتو دێیەکن ئەمن چت پێ دەکرێ؟)

(تحفە -٢- ل٧٤)

٢-ئەو پیاوەی کە ژنەکەی پەسندی نەکات.

گوڵە لەکێوی ئاتی ئەڵلا لێدایە کانە.

- گوڵە بەرۆژە: بەربەرۆژە: گوڵباخان.

- گوڵە ئێش: گوڵە ئازار: ڕووەکێکی کە پرەیە گەڵاکەی سێ پەلکە بەرەکەی هێلکەییە دەخورێت.

- گوڵە بن زەوی: سێوی بن عاردی.

- گوڵە بێژان: گوڵێکی خۆرسکە لە چیا شین دەبێ گوڵێکی زۆر بەبۆن و بۆن خۆشە.

- گوڵە پرووزە: قەرەخەرمان.

- گوڵە داسو: گۆرە: نەخۆشییەکی ئاژەڵانە.

- گوڵبانگ: ١-بانگ کردنی جوان:

٢-ناوی کچانە.

- گوڵ بەدەم: گوڵ وەدەم: بۆ پەسندی کچ دەگوترێ واتە دەم جوان.

٢-ناوی کچانە.

- گوڵ بەدەن: ١-ئەندامی ڕێك و پێك.

٢-ناوی کچانە.

- گوڵ بەژن: گوڵ بەدەن: گوڵ ئەندام.

- گوڵبۆن: ناوی کچانە.

- گوڵبێنك: قەرێتەی ملی گۆلك.

- گولپ: پێك.

- گوڵچین: گوڵ کۆکەرەوە: ٢-ناوی کچانە.

- گولچیك: گورچیلە.

- گولپنجە: گوڵێکی بۆن خۆشە لە بەهاردا لەناو ڕەزدا زۆرە.

- گوڵخەن: شەکرە خەندە: بزەی جوان و خۆش.

- گوڵخونچە: ١-خونچە: ٢-ناوی کچانە.

٣-ئاوازێکی گۆرانی کوردییە.

گوڵخونچەوە وەی وەی گوڵخونچە

- گوڵدار: بەگوڵ.

لێفەیەکی چیتی گوڵداریان بەسەر تەرمەکە هەڵکێشاو. (حەمەدۆك- ل١٧٤)

- گوڵدان: گوڵدانك.

- گوڵڕۆخسار: ١-ڕووخۆش: ٢-ناوی کچانە.

- گوڵ ڕوو: ١-ڕووخوش:

٢-ڕووخسار جوان.

- گوڵزار: ١-گوڵشەن: ٢-ناوی کچانە.

- گوڵستان: حەدیقەی گوڵان.

- گوڵفك: گرێ بە قوڵفە.

- گولکە: خۆشەویست.

- گوڵگوڵی: گوڵ گوڵ.

- گوللە: فیشەك.

- گوللەی وێل: گوللەی نەزانراو.

خەسرەوی برای گوڵە خان بەر گوللەی وێل کەوت.

(ئاشتی- ل١٨٠)





- گولمە: نەرمك: نەرموك: گۆشتی بێ هێسك.

- گوڵمێخ: سنگ: سینگ:

ئامرازی بەستانەوەیە لە رەوەی دەچە قێنرێ گوریسی پێوەیە.

- گوڵناز: ١-ناوی کچانە: ٢-جۆرە گوڵێکە.

- گوڵندام: گوڵ ئەندام: ئەندام جوان.

ئالی حوکمی گوڵندامان پیری لەژیان زویریشیان تەڕ کردووە.

(شەرەف- ل٣٣٥)

- گولنك: گولینك.

- گوڵیشان: ١-گوڵی سوور: ٢-ناوی کچانە.

- گوڵ نیلوفەر: تەماشای نیلوفەر بکە.

- گولولە: گلۆڵە: هەڵکراوەی بەن و دەز و بەسەریەکەوە.

گلۆڵەی کەوتە لێژی کەس خاست پێ نایێژی.

- گولهە: فەریکە جوز: گوزی وشك نەبوو.

- گولی: ١-سووری: ٢-کەزی ژنان.

٣- پیسکی: دووزامی ئالە: بەلوشین.

- گوم: بزر: ون: نادیار.

- گومبوون: ون بوون: بزربوون: گومبە: لاچاو لەبەرچاو.

- گومبەت: ١-گونبەد: گومەز.

٢- چاتی: بانی لە شەلمان و گەچ و کەرپووچ دروستکراو.

- گومان: شك.

گومانی لێیەتی.

- گومان بردن: شك کردن: گومان کردن.

- گومانبار: گوناهبار: گوناحبار.

- گومەز: گومبەز: گومبەت: گومە: ئاقد.

- گومڕا: بێ دین: کافر.

- گومگومە: مەسینەی قاوە.

- گومی: بزری: ونی.

- گوناح: زەنب: زەمپ: گوناه: تاوان.

لۆگوناحکاران تۆبە دەکا. (هۆنراوە- ل١٨٢)

- گونەڵان: نەرمایی گوێ.

- گونجان: ڕێك کەوتن.

- گونجەنە: بەنەخوێن.

- گونچیلکە: گورچیلە.

- گونجە: جەزا.

- گونەوشتر: گیایەکی دەشتەکییە، گوڵەکەی بچووك و بنەوشەییە.

- گوند: ئاوایی: دەگا: لادێ.

- گوندار: بەهێز: بەدەسەڵات.

(گونی گونداری دەردێنێ) پەند

- گوندك: ئەنگوتك.

- گوندۆر: گندۆرە: کاڵەك: خەربزە:

بەتۆ دەچێنرێ وەرزییە بەرەکەی خۆشە.

- گوندیی: لادێی: خەڵکی گوند.

- گونەوێڵە: بۆری شاوەت: بۆری سپێرم: ئەو بۆرییەی کە ئاوی سپێرم دەگوێزێتەوە لە کۆئەندامی زاوزێدا.

- گونڕەش: عاسی: یاخی: لاسار.

- گونك: ئەنگوتك: گونگێ.

- گونیە: گوش.

- گوھ: گوویی.
- گویی کونکەرە: جۆرە مێرووەکە لە شێوەی هەزارپێ دەچێتە ناو گوێچکەوە.
- گوھار: ١-گوارە: ٢-گۆڕین.
- گوھارتن: گوھار: گۆڕین.
گوێی سوانە: گوێ سەوانە: گوێ سوانکە: سواندە.
- گوھارتن: گواستنەوە.
- گوھان: گوان.
- گوھەر: گەوھەر.
١-جۆرە بەردێکە. ٢-ناوی ژنانە.
- گوھتەژیی: محەنەك: لەکاردەرهاتوو: قالبوو.
- گوھدار: گوێدێر.
- گۆهێدر: موتیع: مل کەچ.
- گوهێڕین: گۆڕین.
- گوهووژ: گێوژ.
- گوێز: گویز.
- گوێزی کەرە: جۆرە گوێزێکە بەرەکەی هێلکەیی توێکل تەنکە کالکەی خۆشە.
- گوێزی پووچ: گوێزی کوێر: وەزە کوێر.
- گوێزی بەردەلان: جۆرێکە لە دار گوێز.
بەرەکەی بچووك و هێلکەییە.
- گوێزی رەش: بەرەکەی نیمچە خڕ و کالکەکەی خۆشە تەختەکەی نایابە.
- گوێزە بەرازانە: گوێزە خوگانە: رووەکێکی ژەهرینی سەلك دارە گەلاکەی لەگەلای کەرەوەز دەچێت تۆوەکەی ڕەوانکەرە سەلکەکەی بۆ هەرس کردن و میز کردن باشە.

- گوێ ورچە: گیایەکە: گەلاکەی تووکنە گوڵەکەی فستەقییە.
- گوێ قولاخ: لەسەر هەست.
خەبەرهێنەکە نەختێك دوورتر چاوەڕێ و گوێ قولاغ بوو. (حەمەدۆك -١- ل١٦٢)
- گوێرەکە سوورە: خاڵخالۆکە: خاڵخالان.
جۆرە مێروویەکی زیان بەخشە بەقەد مشێك دەبێت ڕەنگەکەی سەری مەیلەو پرتەقالی رەش پێوەیە.
- گەبر: ١-گەور: گاور.
٢-لەزانستی مۆسیقادا بەمەقامێك دەگوترێ کە هەوایەکی کۆنی ڕۆژهەلاتییە مەقامەکانی (دەشت، حسەینی) ئورفە لەریشەی ڕەچەڵەکی نەغمەی ئەم مەقامە کۆنەن بە هۆنراوەی (دانراو) و فۆلکلۆری دەووترێ.
- گەپ: ١-گەورە: ٢-گەمە: ٣-خەبەر.
- گەپدان: یاری کردن: گەمەکرن.
- گەجەروگوجەر: گەدە و گوودە: هەرزە و خوێری.
هەرچی و پەرچی: شلە و قولە: گەجەلەوگوجەل: قەلەوقوتە.
قەلەوقوتە و گەجەرگوجەری شڕ و شەپڕێوی پاشاوەی شێر و خەنجەری کوردان کە دەرباز بوون. (شەرەف- ل٦١٧)
- گەدا: ١-نەبوو: فەقیر: ٢-دەرۆزەکەر.
- گەدە: ١-زگ: ٢-مەعیدە.
- گەر: ئەگەر: ئامرازی شەرت.
- گەڕ: ١-حیلە: فێڵ. ٢-سڕە: نۆبەت: نۆرە.





- گەرا: ١- هێلکەی زیندەوەر وەك ئەسپێ: ٢-هێلکەی ماسی.
- گەراقوپ: قەراقوپ: قەرانقوپ: هیچ قسەنەکردن و بێ دەنگ بوون.
- گەراویتك: قەرێتە: قایشەکە لەملی تانجی دەکرێ.
- گەراکوت: گەلاکوت: ئامرازێکە لەدار دروستدەکرێ لە شێوەی کوتکە بۆ خوری پاك کردنەوە بەکاردێ.
- گەڕان: سووڕانەوە: خول خواردن.
- گە: پاشبەندە بە دوای ناوانەوە دەنووسێ ناوی شوێن دیاری دەکات (سەیرانگە، کارگە، مەزارگە).
- گەبەڵ: پەڵەهەور: پارچەیەك لەهەور.
- گەپ گەپ: بێ سەروبەر: ناڕێك وپێك.
- گەجەڵ و گوجەڵ: گەجەروگوجەر: شلەوقولە.
(شلە و قولە و گەچەر و گوجەری لێ هەلاوێرم). (شەرەف- ل١١٢)
- گەچ: گێچ: هاڕاوەی جۆرە.
بەردێکە بۆ سپی خانووبەکاردێت.
- گەچران: گەچلان: دەق شکان.
- گەچراو: گەچلای: دەق شکاو.
- گەچکاری: سپیکاری.
- گەجۆر: زەوی بەردی گێچی لێبێ.
- گەردانە: زنجیرەیێکی شێوە پلپلەی لە ئالتون دروستئەکرێت و بەگەردن و ملدا ئەهێنرێتە خوارێ یان گەلێ جار ئەکرێت بەفێستی سەری ئافرەتان.
- گەردەلوولە: گەردەلوول.

- گەردەن: گەردن.
گەردنتان خۆش و ئازابێ. (شەرەف- ل٣٢٩)
زنجیر لەگەردەن چوون گوناهکاران. (مەلۆ- ل٥٩)
- گەردەنی: مل پێچ.
- گەردش: ١-سوڕ: خول: گەڕان: ٢- سووڕانەوە.
- گەردن بەرز: گەردن کێل: کێل گەردن.
- گەردن بەند: گەردن بەس.
- گەردەلوول: گێژەلووکە: باگێژە: گێژەبا: باگرۆکە: باگڕۆك.
- گەردن کەچ: ملکەچ.
- گەردنکێش: یاغی.
- گەردوو خۆل: گەڕان.
- گەڕان: گەردش.
- گەڕانەوە: گەریانەوە.
- گەڕانگە: گەڕانگا: شوێنی گەڕان و پشوودان.
- گەڕاو: گڕاو: ئاوێك کبریتی تێدابێت.
- گەڕەك: محەلە: تاخ: لەچەند کۆلانێك پێکدێت.
- گەڕە لاوژە: گەڕەلاوژێ.
گۆرانی گوتنی چەند کەسێ لەیەك شوێن، جاهەیە دەنگی خۆشە هەیە دەنگی زۆر ناخۆشە لەکاتی گوتنی دەبێتە پێکەنین.
تشتێکمان بۆ بێرە بابی خوێن لەم گەڕەلاوژەی چاکترە. (ئاشتی- ل٣٠)
- گەرەو: گرەو.
- گەرچی: ئەگەرچی.
- گەرچەکی چینی: جۆرە رووەکێکە لە ناوچە گەرماکاند دەروێت.

- گەرد: ١-غوبار: ٢- گەردیلە.
دەردی دوری گەردێکی خستۆتە نێوان.
(شەرەف- ل٧٣٠)
- گەردان: فیشال.
- گەردوون: فەلەك: کەون.
گەردوونی چەپ گەرد و ڕۆژگاری دڵ بەرد.
(شەرەف-ل٣٢٦)
گەردوون... هەر خۆت ئەزانی چی ئەکەیت.
(ئاشتی- ل١٧٢)
- گەردووەرد: مێ وەرد:
تۆوکردنی شۆ یان وەرد لە دوای باران بارین یان پەڵەکەوتن.
- گەردێ: ١-کەمۆکەك: ٢-ئەگەردێ.
- گەردی: ١-عەشیرەتێکی کوردە:
٢-بەیانی زوو
لەگەڵ گەردی بەیانی هات.
- گەردیان: خواری: چەوتی.
- گەردیاو: خوار: چەوت.
- گەرگەدەن: کەرکەدەن: گیانەوەرێکی بەهێزە.
ئەگەر فیل هەبێ کەرکەدەنیش هەیە.
- گەرگەر: زەوی بەردەڵان، زەوییەك بەردی زۆربێ.
- گەڕگەڕ: گەرگە ڕۆك: بەکرە.
- گەرگاندن: چەڵتوك لێ کردنەوە.
- گەرم: دژی سارد: ١-ئاوی کوڵاوبێ:
٢- هەوای گەرمی هاوین.
خاتون ئەستی گەرمای بوو عارەقەی لێ دەتکاوە.
( تحفە-٢- ل١٠٨)

- گەرماو: گەرماڤ.
- گەرماژۆ: خواربوونی بڕبڕەی پشتی مەڕ دوای خوری بڕینەوە ئەگەر خۆڵەمێشی پێ دانەکرێ.
- گەرماوگەرم: دەزبەجێ: هەر ئەودەم بێ دواکەوتن.
- گەرمایی: گەرماهی: تینی گەرما.
- گەرماژۆ: ئاوسان: گەرمەژنە.
- گەرمەسێر: گەرمێن: گەرمیان: گەرمەسێن: دژی کوێستان.
زۆر گەرمە سێری بژوێنە و بەپوش و پاریش هەیە.
- گەرمە هەوێن: ئەو شیرەی بەگەرمی هەوێن بکرێت ماستەکەی شل دەبێت تامیشی شیرینێکی بێ تامە.
- گەرمك: ١-ئاوێکی گەرم و مەند و تەنك کە زستانان نەیبەستی و مراوی تێدا کۆببێتەوە:
٢-شوێنکی تایبەتی بوو لە گوندان ئاوی لێ بوو سەری گیرابوو ئافرەت کۆڵ و کانی لێ دەکرد.
- گەرمشتە: گەرمێتی: گەرمی.
- گەرمیان: گەرمە سێر: ناوچەی گەرم و زستانە کەم.
- گەرمی پێو: گەرم پێو.
- گەڕناس: ئازا: بوێر: عگید.
- گەڕندە: گەڕۆك: گەڕاڵ: فرەگەڕ: جەهان گەڕ: جیهان گەڕ: ڕاتۆل.
- گەر نیزە: زەعیف: لاواز: لەڕ: دژی قەڵەو.
- گەروو: ١-گەلی: ٢-هەوك:
پیاوەکە گەرووی پاك کردەوە و دیسان پرسی.
(حەمەدۆك- ل١٣٨)





- گەروەخرە: گەروخرێ: نەخۆشییەکە گەرو ئەستوور دەبێ.
- گەڕەشایی: پێچەك شایی: یەکجار سووڕانەوەی شایی.
- گەریی: نۆکەند.
- گەڕیی مەڕ: نەخۆشییەکی پێستە بە هۆی گەنەیەکی مشەخۆرەوە بڵاو دەبێتەوە.
- گەڕیی: گولی: گوڕی: نەخۆشی پێست کە هەو بکات.
- گەڕیداوەتێ: گەڕی دیلانی: پێچی شایی: پێچی هەڵپەڕکێ: گەڕەشایی.
- گەڕیدە: گەڕۆك: گەڕندە.
- گەڕاڵ: شاران گەشت: جهانگەرد.
- گەریسك: مریشك: مامر.
- گەز: ئامرازی پێوانە.
هەرکەس بەگەزی خۆی دەپێوێ.
- گەزگوزۆك: گیایەکە گەڵاکانی باریك و لووس و چرە لەدەو بەستان شین دەبێ.
- گەزارە: زمان: زوان: زیان:
ئامرازی قسەکردن لەناو دەمی مرۆڤ.
- گەزارەکێشان: زمان درێژ: زۆروەر: زۆربڵێ: لەوچە.
- گەزتن: گەستن: قەپ لێ داگرتن.
- گەزمازگ: بەری دارگەز.
- گەزك: گەسك: گێسك.
بۆ پاك کردنەوە بەکاردێ چەپك چەپك لە ١-کرتی:
٢-گەزگەزۆك: ٣-قاتوری گەنم: دەبەستن.
بۆماڵینی حەوشە و ناو ماڵ و.... بەکاردێ.

- گەزندە: گەزەك.
- گەزیزە: ١-گوڵەزەنگ: ڕووەکێکی جوانە گوڵێکی سپی یان شین بنەوشەیی دەگرێت:
٢-ناوی کچانە.
- گەزۆ: جۆرێکە لە شیرینی.
- گەزیر: جزیرە.
- گەزنە بەیبونە کێویلە: گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە گەڵاکەی تووکنە تۆوەکەی ئاوێکی سوتێنەر دەدات گوڵەکەی سەوز.
- گەزنە: ١-پەتا:
٢-ئامێرەکە زین درو بەکار دێنن.
- گەسك: گێسك.
- گەسك دەر: کەناس.
مرادی گەسك دەری بازاڕەکە. خەریك بوو بەردەرکی دوکانەکانی دەماڵی..
(حەمەدۆك -١- ل٣١٨)
- گەش: ١-پۆلی نەکوژاوە.
٢-شادومان: بەختیار: ٣-ئاڵ.
- گەشە: ١-ڕوان: ٢-ناوی کچانە.
- گەشت: ١-گەڕان: سووڕانەوە.
- گەشکە: ١-زۆر بەختیار: ٢-فی: خو:
هەرهێندنە بۆ گەشکە نەیکرێ. (دم دم- ل٣٨)
- گەف: هەڕەشە: گەفێن: گەڤ.
- گەڤوگوڕ: گەفە: گەف گەف.
گەف و هەڕەشە لێك کران. (شەرەف- ل٧٣٠)
- گەڤێن: وەڕینی سەگ و هەڕەشە و گوڕەشەی سەگ.
- گەل: ١-ئامرازی کۆیە: ٢-دەستە:

٣-زۆر: ٤-میللەت

- گەڵ: ١-نێوان هەردووڕانی مرۆڤ: ٢-چرۆ گەڵای دار بەڕو کە لە نێوان دوو لقی بەرزی داربەڕوو دا ئەینێن بۆ بزن.

- گەڵا: ١-چلچەی گۆ: نەرمەی گوێی:

ئەو پارچە نەرمەی بەبنی گوێیەوەیە

- ٢-گەڵا: پەلك: پەلکی دار و درەخت.

- گەلاج: ئازاردەر.

- گەلاجی: ئازاری: ئێشی.

- گەڵاڕێزان: گەڵاڕێژان: پاییز: گەڵاخەزان: خەزەڵوەر.

- گەڵازە: دەسترازە:

ئامرازی لانکە بۆ بەستنەوەی منداڵ بەکاردێت.

- گەڵاس: گەلاز: گێلاس: گیلاس:

بەری دارێکە شێوەی خڕە و ترش و شیرینە.

- گەڵا کوتك: گەڵاکوت.

ئامرازێکە لەدار دروستدەکرێ خوری پێ دەکوتن بۆ خاوێن کردنەوە.

- گەلال: رووبار: ریبار: لەزێ بچووکترە هاوینان وشك دەکا.

- گەڵاڵە: ئامادە: حازر.

- گەلاوێژ: ١-لەدانانی چەند باوەش گەنم پێك دێت بەمەرجێ گوڵەگەنمەکان بکەونە دەرەوە، چونکە گوڵەکان بەهێزە و بۆ سۆر هەڵگەڕانی گەنمەکەیە لە ٤-٥ ریز.

٢-ناوی ئەستێرەیەکە.

٣-ناوی کچانە.

٤-ناوی گۆڤارێکی کوردییە.

٥-ناوی مانگێکی کوردییە.

- گەڵامێو: پەلکە مێو: پەلکی دار مێو دەکرێتە چێشت گەڵا وەرین: پەلك وەرین: کاتێك پەلکی داران دەوەری: ١-لەوەرزی پاییز: ٢-کاتی دارەکە تووشی نەخۆشی دەبی.

- گەڵەباوەش: شارا.

- گەلە: ١-ران: مێ گەل: ٢- نەهێنانی زاری مەبەست لەیاری تاوڵەدا: ٣-ئاوازێکی گۆرانی کوردییە.

گەلەو گەلەو گەلە

هەی هەی لەو گەلاوێژە

٤-گەلێك: گەلەك.

- گەلەکۆمە: گەلەکۆمەگی: گەلە کۆمەکی.

- گەلە درەو: چەند کەسێك بەیەکەوە درونە دەکەن بۆ مەلای ئاوایی یان بۆ کێخوا.

- گەلەوان: شوان.

- گەلە گورگ: واتە کومەڵێك گورگ کە بەیەکەوە دەگەڕێن لە وەرزی زستاندا.

گەلەگورگ لەناوچەمان پەیدا بوون.

(بزرە- ل٥١)

- گەلەووتە: رستە.

- گەلەك: گەللەك: گەلە: گەلێك: گەلیٚ.

شایەری گەلەك خاسم. (هونراوە- ل١٧٠)

ئەوان گەلیٚ لە ئێمە زۆرترن. (دم دم- ل٣٠٦)

گەلێکی بەرێزگرتن. (شەرەف- ل٢٤٦)

- گەلو: وشەی هاوارکردن بۆ خەڵك: خەڵکینە.

- گەڵوازە: دەسترازە: چەند پەرۆیەك.





لێك دەدرێ یا دەچنرێ منداڵی لە لانك پێ دەبەستنەوە.

- گەڵوان: گلوان: بەری دارمازووە بۆ دورمان بەکاری دێنن.

- گەلۆرە: گەلحۆ.

- گەڵوگوان: ناو گەڵ.

خورشتی گەڵ و گوانی. (غەوارە- ل١٠٨)

- گەلوو: گەروو.

- گەلیٚ: گەلەك: گەلێك: گەللەك.

کارەکە گەللەك نەقنجەو... (شەرەف- ل٧٣٢)

ئەمن ئەو شەو خەونێکی گەلێك عەجیبم دەدییە..

(تحفە -٢- ل٢٥٣)

- گەلی: گەلیٚ: گەلۆ: گەرو:

ئەو شوێنەیە تەسك و تەنگەبەرەی کەوتۆتە نێوان دووچیای گەورەوە وەکو سەرگەلی، زارگەلی، گەلی بەدران، گەلی بێجان، گەلی عەلی بەگ، لەهەندێ شوێنی تر بە (گەرو) ماوەتەوە وەکو گەرووی عومەراغا، گەرووی بێشە، گەروان، گەرەوان، هەرگەلیەك ناوێکی جوگرافی خۆی هەیە وەك گەلی عەلی بەگ، گەرووی عومەراغا.

- گەمەپێ کردن: فشەپێکردن: گاڵتە پێ کردن: زرتەك: تەوزە: گەپ پێدان: تیز پێ کردن: گەپ پێ کردن: ترانێ پێکردن.

مەزاق پێ کردن: قەشمەری پێ کردن : پێ رابواردن.

- گەم: لغاو: ئامرازی ئەسپ لیٚ خورینە.

- گەمار: پیس: پۆخل.

- گەمارۆ: ئابلوقە: دەورەدان.

- گەمال: گەمبۆ.

گەمال دەکەن چەق و لوور.

(تاریك و روون- ل١٠٨)

- گەمە: ١-یاری: وازی:

٢-گاڵتە و قەشمەری: گەمەپێ کردن: گاڵتەپێ کردن: قەشمەری پێ کردن: تیتالی.

- گەمیٚ: گەمی: گەمییە.

- گەنجینە: ١-خەزینە: خەزێنە: خەزنە: شوێنی زێڕ و زیو جەواهێر و بەردە. بەنرخە و لە جێگای نهێنیدا: ٢-تاقی ناوژور خواردەمەنی لەناو دادەنێن: ٣-شانشین: خەڵوەتی.

- گەند: فاسد: بۆگەنی: گەنی.

- گەنج: لاو: جاحێل.

- گەندەتا: سووکەتا: گەنگە تا.

- گەنداو: گەناو: گەندە ئاو.

- گەندەژە: گەند.

- گەنەدەموو: گەنگەموو: گەنەموو: تووکە حەرامە: کورك.

- گەندەتا: تای سووك.

- گەنکاز: ئاسان.

- گەنەگەرچەك: گەرچەك: کرنگ.

- گەنکاو: زولکاو: زەلگاو: باتلاع.

- گەنم پەڕین: وشك بوونی گەنمی گەیشتوو بەرادەیەك کە وەختی دورێنەگوڵەکانی بپەڕن.

- گەنم: کەنم: بەتۆ دەچێنرێ وەرزییە و لەزستان دەچێنرێ و لەهاوین دەدرووێتەوە جۆری هەیە وەك:

١-سۆر گوڵ: دەنکی گەورەیە و بـژی و گوڵەکـەی مەیلەو سۆرە و دەنکی گەنمەکەش ئاماڵ سۆرە.

٢-قەنـــــدەهاری: حـــــومێرە، عـــــومیرە: یەقەدادری: یەخەدرای.

شـێوەی دەنکەکـەی خـڕە و وردە زۆر بـەپێزە لـە نان کردندا.

٣-هەرەمە: هەموو گەنمێکی تێکەڵ.

٤-رەش گـوڵ: گوڵەکـەی و بـژی رەشـە و دەنکـی گەوریە و بۆ ساوارکردن بەکاردێ.

٥-گەنمە رووتە.

٦-مەسی پاك.

٧-گەنمە حۆڵە.

- گەنی: گەینك: گەنین.

- گەنم رەنگ: ئەسمەر.

باپیر جوامێرکی گـەنم رەنـگ و چوراشـان تۆزیـك کورتەبالاّ... (غەوارە- ل٦٠)

- گەنمۆکە: گیایەکە لـەناو کێلگـەی دەغـڵ و دان سەوز دەبێت.

- گەورەکچ: قەیرە کچ:

کچی تەمەنی گەورە بوبێ و مێردی نەکردبێ.

- گەورەل: قەبیلە.

- گەورۆنە: زۆر گەورە.

- گەو: چەماوە.

- گەواهی: شایەدی: شاهێدی: شایەتی.

- گەواد: دەیوس: دەویت.

دەویت باب عەقلت بۆ لەکار کردم...

(گەدا)

- گەواڵە: ١-پەڵە هەوری گەورە: گەوارە.

ئەو گەوارەش ئەمەی بگرێتەوە.

- گەوە: پێچی رێگای شاخ.

- گەوەڕ: ١-شوێنی عاسی لە چیا:

٢-بناغە: ٣-لەوانەیە: ٤-کونە تەیارە.

- گەوەنـد: گۆڤەنـد: گۆوەنـد: زەماوەنـد شـایی ژن هێنان.

- گەوج: ئەحمەق.

راکە خۆت دەرکە گەوجەی چارەڕەش.

(ئاشتی- ل١٦٥)

- گەوجانە: وەکو گەوج.

- گەور: ئاگر پەرست.

- گەوڕ: ژووری داکردنی رەشەولاغ.

- گەوەڕ: یاسە: کێوی سەخت.

- گەوران: مەجوسی.

- گەورە: ١-زل: ٢-بەرێز.

- گەورەدێ: ١-گوندی قەوغا: ٢-ناحیە.

- گەوز: قەلب: تل: ئەودیو : ئەم دیو کردن.

- گەوزان: گەوزان: گەوزین: تلدانەوە: قەلپ بوونەوە.

- گەوزدان: قەلپ کردنەوە.

- گەوگەو: مێشە کەرانە: جۆرێکە لـە مـێش لـە مێشی ئاسایی گەورەترە.

- گەوو: مەعیدە.

- گەوهەریی: شەوچرا.

- گەهشتن: گەیشتن: گهیشتن.

- گەیگر: گەپگیر: گروگرتن.

- گەوهەر: پێزە: بلەخش: دوڕ و مەرجان.

١-بەردێکی بەنرخە وەکو دوڕ (مرواری دەنك گەورە).

٢-ناوی ژنانە. ٣-زاخی مرۆڤ.

زەلامەکی بەجەوهەرە.





- گها: گهان.

- گهیشك: گهووژ: گێوژ:

بەری دارێکی خۆرسکە.

- گێ: گوێ: گۆش: گوێچکە: گۆ:

یەکێکە لە پێنج هەستی بوونەوەر و ئامرازی بیستنە.

- گێتی: جیهان: دنیا: عالەم.

- گێج: ١-هێڕ: گێژ: ٢-گەوج.

- گێجاو: گێژاو: سوڕخواردنی.

ئاوی رووبار و زێ لەشوێنێکی قوول.

- گێجەنە: گرێژنە.

- گێچ: گەچ.

یەك خانوو هەیە کە بەگێچ سپی کاری کراوە.

(حەمەدۆك -١- ل٥٢٦)

- گێچەڵ: تەشقە لە: گەڕ: شەڕپێ فرۆشتن.

- گێچکاری: سپی کاری: بە گەچ سواغ دان.

- گێچنووس: تەبەشیر.

- گێڕ: خوار: ناراست: نادروست.

- گێڕانەوە: ١-گەڕاندنەوە بۆ دواوە:٢-باس کردن.

- گێرە: دابەستانی چەند ولاغێك بەستنەوەیان لـە ملی یەکتر و تا قرشەکە ورد دەبێت.

ئەمجار گێرەیان کرد.

(حەمەدۆك -١-ل٥٤)

- گێرە تێکدان: گێرەنەکەر.

- گێـرە نەکـەر: بـەولاغی بنـەی گێـرە دەڵـێن کەدەداتە لابـاری و لـە شـوێنی خـۆی دەچـەقێ و ناجوولێ و گێرەکە تێکدەدات.

- گێرە شێوێن: ١-بریتییە لە تێکدەر:

٢-گایەك باش گێرە نەکات.

- گێرەکـەر: ئـەو کەسـەی ولاغـی سـەر قرشـە دەسوورێنێ تا قرشەکە وردەبێت.

- گێرەوان: ئەو کەسەی گاکانی گێرە لێدەخورێ.

- گێرەپانە: گوێ رەپە.

- گێرەڤان: گێرەوان: گێرەکەر.

- گێرە و کێشە: ١-گێرکردن و گواستنەوەی:

٢-مل ملانێ.

- گێرکە: گێرنگ: زیندەوەرێکی لە مێروو وردترە.

- گێز: ١-گوێز: ٢-مەیل:٣-پشت مل.

- گێزەر: گەزەر: گزەر: کارووت: کارۆت: یارکۆکی رووەکێکە رەگەکەی مێخـی و ئەسـتوورە زەرد یـا پرتەقاڵییە یان سۆرە دەخورێت.

- گێژ: ١-سەرەسوورە: ٢-سەرسوڕمان.

- گێژەکە کردن: گێژەوکردن: لەپێژینك دان.

- گێژەڵۆك: گووژالك.

- گێژەن: گێژئاو: گرد ئاو: گێژنگە: گێژینە: گێژاو.

- گێژگوڵ: عەزیز: خۆشەویست.

- گیف بوونەوە: زیت بوونەوە: لێ قەبووڵ نەکردن.

- گێـسك: گەسـك: گزیـی: گـزك: جـاڕو: گـسی: گزگ" گزجاڕ:

لەزۆر گیا و بنەتەراش دروستدەکرێ.

- گێسل: گەلۆر: دەبەنگ.

- گێل: وەرز: کەژ: فەسل:

بەشێك لە چوار بەشی ساڵ.

- گێلاخە: گلیخە: گیایەکی بەهارانە و دەخورێ.

- گێلاس: گلیاز: گەلاس.

- گێلە: ١-گەلە: ئەحمەقە.

- گێوژ: ١-بلچ: گوێز: گوشك: گڤییر: گووژ.

گێوژی زەردی درشت دەتگوت بۆ هەتیو بەردەگرێ...
(مجێور- ل٤٣٦ )

- گیا: گەیا: کشت.

- گیائەژدیها: رووەکێکی سەلك دارە بە تۆو و سەلك زیاد دەکرێت.

- گیا سیر: گیایەکەی گەڵاکەی بۆن سیری لێ دێت گوڵەکەی سپییە تۆوەکەی وردە.

- گیا دووپشکە: قاپە کەوڵە: دۆبەسەر: سەربەدۆ: گیایەکی بۆن خۆشە گەڵاکەی ددانـدارە، گوڵەکەی سپی یان شینە بەرەکەی لەترێ دەچێت ناخورێت، هەروەها رووەکێکی پزیشکی تاڵە بەهێزکەر و وریاکەرەوەیە بۆ لەش.

- گیاکەڵە: گورگە: رووەکێکی مشتەخۆرە ماددەی کلۆرفیلی تیانییە، بەڵام گوڵ دەگرێت و خۆی بەرەگی رووەکەکانی ترەوە دەنووسێنێت و ئاوەکەیان دەمژێت.

- گیاورچ: گیایەکی پزیشکییە گوڵەکەی پەمبەیە بۆ لەوەریش باشە.

- گیاگامێشە: گیایەکی لەوەڕە.

- گیاشێر: دەوەنێکە گوڵەکەی سوورە شیراوێکی لینجی سوتێنەری لێ دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی دەرمان بەکاردێت.

- گیافریشتە: رووەکێکە لە دروستکردنی مەیی ئەلکهولیدا بەکاردیهێنرێت و بۆنی خۆشە لەقەراغ رووبار و گۆماندا دەڕوێت.

- گیا جۆ: گیایەکە لە جۆ دەچێت.

- گیا کێچ: گیایەکی دەشتەکی و پزیشکییە ماددەی لینج لەگەڵا و گوڵ و تۆوەکەی دەردەهێنرێت بۆ دەرمان و پیشەسازی.

- گیای کوێستان: بریتییە لەو گیایانەی لە کوێستان شین دەبن بەسەدان جۆرەگیای لێ دەڕوێ و هەر یەکەیان ناوی تایبەتی خۆی هەیە هەر ئەوەندەم کەوتە بەردەست.

١-بەڕەزا: گیایەك لە کوێستانان دەبێ.

٢-بێزا.

٣-کەما: گیایەکی بڵندی گەڵادەرزییە.

٤-کەنێرە: گیایەکی گەڵاسێ پەلکەیە و گوڵی زەردەکا: بۆنی خۆشە.

٥-گیابەند: گایەکی کوێستانی بۆن خۆشە.

٦-هەڵەز: گیایەکی کوێستانییە بۆ خواردن و دەرمان بەکاردێ.

٧-مەندوك: گیایەکی جوان و تام و بۆن خۆشە.

٨-مێژورد: گیایەکی گوڵشینە.

٩-بێژان: گوڵێکی ورد و بۆن خۆشی هەیە.

١٠-خاو.

١١-ترشۆکە: گیایە دەخورێ. ١٢-سیرۆکە.

١٣-هەندرێشە: لەکەور دەچێ تامی تیژە.

١٤-دۆرە.

١٥-گوێنی: گیایەکی دڕکاوی کوێستانە کە تیرەی لێ دەگیرێ.

- گیان: ١-روح: رەوان: جان: گێن:
٢-وشەی رێزلێنان.

هێمن گیان. (ئاشتی- ل٨١)

- گیان باز: پێشمەرگە.

- گیانەوەر: گیاندار.

- گیانەوەرزانی: گیانەوەر ناس: وڵس ناس.

- گیانەلا: ئاوزینگ.

- گیاندان: مردن.





- گیای ناوچەی دەشتی هەولێر: ئەو گیایانەی لە دەشتی هەولێر دەڕوێن و ناوی تایبەتی خۆیان هەیە لە بەهار دەروێن وەك:

١-شملی شاق: گیایەکە سەلکێکی هەیە لەشێوەی پیوازە دەخورێت.

٢-چاوە: گیایەکەی پەلکی پانە لەبەهار دەروێت سەلکی هەیە گوڵێکی پەمبەیی هەیە.

٣-ماسیرە: گیایەکی شێوەی باریکە بەیەکەوە شین دەبێ ئاژەڵ باش دەیخوات.

٤-دانەقەتی: گیایەکە لەبەهارادەروێت سەلکی هەیە و دەخورێت.

٥-دۆ بەسەرە: گیایەکە پنچی دەکات گوڵێکی سپی پەیدا دەکات.

٦-تورۆکە: گیایەکە لە بەهار شین دەبێ گوڵەکەی پەمبەیە دەخورێت تامی تووری هەیە.

٧-بزن ترێنە: گیایەکە لەبەهارا شین دەبێ گوڵەکەی رەنگی پەمبەکی ئاڵە.

- گیاو گۆل: گژ و گیا.

قەپاڵەی لەگیا و گۆل و لکە داران دەگرێت....
(حەمەدۆك -٢- ل٣٤٧)

- گیای خۆرسك: گیای سروشتی.

- گیپش: گوپ: لاروومەت.

- گیدی: برالە.

- گیران: گران.

هەموو گیران و کوژران. (شەرەف- ل٢٤٧)

- گیربوون: ١-تەخیربوون.

گیر مەبە خوشکم. (حەمەدۆك-١-ل)

٢-عاسی بوون: ٣-راوەستان.

- گیرسان: داگیرسان: هەڵبوون: پێبوون.

- گیرستن: گریان: گرین.

- گیرفان: بەرك.

گیرفانی پڕ کرد لە مێوژ. (تحفە-٢- ل٩٩)

- گیرگە: دارێکی دووشاخ یادووفاقی ئەستووری زلە مێخیان ئەخستە ناو دوو فاقەکە بۆ ئەوەی نەهێڵێ مێخ دەوار لەژێر زەوی بێتەدەر.

- گیرنگرك: تمساح.

- گیرۆدە: گرفتار.

- گیریان: گریان.

- گیزە: دەنگی سەماوەرە کە دەم ئەسێنی.

- گیز: گووز: گوێز: وەز.

- گیسك: رەشانی نێرومێی تەمەن (٦) مانگ تا تەمەنی ساڵ و نیو.

- گیزی: پیاسە: قەدەم لێدان.

- گیزان: گوزان: ئامرازی مووتراشین.

- گیزی مل: گێزی مل: ئەستوورایی مل: پشتمل.

- گیژ: نارێك.

- گیشە: کیشۆك: لەدانانی چەند باوەشێ جۆپێك دێت بە مەرجێ گوڵە جۆیەکان بکەونە ناوەوەی گیشە لەبەر ناسکی و کێشانی شێ و قەڵەوبوونی جۆیە. چونکە هێشتا نێمی تەڕی هەیە کە دەستدەکرێ بە دورینەوەی.

- گیفۆك: مەزبەلە: سەرانگولك: گووڤەك: شوێنی زبل کۆ بوونەوە.

- گیڤ: بەفیز: بەدەعیە: لەخۆبایی: رووح گەورە.

- گیل: قوڕ: حەری: خۆلو ئاوی تێکەل.

- گیو: ١-کوردێکی زانابووە لە سەردەمی کەیکاوس وەزیربووە.

٢-نازناوی مامۆستا عەبدولرەحمان برای حوزنی موکریانییە.

- گیهان: جیهان: هەمودنیا: گێتی.

# ل

- ل: ١- له ناوچەی هەولێر و خۆشناوەتی و کۆیــه پیتی (ل) دەنگگۆڕکی لەگەل پیتی (ر) دەکات (ل) دەکەن بە(ر):

ماڵ: مار: خەڵك: خەرك.

هامۆشۆی ماریان ناکەم خەرك سەری سوڕمایە...

(فولکلۆر- ل٢٦)

لەگەڵ: لەگەر.

عەسکەری من رەشیدە خائینی لەگەردایە.

(فۆلکلۆر- ل٢٦)

٢- ل: لا: کن: نك.

- لبامن: کنەمن.

ل گای گوهی نیشتیٚ داکان ل٩٨

- لا:١-ل: لە: ٢-مەنفەعەت:

٣-زولف: ٤-لاکۆ: لاچۆ.

- لابا: ١-ئەو گەنمەیە کە با بە توێکڵەوە بردوویەتی: ٢-لای بە.

- لابار: تا: لایە: لایەیەك لەبار.

- لابانە: ئەو بەشە زەوییەی دیاریکراوە بۆ تۆوکردن.

- لابە: لای بە.

- لابەر: ئامانی شیری لیٚ دەدۆشین.

- لابەلا: ١-خوار: ٢-ناڕاستەوخۆ.

- لابراو: لابرای.

- لاپاڵ: قەدی لایەك لەچیا کەژ.

- لاپاو: لافاو: لاشاو: سێلاو.

ئاوی بارانی زۆر کە کۆدەبێتەوە شوێن وە بنە خۆی دەخا.

لاپەڕ: لاپەرگە، دورە پەرێز.

- لاپەڕە: رووپەرە: رووپەل.

- لاپەسەن: لاپلار: لاپواز: مشەخۆر.

- لاپۆرە: بەلاش: بەخۆرایی.

- لات: ١-قەلاش: نەبوون: ٢-رووت: ٣-کنت:

٤-رێگای عاسی: ٥-سنووری دیارکردنی تۆوکردنە، لاتەکانیش جیاوازی هەیە لاتی کەر لەلاتی ئێستر بچووکترە.

- لاتی کەر: لاتێکی بچووکە.

- لاتی ئێستر: لەلاتی کەر گەورەترە.

- لاتەك عەرد: ١-ئەوەندە عەردەی دیاریدەکریٚ بۆ تۆودان.

٢-پارچەیەك عارد.

لاتەك عاردی گرتییە.

- لاتاو: پەلار: توانج.

- لات لێدان: یەکەم هەنگاوی تۆوکردنە، ئەوپارچە زەوییەی تۆ دەکریٚ بە خەتی گاسن سنووری لاتەکە دیاردەکات بۆ تۆو کردن و کێلان.

- لاتەرقەوج: لاتەلقەوج: بەرەواژ: ئاوەژو.

- لاتی: نەبوونی.





- لاچ: کوڕ.

- لاچی: کوڕی.

- لاجانگ: لایەك لەرووخسار.

- لاجوور: نەزان: ڕەمەکی: غەشیم:

نەزانی لە کردەوە و کار.

- لاچك: ساق.

- لاچۆ: لاچو: لاکەوە: لاکۆ: برۆ لای: برۆ بەملاوە: هەروەولای.

برۆ لاچۆ لەبەر چاوم. (گێلە- ل٢٦)

- لاچوون: ١-لابردن: ٢-لاکەوتن.

- لاچێ: ١-لاکەویٚ: ٢-لەبەرچیٚ.

- لاخیر: لافاو: سێلاو: لێمشت.

- لادان: لابردن.

- لادەر: موتحەریف: چەواشە بوو.

- لادەگا: لادێ: گوند:

لە چەند خانوێك پێکهاتووە لە دەرەوەی شار و شارۆچکە.

- لادێ: ١-کەمێ: تاوێ:

٢-گوند: ئاوایی: ٣-ناوی کوڕانە.

- لادێیی: گوندی: دێهاتی: خەڵکی گوند.

سێ لادێیی بەستەزمانی داماو.

- لار: ١-خوار: ٢-لاڵ: بێ زمان.

٣-تفەنگی پڕ: ٤-لەش: لەش و لارت جوانە.

- لاردانەوە: لەرینەوەی دەنگی گۆرانی.

- لاراندنەوە: لارانەوە.

- لاڕشە: نەخۆشییەکە، کە برین پیس دەبێ.

- لارە: ١-لاڵە: ٢-کۆڵەگرێ.

٣-زیزبوونی منالٚ: ٤-خوار: ٥-ناوی کچانە

- لارولۆچ: خوار.

- لاڕێ: رێگای ناسەرەکی.

- لاڕێ گرتن: ١-رێگای ناسەرەکی گرتن.

٢-چەواشە بوون.

- لاری: خواری.

- لازووان: غەبی: گێل.

- لاژە: گۆرانی میللی کوردان.

- لاژەبێژ: گۆرانیبێژ: سترانبێژ

- لاژوارد: کان.

- لاس: ١-ناوی دڕکێکە: ٢-ناوی کوڕانە:

٣-دلداری خاتو خەزالی بەیتی لاس و خەزالە:

٤-دارێکی درکاوییە: ٥-تەپاڵە:

٦-قسەی بەئارەزوو.

- لاس دان: فریودان: هەڵخەلەتاندن.

- لاسایی: تەقلید: لەچاوکردنەوە.

- لاسامە: لافاو: سێلاو:

ئاوی زۆری کۆ بۆوەی باران کە بۆ شوێنێك بێت.

- لاسەنگ: هاوسەنگ نەبوون.

- لاسك: قەدی رووەك.

- لاسوور: نە ئەنگاوتن.

- لاسەرە: خشڵێکی ژنانە لە کلاو قایم دەکریٚ.

- لاش: بەدەن : جەسەد: قەلب: گیان: قالب: جەستە.

- لاشاو: لافاو: سێلاو: لێشاو.

- لاشە: کەلاك: جەستەی بێ گیان.

- لاشەڕ: دوورەشەڕ: کەسێ حەزی لەشەڕ نەبێ.

- لاڤ: لاو: جحێل: گەنج: جاحێر: جاحێل:
قۆناغی تەمەنی دوای مێرد منداڵی.
- لاشەویلکە: لاشەویلاك.
- لاعیە: خوازراو: وەرگیراو.
- لاف: گەزاف: زیادەگۆیی: لاف گەزاف: خۆهەڵکێش.
- لاشەغرە: لەدووداری درێژپێك دێت، سێ چوار شەپکە شەغرە یان لەنێوانە بەدوو لاشەغرە، شەغرەیەك دێنن.
- لافاو: سێلاو: لاشاو: لاسامە: لاپاو: لووشاوە: - لێمشت: تێژاڤ: لەهێ: پۆك: شەتاو
ئاوی زۆر بەتەوژم کەپاش باران دێت.
لەهەمووی زینو و بانوان هەڵستاسێلاوە.
(تحفه -٢-ل١٢٢)
- لاڤا: تکا: رجا.
- لاڤاو دیلەك: نزاو تکا: پاڕانەوە.
- لاڤاکردن: پاڕانەوە: تکاکردن.
- لاڤە: لاوك: گۆرانی شەڕوشۆڕی ناوچەی کرمانجی سەروو.
- لاڤە پێژ: لاوك بێژ.
- لاق: قاچ: پا: پێ.
- لاقم لەجێ چوو: لاقم لەگەرچوو. (گێلە-ل١١٥)
- لاقە فرتێ: لاق کوتان:
مردن مردنە لاق کوتانی لۆچیە.
- لاقەڕەشە: دوان خڤیك: لاڕەشە:
نەخۆشییەکی درمە لەمانگادا بڵاو دەبێتەوە.
- لاقردیی: لاقرەتی: قسەی قۆڕ.

- لاك: لاشە: جەستەی بێ گیان.
- لاکەلاکە: لاکە لاك: بێ هێزو تاقەت.
بەلاکەلاك لەگەڵی چوومە دائیرەی تاپۆ.
(غەوارە- ل٧٧)
- لاکەلێوەهاتن: بێ هێز و تاقەتە.
- لاکەوتن: ١-چوونەوەلای: ٢-لابردران.
- لاکەوە: وەلاکەوە: برۆلای: دەلا: هێوەڕو: جێکە.
- لاکۆت: لاپەسن.
- لاکۆشکە: یاریدەدەر: یارمەتیدەر.
- لاکۆشی: پاراستن.
- لاکێش: ١-جۆرێك لەمافور.
٢-لایەنگر هەوادار: لاگر: لاگیر: لادار.
- لاگا: ١-قۆناغ: مەنزل.
٢-گوند: ئاوایی.
- لاگایی: گوندی.
- لاگیرە: خشڵی ژنانە: زنجیرە.
قایشێکە و ئافرەت لەسەرسەربیت قایمی دەکەن.
- لاگر: لایەنگیر.
- لال: ١-کن: ٢-خاڵ: ٣-لاو.
٤-لەعل: بەردێکی بەنرخە.
- لامێژ: لامژ: بەو کار و بەرخە دەگوترێت کە جگە لەدایکی خۆیان مەڕ و بزنی تر بمژن.
- لاڵ: ١-بێ زمان: ٢-لەعل.
وادیارە لاڵە قسەناکا؟ (گێلە- ل١١٢)
- لاڵا: لاڵایەوە: پاڕایەوە.
- لاڵانەوە: پاڕانەوە: لوباندن.
- لاڵام: لاڵامەوە: پاڕامەوە.





- لاڵانێ: لاڵامەوە: لاڵام.
- لالە: ١-خاڵە: لالۆ.
٢-لامپە: ٣-جۆرەگوڵێکە.
٤-ناوی کچانە.
- لالسکە: لالکە: پاڕانەوە: لالانەوە.
- لاڵە: ١-بێ زمانە: ٢-پاڕانەوە.
- لاڵەپتە: کەسێ بەچاکی زمانی گۆنەکات.
- لالەزار: شوێنی لالەی زۆر لێ ڕوابێ.
- لالوان: خاڵوان.
- لالۆ: خاڵ: برای دایك.
لالۆ هەواس خەڵك دێی ئەو بەربوو.
- لالووت: عاجز.
- لێمان لالووتە.
- لالێ: زمان نەبوون.
- لالیان: پاڕانەوە: تکاکردن.
- لام: کنم.
لەلام نییە: لەکنم نییە.
- لامال: ١- پڕبەپڕ: ٢- تالان.
- لامپا: لەمپە: لالە: ئامرازی رووناککەرەوەی شەو.
- لامژ: ئەو کەسەی جگەرە دەخوا و جگەرەی پێ نییە.
- لامشت: کمست.
- لامێردان: بنەبان: لای سەرەوەی کۆڕی دانیشتن.
- لامل: لاسار: عیناد: گوێ نەدەر.
- لامەردو: دیوەخانە.
- لان: ١-لای:
٢-هێلانە.

- لانە: ١-هێلانە: ٢-ناوی کچانە.
کوردستان لانەی شێران.
- لانەواز: ئاوارە: مهاجیر: مشەخت: لونەواز.
- لانەوێران: لانەلێ تێکچوون.
- لاوك: سترانێ مێرانیێ: سترانێ سیبیارا: سترانێ شەڕا.
جۆرێکە لە مقامی کوردی کە داستانی قارەمانییەتی و خۆشەویستی و سەر و سەربردەی شەڕ و شۆڕ و کردەوەی ئازایەتی پیاوە بەناوبانگەکانی کوردەواری دەگێڕێتەوە، ئەولاوکانەش شۆڕە سوارە بەناوبانگەکان و پیاوە ئازاکان هەڵدەبژێرن بەسەر ئەورووداوانە گوتراون کە قارەمانەکان ناویان پێ دەرکردووە و ئازایەتییان تێدا نواندووە لە خەیاڵەوەش هەرچی رەوشی پەسندی ئەو سەردەمی خۆی هەبووە داویانەتە پاڵی وناوی لاوك لەقارەمانی رووداوەکەوە هاتووە وەك لاوکی: ١- چەتۆ: ٢-مەمێ زەر: ٣-سوارۆ: ٤-میرزاغا: ٥-عەمێ گۆزێ: ٦-شێخ مەحموود: ٧-سمایلاغە.
- لاوك بێژ: ئەو کەسەی لاوك دەڵێت و زۆربەی لاوکەکانی لەبەرە چوار پێنج شەو لەسەر یەك لاوکی دەگۆت و لاوکێکی دووبارە نەدەکردەوە، زۆرجاریش چونەتە شوێنی رووداو ئەو شوێنەی لاوکەکەی لێ قەوماوە بۆ ئەوەی لە چۆنیەتی رووداوەکە بگەن، لەکاتی لاوك گۆتندا رووداوەکەیان بۆ گوێ گران دەگێڕایەوە.

- لانك: لاندك: بێشكه: گەهواره: دەرگووش:
دەرگویش: کەهوواره:
ئامرازێکه مناڵی تێدا دەخەوێنن تایبەته
بەنەتەوەی کورد لەم بەشانەی خوارەوە پێکدێت:
١-پێچکه: رارەو: ٢-تەپان: ٣-قورشاقی تەپان:
٤-بان: ٥-کەوە: ٦-پشتۆك: ٧-ناولانك:
٨-سایل: ٩-کویشکە: ١٠-دەسرازە:
١١-پێش لانك:
١٢-سەرلانك: ١٣-کۆچك: ١٤-دۆشەك:
١٥-بالیف.
- لانگرتن: دیفاع: بەرگری.
- لاو: ١-جحێل: جاحێل:
٢-کوڕی نازدار: ٣-جوان.
- لاواز: زەعیف: دالگۆش: لەڕ: دژی قەڵەو.
- لاوانە: لاشیپانە: لایەکی چوارچێوەی دەرکە.
- لاوە: ١-گەنجە: ٢- ناوی کوڕانە: ٣-لابە.
- لاودا: ١-لافاوی کرد: ٢-لاتان دا.
- لاواندنەوە: لاونان:
بەو بەستانە دەگوترێ کە بەسەر مردوو دەگوترێ.
- لاوەلا: لابەلا: ناڕاست و راست.
- لاوچاك: گەنج: جحێل.
- لاوژە: لاوێژ: لاوێژگە.
- لاوژۆکە: ئاسنە بچووکەکەی ناو زەنگوڵە.
- لاوێز: بەلاداکراو.
- لاویی: لاوێتی.
لاوێتی و نەفامی بەرۆکی گرتم. (گێلە- ل٩)
- لاهێر: نارێك.

- لای لایی: لایەلایە.
- لب: دەنك: دنك.
- لبا: کن: ل : لە.
- لبام: کن من.
- لبەك: دانەیەك.
- لباد: نمەد: لیبی: کولاڤ:
جۆرێکە لە رایخی کوردەواری لە (لوا: بەرەنگن)
دروستدەکرێت جۆری زۆرە ئەوە لە لوا دروستدەکرێ.
١-فەرەجی (١-کەپەنەك: هیزدانی):
٢-خەیلانی: ٣-بلباسی: ٢-لاکێشەی:
٣-سەرکراوی هاوین و زستانی.
- لبادە: ١-مێزەر: ٢-نمەدە.
- لپان: لەرزین.
- لپاشرا: لەپشتەوە.
- لپەی: لەدوای.
- لپر: ئەستوور و نارێك.
- لپە: نارێك: دژی رێك.
- لچ: لێو: ١-کەناری دەم:٢- قەراغ.
- لخ: لق: چل: کەلی داری.
- لخاو: لغاو: لەغاڤ.
- لخاوە: لغاوە.
- لر: لییر: لرگ: شێوە بازنەی بچووکە لەسەر
جەستە پەیدادەبێ لەئەنجامی خورشتی زۆر.
- لرخە: لرخە لرخە.
دەنگی مرۆڤی نوستوو.
- لرمە: دەنگی بەربونەوەی شت، لرمەی هات.
- لزگە: جۆگە: جۆگا.





- لستن: لستنەوە: لێستنەوە.
- لغاو: لخاو: لەگم: لەخام: لەغاو.
ئامرازێکە لە شێوەی نیوە بازنەیە دەخرێتە دەمی
ئەسپ و ماین و جلەوی لێ دەبەسترێ .
جوتێك زەرگ دروستدەکرد دانە لغاوێکی مرواره...
(تحفە- ل٢٠٦)
- لفانە: جمك: جووت: دوانە.
- لفك: دامەنی کراسی.
- لفکە: لیفکە: لەبەن دروستدەکرێ بۆ خۆشوشتن.
- لڤ: دەنك.
- لڤکۆك: ماك.
- لڤلڤاندن: هاندان.
- لق: لەق: چڵ: کەل: چلۆ: لقی دارێ: چلو.
- لمە: زگ: ورگ: هور: سك.
- لمۆز: لموز: لمبۆز: لیپوز.
- لنج: ١-جیاواز: ٢-لاسار: ٣-تەوس.
- لنگ: ١-لینگ: پا: ٣-تا.
- لنگەبار: لابار: تایەك لەبارێك.
- لنگەفرتی: پەلەقاژە: لنگەفڕە: لنگەفرکە: لنگە
فرتە: لنگە فڕی: لینگ کوتانی لەبەر مردن.
- لنگدان: غاردان: راکردن.
- لنگیان دامێ: غاریان دامێ:
دەستەی نیزامی خۆل بە سەر لنگیان دامێ
دەستە و خەنجەر.
- لۆ: لەبەرچی: ٢-چین: ٣-لق: ٤-هەرامە.
لۆ وەت کرد عەیشێ؟
٥-ناوی رووەکێکە: ٦-سۆ: لك.

- لوباندن: لالاندنەوە: لاواندنەوە.
- لۆترە وان: زۆروەڕ: ئەو کەسەی زۆر قسەی دەکات.
- لوتکە: ترۆپك: دوند.
کۆتایی چیا بۆ سەرەوە تیژ بێ هەر لوتکەیەك
ناوی مێژوویی خۆی هەیە.
- لۆتی: ١-فاسق: ٢-لەکوردەواریدا بەوکەسانە
دەگوترا کەتاپێش شەڕی دووەمی جیهانیش
بەدێهاتەوە دەگەڕان و بەدەهۆڵ و زورناوە ورچ و
مەیمونیان هەڵدەپەڕاند.
- لۆچی: لەبەر چی: لۆ: بۆچی: وشەی پرسیارکردنە.
- لۆدە: لەودە.
- لۆر: ١-شوێن: جێگا.
٢-لور: لۆرك.
- لۆرك: لۆر: لواك.
- لۆرەپ: لۆلەپ: ئامرازی دۆ ژەندنە.
- لووراندن: لوورە: لوورەلوور.
- لۆرخ: قوروبەفری تێکەڵاو.
- لۆر: جۆرێکە لەسپیات: سزگ هەندێ شیری تێ
دەکەنەوە یان نەءلەهەر دووباردا سەر لەنوێ
دەیکولێننەوە و دیسان ئامێژنی تێ دەکەن
هەڵدەبزرکێ هەندێ کوراتی تێدەکەن بۆ ئەوەی
تامی خۆش بێت پێی دەڵێن (لۆر).
- لۆریی: ١-لانك ژین:
٢-جۆرە گۆرانییەکە.
٣-قەلاب: ئۆتۆمبێلی بارهەڵگری گەورە.
- لۆغان: ١-نەخۆشییەکە تووشی پەلەوەر دەبێ
بە تایبەتی مریشك جیقنەی سپی دەبێ.

۲- خۆشی و شادی و هەڵپەڕینی شایی و لۆغان.
- لۆغەلۆغە: لۆخەلۆخە.
- لۆخە: ١-گەورە: ٢-پێچ ڕێگا.
- لۆق: هەنگاو: شەقاو: پێنگاف.
- لۆقە: لۆقەلۆق: هەرۆلە: نەرمە غاری مرۆڤ.
- لۆقبڕ: کۆشش: هەوڵ و تەقەلآ.
- لۆقدرێژ: دۆلەدرێژ: لۆقە.
- لۆقن: لۆقدرێژ.
- لۆك: ١-حوشتر: ٢-زەمەقە لۆرك.
کەتیرەی لۆك: جـۆرە زەمەقێکـە لەلایـەن هەنـدێ درەخت یان مێرووەوە دەردەهێنرێت.
- لۆکە: پەمۆ: پەمگ:.
- لۆلە: ڕۆلە : کوڕ.
- لۆلکە: خواردنێکە لە ئاو و ڕۆن و ئارد پێکدێت.
- لۆلۆ: ١-ئامرازی بانگ کردنی کوڕە بەتایبـەتی لە لاوکی کوردەواری.
٢-سەربەند و دوابەندی لاوکە.
٣-زازا: ئەزبـەنی: وشـەی ناونـانی خـەڵکی کرمانجی سەروو.
- لۆوا:١- لێوار: ٢-لا: ٣-لۆئەوها: بۆوا.
- لۆو: ١- لۆوك: لۆڤك: لۆبیا: ٢- بۆتان: لۆتان.
- لوای بەرەوە: دەرچوون.
- لوا: ١-ڕۆیشت: ٢-خوری بەرخ.
- لووای: ڕۆیشتن.
- لوان: ١-کۆی لوا.
٢-ڕۆیشتن: ٣-گونجان.
- لوانی: ڕۆیشتووی.
- لوانێ: ڕۆیشتم.
- لواشان: ڕۆیشتنیان.
- لواوە: ڕۆیشتەوە: چۆوە.
- لوە: بڕۆ: هەرە: بچو: بچۆ: فەرمانی داخوازییە.
- لونە: لانە.
- لووت: کەپوو: لیت.
- لووتەلا: لالووت: زوێر: تورە.
- لووتەوانە: خەزێم: ئامرازی جوانکاری ژنانە.
- لووت براو: کەپوو بڕاو: کەسێ لووتی بڕابی.
- لووت بڵند: کەپو بڵند: بەدەعیە.
- لووت پان: کەپووبڵند: لووزبڵند: بەفیز.
- لووت پژان: کەپوو دارِسان: خوێن لە کەپوو هاتن.
- لووتخوران: حەزلێ بوون.
- لووتخوار: نارازی: ناقایل.
- لوتکە: ترۆپك: چم: دوند: تۆپەڵە: تۆقەلەی چیا.
- لووتگرتن: نارەزایی.
- لووت و بزوت: لەناکاو (لـووت بـزوت تووشـی یەك بووین).
- لووچکاندن: پەلك لێ کردنەوە.
- لـوڕ: ١-نـاوی لـوڕ لەچـییەوە هـاتووە لەشەرەفنامەدا لاپەڕە (٦٢) سـەرتای پەیـدابوونی ناوی لـوڕ ئاوابـاس دەکـات و دەڵێ ئەمانـە بۆیـە لوڕیـان بەسـەردابڕاوە لەمەڵبەنـدی (مـانڕوڕ) گوندێك هەیە ناوی (کورد)ە لە نزیك ئەو گونـدەوە دەربەندێکـە بـەلوڕی پێـی دەڵـێن (کـول) لـەناو دەربەندی کولیـشدا شـوێنێك هەیـە (لـوڕ)ی پـێ





دەڵێن جاچونکە بنەچەکەی ئەو هۆزانە و تیرانە لەو شوێن بووە ناوی خۆیان ناوە(لوڕ).
٢-بە هەموو هۆز و تیرانە دەڵـێن کـە لـە لـوڕەوە پەیدا بوون.
٣-بەشێك لەچوار بەشی زمانی کوردی.
٤-باشووری کوردستانی ئێران پێکدێنێت.
٥-دانیشتوانی بەشی باشووری کوردستان.
لوڕستان: مەڵبەندی لوڕانە یان هەرچـی لوڕنـشینە کەبریتییە لـەو هەرێمـە و چـیایەکە لـە کەوانـەی چیاکانی زاگرۆز واخۆی دەنـوێنی و کـەوا سـەرەتا لەچیاکانی کرماشـان لـەباکوورەوە هـەتا گۆشـەی بـاکووری خۆرهـەڵاتی کەنـداوی عـەرەب درێـژ دەبێتەوە دەبێتە دووبەش:
١-لوڕی بچووك: ٢- لوڕی گەورە.
- لوورەی با: دەنگی بایەکە کـە لـە دەنگـی گڤـە گڤەکەی تیژ و باریك ترە.
- لووراندن: لوورە: لوورەلوور: دەنگی بەرزی سەگ و گورگ.
- لووزەو: بەپڕی هەڵڕشتن.
لووزەوم بەردەسەرێ نامەوێ جورعەی کەم کەم. (هێمن)
- لووس: ١-بێ‌گرێ و لووس و پوس.
بن سکیان لووس هەلقاچین. (بۆرە- ل٧٦)
٢-هەمووی.
- لووسکە: گەنجی بێ موو.
- لووشە لووش: دەنگی وڵاغ لەکاتی دیتنی ئالیك
- لووشـکە: جۆتکـە: لـە قەوەشـاندنی کـەر و ئەسپ و ئێستر.
- لووشین: هەڵلووشین.
- لـوولاك: لـوولاق: ئێـسکی ئەسـتووری نـاو گۆشتی لاق.
- لوول گێچ: گەردەلوول.
- لووله هێن: ئافتاوە: مەسینە: ئامرازی ئاوتێکردنە بۆ دەست شوشتن و دەست بە ئاو گەیاندن.
- لوولوپەڕ: نیلوفـەر: لەیلوپـەر: جـۆرە گوڵێکـە دەڵێن لەگەڵ ڕۆژ دەرچوون سەر لـەئاو دەردێنـی و کەڕۆژ ئاوا بوو گوڵ دەچێتەوە بن ئاو.
- لـوولێ: نـای: نـەی: ئـامرازی مۆسـیقا بـە دەم دەیژەنن.
- لوولێنە: مەسینەی نەخشێنراو.
- لوویت: کەپوو.
- لۆمەکردن: سەرخستنە سەر: سەرزەنشت کردن. نارەزایی دەربڕین دژی کەسێك کە کردەوەی ناڕەوابێ.
لۆیێ: لەبەر ئەوەی.
- لەبەرنانی: ژنی خەریکی نان کردنە.
- لەبـەر بـەرخان: کەسـێ خـەریکی بـەرخ لەوەڕاندن بێت.
- لەبـەر گـاڕانێ: گـاوانی خـەریکی چـەراندنی گاران بێت.
- لەبەر بێرێ: بێری کەخەریکی مەڕدۆشینە.
خۆم لەسەر گردی شام لەبەربێری. (هۆنراوە- ل٣٨)
- لەبەر کۆرێ: لەبەر کۆڵـێ: ژنـێ خـەریکی کـۆڵ کردن بێت. خۆم لەسەرگردی شام لەبەر کۆرێ.

(هونراوه- ل٣٩)

- لەبەر مەڕی: شوان خەریکی مەڕ لەوڕاندن بێت.

- لە: ١- ل: لا: نك.

لە ئەوان: لەوان.

٢-ئامرازی بچووك كردنەوەیە.

برالە: (برالە توونی حەمام پاڕانەوەی بۆچییە) .

(گەدا- ل٢١)

٣-ژ: ژدوورڤە: لەدوورەوە.

٤-دە: دەگەل: لەگەڵ.

- لەبات: لەباتی: لەبریی: زانەویر: لەجیاتی.

بریا لەجیاتی خواردنی گەنم. (گێلە- ل١١٨)

- لەبار: ئامادە.

- لەبارە: ١-لەبار: ٢-لەبارەی.

- لەباربوونەوە: دادانی منداڵ واتە منداڵ بوون.

- لەباك: فێڵباز: خاپیۆك.

- لەبلەبان: لەولەوان: قسەزانی حازر بەدەست.

- لەبەر: سەبەب: هۆ.

- لەبەر چی ڕۆیشتن.

- لەبەر چون: لەبارچون.

- لەبەرچی: لەبەرچ: لۆ: لەبۆ.

- لەبەرگوو: لەبەرەن گۆ: لەبەر ئێوە.

- لە بریی: لەجیاتی.

- لــە بێژنگــدان: گێژكــەكردن: پــاك و پــیس لێــك كردنەوە.

- لەبیر چوون: لەبیر كردن: لەیاد كردن: بیرە و چووگ.

- لەبۆ: لۆ: بۆ: لەبەرچی.

- لەبڕان: لەمشە.

پەلە گۆشتێكت لەبڕان دەبێت.

(بۆرە- ل٨٤)

- لــەپڕ: لــەپڕرا: لــەناكاو: لــەنكاو: لــەهێكرا: لەهیكــەوە: لــەهێكرا: نیــشكنە: كتــووپڕ: یــەك ئەندەروو: ناخلاف: نشكێفە.

لە هیكەوە هەڵمەت دەبات. (بۆرە- ل٧١)

- لەپكە: قۆپچەیەكی شینە لەشــانی منــاڵ قــایم دەكرێ دەڵێن بۆ چاوزار باشە.

- لەپۆرت: نانی هەنجری.

- لەپ: ١-تەپۆڵكە: گرد.

٢-سەربەرەلا: ٣-بەری دەست.

- لەت: پارچە.

- لەتێك شوتی: پارچەك شفتی.

- لەتە: پارچەیە.

- لەتك: پارچەی بچووك.

- لەتكــە نــۆك: ئــاری نــۆك: نــۆكی دووكــەرت دەخرێتە چێشتەوە.

- لەتوپەت: لەتوكوت: لەت لەت.

- لەحن: ئاواز: هەوا: ئاهەنگ: نزم.

- لەجێی چون: لەگەڵ چون: لەجێگە چوو.

- لەچە: لەچی: لەچ: وشەی كات و شــوێن دیــاری كردن هۆدیاری كردن (لە چ دەگەڕێی).

- لەچەك: لەچك: لەچەگ.

- لەچەك كردن: سەرو چاوپێچان بەپەرۆ.

- لە چی: لە چ.

- لە چ ترسای: لەچی ترسای.

- لەخت: جسم: بەدەن: قالب: قەلب.





- لەخۆچوون: بوورانەوە: لەهۆش خۆچوون: لەهۆش چون: - بیاوان بوون.

- لەخش: هەڵخلیسكاو.

- لەخشا: هەڵخلیسكا.

- لەڕادەبەدەر: زیادە لەڕادە: بێ حساب: فرە: زۆر.

- لەدووگەڕان: بەدوادا گەڕان.

- لەڕ: لەغەر: لەر: لاغر.

- لەرزان: ئەوەی ئەلەرێتەوە.

- لەرزانە: ناوی گۆرانییەكی كوردییە.

لەرزان لەرزان هۆ لەرزانە.

- لەرزین: لەرزیان: لەرزان: لەرزسە.

- لەرزەك: لەرزۆك: ١-نەخۆشــییەكە تووشــی ئــاژەڵ دەبێــت و ئاژەڵــە تــووش بووەكــە هــەموو لەشــی دەلەرزێت.

نەخۆشــییەكی كوشــندەیە بــە چــەند ســەعاتێك ئاژەڵەكــە دەكوژێــت لــە ئــەنجامی زۆر خواردنــەوە پەیدا دەبێت.

٢-نەخۆشیەكە مرۆڤ تووشی دەبێ و هەموو لەشی جەلەرزێ.

- لەرزوتا: نەخۆشییەكە لەرزوتای دێتی.

- لەڕیی: زەعیفی.

- لەز: عەجەلە: خێرا (بە لەز ئاگر دەگرێ).

- لەزكردن: عەجەلە كردن.

- لەزگ: لەگژ: خەریك.

- لەزەت: زەلەت: تام.

ئەوەندەم لەزەت لێ دیبوو. (گێلە- ل٨١)

- لەزگین: ١-لەسەر ئاو و ئاگر:

٢-ناوی كوڕانی كوردییە.

٣-خەریكین.

- لەزووبەز: زۆرخێرا:

مەبویك ئانی بەلەزوبەز. (مشتاخ- ل٢٦٥)

- لەزۆ: بە تالوكە: بەعەجەلە.

- لەزیان: لەزین.

- لەژێردا: لەژێلا: لەبەرەوە: لەخوارێدا:

لەژێلابچم: لەبەرەوە بڕۆم.

- لەسەرخۆ: لەسەرخۆ: دژی خێرا.

- لە سەررۆ: بەردەوام: بێ پسانەوە.

- لەسەررۆیشتن: لەسەر ڕۆین.

- لەسەر پێ: ١-وەستاو: وێستاو: ڕاوەستای:

٢-سوار: تفەنگی لەسەر پێیە.

- لەش: بەدەن.

- لەش سووك: قەڵەبە سووك.

- لەشروان: لەسوان: لەسوێیان.

- لەشكەر: لەشكر: هێزی سەربازی.

- لەشــكر بــەز: لەشــكرگا: ئوردگــا: شــوێنی دابەزینی سەرباز.

- لەشگران: قەلب گران.

- لــە شــیرگرتنەوە: شــیربە منــداڵ نــەدان: لەشیركردنەوە: لەشیر بڕینەوە.

- لەغەر: لەڕ: لاواز.

- لەعنەت: نەعلەت: نەفرەت: نەحلەت:

شەیتان بەنەعلەت بی.

(بۆرە- ل٦٦)

- لەغەم: لەخەم: تونێل.

- لـــــەقنارەدان: لەقـــــەنارەدان: هەڵواســــــین:
لەسێدارەدان: خنکاندن: ئیعدام کردن.
- لەقە: لووشکە:
لاق وەشاندنی کەر و ئەسپ و ئێستر.
- لەفز: لەبز.
هەرکەسێکی بە لەبزێکی شیرین زیارەت بکا.
(تحفە -٢- ل٢٠٣)
- لەقەم: ١- ڕەخنە: ٢- لەقەب: نازناو.
لەقەم گرتن: ڕەخنە گرتن.
- لەقەوەشێن: چەموش.
- لەقین: ١-لەقان: ٢-لەرِك.
- لەك: ١-سەت هەزار.
٢-عەشیرەتی کوردە.
- لەکاردەرهاتوو: لەکڵ دەرهاتوو.
- لەکۆڵەڕۆ: تووك: نزا.
- لەکوێ: لەکێ: لەکۆ.
- لەکۆڵدان: دوای ئەوەی (کر) لە شەپکە دەئاڵێنن دەیخەنەناو کۆل و بەزەمۆمە توندی دەکەن تاکرەکە دەق بخوات ئەمەپێی دەگوترێ لەکۆڵ دان.
- لەگام: ماستاوچی: کـوس کـێش: شـان تـەکێن: مەرایی کەر: جامەلوسکە.
- لەگە: لەگەڵ: لەگەر: دەگەل: ڕەگەل.
- لەگرە: لێرە: لەگرنە.
- لەگرەودووا: لەمەودوا: لـەناوپاش: لەمــەوپاش: لەمە بە دواوە.
- لەگژ: خەریك: لەزگ: کار ڕاپەراندن.
- لەگلەگ: لەق لەق.
- لەگوون: لەگێن: لەگوێن: گونجاو.
- لەلەنگی: پارچە هەویری ناورۆن.
- لەم سوتی: سك سوتاو.
(ئیدیۆم- ل٣٨٣)
- لەم: ١-زگ: ٢-لەو.
- لەما: لەبەرئەمە.
- لەماك: فێڵباز.
- لەماژی: هەر بۆیەش.
- لەمە: ١- زگ: ٢-لەوە.
- لەمەو بەر: پێش ئێستا.
- لەمەودوا: لەمــەوپاش: لەنــەوپاش: لــەداهاتوو: لەناوپاش: لەئێستا بەدواوە.
گوتم لەمەو دوابێدڵت ناکەین.
- لەمپــە: لامپــا: لالــە: ئــامرازێکی ڕوونــاك کردنەوەی شەوانەیە.
- لەمپەر: ١-هاریکار: ٢-کۆسپ: ئاستەنگ.
- لەمن وابی: لەموابی: وامزانی: وەمزانی.
- لەمنت کەوێ: لـەمنت کـەوی: وشـەی هانـدان بەزۆر جۆری تریش دەگوترێ.
- لەخاڵت کەوی: لە مامت کەوی، لـەداکت کـەوی: لەبرات کەوی، لە خوشکت کەوی، لەوچاوەت کەوی، لەمنت نەکەوی: وشەی سەرکۆنەکردنەو دڵ دانەوە
لەمنت نەکەوی هەرگێش مەدێ.
- لەمێژ: لەمێژە: دەمێکە.
لەمێژە سزای ئەم شامی کەبابەنە دەچێژم.
(گێلە- ل٨)
- لەن: دوورگە.





- لەناکاو: لەنکاو: لەپڕ: لەهیکەوە: لەهیکرا.
- لەناو: لناڤ: لەنێو: لەدوڕ: لەهەن دوڕ: دەنێو.
- لەنج: ١-عیناد: لاسار: سەهەند: ٢-جەغت
- لەنجە: ١-عیشوە: ٢- ناوی کچانە.
- لەندەهۆر: زەبەلاح.
- لەنگۆ: لەئەنگۆ: لەئێوە.
لەنگۆوایە میوان حەیوانە.
(تحفە-٢- ل١٣٧)
- لــەنگێزە: بــارانی بــەهێز: ڕەهێڵــە: لێزمــە: بارانی بەخوڕ.
- لەو: ١-لەئەو: ٢- لەم.
لەو دەمەیدا گوێ هەڵدەخەن بۆ تارێ.
(تاریك و روون- ل)
مەلا حەسەن هاتووە لەوێوە.
(تحفە-٢-ل١٣٨)
- لەواشــە: ١- جۆرەنــانێکی تۆزێــك ئەســتوورە بەتەندور دەکرێ.
٢-لۆچـکە: پارچـە دارێکـە بـە ئەنـدازەی زیـاتر لەبستێك درێژە، پـەتێکی ئەسـتووری درێـژ هـەر دووسەرەکەی ئەبەسـترا بەسـەرێکی دارەکـەوە بـۆ ولاغی چەمووش بـەکاردێت لـەکاتی نـاڵ کردنـی لێوی ولاغەکەی پێ دەبەسترایەوە.
- لەوانە: ١-لەئەوانە: ٢- شوان.
- لەوەبەر: بەر لەئێستا.
- لەوەتی: لەوکاتی: لەوەختی: لەوەتا:
لەوەتی ئەو ڕۆشتییە.
لەوەتی ئەتوو لێمان دەپرسیت.
- لەوەڕ: پەراغ.
بۆ لەوەڕ چوو..
(بۆرە- ل٥٨)
- لەوەڕاندن: چراندن.
- لەوەڕگە: لەوەڕگا: شوێنی لەوەڕی زۆر بێت.
- لەوەڕین: لەوەڕان: تێرگیابوون.
- لەوەندە: لەئەو هەندە: لەوهەندە: لەوەندە.
لەوەندە زیاتر نادەم.
- لەوجڕ: زۆروەڕ: لەوچە: چەنەباز.
- لەوچە: قەوچە: لەوچ.
- لەوچەتی: زۆروەڕی: زۆر گۆتن: چەنەبازی.
- لەودە: لۆدە: لۆد:
چـواردیواری بەقـەد پـشتێنەی زەلام بڵنـد دەبێـت دوودیواری درێژ ئەو سەر و ئەم سەری وەك خانووی جزیرەی بەسـێ گۆشـەی دیوارەکـەی دروسـتکراوە کای تێدەکرێ.
- لەوڕا : لەئەوڕا.
- لەورە: لەوێ: لەئێرێ.
- لەیلا: لەیلێ: لەیلە:
١- ناوی کچانە : ٢-دلبەری مەجنون بووە.
لەوساوە: لەئەوساوە: لەوکاتەوە.
- لەوێ: لەوێ: لەئەوێ.
- لەوێدا: لەئەوێدا.
- لەوێندەرێ: لـە ئەوێنـدەرێ: لـەوێ: لـە ئـەوێ: لەوێدەرێ.
- لەوێرا: لەئەوێرا.
- لەهە: پارچە.

- لەهجە: شێوە: شێوەزار: دیالێکت: زار: جۆرێکی تایبەتی ئاخاوتنە لە کۆمەڵە مرۆڤێکی نێو ناوچەیەکی دیاریکراو بە کاردەهێنێ و لەئەنجامی دەساوێژێکی تایبەتی سەرهەڵدەدا وەك شێوە زاری گەرمیانی، بادینانی.
- لەهی: لافاو.
- لەی: لەو.
لەی ماڵە: لەوماڵە.
- لەیرە: لێرە: لەئێرە.
- لەیلووك: لەلووك: لەلو.
- لەیز: رەقس.
- لەیزاندن: سەما.
- لەیزین: یاریکردن: لەزتن: لزین: هەڵپەڕین.
- لەیلاخ: کوێستان.
- لێ: بەڵام: بەڵان: بەلانکێ.
- لێ بووردن: عاف کردن: لێ بوورین: لە گوناح خۆش بوون.
- لێ بووردوو: لێ بوور: لێ بوورەر.
- لێبان: ماددەیەکی لیچە کە کار و بەرخ لە دایکیان بەردەبنەوە بە لەشیانەوەیە دایکەکەیان دەیلێسنەوە.
- لێپرسراو: مەسئوول: بەرپرس.
- لێ پێچانەوە: لێکۆڵینەوە.
- لیتاڤ: لیت و قوڕاو.
- لیتۆکە: ئیهتمام.
- لێکۆکە: دمۆر.
- لێ خڕێنە: شقارتە: شەمچە.
- لێ خور: شوفێر: هاژوەر.
- لێخن: لێدەن.
- لێڕ: دارستان: لێڕەوان.
- لێرە: لەئێرە.
- لێزان: ١-زانا: ٢-ناوی کوڕانە.
- لێزم: خوێش: قەوم: کەس.
- لێزماو: لافاو: لێشاو: لشت.
- لێزمە: ١-بارانی بەخوڕ: ٢- ناوی کچانە.
- لێزمت: خزمایەتی: خزفاتی.
- لێژ: سووکە: شوێنێك ئاو رانەگرێ.
- لێژنە: لنجە: چەند کەسێك بۆ سەرپەرشتی و کار راپەڕاندن.
- لێستن: لێستنەوە.
- لێشاو: لافاو.
- لك: ١-لۆ: تشبو: سۆ: تشپۆ: برزك: لڤك: لف: تەشك: ناسۆر.
٢-چل: لق: ٣-سێ پەلە پێشمەرگە.
- لێفانە: موبالەغە.
- لێفە: لیف: لحیف: لیحاف: لحێفك.
(شەڕ لەسەر لێفەی مەلایە). (پەند)
لێفە شڕەکەی بەشانیدادا. (گەدا- ل٢١)
- لێڤ: لێو.
- لێگدی: لەیەکتری.
- لێلاو: قوڕئاو: قوڕاو.
- لکاندن: لکانن: نووساندن.
- لێ لێ: وشەی بانگ کردنی کچ لەلاوکی کوردی.
- لێمشت: لافاو.
- لێن: لێمان.





- لێن گەڕێن: لێمان گەڕێن: وازمان لێ بێنن.
- لێن ناگەرێ : لێمان ناگەرێ.
- لێنان: خواردن دروستکردن.
- لێو: ١-لچ: لەب: لێڤ:
٢-قەراغ: گوێی: رۆخ: ٣-لێتان.
- لێوار: قەراغ: رۆخ: کەنار: گێ: لێو.
- لێوان: جامی ئاو خواردنەوە: فافۆن: جام.
- لێوە: شێت: لێوە: دێوانە: پەتیار:
دێوانەم دێوانەم
دێوانەم بە دوای خێڵی
- لێویا: شێت بوو: دێوانەبوو.
- لێویام: تێکچووم.
- لێوەلەرە: لێوە لەرزە:
لێوە لەرزە لەسەرمان یان لەترسان.
- لیپۆز: لمبۆز.
- لێهاتوو: لێ هاتی: زرینگ: بەکار: کاربین.
- لیر: ئاوسانی پێست و خورانی: لیرگ: کیس: بلۆق: لر.
- لیراندی: لوراندن.
- لیستك: بووکە شووشە.
- لیڤۆك: لیۆك: قەشمەر: حەنەکچی.
- لینگ: پا: پێ: قاچ.
- لینگیدا: غاری دا: رای کرد: هەڵات: هەرات.
- لینگە: تاك: هاوتا.
- لینگەی نییە: تاکی نییە.
- لینگدان: غاردان: راکردن: هەراتن.
- لینگ دەدەی: غاردەدەی: رائەکەی: هەڵدێی: هەردێی.
فەرخۆڵە بۆوا لینگ دەدەی چت لێ قەوماوە.
(تحفە- ل٩١)
- لینگیان دامێ: غاریان دامێ (لینگیان دامێ دەستەو خەنجەر).
(زیرەك)
- لیکاو: لییك: لکاو: ئاوی دەم: دەم ئاو.
- لیوان: ١-گۆزەلە: ٢-لیوان:
- لێهاتی: شیاو: شایان: شانۆ.
- لیلوفەر: نیلوفەر: لەیلوپەڕ: ناوی گوڵێکە.
- لیمو: لیمۆ: میوەیەکە لەتیرەی پرتەقالە ترشە.
- لێ گێڕانەوە: بانك کردنی خەڵك.
بۆ سەرشایی بووك گواستنەوە لەماڵی زاوا.
- لێکۆڵینەوە: پەیجۆری.
- لێنەڕین: لێ نۆڕین: سەیرکردن: تەماشاکردن: دیقەت دان: لێ نواڕین.
- لێکرا: هەڤدە: هەموو.
- لێکراوەرن: هەڤدە وەرن.
- لێی وەبڕە: واتە بڕەوە: بێ دەنگ بە (لێی وەبڕە قەمەر).
(حەمەدۆك)
- لیبیان: لە دار دروست دەکرێ لە شێوەی کەلەی هێلگە بۆ سەر بەفر گوندنشین لە پێی ئەکەن بۆ ئەوەی پێیان لە بەفر نەچێتە خوار.

# م

- بەم پیتانە دەنگ گۆڕکێ دەکات:
١-بەپیتی (و) دەنگ گۆڕکێ دەکات:
سمێل: سوێل.
دەم: دەو.
زەمین: زەوین.
نیم: نیو.
تام: تاو.
٢-بە (ڤ) دەنگگۆڕکێ دەکات.
دەم: دەڤ.
جمێن: جڤین.
جمان: جڤان.
٣-هەندێ جار بە (ن) دەنگگۆڕکی ئەکات:
شەمبە: شەنبە.
بەرامبەر: بەرانبەر.
عەمبار: عەنبار.
- م: ١- من: ٢-جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك (دەستم).
- ما: ١-نەمرد: ٢-مێ: ٣-مانگ:
٤-ماه: چیای سەخت.
٥-چما: مادین هەر ئەوییێن دەچنە چولی.
- مات: بێ دەنگ: کڕ: غەمبار.
- ماتانێ: کەلایانێ.
- ماتاو: مانگەشەو.
- مابەین: مەعبەین: مەعبێن: مابێن: نێوان: بەین:
ئەوە لە نێوان من و تۆدا هەیە تا میری بکەوێتە مەعبێن.
(غەوارە- ل٧١)
- ماتە: ١-تەداوی کردنی برین:
٢- فەریك.
- ماتەل: مەحتەل.
- ماتڕ: پشت قوونی ئادەمیزاد.
هەندیان بەماتڕی دادا.
- ماتێن: ماتانێ: کەلایانێ.
- ماتۆڕ: پەرەمز: پرمێز.
ئامرازێکی ئاگرە بۆ چێشت لێنان و ئاو گەرم کردن بەکار دێت.
- ماتێ: کزی: بێ دەنگی.
- ماچ: مووچ: ماچۆ: ماچك: راموسان: رواس: چك: مۆچ: (ئەم شەو دووشەوە نەمکردووە ماچێ).
شەو ژوان راموسان و دەست لەملانێ.
- ماچا: ئەڵێن: دەڵێن. (غەوارە- ل١٢٦)
- ماچان: ١-کۆی ماچ.
باجگر و ماچ ئەستێنی ماچان بام لەسەر پردی رواندزێ.
٢- دەڵێن: ئەڵێن.





- ماچی: ١-مووچی: ٢-ئەڵێیی : دەڵێی.
- ماچی هەور و هاریا: دەڵێی هەوری بەهارە (ئیدیوم). (ل٣٨٥)
- ماچێش: ماچێکی.
- ماچە: مێینەی کەر و ئێستر.
- ماخرا: ماڵ خرا: ماڵ خراپ.
١-تووك دوعایە.
٢-وشەی سەرکۆنەکردن.
ئەمان و ماخرا چمانە ئەتو تزانی (لاوك- ل٢٣)
- ماخەر: ماکەر: مێینەی گوێ درێژ.
- ماخۆ: خێو: خاوەن: ماڵخۆ: ماڵخوێ: ماڵخی ماڵ: ساحێب: ساحێو.
ئەو زمانە سەگباب خێوەی منیش.
(گێلە- ل٨٠)
ماڵ بە ماخۆی نەچێت حەرامە.
(غەوارە-ل٩٤)
- ماخۆلیا: شێت.
- ماخۆمردە: وشەی بێزاربوون.
لەشتێ کەدەتەوێ ناوی نەبەی.
- ماد: چەند هۆزێکی ئاری زمان بوون کەبەر لەسەردەم و رۆژگاری هەخامەنشینەکان لەبەشێکی زۆری سەرزەمینی ئەمڕۆی ئێراندا دەوڵەتی جۆربەجۆر و پادشایەتیان هەبووە.
- مادا: کورد.
- مادام: مادامەکی: کەوابوو: کەواتە.
مادام وایە هۆبالی خۆت بەئەستۆی خۆت.
(گێلە- ل٥٦)
مادامەکی پێی نایە ئێرە لەسەری دەڕوات.
(غەوارە- ل٤٧)
- مادانگ: تۆق.
- مادەك: گامێش.
- مار: ١-مەعر: ماعر: باشقیبان:
(جۆرەکانی مار: ١-سفرە مار: ٢-سەرمێوژە:
٣- کەومار: ٤- زەردەمار:
٥- رەشی مار: ٦-تیرەمار): کۆمار.
٢-لەکاتی جووتکردن بەهەوجار بەرکولە یاسەرخە دەدرێتە پێشەوەی بەینی مژانە و باسکە هەوجار هەوجارەکە نووکی گاسنەکە مارەدەبێ زۆر ڕکە لەگەل زەوی ناکات.
٣-ماڵ.
- مارا: دێنن: دینن.
- ماری شوشە: ماری شوشەیی:
جۆرە مارمێلکەیەکە قاچەکانی زۆر لاواز و بچووکن یان بێ قاچ و دەستە.
- ماری بازدەر: تیرەمار: کولەمار:
مارێکی باریکی مەیلەو سوورە باز دەدات.
- ماری زەنگولەدار: مارێکە کە دەجوولێت دەنگێکی وەکو زەنگوڵەی لێوەدێت.
- ماران: ١-سەرداب: ٢-ماڵان:
٣-دێنن: دینن: بێنن.
- مارانگاز: مارانگەست: مارگەستی.
مارگەستی ژوەریسی دەترست. (مشتاخ- ل٢٦٢)
- مارە بەجاش: مارەوەجاش: مێردی ئەیرەتی.
- مارەبڕای: کچی مارەکراوە.

- مارەبڕین: مارەکردن.
- مارەبڕانە: ئەو پارەیەی مەلا وەریدەگرێ.
لەکاتی مارەکردنی کچێك کوڕێك.
- مارەزیو: هەزارپێ.
- مارەکە: زینی ئەسپ.
- مارەکەر: زیندروو: ئەو کەسەی زینی دەدورێ.
- مارەزا: یەکەم ریخی کار و بەرخە.
لەدوای لەدایك بوونیان رەنگی زەردە.
- ماربار: مارگر: ئەو کەسەی ماری دەگرێ.
- مارەکۆڵ: دووپشك: کلاژدووم.
- ماردە: مردە: سوو: ربێدە:
قازانجی پارەی بەربێدە دراو.
- ماردەخۆر: مردەخۆر: سوت خۆر.
- مارەیی: ریێ: نەخت: ئافرەت لەسەر مقدارێك
پارە یان زێڕ مارەئەبڕێ ئەبێتە موڵکی ژنەکە.
- ماربێچ: حەلزونی: چەقچە قۆلە: پێچ
پێچۆکە: قەپووچکە : قەپووشکە: میزەگا:
پێچ لوولی.
- مارەدەم: جۆرە تفەنگێکە.
- مارف: مەعرف: مەعرفە: ناوی کوڕانە.
- مارستان: نەخۆشخانە: خەستەخانە:
شوێنی تایبەتی نەخۆش چارەسەرکردن.
- مارگەزتوو: مارگەستی:
مارگەستی لەگوریس دەترسێ.
- مارگیسك: جۆرەمارێکە.
- مارمارانێ: جۆرەیارییەکی منالانەیە.
- مارماسی: جۆرە ماسییەکە

- مارمژ: ئامرازێکی ژەهر مژینە لە کەلەشاخ
دروست دەکرا.
- مارمێلکە: مارمێلوك: مارمێلوۆ: پیسپیسۆك.
- مارنەگەز: جزمە: جۆرە پێلاوێکی لێوار درێژە.
- مارۆ: دێنێ: دنی.
- ماریی: ١-مێیەی هەندێ چۆلەکە.
٢-ئەهێنێ: دەینێ.
- ماریم: ١-ئەمهێنێ: دەمێهنێ.
٢-مالیم: گەسکم دا.
- مازگ: مازی: مازوو.
- مازلۆخ: مافور.
- مازماز: بەرخ: بێچوی مەڕتاکو (٦) مانگ.
- مازوورڤان: کەی وانوو: کەی بانوو.
- مازۆ: ئەهێلێتەوە.
- ماژۆ: لێ مەخورە.
- ماژۆن: لێ مەخورن.
- ماس: ١-عاشق: ٢-ئاوسان:
٣- ماست: ٤- سپی.
- ماعدا: مەعیدە: گەدە.
- ماسان: ئاوسان: ئەستوربوون.
- ماسە: ١-ماستە: ٢- لمی ورد.
- ماسبزان: شارێکی کوردییە لە لوڕستان.
- ماست: ماس: قاتخ: مێست: ترۆلە:
هەس: هەس و هۆل: هۆل.
شیری گەرم کراوی هەوێن تێکراوی ساردبووە.
- ماست دروستکردن: شیرەکولێنن ماوەکی کەم
لەسەرزەوی دادەنرێت تا تۆزێك سارد دەبێتەوە





گەرمی تۆزێك بمێنێت هەوینی تێدەکرێت دنیا
سارد بێت گەرم دادەپۆشرێ دنیا گەرم بێت لە
جێگای فێنك دادەنرێت.
- ماستی هەولێر: ماستی هەولێر زۆر بەناوبانگە
لەبەر ئەوەی لەوەڕی دەشتی هەولێر زۆر بەهێزە
دەبێتە هۆی چەوری ماستەکە و مەڕی زۆرە لەگەڵ
چاك دروست کردنی ماستەکەش.
- ماستاو: ئاوماست: ماستەوا: دۆ: ماست و
ئاوی تێکەڵاو.
- ماسیان: ئەستووربوون: ستوربوون:
ئاوسان: پەنمان.
- ماسك: بەخیل: حەسوود.
- ماسی: ١-ماهی: مایی: ماساوی: مەعسی:
گیانداریکی شێوە درێژە و پەرداره لەش بە
پوولەکەیە مەلەوانە و ئاوییە: ٢-زۆر لووسە:
(لەشی دیلی ماسییە)
بۆچی ئەمنیش ماسی نەفرۆشم.
(گێلە- ل٨٥)
- جۆری ماسی:
١-ماسییەپانکە: ٢-ماسییە زەردە:
٣-ماسییە گولە:
٤-ماسی سوور: ٥-مانگا ماسی: ٦-مرتالە.
(ماسی لە ناو ئاو مامەڵەناکرێ).
ماسیاگ: ماسیاو: ئەستوربوو.
- ماسییەوان: ماسی گر: ئەو کەسەی لە رووباران
ماسی دەگرێ.
- ماسەوا: خوورەوشت: ئەدەب.

- ماش: خواردەمەنییە لەتیرەی دەغلە.
- ماشاندن: ١-تواندنەوە: ٢-شۆفاری.
- ماشە: مقاش: مەقاش: پەلگرك: پەنگرکێش.
- ماشەی تفەنگی: چەخماخەی تفەنگ:
باقەنەزمە: میلی تفەنگ کە فیشەکی پێ
سوار دەکرێ.
- ماشتن: مالێن: گسك دان: خاوێن کردنەوە.
- ماشیان: مالیان: مالیان: خاوێنیان کردەوە:
گەسکیان دا.
- ماشیم: مالیم: گەسکم دا: گەسکی داوە.
- ماشیتی: مالیتی: خاوێن کردەوە.
- ماشێن: تورمبێل: تورمبێل.
- ماف: ١-چەق: ٢-پەیوەندی.
بۆچی کەویش مافی ژیانی نییە
حەققی کەژ و کێوی جوانی نییە
(شیعری مەلا ئاوات)
- مافور: مەهفور: مافویر: مەحفیر: فەرش:
مافویر: قالی: سجادە:
١-رایەخێکی بەنرخە بەتەون دەچێنرێ، زۆر جۆری
هەیە وەك سەرەناز، لاکێش:
٢-لەم بەشانە پێکدێت : ١- لێوار،
٢- رەوشت، ٣-مێراب،
٤- قوچەك، ٥-سیوەرۆك،
٦-سپیلك، ٧- ساکار.
٣- ناوی مافور: ناوی عەردەکەی بە
رەنگەکەیە وەکو ناولەسوور، ناولەڕەش،
ناولەزەرد، ناولەکەسك.

٤-نەخش و نیگارەکەی: نیگاری جوان جوان مافور دەرازێنرێتەوە وەك (رەشبەلەك، فنجـان گوڵەسـێو، قەمزە و توشتی، پێ قلە، ئەستورك).

- ماقول، ماقویل، مـەئقول: پایەبـەرز، شـەریف، مەزن، بەرێز.

- ماك، ما، مێ، مەها، مێینە، ماینە.

- ماکەو: مێینەی کەوێ.

ماکەوەکە بەهەشتی گیانداران و بوارەکەی.

(بۆرە- ل٤٦)

- ماکاو: دابەش کردنی مەرەزە بۆ ئاودان.

- ماکەر: مۆکەر: ماخەر: ماهەر.

- ماکدەر: سەرچاوە: مەسدەر: ژێدەر.

- ماکێش: پارزونگی برنج: برنج پاڵێو.

- ماگە: ماوە: مایە.

- ماڵ: ١-حەق: ٢-ژن و منداڵ:

٣-سامان: ٤-خانوو: ٥-ئەسپ.

ماڵا:١- ماڵیەوە: ماشیەوە: ٢-یەکـەم کـەس لـە یاری ماتانێ تیر دەهاوێ.

- ماڵات: مالیات: مەڕ و ماڵات سپان رەشان گاو گۆلکیش ئەگرێتەوە.

- ماڵاڤا:١-ماڵئاوا: ٢- ناسیاو.

- ماڵاڤایی: ئاوەدانی.

- ماڵاو: مەلەوانی.

- ماڵاوە: هەڵماڵی: دووعـای پاداشـت دانەوەیـە: پاداشت نەوەیە؛ واتە ماڵت ئاوەدان بێت.

- ماڵە : ١-مـالنج: ٢- مـاکی رەشـی لـەدەم و چاوی ژنی زگپڕ دەردەچی.

- ماڵەباب: ماڵەباوان: ١-کەس و کاری ئافرەت: ٢-کەس و کاری مێرد.

- ماڵەر: کەناس: مالشتە: خاوێن کەرەوە: ئەو کەسەی وڵاتی خاوێن دەکاتەوە.

- ماڵبڕین: دزینی ماڵ: ماڵ دزین.

- ماڵخێر: جۆرە تفەنگێکە.

- ماڵد: مالت: مارت: ماڵی تۆ.

- ماڵدار: دەوڵەمەند: بگر.

- ماڵزارۆك: ١-زێ:

٢- منداڵدان.

- ماڵستە: نەقاش: نەقشچی.

- ماڵشتە: ماڵەر: کەناس.

- مالك: کوخ: خانووی بچووکی هەژاران.

- ماڵکەتی: لات: موفلیس: هەژار: نەبوو: نەدار.

- ماڵماڵۆك: جۆرە شاییەکە.

- ماڵ ماڵ: ١-ناوی کوڕانە: ١-پڕ.

- ماڵمێڤان: مێوان خانە: ژووری مێوانان.

- ماڵوەدەر: کاتی خەڵك دەچێتە دەرەوە لەبەهارا.

- ماڵۆس: بەرازی مێ: دەڕ.

- ماڵۆسکە: رەوسە: گەنمی لەکا جوێی کراوە.

- ماڵۆك: حەوزێکی بەخشت دروست کرابووە شـلەی سابوونی تێدەکرا لە کاتی سابوون دروست کردن.

- ماڵ و منداڵ: ماڵومنداڵ: مارومندار: خێزان.

- مـاڵوێران: مـاڵ خـراپ: ١-خـانووی رووخـاو: ٢-بەدبەخت.

چ دەکەن ماڵ وێرانینە.

(بۆرە- ل٦٣)





- ماڵهات: شازادە.

- ماڵوێنچە: ملەوێچە: رووەکێکی پزیـشکییە بـۆ رەوان کردن باشە.

- ماڵیات:١-باج: ٢-ماڵات.

- ماڵی: رام: کەوی: دەستەمۆ:

وەك بەرخی دەستەمۆ دوای کەوتم. (گیلە- ل٣٩)

- ماڵێمە: ماڵی مە: ماڵی ئێمە.

- ماڵیە: دەغل و دانی مایەوە بۆ کشتیار.

دوای تاپۆی ئاغا و زەکات و سەپانی لێ دەرکردن

- مالیش: سریەوە.

- مـــاڵێن: گەســـکدان: پاشمـــاوە کۆکردنـــەوە خاوێنکردنەوە.

- ماڵی دنیا: ١-پارەوپوول: ٢-سامان.

- مالەیل: ماڵان : ماران.

- ماڵی دنێ: ماڵی دنیا.

- مـام: ١- ئامـك: مـامۆ: ئـاپ: ئـاپۆ: هـاپۆ: مامك: ٢- نەمردم.

- ماما: ١-مامە: وشەی بانگ کردنی مام.

٢-نەنك: ٣-ئەوهات.

- مامادی: مام ئادی: مام هادی.

فەرخ کوڕی مامادیە. (تحفە -٢- ل٥٤)

- مامالە: مامالی: عەنکەبوت: جالجاڵۆکە.

- مامان: ١- ئەهاتن: ٢-پەژاچ:

ئــەو ئافرەتـــەی یارمـــەتی ژن دەدات لـــەکاتی منداڵبوون و ناوکی منداڵەکەی دەبڕێ.

- مامە: وشەی بانگ کردنی مام.

٢-نەنە: ٣-ماوم.

- مامە حۆجی: لەفەی نان.

- مام جێژنۆکە: مام دەرزیلە: گیایەکە.

- مامر: مریشك.

- مـام رێـواس: جۆرێکـە لـەرێواس دەرمـانی کرم کوشتنە.

- مامز: ئاسك: ئاهو: شکار.

- مامزە: مامێز: ئامرازی لێخورینی وڵاغ.

- مـامزاوە: ١-نـاوی گوندێکـە لـە ناوچـەی شەمامکی دەشتی هەولێر.

٢-ناوەکەی لەوەوە هاتووە کاتی خۆی شوێنی ئـەم گوندە جۆگـەی ئـاولێ بـووە هـەموو کاتێـك رەوە مامز لەسەر ئەم جۆگەیە بـووە و کاتێـك ئـاوەدان کراوەتەوە ناویان ناوە مامزاوە.

- مامك:١-مەتەڵ: ٢-ناوی کوڕانە: ٣-مامك.

- مامۆ: ١-مامە: ٢-ناوی کوڕانە.

- مامو: ١-مامتان: ٢-مامان.

- مامۆتك: مامۆرتك: راوێژکەر: زیرەك.

- مام مۆرتك: ١-مامۆتك:

٢-کەسایەتییەکی زیـرەك و زانـا و زۆر بـەرێزبووە بەتەکبیر و رای ژیرانە ناوی دەرکردووە زۆر نوکتە و قسە و تەکبیر لە زمانی ئەوەوە ئەگێڕنەوە خـەڵکی وەرتێ بووە.

- مامۆخ: مامۆك.

- مامۆزا: ئامۆزا: کوڕە مام یان کچە مام.

- مامۆژن: ئامۆژن: ژنی مام.

- مامەڵە: معامەلە: کڕین و فرۆشتن: مەعامەلە: ملە: ماملەت: سەودا.

- مامۆستا: مامۆستا: مام وەستا: مامەستا: ماستا: سەیدا.
١- وشەی ڕێزلێنانە بە فەرمانبەری میری دەگوترێ.
٢-بەوانەبێژی قوتابخانەکان دەوترێ.
٣-بە زانا(مەلا)ی ئایینی دەگوترێ.
مامۆستاکەمان پیرەپیاوێکی..
(تاریك و روون- ل٧)

- مامیران: گوشاد: گیاتاڵە:
جۆرەگیایەکە کێوییە گوڵێکی شین دەگرێت بۆ دروستکردنی مەی بەکاردێ هەروەها دەرمانی چارکردنی گیانداری لێ دەردەهێنرێت.

- مانا: موعنا: مەعنە: پەژن:
ئەو کارە مانای چییە. (گێلە- ل٥٨)

- مانقر: ماقر: جۆرە دراوێکی بێ نرخە.
- مانەکی: ماندوویەتی: ماندیەتی.
- مانگوڕ: کچی عازەب: بەربەخت.
- ماند: ئاینده: داهاتوو.
- ماندوو: ماندی: مانوو: مانیاگ: ڕەتیاگ: ڕەتاو: شەکەت: ماندگ: ماندك.
تاشەکەت بوون هەڵپەڕین. (بۆرە- ل٦١)

- مانای وشە: مانای وشە دەبێتە دووجۆر:
١-مانای حەقیقی:
بەو مانایەی وشە دەوترێ کە ڕاستەخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقعی نیشاندەدات وەك
ئاگر کردنەوە: ئاگر لە شوێنێ بەردان.
٢- مانای مەجازی: بەو مانایانەی وشە دەوترێ کە ڕاستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزووعی واقیعی نیشان نادات، بەڵکو لەڕێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا مانا دەدات.
وەك:
کەر: بێ عەقڵ: شێر: ئازا.
ریوی: مروڤی فێڵباز.
بێ سێبەر: مرۆڤی بێ سوود.
پاك: مرۆڤی بێ زیان.
ژن: بێ غیرەت.
نەرم: مرۆڤی لەسەرخۆ.

- مانگ: ما: هەوی: هەیڤ: مەه: هەیو: کاوت: مۆنگ.
١-سی رۆژ: ٢-ئەو تەنەی لە دەوور زەوی دەسوورێتەوە، ڕۆناهی بە شەڤ دەدات، مانگی ئاسمان کە بە بەردەوامی لە گەورە و بچووکی دایە کە بە گوێرەی تەمەنی دیاریدەکرێت.
١-مانگی یەك شەو.
٢-مانگی نێوەتابان.
٣-مانگی تابان.
مانگا: چێل: مگاو.
مانگانە: ١-مووچەی سی رۆژ.
ڕەنگ بوو داوای مانگانەش بکات (گەدا- ل٦٤)
٢-ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارەی لە مانگێك دەردەچێ.

- مانگە شەو: مانگە رۆژ: تاڤە هەیڤ:
شەوێك مانگ بەدەروەبێ.
- مانگ روو: ١-ناوی کچانە:
٢-رووی جوان وەك مانگ.
- مانگی تازە: مانگی یەکشەوە.





- مانگی چاردە: ئاخیری رۆژی تەمەنی مانگ.
- مانگەك: مانگێك: مەهەك.
- مانگیران: ماگیرسە .
- مانگی کوردی: لەمانگی نەورۆزەوە دەست پێ دەکات شەش مانگی بەرایێ (٣٠) ڕۆژن و شەش مانگی دوایش (ڕەشەمێ) نەبێت دەبێتە (٢٩) ڕۆژ مانگەکانیش بەپێی شوێن و وەرز هەر لایەکیان ناوێکیان بۆ داناوە.
یەکەم مانگی کوردی: (نەو+ ڕۆژ) (نەورۆز) واتا ڕۆژی نوێ سەبارەت بەناوی جەژنی نەورۆزەوەیە کەوا لەیەکەم ڕۆژی ئەو مانگەدایە و ڕۆژی ڕزگاربوونە لەسەرما و سۆڵەی زستان ئەم ناوانەشی هەیە (ئاخەلێوە) خاکەلێوە، هەرمێ پشکون.
دووەم مانگی کوردی: بانەمەر: مەڕ و چوار پێ شەو لەدەشت دەبن شوان بەدیاریانەوە، چونکە لەوکاتە لەوەڕ زۆرە مەڕ نایەتەوە ناوئاوایی، ئەم ناوانەشی هەیە: گوڵان، نیسان: هیلانەمە: پتر خور: شەستە باران.
سێیەم مانگی کوردی: جۆزەردان: جۆزەرد دەبێت ئەم ناوەش هەیە بەختەباران، باران بڕان،باراوشان.
چوارەم مانگی کوردی: پوشپەڕ: گیاوشك دەبێت و دەبێتە پوش ئەم ناوانەشی هەیە:
پووش کال، زەخیران، خەزیران، مردارەمانگ.
پێنجەم مانگی کوردی: خەرمانان: ئەم ناوانەشی هەیە، جۆخینان، مێوە گەنان، تیرمە.
شەشەم مانگی کوردی: گەلاوێژ: گەلاوێژ هەڵدێت و ئەم ناوانەشی هەیە (تەباخ، مشتاخان).
حەوتەمین مانگی کوردی: ڕەزبەر: ڕەزی ترێ دێتەبەر و میوە پێ دەگات ئەم ناوەشی هەیە ئیلون.
هەشتەمین مانگی کوردی: خەزەل وەر: خەزەل بەموکریانی گەڵا واتا گەڵای دار دەوەرێت ئەم ناوانەشی هەیە:
گەڵا ڕێزان، باران پەلە، چریەیەکەم.
نۆیەم مانگی کوردی: سەرماوزە: واتە مانگی سەرماهێ نەر، ئەم ناوانەشی پێ وتراوە (بەروبەز، چریەدووەم، گردوز، کەو بەردار).
دەیەم مانگی کوردی: بەفربار لەم مانگی کوردی بەفر دەبارێ.
یازدەم مانگی کوردی: ڕێبەندان: لەکوێستاندا لەبەر بەفرێ ڕێ لە ڕێبوار دەگرێت:
(چلەشور) پێ وتراوە.
دوانزەمین مانگەی کوردی: ڕەشەمێیە: لە ناوچەی هەورامان ژن لەبەر هەتاو لەم مانگە دابنیشن دەم و چاویان ڕەش دەبێت ئەم ناوانەشی هەیە (داراوس، میش پەڕ، ڕەشەما، کۆلەمانگ).

- مانیا: ماندیی: ماندوو: مانوو.
- ماو: مای: واتە نەمردی.
- ماوا: ١-ماوە: مەسافە: ٢-ئیزن: ٣-جێگە.
- ماوە: ١-مودە: ٢-مەجال.
- ماودا: مەودا: مەجال: بوار.
- ماوو زەڕ: ١-جۆرەتفەنگێکە:
٢-جۆرە گۆرانییەکە.
- ماوزۆ: ئیهمال: پشت گوێ خستن.
- ماوەر: ١-مەهێنە: مەینە.

٢-لەشێوەی تەورە بەردی پێ دەشکێنن.

- ماوەرۆ: دێنێ: دینی: دەبینی.

- ماوەروو: دێنم: دەبینم.

- ماوەران: ١-ناوی گوندێکە.

٢-دێنن: دەبینن.

- ماوەردش: ئەیهێنا: دەیهێنا.

- ماوەردن: ئەیانهێنا: دەیانهینا.

- ماوەرمێ: ماوەرۆ: دێنێ: دینی: ئەهێنین: دینین.

- ماه: چیای عاسی.

لای خواروویشیان هەڵدێر و زەرد و ماه بوو...
(گەدا- ل٨٣)

- ماهودانە: دەند: جۆرە درەختێکە بەرەکەی بۆ رەوان کردن بەکاردەهێنرێت.

- ماهوو: کەنیزە: قەرەواش: تەیان: ژنی خزمەتکار.

- ماهی: ماسی.

- ماهین: ماین: مەهین: مهین.

- ماینی گوێ بەل: ماینی گوێ شۆڕ.

- مای: ١-ماوی: ٢-هەڵدێر: ٣-مانگی.

- مایە: ١-ماوە: ٢-سەرمایە. ٣-دەسمایە.

پارەت مایە (قازانج سەری مایەی خوارد).
(گێلە- ل٣٨)

- مایان: هەوێنی پەنیری.

- مایە پوچ: مایە پووت.

- ماین: ١-ماهین: ٢-دیکە: تر.

٣-ماون: ماینە:

داك و بابت ماینە.

- مبارەك: ممبارەك: موارەك: پیرۆز: موبارەك.

زۆربەی کاتی ممبارەکیان بە کۆڵ و کەسەر دەبوری.
(شەرەف- ل٧٧٤)

- مبارەك بایی: پیرۆزبایی.

- مبۆ: ئەبێ: پێویستە.

- مبۆسا : ماچی کرد: رایموسی.

- مبەخشا: ئەی بەخشی: عافوی دەکا.

- مبەخشان: ئەبەخشن: دەبەخشن.

- مبەست: رێکی ئەخست.

- مبەندۆ: ئەبەستێ: دەبەستێ: گرێ دەدات.

- مبی: مبیا: ئەبوو: دەبوو.

- مبیم: ئەبوم: دەبووم.

- مبین: ئەبوون: دەبوون.

- مپۆشیم: لەبەرئەکەین: لەبەردەکەین.

- متاشۆ: ئەتاشێ: دەتراشێ:

بەرێکی لێ کردنەوە لە دار و بەرد و هیتر.

- متاوا: ئەتوایەوە: دەتاواوە.

- متکیۆ: ئەتکێ: دەتکێ.

- متمانە: باوەڕ: بڕوا.

ئەمە چۆن جێگای متمانەیە! (گێلە- ل٦٢)

- مخابن: مووغابن: موخابن: مەخابن: حەیف.

- مدا: ئەدایەوە.

- مدار: وەستان: راوەستان.

- مدارم: ئەمدا: دەمدا.

- مدران: وەستاوە: راوەستایە.

- مدۆ: ئەدا: دەدا.





- متەق: متق: قسە:

کەس متەقی نەکرد. (گێلە- ل٢١)

- متۆ: متو: ئۆگر: متوو: هۆگر

وامتووی یەکتر بووبوون. (غەوارە- ل٧٣)

- مجەچەحان: خرنووك.

- مجاخ: رەشانی بناگوێ سوور.

- مجرۆ: نەخۆش: دەردەدار: ناساز: ناساخ: ناساق.

- مجریی: سندووق.

- مجرۆبی: نەخۆش بی.

- مجۆعمە: سنی: سێنی.

- مچ و مۆڕ: عەبوس.

- مچیرە: قەوچە.

- محەك: بەردی ئەیار: بەردی رادەی زێڕ: لەبۆ زێڕ و زیو سینەوە بەکاردێ.

- محال: دەڤەر: ناوچە.

- محەمەد: مەمەد: حەمە: مەم: مەمۆ: حەمەدۆك: حەمەدێ: مامەند: مەمەندی: ممحەمەد: مەمەند: مەدێ: حەمۆ: محۆ: ناوی کوڕانە.

- مخابین: مخابن.

- مختە: ١-پارچەزەوی بۆ بەرهەم هێنان.

٢-بڕینەوەی منداڵ لەمەمك. ٣- قۆنتەرات.

- مر: ١-بەدەن: جسم: ٢- مریشك.

- مڕ: ١-تێر: ٢-مۆرانە.

- مڕبوون: تێربوون.

- مراز: مراد.

(بە هۆی سۆرتکەوە دەتوانین بە مراز بگەین).
(بۆرە- ل٥٤)

- مڕاندن: گەڤ: هەرەشە.

- مرئاوی: مراوی: وەردەك: سۆنە: مامر ئاوی: مرئاڤی: پەلەوەرێکە لەتیرەی قاز و قورینگ کێوییان هەیە ماڵیش زۆر حەز لەناو ئاودەکات جۆری زۆرە وەك:

١-شامی: ٢-جوڕە مراوی: ٣-مراوی کێوی:

٤-قەلەمراوی: ٥-مراوی تورکی:

٦-رەشە زلەکان و پێ بەگۆشتن.

- مراوی مێ: لەدەنگ جیاوازی لەگەڵ نێر هەیە دەنگی بەرز و قەبەیە.

- مراوی نێر: دەنگی نزمە.

- مڕە: مڕەمر.

- مرتە: مردە: ئەو زێدە گۆشتەی لەدوای خاراندن و خۆش کردنی پێستە سەر هەڵدەدات.

- مرچە: مرچە مرچ.

- مرخەك: پارچە دارێك دینین تەونی پێ ئەپێچین ئەوەندەی زۆری بی پێچین وەکو گولۆڵەی لێ دێ، ئەمەپێی دەڵێن مرخەك.

- مردار: مندار: مردال.

- مرداو: زۆنگاو: زۆلگاو.

- مردی: مری: مردوو: مەردەو.

١-گیان لێ تۆریاگ:

٢-لەکارکەوتنی چەمەنتۆ:

٣-بریتییەلە بێ دەسەڵات لەکردەوە و کار.

- مرۆشیان: قەرەبالغ.

- مرۆڤایەتی: مرۆیەتی.

- مدۆش: ئەیداتێ: دەیداتێ.

ئەشکەوت... هتد دەگەڕێتەوە سەر ناوی پیاوێکی ئایینی یان نەتەوەیەك یا هۆزێك یان ئاژەڵێك یان رووەکێك ئەمانە پێیان دەگوترێ ناوی جوگرافی وەك ئەمانەی خوارەوە.

١-ناوی چیا: هەرچیایەك ناوی تایبەتی خۆی هەیە وەك چیای سەفین، چیای ماکۆك، چیای دالاهو، چیای باواجی.

٢-ناوی گوند: تم ئاوایی بکە

٣-ناوی رێگا: ناوی رێگا لەناوی ئەو شوێنە یان ئەو شارە وەرگیراوە کە بۆی دەچی وەك رێگای کۆیە، رێگای شەقلاوە، رێگای بەحرکە.

٤-ناوی دۆل: هەر دۆڵێك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە بە ناوی گوندێکە گەورەی ئەم دۆڵە دۆڵی هیران، دۆڵی بالیسان، دۆڵی خانەقا، دۆڵی ئاکۆیان.

٥-ناوی زوورگ: وەك زورگەزراو، زورگی ناڵە شکێنی، زورگی خانزادی.

٦-ناوی گرد: وەك گردلانکە گردمەلا.

٧-ناوی کەند: وەك کەندیناوە.

٨-ناوی کوێستان: تم کوێستان بکە.

٩-ناوی کانی: وەك کانی کنێر، کانی بزرە، کانی ماران.

١٠-ناوی دەشت: هەردەشتێك ناوێکی هەیە کە لە ناوی شاریار یان گوند یان کەسێکی ناوداری ئەو شوێنە وەرگرتووە وەك دەشتی هەولێر، دەشتی هەریر.

١١-ناوی ترۆپکی چیا: هەر لوتکەك ناوێکی هەیە وەك:

١٢- ناوی بان: هەربانەك ناوی جوگرافی خۆی هەیە وەك بانی دووبرا لە چیای (سەری ڕەش).

١٣- ناوی زەوی گوندێك.

بریتییە:

١-زەوی هەموو گوندەکە بەناوی گوندەکە دەناسرێت و دەخوێنرێتەوە وەك زەوی سیراوەی، زەوی بەحرکەی.

٢-هەرپارچەیەك لە زەوییەکە بە ناوێکی تایبەتییە سەر بە ناوی جوگرافییە.

١٤- ناوی کانی: کانی و کانیاو لەکوردستان زۆرە و بۆ ناسین و پێزانینی هەر کانییەك ناوێکی دراوەتێ جا ئەو ناوانەش لەگەڵێك هۆ و رووداو کەسێك ناوەکەی دراوەتی وەك:

١-زۆربەی ناوی کانی لەو داروبارەوە وەرگیراوە کە لەدەوروپشتی کانییەکەدا بووینە وەك کانی کنێر: دارکنێری زۆر لەسەر بووە ئەو ناوەی لێنراوە .

٢-ئەو کەسەی خزمەتی کانیەکە دەکا و خاوێنی دەکاتەوە وەك کانی فەقێ ئەحمەد، کانی کەهیەخاتوون.

١-کانی سمایلان.

٢-کانی قوڕ ئاو: ئەو کانییە لە چیای سەفینە ئاوەکەی کەمە، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە.

٣-کوێرەکانی: ئەوکانییەی لە بەهارا ئەتەقێ و لە هاوین وشك دەکات.

١٥-ناوی رووبار: هەر رووبار و ئاوێك ناوی خۆی هەیە ئەم ناوانەش هەندێکیان ئاوەکە لە کام شوێن و ناوچە و چیا هەڵقولابێ بە ناوی ئەو شوێنەو چیایە و ناوچەیەوە کرایە وەك:





- ئاوی ئارامیش: لەچیاکانی ئارمیشەوە دێنە خوارەوەو بەناوی ئەو چیایەوە کراوە.

- ئاوی ئاکرێ: لە چیاکانی قەڵای ئاکرێ دێنەخوار.

رووباری بەستۆرە: بەناوی ناوچەی بەستۆرەیە.

زێی سیروان، زێی گەورە، زێی بچووك.

١٦-ناوی دەنگ: ئەوناوانەی دەنگن کە تەبیعین.

١- ناوی دەنگی تەبیعی کۆمەڵە کەسێك (بلمە بلم، منگەمنگ).

دەنگی نەخۆش.

٢-ناوی دەنگی تەبیعی گا و مانگا و هەرس (بۆڕەبۆر).

٣-ناوی دەنگی تەبیعی ئادەمیزاد

بۆ نارەزایی دەربرین.

بۆڵە بۆڵە، پرتەپرت.

پرخە پرخ: لەکاتی نووستن.

لەکاتی لەبەرخۆوە قسەکردن ترمە ترم.

٤-ناوی دەنگی تەبیعی پاساری: چوکەچوکە.

٥-ناوی دەنگی تەبیعی سەگ (حەپەحەپ).

ناوی دەنگی مریشکی کورك:

گاڕەگاڕ.

٦-ناوی دەنگی تەبیعی هەور:

گرمە گرم.

٧-ناوی دەنگی با: گڤەگڤ.

٨-ناوی دەنگی گورگ و چەقەڵە و سەگ: لوورەلوور.

٩-ناوی دەنگی شێر و پلینگ: نەڕەنەڕ

١٧-ناوی تورکی:

بریتییە لەهەموو ئەوناوانەی کە لە چیا و شار و گوندی کوردستان نراوە، ئەوەناوانەش لەئەنجامی داگیرکردنی کوردستانەوە هاتووە لەلایەن شالاوی (سەلاجقە و مەغۆل و خوارەزمی و تاتار و قەرەقۆیونلو ئاق قویونلو دوای داگیرکردنی ناوی رەسەنی کوردی ئەو شوێنانە فەرامۆش کراوە ناوی تورکییان بەسەر دابڕیوە وەك:

١-ئاجی کەند.

٢-ئاختامی.

٣-ئیلتەمور.

٤-تەرەغە.

٥-تیکانتەپە.

٦-سارق.

٧-ساری قامیش.

٨-ساوج و بولاق.

٩-سەلدوز.

١٠-قوش تەپە.

١١-قەرەجوغ.

١٢-قەرەئوغلان.

١٣-یەدقزلەر.

١٨-ناوی کوردی: بریتییە لە ناوی کچ و کوڕانی کوردی کە هەر یەکەیان ناوێکی جیاوازو تایبەتییان هەیە وەك:

١-ناوی کوڕانی کوردی کۆن وەك: مەم، بەهرام، پیربال، فەرهاد، گودەرز، شاپور، ئاری، هۆشەنگ،

فەرەیدون، پەرویز، بەهرام، سام، ئەردەشێر، نەوشیروان، کەیخوسرەو، شەهریار، زولال، کلول.

٢-ناوی کوڕانی نوێ وەك: دلێر، هیوا، شاخەوان، ئاری، دلدار، ئاسۆ، پشکۆ، هونەر.

٣-ناوی کچانی کوردی کۆن وەك: زارێ، خانەگوڵ، بەگیسی، خاتوزین، مەنیژە، شاناز، ئافتاو، بوسکان، بەسێ، تێلی، خانزاد، گوڵناز، خاسێ، خەزال، مامز، ئاسکۆل، گەوەر، هەمین، کەژێ، زێرین، مێرێ، کابان، گولێ، خونچە، ئامان، پەری، خەیال، خۆخێ، سێوێ، شۆرێ، ئاسکە، شانازێ، خوازێ، خانێ، کەتان، خەزێم، زینێ، نانێ، رەندێ، خەزار، رابە، رابی، حەفسەت، ماسێ، سۆتی، شەمام، رەوشەن، شەمێ، خانم.

٤-ناوی کچانی کوردی نوێ: وەك ئەڤین، سایە، هەلۆ، ئاودەنگ، هێشو، خۆزگە، بەفرین، نارین.

١٩-ناوی ئایینی: دوای بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام گەلێك لەناوی ئایینی ئیسلامی لە عەرەبییەوە وەرگیراون کاریگەرییەتی ئیسلامی هەقی دا بەو ناوانە کە لە ناو زۆر هۆز و تیرە و نەتەوەی سەر رووی زەمین بلاویێتەوە و غەیرە عەرەب وەری بگرێ بۆ ناوی نوێیان بەکاری بێنن وەك:

أ-ئەو ناوانەی لە پێغەمبەرانیان هەلگرتووە وەك (محمد، احمد، ایوب، ابراهیم، یوسف).

ب-ئەو ناوانەی بە پاشگری (الله) دواییان دێ وەك (نعمە الله، عبدالله).

ج-ئەو ناوانەی ناوەکانی (خوا) یان هەلگرتووە وەك (عبدالوهاب، عبدالرحمان، عبدا).

٢٠-ناوی مێژوویی:

أ-ناوە عەرەبییەکان وەکو ( ابوبکر، عمر، حسن، خالد).

ب-ناوە ئێرانی و کوردییەکان وەك (ئەردەشێر، ئەسفەندیار، ئەفراسیاب، بەهمەن، بەنگین، گیو، ئاراس، چەکۆ،خوسرەو، رۆستەم، زۆراب، سیامەند، هۆشەنگ).

٢١-ناوی شەڕ:- بریتییە لەناوی ئەو شەڕانەی کە میللەتێك بەرامبەر بە هێزی داگیرکەر دەیکات یا ئەو شەڕانەی کە حەق بەرامبەر ناحەق دەیکات، شەڕی سەربەستی بەرامبەر چەوسانەوە و زۆرداری، شەڕی کورد بەرامبەر داگیرکەر، تۆمارکراوە. وەك (شەڕی هەندرێن، شەری قەیوان ماوەت، شەری سەفین، شەڕی مللەقەرنی).

٢٢-ناوی گۆرانی:- هەرگۆرانییەك ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە جا ئەم ناوە لە زۆر شتەوە هاتووە لەزۆر سەرچاوە سەری هەلداوە وەك ئەمانەی خوارەوە:

١- ئەو کچەی ناوی لە گۆرانییەکە هاتووە بووەتە ناوی گۆرانییەکە و لەسەربەندی گۆرانییەکە ناوی هاتووە بووەتە ناوی گۆرانییەکە وەك ئەمانەی خوارەوە:

وەی وەی زارا، ئامینی سورگوڵ، خاسێ تۆ خانمی.

٢-جل و بەرگی لەبەرکراو دەبێتە ناوی گۆرانی کەوای بەرت ماهوتە، بەرهەبیینە.

٣-چاو دەبێتە ناوی گۆرانی:

چاومەستە.





٤- پیر و پیاو چاك: وەك بابچینە سەر وەیس.

٥- کەش و هەوا: وەك بارانە و بارانە.

٦- خرینگەی باران و بەرمورو خشلی ژنان: خرینگەی بازنەکانی.

٢٣-ناوی تەریقەت: رێبازێکی ئایینییە لە چەند تەریقەت پێکهاتووە هەر یەکەیان شێخێك سەرپەرشتی دەکات ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە:

١-قادری.
٢-نەقشی.
٣-چەشتی.
٤-تەیفوری.
٥-رفاعی.
٦-شازی.
٧-بەدەوی.

- ناویت: نابووت.
- ناهەموار: نائەموار: ناهەنجار: نارێك.
١-شوێنی پڕ کەندولەند.
٢-قسەی ناشرین.
- ناهومێد: نائومێد: بێهیوا.
- نایاب: زۆرچاك: زۆرباش.
- نایژەن: نەیژەن: ئەو کەسەی نەی دەژەنی و هەموو نزمەکان دەزانێت.
- نایژیت: نالێت: نارێت.
- نایژی: نالێی: نارێی.
- نایهەوێ: نایەوێ: نایەوێت.
- نج: نالە: نچە نچ.
- نتراندن: نەخشاند.
- نچك: ١-نتك: خاڵ: ٢-ئامانج.
- نچك دان: نچاندن: ئازاردان.
- نچیر: نێچیر: ئەو ئاژەڵەی لەڕاوا دەگیرێت.
- نێچیرەوان: نێچیروان: نێچیرڤان: راوکەر: ئەوکەسەی لەڕاو نێچیر دەگرێت.
- نخە: نۆك.
- نخوون: نخوین: قەلپ.
مەنجەلەکە دەم نخوون دانێ.
- نخۆ: نەخۆ: نەوەك.
- نرخ: فیەت: قیمەت: بایی.
- نرخە نرخ: پرخەپرخ: دەنگی کە لە کاتی خەوتن لە مرۆڤ دێت.
- نرخدار: بەنرخ: بەقیمەت: بەهادار.
- نرخ دانان: سعردانان.
- نزا: تووك: دوعا.
- نزار:١- نسرم: نسار: لای سێبەر لە چیا: دورەتاو.
٢-ناوی کوڕانە.
٣- ناوی گۆڤارێکی کوردییە.
- نزانم: نازانم: ئاگادارنەبوون لە کار و خەبەرێك.
- نزبە: مێوی چیا.
- نزگ: حەیات : ژیان.
- نزم: ١-نەوی: بێ هێز: ٢-ئاواز
- نزیك: نێزیك: نزویك: دژی دوور.
- نیزیکەگا: سەرمژانکە لە کونی دووەم یا سێیەم مژانە بەلای خوارەوە دەبینێن ئەویش مار دەبێت، بەلام ولاغ ئەزیەت نادات لە کێلانی زەوی.

- نمەك دان: خۆی یان: خێدان: خـوەدان: نمەکـەدان: ئامرازێکی تایبەتییە خوێ تێدەکرێ.
- نمو: گەشە: بالآکردن: روان.
- نمەك ناس: پێ زان: بەوەفا.
- نۆمال: نومال: ماڵی تازە دامەزراو.
- نوکیسە: تازە بە نان گەیشتوو: تازە دەوڵەمەند: تازە پیاکەوت.
- نـورە: واجبـی: دراوو: دەرمـانی مـوو لابـەر: دەرمان حەمام.
- نۆر: نۆرە: نۆبەت: نۆگە.
- نۆبەت گرتن: ١- پاسەوانی کردن: ٢-ریز گرتن.
- نە: نا: نەخێر: خەیر: نەخەیر: وشەی نەرێ.
- نەبا: ١- نەوەك: نەبادا: ٢-نەبیا.
- نەبایە: نەبیا: نەبووایە.
- نەبامایە: نەبوومایە: نەبیام.
- نەءنەء: نانا: نەخێر نەخێر. بۆ تەکید کردن لە نەکردنی کارێك.
- نەباش: خراپ: باش نییە.
- نەبان:١- تورە.

٢-رام نەبوو.

٣-ئەو ئاژەڵەی کەنایەڵێ بێچووی خۆی بیمژێ.

- نەبانۆك: بزر: ون: نەهاتوو.
- نەبەرد: چالاك.
- نەبەز: ١-کۆڵنەدەر.

٢-بێ توانا لە هەڵاتن.

- نەبەکار: ژنی هار.
- نەبڕ: کۆر: کول.
- نەبڕان: نەبڕین.
- نەبڕاو: نەبڕای.
- نەبڕاوە: کۆتایی نەهات.
- نەبوو: ١-بزر.

٢-دەست نەکەوت.

٣- هەژار.

- نەبیرە: نەوە.
- نەبینابوو: غەیب بوو: لەچاو ون بوون.
- نەبین: کۆر: کوێر.
- نەبزۆك: نەجوولاو.
- نەپەندیی: نەپەنی.

١-شاراوە.

٢-بیابان.

- نەتەوەیی: دوژمن.
- نەتر: ورە.
- نەتۆرە: ناتۆرە: ناوبانگی خراپ: ناتۆرە: ناونەنگ.
- نەجین: حەزین: غەمبار.
- نەچار: ناچار.
- نەخازم: تایبەتی.
- نەخت: ١- نەختەك: نەختێك: ٢-شیربایی.

١-نەخۆشی کە بەد: ٢-نەختەك.

- نەختە نەختە: کەم کەم.
- نەختێ: نەختەك: نەختێك: کەمێك: نەختە.
- نەخشە: نوقلانە: نەقلانە: ١-پێشبینی.

٢-خەریتە.

- نەخش: نەقش.
- نەخچیر: نێچیر: راو.





- نەخشە گەند: نەخشەی خراپ.
- نەخشەی چاك: نوقلانەی باش.
- نەخشاو: نەخشای.
- نەخوازەلا: نەخەسەلە: نەخاسمە.
- نەخۆش: نەساغ: نەساخ: ناساق: ناساخ: خەستە: ناخۆش: دەردەدار: بیمار.
- نەخۆشەوان: سستەر.
- نەخۆشخانە: نەخۆشگە.
- نەخۆشی: نەساغی: ناساخی: دەرد.
- نەخێر: نەء
- نەچار: ناچار.
- نەدار: نەبوون.
- نەدە: مەدە: مەیدە.
- نەدیار: نادیار.
- نەدیتم: نەمدیت: نەمدی.
- نەڕاست: ناڕاست.
- نەدیتوونە ناسی: غەریب.
- نەدیتە: نەدیدە: نەدیتی.
- نەراورتی: زبر: درشت.
- نەڕۆنە: روون نییە: تێرە.
- نەرد: ١- تاولە: ١-بەخت: ١-چیای عاسێ.
- نەردە: کۆسپ: دیوار.
- نەردێن: نەردین.
- نەردیوان: پەیژە: قادرمە: قالدرمە.
- نەرگس: نێرگس.
- نەرم: دژی رەق.
- نەرمی: میهرەبانی: مێرەبـانی: دڵ نـەوایی: دڵ نەرمی: بەزەیی.
- نەرمە پێکەنین: زەردە: بزە.
- نەرمەباران: بارانی ورد لەسەرخۆ.
- نەرمەساو: مەورەد: بڕبەند.
- نەرمك: نەرمە.
- نەرمە نێشك: لەبار.
- نەرم و شل: نەرمونۆل.
- نەرم کێشان: نزم کێشان: سەلماندن و لێ بوردن.
- نەرمۆڵ: نەرمێ: ناوی کچانە.
- نەرین: نۆرین: نوارین: روانین.
- نەریت: ١-نەریەت: رێ و رەسم: ٢-نیزام.
- نەژن نە مێرد: نێرەمووك.
- نەزوایە: وشك نییە.
- نەزار: نسار.
- نـەزمی گـۆرانی: نەغمـەی گـۆرانی: ئـاوازی گۆرانی.
- نەزان: دژی زانا: نەزانکار.
- نەزۆك: نەزا: زك نەکەر.
- نەشونما: گەشە.
- نەعامالان: نەگونجان.
- نەغد: نەقد.
- نەغدە: کەللە.
- نەسەقچی: جەللاء: جەللاب.
- نەستێك: ١- دەرد: ٢- زیان.
- نەفام: نەزان: نازیرەك.
- نەفەرە: نەفەل: گیایەکە.

- نەفتك: شقاتە: شەمچە.
- نەڤەكریی: جیاواز: نەكراو.
- نەقورِم: نەقیرێنم.
- نەڤی: نەوە.
- نەقرقران: دڵنیانەبوون.
- نەقۆ: نها: ئێستا.
- نەشەمزان: تێك نەچوون: خۆتێك نەدان.

حەمەد لەدیتنی عەبدی خان هیچ نەشمزا.

(حەمەدۆك -١- ل٥٢)

- نەكاریی: بێ توانا.
- نەكاو: نكاو.
- نەكەس: ناكەس: بێ ئەسل.
- نەشۆ: ١- نەڕوا: ٢- مەشۆ.
- نەشیار: ناوشیار.
- نەكراندن: دەنگی باڵندە لە شەودا.
- نەكردی: نەكردوو.
- نەكوو: نەوەكو.
- نەكێش: حەسوود.
- نەكەڤن: حەسادەت.
- نەگبەتبار: تووشی نیگەبەت هاتوو.
- نەگبەت: نیگبەت: بێ ناوچاو: دوومۆر: دمـۆر: قەشقە: قۆشە: نەگریس: نگرس: دمۆر.
- نەگۆڕ: جێگیر.
- نەگریس: نگریس: دمۆ.
- نەگهایی: پێ نەگەیشتوو.
- نەمازە: نەخەسە لە: نەخوازە لا.
- نەماو: نەمای.
- نەماوە: نەمایە.
- نەمە: لباد.
- نەمر: هەرماو.
- نەمرم: بژیم.
- نەمریی: هەرمای.
- نەمێر: ناپیاو: نامەرد.
- نەناس: نەناسراو.
- نەنك: داپیرە: دایكە گەورە: دایە گەورە: نـەنك: داپیر: ١-دایكی دایك: ٢- دایكی باوك.
- نەنگ: شوورەیی.
- نەنگین: عەیبدار.
- نەو: ١- نا: ٢- نوێ: ٣- لباد.
- نەوا: ١- شوێنی حەوانەوە.

٢-ئاواز.

٣-گۆرانی.

٤-نەوەك.

- نەوبەر: نۆبەرە.
- نەوات: شەكری نەباتی.
- نەوبووك: نۆبووك: تازەبووك.
- نەوار: شریت.
- نەوال: نەورایی نێوان دووچیا: نهالە: نەواڵە: نەور.
- نەواوون: نەبان.
- نەوبەر: نۆبەر: نۆبەرە.
- نـەوە: ١- نەوەونـە نێـژە: نـەوەو نەتـەوە ٢- بەرامبەر.
- نەورایی: نزمـی: نـەوین: نڤەچـوون: لێـژایی: زەوی چاڵ.





- نەوەرد: ئازا: نەبەرد
- نەوەش: نەخۆش.
- نەوەدەم: نەوجەوان.
- نەوەكو: نەك: نەكو: نـەوەك: نـەوەكا: نـەوەكی: نەوەكینێ: نەوەكانێ: نەوا: نەباكو: ئامرازی عەتفە واتای نەفی دەگەیەنێ.

نەك هەنار، رێواسیشم خوارد.

- نەوزاد: ١- تازە لە دایك بوو.

٢- ناوی كوڕانە.

- نەوسن: نەفسن: چلێس.
- نەوی: نزم: پەست: چاڵ: شیو: نزمان.
- نەوك: تەنیشت: تەك: رۆخ.
- نەومید: نائومێد: دڵ سارد: بێ هیوا.
- نەوهال: حجێل.
- نەینەك: نەینۆك: قۆدی: ئاوێنە.
- نەوێر: نەوێرەك: نەوێرۆك: ترسنۆك.
- نەویی: نزم.
- نەیاوی: هی وی نا.
- نەهار: نیوران.
- نەهشین: ئەحمەق.
- نەهگوون: نێنگون.
- نەهۆ: ئێستا.
- نەهویت: نەوەت: نۆهەت.
- نەهەنگ: گاماسی: ماسی گەورە.
- نەهێژ: بەرهەڵستكار: نەهێل.
- نەهێژتن: نەهێشتن.
- نەهێنی: نەهێشتن.
- نەهێنی: نهێنی.
- نەهییتە: ١- ئازا: ٢- باش.
- نەی: ١-نایی: ٢-قامیش.
- نەیار: ناحەز: دوژمن.
- نەیارێتی: نەیاریی.
- نەیاوای: پێ نەگەیشتوو: پێ نەگەیشتی.
- نەیجە: قەمیش.
- نەیرۆنی: نەدیا: نەیروانی.
- نەیژەن: نایژەن.
- نەیرڤان: مولاحیز.
- نەبێنی: نەهێنی: نەینی.
- نەیرین: ١-تێبینی: ٢- تەماشاكردن.
- نەینك: نەینۆك.
- نەیدیت: نەیری: نەدیش.
- نەیەلێ: نەهێلێ: نەهێلی.
- نتك: نوقتە: نچك.
- نچ: ناڵە.
- نیچیر: نێچیر: راو: نەچیر.
- نخافتن: داپۆشین.
- نخە: نۆك.
- نخۆ: نەخۆ: نەوەكو: نەوەك: نەبادا.

نەخۆئەوان هاتبن.

- نزا: دوعا: پاڕانەوە.
- نزاو: ١-نزیك: ٢- پاڕانەوە.
- نزبە: ترێی چیایی.
- نزم: ١-نەوی: ٢- بێ هێز: ٣- ئاواز.
- نزیك: نێزیك: نزدیك: نهنك.

- نزگ: ژیان.
- نزگره: نزگەره: هەناوکوتان.
- نژاد: نەژاد.
- نژدار: جەراح.
- نژده: چەته: گۆران: ڕێگر: نژدەکار: ئەوکەسەی ڕێگا لە خەڵك دەگرێ بۆ دزی کردن.
- نژیی: نیسك.
- نسار: نسرم: نزار: دوورەتاو: نەزار: نێل: جێگای ڕەوەو کوێستان: لای سێبەر لەچیا.
- نستوو: نووستی: خەوتوو: ئەوکەسەی نووستییە.
- نسیێ: سێبەر: سایە.
- نشك: کات.
- نشکۆ: ناکاو.
- نشمی: هێمن.
- نشیڤ: نشووڤ: نشێو: لەبەرزییەوە بۆ خوارەوە.
- نغرۆ: نوقم: ژێرئاو بوون.
- نفت: نرت: نویێ: تازە: دژی کۆن.
- نفتل: شەمچە: شخاتە.
- نفش: بەرە: جیل.
- نڤار: نویێ: نو: نرت.
- نڤز: نەوی: نزم.
- نشکێفا: لەپڕ: لەناکاو.
- نڤینۆك: ژووری نوستن.
- نق: نوتق: قسە.
- نقم: نقووم.
- نقورچك: نقورچکە.
- نقێم: نقییم.
- نکاو: ناکاو: نۆوکم: لەپڕ.
- نك: کن: لا: ئالی.
- نکارین: نەشیان: ناتوانین: ناتانین.
- نکاریی: خەمگین.
- نکام: نکارم: ناتوانم: ناتانم: نەتوانم.
- نکل: دومدك: دەنوك.
- نکارت: نەشێت ناتوانێت: ناتانێت.
- نکمال: یەکمال.
- نکوول: زیرەك.
- نگە: ڕق.
- نما: ١-نوێژ: ٢-دیمەن: ٣-خەلاس.
- نم: شیێ.
- نماز: نوێژ.
- نمانا: ١-نواند: ٢- لەو شوێنە نەمان.
- نماوی: شێدار.
- نمە: نمەنم: بارانی سەرخۆ.
- نمەد: لباد: نمەدماڵ.
- نمەز: تومەز: لەڕاستیدا.
- نموونە: قالییەکی بچکۆلەیە ژن وەستا لەلای خۆی دای ئەنێ لەسەر نەخشی ئەو قالییە بچووکە نەخشی قالییە گەورەکە دروستدەکەن.
- نمەك: ١-خۆیی: خیێ: ٢- وەفا.
- نمدار: نمین: شێدار.
- نمینە: نموونە.
- نۆ: نەهـ: ١-یەك کۆهەشت.
٢-نەوا: نویێ.





- نۆبە: نۆرە: نۆگە.
- نۆبەتچی: نۆبەدار: نۆبەچی.
- نۆبەتێ تا: ١-ئەوساتەی کە تادەگرێ.
- نۆبەتی دار: تادار.
- نۆبەخش: بەخشین.
- نۆبەرە: ١- نەوبەر: یەکەم منالّی لەدایك بوو.
٢-یەکەم بەرهەمی مێوە.
- نۆبەدار: نۆبەت دار.
- نۆبەن: نۆبەند.
- نۆپیشە: نۆبەرە.
- نۆچە: نەوجەوان: جەهێل: جەوان.
- نۆڕین: ڕوانین: نوارین.
- نۆشین: خواردنەوە: نۆشان.
- نۆك: نخە: بەتۆ دەچێنرێ: وەرزییە لەهاوین پێدەگات.
- نۆکە: ئێستا: نها: نهۆ.
- نۆکەل: کەلێ جحێل.
- نۆلا: نۆگۆشە.
- نوێن: پێخەف: شەویس: نڤین: جیێ: جێگە: نوین: دۆشەگ و لێف و سەرین بۆ نوستن.
- نۆوەند: نوبەند: نوکەل.
- نوو: نویێ: نرت: تازە.
- نوا: پێشان: بەر لە ئێستا.
- نووەی: نۆك: نخە: نوخە.
- نوچە: خەبەر: هەوال: خەوەر.
- نوخان: نینۆك: پارچە ئێسکی کۆتایی قامکان.
- نوخە: نۆك.
- نوور، ڕووناکی: ڕۆناکی: ڕۆشنایی.
- نوورە: ڕەژوی بەرد.
- نووردی: ١- پەپکەی مار.
٢- چەند نانێکی بەیەکەوە برژاو.
- نۆو ڕۆژ: نەوڕۆژ، نەورۆز.
- نووزا: نەوزاد: تازە لەدایك بوو.
- نووزانەوە: ناورانەوە: پاڕانەوە.
- نووژەن: لە نوێوە: نۆژەن.
- نووسەر: نویسەر.
- نووسەکە: نووسەنەك: گیایەکە.
- نووسەوەری: ئیملا.
- نووستی: نووستگ: نووستوو: خەوتوو.
- نووسکە: نووسکە نووسك: دەنگی سەگ لەکاتی لێدان.
- نووسێن: نووسیار.
- نووسینگە: مەکتەب: شوێنی تایبەتی کەسێ دەیکاتەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاری تایبەتی.
- نوشتە: نوشتوو: نوشتی: نویشتە: دوعایە لەلای مەلا دەکرێ بۆ چاك بوونەوەی نەخۆش و مراز حاسڵ بوون.
- نوغرۆبوون: ژێرئاو بوون.
- نۆڤەژەن: نووژەن: نۆژەن.
- نووقان: قوچان: چوقان.
- نووقاو: قوچاو: چوقاو.
- نوقلانە: موژدە: مزگێنی.
- نووکاندن: نووکە: ناڵە.

- نووکتەباز: قسە خۆش.
- نووکە: ١-ناڵە: ٢- ئێستا.
- نوومال: نوهونە: تازە ماڵ.
- نووند: دەغڵێ لەبەهاردا بچێنری.
- نووژن: هەموو: هەمی: گشت.
- نووهال: نوال: دۆل: خڕ.
- نووهە: ئێستا: ئێستە.
- نووهەوار: هەواری نوێ.
- نوهۆم: نهۆم: تەبەقە: قاد.
- نوین: نوێن: پێخەف.
- نوێ: نوو: نڤار: نۆچە: تازە.
- نوهەشت: نێنگۆین: مێگوین: نهگوون.
- نوێ بووك: نەوبووك: تازە بووك:
ژنێ کەماوەیەکی کەمبێ گواسترابێتەوە.
- نوێژ: نێژ.
- نوێ ماڵ: نەوماڵ: ماڵی تـازە دانـرێ و هـەموو کەل و پەلی نەبێ.
- نووێنەر: وەکیل.
- نوێ هەیڤ: هیلال.
- نوویسەر: نووسەر.
- نوویشتە: نووشتە.
- نوشیك: کەرە.
- نووبیك: نووك.
- نها: ئێستا: نهە.
- نهێن بین: ئەوەی پەی بە نهێنییەکان دەبا.
- نهێنیار: سکرتێر.
- نهێرتن: نهێرین: دەرس خوێندن.
- نێب: جار.
- هەندەنێبان: هەندە جاران.
- نێر: دژی مێ.
- نێراو: شوفار: جاسوس: قسەبەر.
- نێرە: کەڵ.
- نێردیوان: پێ بلقە: قادرمە.
- نێرەکەر: کەری نێر.
- نێرەکەو: کەوی نێر.
- نێرەنان: هەنگوتك.
- نێرە مووك: نێرەمۆ: نەژن نەمێرد.
- نێروما: نێرە مۆك: نێرومێ.
- نێرە هەنگ: هەنگی نێر.
- نێرباز: هەتیوباز: منداڵ باز.
- نێردیوان: نەردیوان: قادرمە.
- نێرم: لای من نییە: لەکنە من نییە.
- نێرۆك: ناوەڕاست: ناڤین.
- نێروبەند: گیایەکە.
- نێڕین: ڕوانین.
- نێزە: سونگی.
- نێژ: نوێژ: نما: نماز: نڤێژ.
- نێژران: ناشتران: شرانەوە.
- نێسایی: ئاسانی.
- نێش: ئێش.
- نێڤ: ناو: نێو: نام.
- نیگبەت: نەگبەت.
- نێڤرۆ: دوورگە.
- نێڤمال: ناوماڵ: ناو مار.





- نێك: ١-گلۆت: ئێسکی سەرەوەی ران.
٢-قەد.
- نێڵ: نسار: دوورەتاو: نزار.
- نێڵە: نیر.
- نێڵەمال: کاریتە.
- نێری: کەڵ: نێرەی مامز:
قۆچی هەیە درێژی قۆچەکانی (٤٠)سـم ئـەبێ و بـەلای پـشتەوە رۆیـشتووە گرێ گرێیە.
- نێری شـامی: جۆرێکـە لـە ئاسـك: ئـەم جـۆرە ئاسکە قۆچەکانی: لەئاسکی تر باریك و درێـژ تـر رەنگی سەروچاوی سپییە هەموو لەشی لەئاسـکی تر سپی ترە،
باڵای لە ئاسکی تر گەورەترە.
- نزم: ئاواز: ئاهەنگ: هەوا: ١-نەغمە: ٢-نەوی.
- نزمـی شـوانان: بریتییـە لـەو ئاوازانـەی کـە شوانەکان لـە دەشـت و دەر بـە شمشاڵ دەیـژەنن، جۆری زۆرە. وەك: ١- هەوارە بـەلۆ: ٢-قـەل و بەل: ٣-سەر چیا: ٤-قەرەچوغ.
- نزم گۆڕین: ئاواز گۆڕین.
- نزمی زۆر: ئاوازی زۆرە.
- نزمی شایی: ئاوازی سووك بۆ شایی کردن.
- ناڤ گور: ناوکور: ناوقوڕ. ئاڤ+ گور+: کور: قور. واتە شـوێنی قـوڕ بێـت، ناوچـەیەکە لـە بادینـان ناوچەیەکی بەپیتە.
- نێواخن: ناواخن: پەرۆی ناوەڕاستی هەندێ جل و بەرگ: ئەو وردە بەردانـەی دەخرێنـە ناو کەلێنی ئەو دیوارەی لە بەرد دروست دەکرێ.
- نێوان: مابەین: عیلاقە: ماوە.
- نێوەڕاست: ناوەڕاست.
- نێوەند: ناوەڕاست.
- نێوەوە: ناوەوە: دووڕ: ناخ.
- نێو چاوان: نیوچەوان: ناوچەوان.
- نێودار: ناودار.
- نیو داش: نیمدار: نیمدات: بەکارهێنراو.
- نێوساجی: ناوساجی: زرووبی: ناوسێلی.
- نیوە کۆچەر: نیوەرەوەند:
ئەو ئاژەڵدارانەی زستانان لە گوندان دەبن.
- نێو شان: ناوشان.
- نێوقەد: ناوقەد: کەمەر.
- نێوگەڵ: ناو گەڵ.
- نێون: نێنگوین.
- نێوەنێوە: ناوە ناوە: جاربەجار.
- نێونیرە: ئامرازی جوت.
- نێوونیشان: ناونیشان.
- نێویی لاوە: ناوی خواز لاو.
- نیاز: مەبەست.
- نیاز کار: ماستاوچی.
- نێن: نەیێن.
- نیانگر: ناپاك: خاین.
- نیانی: نهێنی: سو: سور: قسە و باسێك کە نابێ باس بکرێ.
- نیتك: پەڵە.

- نیتم: نیمە.
- نیرگە: کاریتە.
- نیسك: نژی: نوو پژی.
- نیسێ: نزار: نسرم: نسار.
- نیشاستە : نەشاستە.
- نیشتمان: مەفتەن: زێد:

دێم ببینم نیشتمان و زێدەکەم.

(هێمن- ل)

- نیفۆ: ماڵ دۆخین: پزوو: شوێنی دۆخین لە شەروال.
- نیشان:-جۆر: ٢-ئامانج: ٣-زێڕی کەم بۆ بووك دەبەن پێش گواستنەوە.
- نیڤانی: پچڕپچڕ.
- نیڤەشەڤ: نیوەشەو.
- نیڤەکار: برابەش: شەریك.
- نیڤچۆ: کەم: ناقس.
- نیڤرۆ: نیوران: نیوەڕۆ: نیمرۆ: نیمەڕۆ: نافرۆژ: نیوەڕۆژ.
- نیڤساڵ: نیوەی ساڵ.
- نیگار/ دیمەن: ناوی کچان.
- نیگەران: نائاسوودە: دڵتەنگ.
- نیل و پەرا: نیل و فەر: لوولووپەڕ.
- نیم:١- شێ: ٢-نیوە.
- نیمان: میوان: مێوان.
- نیمچە: نیوە: تاڕادەیەك.
- نیمە شەو: نیوەشەو.
- نیمداد: شێدار.
- نیمە: ١- نیتم: نیەتم: ٢- نیوە.
- نیمرۆ: نیوەڕۆ: نیوڕان: نیوەڕۆژ.
- نینە: نییە: نینۆ.
- نێنگوین: نوهوشت: نهگون.
- نیو: نیوە.
- نیوەبرژاو: نیوەبرژای: خاوەبرژ: نەتەواو برژاو.
- نیوەڕۆژ: نیوڕان.
- نیوە شکێڵ: نیوە تیرە.
- نیوە نمەك: نیوە لمەك.
- نیو داشت: نیوداش: نەکەون و نە نوو.
- نیوە رۆبار: پشوی کاروانچیان لەنیوەرۆدا.
- نیوڕان: نیوەڕۆ.
- نهاد: نیەت.
- نیهان: پەنهان: شاراوە.
- نهانی: نهێنی: پەنهانی.
- نینۆك: ناخوێن: هەینۆك: ناخوون: نەینۆك.
- نیر: نیلە: نێڵە: نیریی: نیرك: نییل:

ئامرازی جووت کردنە، بەوداره دەگوترێ کە دەکەوێتە سەرملی وڵاغان لە کاتی بەستنیان بۆ جووت و جەنجەر کردن، بەڵام جۆری لە وڵاغدا دەگۆڕێت.

نیری یەخسیری لە ئەستۆ دارنی، لەبەری نیرەی دەرهات: واتە لەژێر دەسەڵاتی دەرهات. (ئیدیۆم)

- نیشان: ١-ئارمانج: ئامانج:

٢- جۆر: ٣-ئەنگوستیلە یان بازنێك ... هتد. ئەدرێ بەو کچەی کە بڕیاری شووکردنی داوە.

- نیشانکردن: ئەو رۆژەی نیشان بۆ کچ ئەبردرێ و نیشانەکە ئەدرێ بە کچەکە.

# و

١- ئامرازی پەیوەندیی.
٢-بەپیتی (بە) جێگوڕکێ دەکا.
قوڕت وەسەری: قوڕت بەسەری.
٣-تان: نیشانەی کۆیە.
ژنوهەیە: ژنتان هەیە.
ماڵو خەرانەبی: ماڵتان خەرانەبی.

- وا: ١- با: ٢- ئێستا (وادەڕۆم): ٣- دووبارە (والەماڵێیە).
- وابەستە: پەیوەندی: پابەند.
- وابزانە: وەبزانە.
- واپەڕ: باپەڕ: نەخۆش کەوتن لەسەرمان.
- واتا: مانا: مەعنا.
- واتادار: بەواتا: بەمەعنا.
- واتا گوڕکێ: خوازە: مەجازە.
- واتەلێلێ: ئالۆزی لەقسەدا.
- واتەوات: دەنگۆ: دیعایە.
- واتر: ١-یەکەم: ٢- دواوە.
- واچە: قسە.
- واخ:١- بەداخەوە: ٢- ئاژەڵ.
- وادار: بادار: نەخۆشییەکە تووشی مرۆڤ دەبێ و ژانی هەیە.
- وادانەوە: بادانەوە.
- وادان: بادان.
- وراز: بەراز.
- ورما: لەوێ بەجێ ما.
- وادراو: بادراو: بادرای.
- واران: باران:
- واراناو: باراناو: ئەو ئاوەی لەباران کۆ دەبێتەوە.
- واراندن: باراندن.
- وارە: پاڵ.
- واڕەسە: تەرکەدنیا.
- وارەوارە: پێ بەپێ.
- واردەمەنی: خواردەمەنی.
- واردنەوە: خواردنەوە.
- وارس: خوێنگر: شڕەگر:خوێنە خۆی: خوێنەخوا: میرات گر: میرات بەر: بەش بەر: خوێن ڕەس:
واردییەڤە: خواردییەوە.
- وارش: چیۆرمە: دیواری قەبر.
- واڕك: فروج.
- وارکۆر: وجاخ کۆر.
- وارگەه: هەوارگە: وارگە.
- وارێ: وەدەڵێ: وائەڵێ.
- وارێم: دەڵێم: ئەڵێم.
- وارۆکە: بارۆکە.
- واریقات: بەسەرهات.
- وارین: گۆڕین.





- وارێن: دەڵێن: ئەڵێن.
- واز: نەخۆشییەکە تووشی سەر دەبێت.
- وازا: بن عام: دووکەس باپیرایان برابێ.
- وازتن: خوازتن: داواکردن.
- وازکردنەوە: کردنەوە.
- وازلێ هێنان: لێ گەڕان: واز لێ هێنان: دەست لێ کێشان: دەست لێ هەڵگرتن.
- وازی: یاری: گەمە: گەپ.
- وازی وازی: ڕاڕا: دوو دڵ بوون لە کارێك.
- واژ: سەرسام: واق مان.
- واژەبەس: وشەی پەیوەندی.
- واسە: وایە: وەیە.
- واسەی: واستن: خواستن.
- واغێن: بەگوێزیاری کردن.
- واق: موتەحەیر: سەرسام.
- واقمان: تەعەجوب: سەرسام بوون.
- واقماو: واق و دووڕ: سەرسام ماو.
- واك: فلان: وانەك: هەرامە: کەسێ و باسێ نەتەوێ ناوی بەری.
- واکەت: ١-وادەکات: وەدەکات: ٢-دووبارەکەوتنەوەی نەخۆش.
- واکەواك: ١-هەرامەهەرامە: ٢-دەنگی مراوی.
- والآ: بەرین: فاوان: ٢-کراوە.
- والآمەن: عاشق: واڵە: دڵدار.
- واڵە: خوشك: واڵێ: خواهر.
- واڵەزا: مناڵی خوشك: منداڵی خوشك.
- والح: عاشق: دڵدار.
- واماگ: داماو: فەقیر.
- وان: ئەوان: جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی کۆ.
- وانە: دەرس.
- وانەبێژ: مامۆستا: وانەبێژ.
- وانگ: بانگەواز.
- وانێك: وانەك: هین: ئەوکی.
- وانی: پاراستن: پاس کردن.
- وانییە: وەنییە: وهانییە.
- واوا: وەهاوەها.
- واوە: ١-وهاوە: ٢-لێرە.
- واوەرە: وەرە ئەو لای: وەرەلای: واوە: وەهاوەرە.
- واه: وشەی سەرسوڕمان.
- واهە: ئەو هایە: ئەهوایە: ئاوایە: بەم جۆرەیە.
- وای: وەی: ١-وشەی ئێش و ئازار. ٢-بەداخەوە.
- وای وای: ئاه بۆ سەرسوڕمان.
- وایە/ وهایە: واهە.
- واین: بەزین: هەڵاتن: شکان.
- وە: ١-ئەنگۆ: ئێوە: ٢-بە.
- وەئاگا: بەئاگا: بەخەبر.
- وەبا: پەتا.
- وەبال: ئۆباڵ.
- وەباڵبەز: وەبالکار: تاوانبار: گوناهبار.
- وەبەران: ئاژەڵێ حەز لە جووت بوون دەکات.
- وەبەرکەوتن: بەبەرکەوتن: بەرکەوتن.
- وەبینم: بدۆزمەوە: ببینمەوە: بدینمەوە.

- وەبندانەوە: بەبن دانەوە.
- وەبیە: وەبووە: وابووە.
- وەبێ: ١- بەبێ: ٢-وابێ: وابێت:
کچ وەبێ برا قیمەتی چییە.
- وەپێش خستن: بەپێش خستن.
- وەتاخ: ئوتاغ: ژوور.
- وەتگۆ: وات گۆ: وات وت.
- وەتاك: کراوە.
- وەتاو: بەتاو.
- وەتە: گون.
- وەتابا: گونك.
- وەتۆیە: ١-راستە: ٢- ئەوهایە.
- وەتی: وەتا.
- وەج: لەجیاتی.
- وەجەل: وەج: لەجیاتی.
- وەجاخ کوێر: ئوجاغ کۆر.
- وەجەڵ: بەدەل: لەجیاتی.
- وەحا: وەحە: وشەی دەرکردنی مانگا.
- وەجێ: بەجێ.
- وەچە: منالٚ: بەچکە: کوڕ.
- وچچە: وەچە: هەچە: وشەی لێخورینی کەر.
- وەچکە: منالٚ: مندالٚ: مندار: بەچکە.
- وەچکوو: وەر: وەکو: وەکی.
- وحە: وەحە: وەحا.
- وللاّ: وەللاّ.
- ولخەرجی: هەڵە خەرجی.
- وەخۆکەوتن: بەخۆکەوتن: ئامادە.
- وەخۆهاتنەوە: بەخۆهاتنەوە.
- وەدە: بدە: بیدە: فەرمانی داخوازییە.
- وەدەر: بەدەر.
- وەدەرخستن: بەدەرخستن.
- وەدەرنان: بەدەرنان.
- وەدەست کەوتن: بەدەست کەوتن.
- وەدل: بەدل.
- وەدی هاتن: بەدی هاتن.
- وەدیارکەوتن: بەدیارکەوتن.
- وەر:١- رۆژ: ٢-خاوەن: ٣-وارگە: هەوارگە:
هونەروەر: هونەرمەند.
- وارا: ئازا.
- وڕاو: وڕێنە: هورێنە.
- وەرام: جواب: وەڵام: جواو.
- وەرانور: بەرامبەر: مقابیل.
- وەران: ١-وێران: کاول: ٢-هەڵوەرین.
- وەڕس: وەڕەز: بێزار.
- وەرگن: بەرگن: لوا: لوای بەرخ.
- وەرەم: بەرهەنگ.
- وەرەما: بەرخەمێ: بەرخی مێ.
- وەرەماس: مامز: ئاسك: ئاهوو.
- وەرە ندیك: تفەنگ لێ دان.
- وەرەمدار: ئیسقادار: سیلدار.
- وەرەنێر: بەرخەنێر: بەرخی نێر.
- وەرەوان: بەرخەوان: شوانی بەرخان.
- وەرەوە: بگەڕێوە (وەرەوە بە شەرتی جاران).
- وەرب: بەفر.





- وەرج: پێش.
- وەرچەرخان: گۆڕان.
- وەرد: ١-لەگەڵ:
٢-دووەم کێڵدراوی عاردی چاندن.
- وەردانەوە: دووبارە کێڵانەوەی شۆ: وەردبڕین.
- وەردانی رەش: جۆرێکە لە ترێ.
- وەردەك: مراوی.
- وەردێ: ئەوێ.
- وەردێنە: گونك: ئەنگوتك: هەنگوتك: هەویری
بەشە نانێك.
- وەرز: فەسل: کەژ: سێ مانگی بە دوایەکی ساڵێك.
- وەرزیار: وەرزرکار: وەرزشکار.
- وەرسیان: کەتن: کەوتن.
- وەرقە: سەبر.
- وەرك: بەرخ.
- ورکش: ورگی: هورگ: سگی: زگی.
- وەرکەوە: بنو: بخەوە: بنڤە.
- وەرکەوتوو: نوستوو: نووستی.
- وەرکوڵ: بەرکوڵ.
- وەرگ: گورگ.
- وەرگر: موستەلیم.
- وەرگێر: باجڤان.
- وەرگێران: پاچڤە: تەرجوومە.
(وەرگێرانی بابەتێك لەزمانێك).
بۆ زمانێکی تر.
- وەرم: خەون: خەودیتن: خەون دیتن.
- وەرماڵ: مافور.
- وەروانکە: بەروانکە: وەروانە.
- وەروە: بەفر.
- وەروەر: دەمانچە: دەبانچە.
- وەروبەرەی: وەر ویانا: پێش دەرگا.
- وەرێ خستن: بەرێ کردن.
- وەرس: گوریس: پەت: تەناف.
- وەز: گوز: گوێز: مەن.
- وەزا: لاواز: زەعیف.
- وەزە: ئازا: بەزات.
- وەزێ: ئەزێ: ئەمینی: منی.
- وەزە کوێر: گۆزی خەراب.
- وەزگدان: بەزگدان.
- وەزەندە: زەرەر: زیان.
- وەژە: بست: ئەندازەیەکی پێوانە.
- وەس: بەس: وشەی کۆتایی پێ هێنان.
- وەسا: وەها: وا: ئەوها: ئاوا.
- وەسان: وەهان: وان.
- وەسەرکەوتن: بەسەرکەوتن.
- وەسمە: گیایەکە کە وشکی ئەکەن و ئەیکوتن و
ژنان لەسەرو زوڵف و برۆیان دەدەن.
- وتراخ: دارێکە داریکی تریان لە ناوەڕاستەوە
ئەکوتا بەسەریا وەکو عەسای لێ هات جێگەی
نیشتنەوەی بازبوو لەماڵەوە.
- وەغر: ئۆغر.
- وەغرکرن: ئۆغرکردن.
- وەستا: ١- ئوستا: ٢- راوەستا.
- وەستان: ١-کۆی وەستا: ٢- راوەستان.

- وەستاو: وەستای.
- وەستیان: ١- ماندوبوون: ٢-راوەستان.
- وەشتارگە: حەشارگە.
- وەشە: هۆشە: وۆش.
- وەشت: ١- خوارو: ٢- بارانی نم نم.
- وەشتار: ماندوو: ماندی.
- وەشکار: مهرەبان: بەرەحم: بەروحم.
- وەشێن: وەشێنەر.
- وەفر: بەفر.
- وەقرە: سەبر: ئۆقرە.
- وەق: واقە واق: دەنگی گریانی منالّ.
- وەقولپی: وەرگەڕاو.
- وەقوران: بەقوربان.
- وەك: وەکو: وەکی.
- وەکی:١- هەتا: ٢- وەکو.
- وەکات: ئەکید.
- وەکار: بەکار: چالاك: ئازا لەکاردا.
- وەکاز: گۆپالّ: کۆچان: چەوگان.
- وەکو: وەکی: مینا.
- وەکیەك: وەکو یەك: لەیەکچوون: وەکی یێکتر.
- وەکیـــــل: ١- جوانرۆییــــەکان بەســــەرۆکی
بەگزادەکانی خۆیان دەڵێن.
٢-بریکار: ٣- جێگر.
- وەگر: خەملێنەر.
- وەرگرتن: خەمل.
وەلا: ١-والاّ: کراوە.
٢-سوێند بەخوا.

- وەلاّت: ورات: ولاّت.
- وەلاّتینی: وەلاّتی.
- وەلاّمە: راڤە: شرۆڤە: شیکردنەوە.
- وەلاّمبەر: پەیامنێر.
- وەلاّ مگا: وەلاّمگە: استخبارات.
- وەلانان: بەلاوەنان.
- وەلەك: عەکاز: وەکاز: گۆپالّ.
- وەلەکە: هەلاش.
- وەڵس: حەیوان: ئاژەڵ.
- وەلگە: شازادە: نەوەی شا.
- وەلیّ: بەلاّم.
- وەوەش: بەئەوەش: بەوەش.
- وەمێنین: مێنین.
- وەلێفەت: دیاری.
- وەم لاوە: بەمەلاوە.
- وەمرادن: کوژاندنەوە.
- وەم: ١- بەم: بەو:
٢- وام: ( وام لێدا: وەم لێدا).
- وەلیڤەت: بەرتیل.
- وەن: ١- وان: ٢-ئازا: ٣-قەزوان.
- وەناز: بەناز.
- وەناخ: وەناق.
- وەنە: ١-خوێندن: ٢-هاوپشتن: ٣-وانە.
- وەنەبێ: وەنەبی.
- وەنەوز: وەنەوژ: پینەکی: بۆرژان: خەوەکوتکە.
- وەندە: ١-جەسور: ٢-کوڕ: ٣- سالّ: ٤-شوێن.
- وەنگ: وەندی: رەنگ.





- وەنی: قەزوان: قەزوکان.
- وەن: وەمان: وامان.
- وەن نەگۆتیە: وەمان نەگوتووە.
- وەنییە: وانییە.
- وەولە: بووکۆکە: بووکی بچووکی منالاّن.
- وەولە بەبارانێ: بووکە بەبارانێ.
- وەیلان: وێلان: هەلوەدا: ئاوارە.
وێلانی ئەو کێوانە خۆم.
- وەویی: بووك: وەیوە: بیك.
- وەیهاوار: ئەی هاوار: هاواری کاتی ناخۆش.
- وەهار: بەهار.
- وەها: وها: وا.
- وەهاسە: وەهایە: ئیوهەیە: ئەوهایە.
- وت: وەتۆ: بەتۆ.
- وچان: پشو: ئیسراحەت: ئاسوودەبوون: شـەکەتی
دەرکردن و حەسانەوە.
- وچان دان: پشودان: ئیسراحەت کردن.
- وحە: وەحە: وشەی دەرکردنی مانگا.
- ودم: وودم: ئیجازە.
- ودمدار: ئیجازە پێدراو.
- ور: ئەویّ: ئەوێندەر.
- وارسەی: خەیاتە.
- وارا: والا: کراوە.
- وراوە: خەیالّ: ئەندێشە.
- ورە: هورە: نەترە.
- ورتکە: هورتکە.
- ورچ: هورچ: هرس: هەرس: هەشە: خرس.

- ورد: هورد.
- وردە شەنەبا کردن: کاودان:
لەیەك جیاکردنەوە.
- وردەوالّە: هوردەوالە.
- وردبین: لیّ کۆلّەر.
- وردە ئاژین: سرنج لیّ دەر.
- وردکراو: هورد کراو: هوردکرای.
- وردکردن: هوردکردن:
پارچەی گەورە کچکە کردنەوە.
- وردوخاش: ورد ورد: زۆرورد.
- وردیی: هوردیی.
- وردیلە: هوردیلە.
- ورسی: برسی.
- وردەکوت: دەغل و دانی بەجەنجەڕکوتراو.
- ورگ: هۆرگ: زگ: لەمە.
- ورگن: زگ گەورە: هورگ گەورە.
- وروره: ولّولّە: هێلکەی
بچووکی ناو زکی پەلەوەری مێ.
- وریا: هوشیار: ئاگادار لە خەبەر و دەوروبەر.
- ورێنە: هورێنە: کەسێ لەنەخۆشی قسەی حەلەق
و بەلەق دەکات.
- وزاق: باز.
- وزە: تاقەت: هێز.
- وژەر: وانەبێژ: مامۆستا.
- وژنگ: ئەژنۆ: چۆك.
- وژین: شریخە.
- وس: وست: فەرمانی داخوازییە واتە قسان مەکە.

- وس کردن: بێ دەنگ کردن.
- وسڵ: شوشتن: شتن.
- وش: هۆش.
- وشە: کەلیمە: لە چەند پیتێك پێکدێت.
- وشی: ١- هوشی: هێشو:

٢-کۆکردنەوەی گوڵە دەغل ئەوەی لە پەرێز بەجێ دەمێنێ.

- وشەی رێزلێنان: بریتییە لەو وشانەی کە بەکاردێت لە نێو کۆمەڵدا بۆ رێزگرتن لەیەکتری:

١-کچکە بەکاری دێنێ بەرامبەر بەگەورە.

٢-هاوتەمەن بەکاری دەهێنێ بەرامبەر بەیەك.

٣-گەورەش بۆ رێزلێنان بەکاری دێنی بەرامبەر بە بچووك وەکو ئەمانەی خوارەوە:

(کا، کاك، کاکێ، کاکی خۆم، کاکی من، ئەزبەنی، رۆڵەی مامێ، براله، برا، باپیرە، مامە، سەیدا، ئەزخولام، خالۆزا، خزم، قوربان، گەورەم، کاکی برا، ئەفەندی، مامۆستا، کەسی کاکی، کەسی مامی، کەسی خاڵی، ئۆکاك، هۆ کاك، خوارزا، ئامۆزا، برام، جەناب، بابە، باپیرم).

- وشەی رێزگرتنی پیاوی ئایینی ( یاشێخ، کاکە شێخ، مام سەید، مام خەلیفە، مام دەروێش).
- وشەی رێزلێنانی خێزانی پیاوی ئایینی (شێخ ژن، حاجی ژن، مەلاژن).
- وشەی رێزلێنانی ژن:

خان، خاتوون، خانم، یابێ، یایە، یا، دایکێ، دا، پلکێ، نەنێ، نەنە، داپیرە، دادە، تاتێ، میمی، ژنخال، ژنمام، ژن برا، برا ژن، کچ خاڵ، دوتمام، ئامۆژن، مامۆژن، خالۆژن، خوشکێ، میمکە، پورێ، پلێ، پله، خوچە، باجی، خوشکە.

- وشەی رێزلێنان بۆ نەوەی پیاوی ئایینی:

باوە یادگار، پیرەسوور، مەلازادە، شێخ زادە، سەید زادە، جەلی زادە، هیرانی زادە.

- وشەی هاندان: بریتییە لەو وشانەی کە بۆ دنەدان و رشت بوون لەسەرکار بۆ ئەنجامدان بەکاردێنی وەك:

ئافەرین، چاکت کرد، دەست خۆش، سەرت خۆش بێت، لەمت کەوی، لەمامت کەوی، لە خاڵت کەوی، بەه بەه، لەدایکت کەوی، لەبابت کەوی، لەو چاوەت کەوی.

- وشەی دڵدانەوە: بریتییە لەو وشانەی بۆ دڵدانەوە بەکاردێ (لەدایکت نەکەوی، لەبابت نەکەوی، لەمامت نەکەوی، لە خارت نەکەوی، دەیدەی).
- وشەی بێگانە: بەتێکرایی بەو وشانە دەوترێت کەلە هەر زمانێکی بێگانەوەبێت کەوتینە زمانی کوردییەوە، ئەگەر چی لەڕووی وشەی کوردی رەسەندا پێکهاتنی (مۆرفیم)ەوە لەگەڵ وشەی کوردی رەسەندا هیچ جیاوازییەکیان نەبێت وەك ئاشکراشە بەشی هەرە زۆری ئەو وشە بێگانانەی لە زمانی کوردیدا هەن: ئەمانەی خوارەوەن:

١- وشەی فارسی.

٢- وشەی عەرەبی.

٣- وشەی یۆنانی.

٤- وشەی مەغۆلی.

٥- وشەی تورکی.





٦- وشەی تەتاری.

٧- وشەی رووسی.

٨- وشەی فەرەنسی.

٩- وشەی ئینگلیزی.

١٠- وشەی ئارامی.

١١- وشەی ئێرانی.

١٢- وشەی ئەلمانی.

١٣- وشەی ئەرمەنی.

ئەم وشانەش بەهۆی ئایینی ئیسلام و ئایینی مەسیحی و ئەرمەنی و داگیرکردنی لەلایەن تەتەر و مەغۆل و تورکەوە بووە.

- وشەی مردە: بەو وشانە دەگوترێ کە لە کار دەکەون و پەکیان دەکەوێ و کۆن دەبن و بەرەو سوان دەڕۆن وەکو وشەی (کەبرێن، سەبرێن)
- وشەی نوێباو: بەو وشەی نوێیانە دەگوترێ هێشتا بە تەواوی لەزمانەدا رەگیان دانەکوتاوە یاخود تازە هاتوونەتە ناو زمانەوە (نووسەر خوێنەر، گۆڤار، چیرۆك).
- وشەی دژ واتا: بەو وشانە دەوترێ کە لە مانا دا بەرامبەر یەکتر دژ وەستاون ئەمەش دەبێتە دووبەش:

١-ئەو وشە دژ واتایانەی کە رەگی جیاوازی خۆی هەیە وەك:

گەورە بچووك.

رەش سپی.

زۆر کەم.

بڵند نەوی.

٢-وشەی دژ واتا خاوەنی یەك رەگ بن وەك:

خۆش ناخۆش.

راست ناڕاست.

بەنرخ بێ نرخ.

- وشەی فرە واتا: بەو وشانە دەوترێ کە مانایان زۆرە وەك : کاڵ: ١- میوەی پێ نەگەیشتووە:

٢-پیر:

٣-رەنگی سپی بوونەوە: ٤-خاو: نەبرژاو.

- وشەی تەواو: ئەو وشانەن کەمانای دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی جۆرراوجۆر دەبەخشن لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە ئەم وشانە بەزۆری لەناو ئاوەڵناو ژمارەکردار و جێ ناون.
- وشەی یەك واتا: بەو وشانە دەوترێ کەیەك مانایان هەیە وەك (شەو، ئاشەوان).
- وشەی ناتەواو: بەو پۆلە وشانە دەوترێ وەك پیتی بانگهێشتن وشەی یاریدەدەر کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندییان بەدیاردەی واقعییەوە نییە، مانایان شێوەی تایبەتی خۆی هەیە و هەر ئەوەشە کە مۆرفۆلۆژی گرنگی بەلێکۆڵینەوەی ئەم وشانە دەدا و لێکسیکۆلۆژی تاڕادەیەك دەیانخاتە پشت گوێ لە زانستی وشەی ناتەواو.
- وشەی گۆرانی: لەکاتی گۆرانی گوتندا، هەندێ وشە لەسەرەتای گۆرانیدا پتر لەجارێ ئەوترێتەوە وائەبێ لە شێوەی تەرجیع بەند و تەرکیب بەندا بێت جاری واش هەیە برێتی و تێکەڵاوە لە دووزمان وەکو کوردی و فارسی کوردی و تورکی، کوردی و ئەرمەنی و هەندەجار ئەو وشانە دەبنە ناوی گۆرانییەکە و گۆرانییەکە بەو وشانە ناودێری

دەبێ ئەم وشانەش ئەمانەن، هاهوهاهو- تەوتــەو- جانێجانێ- هاهی- دەلێ لێ لێ- دەلۆلۆلۆ- وەیێ وەیی- وەیلۆ وەیلۆ- وەیدڵ وەیدڵ.

- وشتر: حوشتر: حشتر.

حوشتر و حەمام: کەسێ لەکارێك نەوەشێتەوە.

- وشترالووك: حوشترالووك:

گیایەکی دڕکاویەو دڕکی زۆرە.

- وشترەوان: حوشترەوان.

- وشتر خۆرە: حوشترخۆر: حوشترالووك.

- وشترمرغ: نەعامە.

- وشتومر: مشتومر:

بەتوورەیی قسە دەگەڵ یەك کردن.

- وشترمێ: حوشتری مێ.

- وشك: یشك: هیشك: ئاوی تێدانەماوە.

- وشك بوون: هیشك بوون:

تەڕایی تێدانەمان.

- وشکاوس: هیشکاوس.

- وشکەساڵ: هیشکە ساڵ.

ساڵێك باران نەباری و نەهاتیبێ.

- وڵ: گون.

- وڵایین: کۆشش.

- وڵتە: گەرای ماسی.

- وڵس: وڵت: حەیوان.

- ولك: پەلکی دار: گەڵای دار.

- وڵك: گورچلیك: گورچیلە.

- وڵکــە: هــەرێم: ناوچــە: مەڵبەنــد و دەڤــەرێکی دیاریکراو کە چەند گوندی هەبێ.

- وڵگ: پیستە: پێستە.

- وڵۆڵە: هێلکەی پەرندە لەنیوە زگدا.

- وڵهم: سەقەر.

- ون: ١-خوین: خون: ٢-بزر.

- وندا: غائب.

- وانڕا: ئەوانەی لەگەڵیان بەوانڕا چەند کەسن؟

- وتار: گوتار.

- وتە: کەلیمە.

- وتەر: گوتەر.

- وتەوییرە: قرت و فرت (دڵم کەتە قرت و فرت).

- وتەی: نووستن.

- وراق: پاراو.

- وراوە: ورێنە: هورێنە.

- ورە: مەعنەویات.

- وردە: هوردە: دژی درشت.

- وردە فرۆش: هوردە فرۆش.

- وردەواڵە: هوردەواڵە.

- وردەکار: هوردەکار.

- وردیکلانە: وردیلانە.

- وردیلە: هوردیلە.

- ورسی: برچی: ئاورا.

- وم: وەمن: بەمن.

- ورمێ: ئیجازە: ودم.

- وڵات: ورات: وەڵات: والیێت.

- وێچون: پێچوون.

- وێچنە: غەربیل.

- ویدان: پێ دان.





- وێوە: هێوە: بڕۆلای: بڕۆ بەملاوە.

- وێوە بڕۆ: هێوەبڕۆ: بڕۆ بەم لاوە.

- وێدەچی: پێ دەچی: لەوانەیە.

-وێران کەر: وێرانگەر: کاولکەر: رووخێنەر: لەناوبەر.

- وێرەگا: رۆژئاوابوون: خۆرئاوابوون.

- وێرێ: ئەوێ.

چەند رۆژان لەوێرێ مان.

- وێژدامور: جەرەس: زەنگ.

- وێژە: ئەدەب.

- وێژەن: بنێشت: بینێشت: جاجك.

- وەیژەیی: ئەدەبی.

- وئێستا: ئێستا.

- وێسان: وەستان.

- وێساوە: وەستاوە.

- وێستێ: ئێستا.

- وێڤە هەرە: وێوەروو: بیێوەرو: برۆبەملاوە.

- وێکچوون: پێکچوون.

- وێش: خۆی.

- وێکر: پێکوە: پێکەوە: بەیەکەوە (پێکەوە وەرن).

- وێل: دەربەدەر.

- وێلان: پەراگەندە.

- وێلك: لق: لك: چل.

- وێڵی: دەبەردەری.

- وێم نییە: پێم نییە: لەلام نییە.

- وێتە: پێ تە: لەلاتە.

- وێمان: ئێمە.

- وێندەرێ: ئەوێ.

- وییا: ئەو.

- ویەردە: رابردوو.

- ویەردن: پەڕینەوە.

- ویسحەت: تەندروستی.

- وییر: بیر: فکر.

- ویستەمەنی: پێویستی.

- ویست: ئارەزوو: حەز.

- ویستراو: داواکراو.

- وێروە: هێروە: بیێروە.

- وێروەوەرە:، هێرۆەوەرە: وەرەئەولایە.

- ویشك: هیشك.

- وینك وبا: با.

- وێ: بێ:

خەرمانت گوڵ وێ.

- وێمدە: بمدەێ: بمدەیێ.

- وێت دا: داتێ: دات پێی.

- وێت هەیە: پێیەتی.

- وێن دا: پێمان دا- دامانێ.

- وێی دە: بیدەیێ.

- وێن دە: بمان دەیە: پێ مان بدە.

- وێدەچی: پێ دەچی: لەوانەیە.

- وێچوون: پێك چوون: لەیەکتری چوون: بەیــەکتری چون: لێ کردن: ئەمبائی: ئەرجێ: تزبۆر: تۆڤ بوون: وەك یەك بوون.

- وێڵۆ: رەگەزێکی داربەرووە بەزۆر دمکانەی لێدەکەن.

- وێنجە: یونجە.

- وێن نادا: پێمان نادا- نامان داتێ.

- وێینادەم: نادەم پێی- نایدەمێ.

# ه

١-(ه) بە (خ)
دەنگگۆڕکێ دەکات.
هۆر: خۆر.
هەویر: خەویر.
هوون: خوون.
٢-(ئا) دەنگگۆڕکێ دەکات.
ئاگا: هاگا.
٣-بە (ی) دەنگگـوڕکێ دەکـات (تـەنها: تـەنیا)
(هێشوو: یێشوو).
ها: ١-بگرە: ٢-ئەوێ: ٣-هەیە: ٤-بەڵێ.
٥-ئامرازی بانگ کردن: ٦- وا.
- هاکردن: ئاگادارکردنەوە.
- هاپو: ئاپۆ: ئاپ: مام: ئام.
- هاپۆزا: ئامۆزا.
- هاپۆژن: ئامۆژن: مامۆژن.
- هات: ١-خۆشی: ٢-ساڵی دەغل و دان زۆر:
٣-بەرێوەیە.
- هاتە هات: پڕوپاگەندە: دەمگۆ.
- هاتنەبا: بەباهاتنی سەگ و پشیلە.
- هاتنەبەر: بەروبوم پێ گەیشتن.
- هاتنەدەر: لەژوورەوە هاتنە دەرەوە.
- هاتنەدیی: بە ئامانج گەیشتن.
- هاتنە رێگا: تووش بوون.
- هاتنەوە: گەڕانەوە.
- هاتنەوەسۆ: دەست بەژان کردنەوە.
هاتن و چوون: هاتووچوو.
هاتی: هاتوو: هاتیار: کەسێك بێت:
هاتوو: هاتی: هاتیار.
- هاتیتەوە: هاتۆتەوە.
- هاجریی: زەدەدار: عەیبدار.
- هاجی رەشك: پەڕەسێلکە.
- هاچە: دوو فلیقانە.
هار: ١-بەتەر: ٢-ئارد.
- هاراسیاو: بەردئاش: هارە.
- هاڕان: هاڕدران: هێرران: پلخان: گژمرین:
مرچڤین: پەراشبوون: وردبوون:.
- هاڕاندن: ١-هوردکردن: وردکردن: ٢-هاوار.
- هاڕراو: هاردڕاو: لێکرای: هاڕراوە.
- هاڕە: دەنگی وەیەك کەوتنی زێڕ و زیوە.
- هاڕە: هاڕە ئاسیاو: بەرداش.
- هاڕەی دەس: دەستار.
- هاڕە هاڕ: هاوارهاوار.
- هارت و هوورت: بەفیز: غلور: باغر.
- هارد: ئارد: گەنمی هاڕاو.
- هارس: گوناح: گوناه.
- هارسم: بەرسیلە: پەسیرە.





ترێی پێ نەگەیشتوو.
- هاروو: ئاروو: خەیار: هاروێ.
- هارودین: هاروشێت.
- هاروهاج: هاروبەتەر.
- هاریی: بەتەری.
- هاڕیتی: هاڕیویەتی.
- هاریکار: یارمەتی.
- هاڕین: لێکردن.
- هاز: توانا: وزە.
- هازدار: بەهێز.
- هاژ: ١-سەرسوڕماو.
٢-ئاگا.
- هاژە خوە هەبە: ئاگات لەخۆت بێ.
- هاژان: هەژان.
- هاژیلە: کووژەکە: لەپکە.
- هاژەی ئاوی: هاشەی ئاوی.
- هاژۆتن: هاژۆژتن: ئاژۆتن: لێ خورێن:
- هاژوواژ: سەرسوڕماو.
- هاژێك: کووژەکە.
- هاسان: سانا: ئاسان: دژی گران.
- هاش: بەختیار: بەختەوەر.
- هاشە:١-غرور: ٢- هاژەی ئاو.
- هاشە هاش: هاژەهاژ.
- (هاشە هاشی ئاوێ).
- هافرتی: گومرگ:
دائرەی باج.
- هاڤار: هاوار.
- هاڤرۆنگ: وەرز: کەژ.
- هاڤل: سوود: قازانج.
- هاڤێتن: هاوێتن: هاوێشتن.
- هاڤی: هاویشتن.
- هاڤین: هاوین: وەرزی دوای بەهار.
- هاڤینگە: هاوینە هەوار.
- هاوێتن: هاوێشتن.
- هاڤینی: هاوینی.
- هاکا: نزیك: نێزیك.
- هاڤا: ئاگا: هایی.
- هاڵ: ١-حاڵ: وەزع: ٢- ئەشکەوت.
- هالان: ئازا: جەسوور.
- هاڵاو: هەڵاو.
- هاڵاوی ئاوری: هەڵاوی ئاگری.
- هاڵاوی ئاوی: بوخار: هەڵم.
- هالە کوك: ئاڵە کوك.
- هاڵە لە کوێ: لەکوێیە.
- هالەینە: ئەوێ.
- هالکەتی: حاڵ کەتی: لات: موفلیس.
- هالۆ: ١-ئالۆ: لالۆ: خاڵ: خار: ٢-جەڕە.
- هالۆزا: خالۆزا: خارۆزا.
- هالێ: بەرسێلە.
- هالییگا: هالینگە.
- هام: هاو: هەڤ: هەو.
- هاماو: هەموو: گست.
- هامبێز: هەمبێز: باوەش.
- هامپا: برادەر.

- هامخەو: هاوسەر.
- هامدەس: هاودەست.
- هامدەم: هاودەم: هاونشین.
- هامڕا: هاوڕێ: داش سەفەر.
- هامراز: هاوراز: لەسوڕیەکێن.
- هامزاوا: هاوزاوا: ولداش زاوا.
- هامسا: جیران: دراوسێ.
- هامن: هاوین.
- هامون: ١-دەشت- بەریە- نەرمان:
٢-ناوی دەشتێکە لە ناوچەی کۆیی:
٦- ناوی کوڕانی کوردییە.
- هاموشۆ: ئاموشۆ: هات وچۆ.
- هامێز: هەمێز: باوەش: باوش.
- هامین: هەوێنی شیر.
- هاندان: دنەدان: گال دان.
- هانا: ١-ئامان: فریاکەوتن:
٢-ناوی کوڕانی کوردییە.
- هانابەر: ئەوەی داوای یارمەتی دەکات.
- هانە: سەرچاوە: کانی.
- هانە درۆزنە: کوێرەکانی کـاتی بـەهارێ دوایـی وشك دەبێ.
- هانە هان: هانکە هانك.
- هاندان: دنەدان: گالدان.
- هاندەر: دنەدەر.
- هاندراو: دنەدراو.
- هانومون: لێبوردن.
- هانێ: ها: هانی: بگرە: وەگرە.

- هاو: هام: هـەم: هـەڤ: هـوم: وشـەی بەشـداری دەچێتە سەر ناو.
- هاوار: ١-بانگ کردن بەدەنگی بەرز.
٢-ناوی کوڕانە.
٣-ناوی گۆڤارێکی کوردییە.
- هاوار هاوار: هاواروبانگ.
- هاواڵ: برادەر: هاوڕێ.
- هــاوان: هــاوەن: ئــاوان: جۆهــەنی: هــاون: ئاونگ: دنگ.
- هاوئامانج: هاوئاوات.
- هاو ئاواز: هاو ئاهەنگ.
- هاوئاین: هاودین.
- هاوبەزا: هاوتەمەن: هاوعومر.
- هاوپشت: یاریدەدەر.
- هاوبەش: شەریك: برابەش.
- هاوپیالە: هاوکاسە: دووکەس پێکەوە بخۆنەوە.
- هاوپـــەیمان: هاوقـــەول: هـــاوزوان: هاوپـــشت: هاوقەسەم: هاوسوێند.
- هاوپیشە: هاوکەسب: حەریف.
- هاوتا: هـاولنگ: ئاوقـەران: هـاولف: هاوتـەقا: وەکوویەك.
- هاوتاقەر: یارمەتیدەری پشکێنەر.
- هاوتەقا: هاوتا.
- هاوتەك: رەفیق: برادەر.
- هاوجفت: هاوسەر: هاوجووت.
- هاوچـاو: رەقیـب: خـەنیم: حـەریف: هـاو زۆر: چاولێ گەری.





- هاوخەو: هاوخەف: هاوسەر.
- هاوخەف: هاوخەو.
- هاودەنگ: هاودەم- هاوقسە: هاوڕێ: هاوزوان.
- هاوددان: هاوزە.
- هاودەم: هامدەم: بەردەڤگ: هاونـشین: هـاوڕاز: هاودەنگ: هاڤدەم: هۆگر: هاوڕا: ئاوال:
- هاودەمی: مدەمی.
- هاوپلە: هاوپایە: هاوڕادە: رێك: بەرانبەر.
- هاودڵ: یەکگرتوو.
- هــــاودەرد: هاوخــــەمبار: هاوخەفــــەت- شەریکی خەم.
- هاودەست: شەریك: هاوکار.
- هاوڕ: ئارەزوو.
- هــاوڕەنگ: لەیــەك چــوو: پێــك چــوون: وەکویەك: دوبراڵە.
- هاوڕا: هاوڕێ: هاودەم.
- هاوڕاز: هاوبەش لەسڕ.
- هاوردانەوە: ئاوردانەوە.
- هاوردن: هێنان: هینان.
- هاودەرس: هاوقوتابی.
- هاوڕ هاوڕ: هەندێ جار.
- هــاوزا: ١-هــاوزاوا: هــاڤلنگ: ولــداش زاوا:
٢-ئاوزە.
- هاوزگ: هاوزگە: جمکە: جمك: دوانە.
- هاوزێ: ١-هاوولاتی:
٢-ئاوزە: ٣-هاوسەنگ
- هاوس: ئاوس: دووگیان.

- هاوســا: هاوســێ: ئاومــال: جــیران: جینــار: دراوسێ: هەمسا.
- هاوســەر: ژن و مێــرد: ژن و پیــاو: ژن و شــوو: بەقەدیەك.
- هاوسەرەکەم: ئاوسەرەکەم: موحتاج.
- هاوەن: هاونگ: هەوەنگ: ئاوەن.
- هاوسەنیر: هاوسەر.
- هاوسوێند: هاوپەیمان.
- هاوسێ: جیران: ئاومال.
- هاو شاریی: هاوڵاتی.
- هاوشیرە: دوومناڵ شیری ژنێك بخۆن.
- هاوشان: بارتەقا.
- هاوقەتار: هاوکار.
- هاوکەشەن: هاوسنوور.
- هاوگیان:١-هـەوگیان: ٢-دوو کـەس یـەکتریان زۆر خۆشبوێ.
- هاوڵە: ئاولە: خوریکە.
- هاوەڵ زاوا: هاوزاوا: هاولنگ: هومریش: ولداش زاوا: ولاش زاوا.
- هاولف: هاوشان.
- هاومال: هاوسا جیران: ئاومال.
- هاوناو: دووکەسی یەك ناو.
- هاونوبە: هاونۆگە.
- هاونیشتمان: هاوڵاتی.
- هاونێڵە: هاونییر:
یەکـسانی هـەردوو ولاغـە دابەسـتراوەکانن لـە بەرزونزمی و هێزدا لە جۆت و جەنجەڕ.

- هاوملی: جەلە:
(٥-٦) گایان کەر بەپەتێك هاوملی دەکرێت.
- هاو واتا: یەك واتایان هەبێ.
- هاوها: هەراوهۆریا.
- هاوهاو: وشەی بانگ کردن.
- های: ئاگا: هایی.
- هاوێژ: هاوێتن.
- هاوێر: لێك جیا.
- هاوێر کردن: لێك جیاکردنەوە.
- هاوین: تاوسان: هاڤین: هامن.
- هاوینەهەوار: هاوینگا: هاوینگە.
- هایی: ١-ئاگا: هاژە: ٢-بەڕاستی.
- هاین: ئاگامان.
- هاین لێ نەبوو: ئاگامان لێ نەبوو.
- هاها: ئامرازی سەرسوڕمان.
- هاید: هان دان.
- هـــایهۆ: هـــایهو: هـــەهو: وشـــەی نـــارازیی و سەرسوڕمان.
- هە: ها.
- هەبان: جانتا: هەگبە.
- هەبت: هەبیت: هەبێت: هەبی: هەبێ.
- هەبوو: هەبوون: دارا: هەبین: دەوڵەمەند.
- هەپرون: وردبوون.
- هەپلەگون: گێل: ئەحمەق.
- هەپلەپان: بەرین و ئاڤا.
- هەتا: تا: تاکو: هەتاکو: تاکو.
- هەتاکوێ: تاکوێ.
- هەتان: پەرژینی باخچە.
- هەتاو: تاو: خۆر: رۆژ: خۆرەتاو: خودر: رۆجیار.
- هەتاکێ: هەتاکی: هەتاکو: هەتاکوێ.
- هەتاوپەرس: رۆجیار پەرست.
- هەتاو گازی: هەتاو بردوو.
- هەتاهەتایی: تم وتم: هەمیشە.
- هەتەر:١نهێنی: ٢-رشت: موکڕ: ٣-دیتنی چاو.
- هەتەق: وشەی نارەزایی.
- هەڤکوڤ: ئاوکوف.
- هەتەڵ: مەتەڵ.
- هەتدەر: دنەدەر: هاندەر.
- هەترە بوون: دەربەدەربوون.
- هەترەکردن: دەربەدەرکردن.
- هەترش: ئەترەش: هێزی مەعنەوی.
- هەتك: ئەتك: ئەتك: پەردەدڕین.
- هەتکردن: ئەتکردن.
- هەتڵە: هەرەتە: تارا.
- هەتیو: هەتیم: هێتیم: سیوی: سێوی: وڵ: هیتیو.
- هەتۆ مەتۆل: یاری منالآن.
- هەجە: ١-شکۆفە: خونچە: ٢-قەدەغە.
- هەجەل: ١-ئەجەل: ٢-واریدات.
- هەجووجك: دەنکە هەرمێ.
- هەچە: هەچچە: هەچچ: حەچە: وشە لێخورنکەر.
- هەچهەچك: پەرەسێلکە.
- هەجەت: هەنجەت: بیانگە: پەلپ: بیانۆ: بیانو.
- هەچی: هەرچی: هەرچ.
- هەدا: ئارام: هەدار.





- هەدادان: ئارام گرتن.
- هەدرەش: ئەنجام.
- هەدشە: ئاورە.
- هەدبیە: دیاری: سەوقات: پـەروو: پێـشکەشی- دەس تەرێقانە.
- هەر: قور: هەرگاو: هەرك: هەرگ.
- هەرا: هەرا و هوریا
- هەرا: راکردن: غاردان: هەڵاتن.
- هەراج: حەراج: مەزات: هەرزان فرۆش.
- هەراس: ترس.
- هەراسان: هەرەسان: هراسن: شلەژاو.
- هەراسانی: هەرەسانی.
- هەراش: گەورە.
- هەرافتن: رووخاو.
- هەراڵە: ١-گازکردن.
٢-بانگەواز.
- هەرم: برۆم: بچم.
- هەرامە: فلان: واك:
وانەك: هین: کەسێ یان شتی ناوی نەهێنی.
- هەراهەرا: هـەراوهۆریا: هـورا: هۆریـا: هـوورا: قـاڵ: زڵـە: کـوت کـوت: هەڵاهـەڵا: کێـشەکێش: خولۆو: دەنگە دەنگ: دەنگە دەنگی بەدوای یەك.
- هەرئیسە: هەرئێستا.
- هەرە: زۆر.
- هەرە گەورە: زۆرگەورە.
- هەرە: برۆ: بچو: بچۆ.
- هەرەتە: هەلەتە: هەتڵە: پەرەگاندە: تارا.
- هەرەت: تاف: جەنگە: گۆنـەر: گۆنـەڵ: سـەرتا: بافت: تانگ.
- هەرەج: لەدوای یەك.
- هەرەس: ١-فرمێسك: هەرس:
٢-رمانی بەفری زۆر.
-هەرەشـــە: گـــەف: هـــەرەگیف: گورەشـــە: هەرەشەوگورەشە: تاپاڵ.
- هەرەشیان: هەرەشین: نەمان: قرتێ کەوتن.
- هەرەگەڵ: کەران.
- هەرەم: هەرێم: ناوچە: دەڤەر.
- هەرەوەز: هەرەوەرز.
- هەرپەنمان: هەرایسان: هەلایسان: ئاوسان.
- هەربوو: هەربووگە.
- هەراتن: هەڵاتن: راکردن.
- هەرتا: هەرتاوەکوو.
- هەرتك: هەردووك: هۆردوك.
- هەرتە: دەچێتە: دەچیتە: دەرواتە.
- هەرتەر: رشت: موکڕ.
- هەرجوور: هەرجۆر.
- هەرچاخ: دائیمەن.
- هەرچی و پەرچی: هەرزە و خوێری.
- هەرکو: هەرچۆنی: هەرچۆنێکی.
- هەرخان: تەویلە.
- هەرد: عارد: زەوی.
- هەردە: ١-زەوی بەردەلان: ٢-شێت.
- هـــەردەم: هـــەرتم: هەرچـــاخ: هەروەختـــە: هەردەمەکی: هەردەمێك: هەردەمێکی.

- هەردك: هەردوو: هۆردووك: هەرتك: هەردووك.
- هەردوو هەڵەت: هەڵەت و پەڵەت.
- هەڕڕ: زەڕڕ.
- هەرۆ: هەرو: ١-برۆ: بچو: بچۆ: هرری: ٢-هەرڕۆژ.
- هەڕۆوە: برۆوە: بچۆوە: هەڕوەوە.
- هەرزاڵ: هەرزاڵە: هەرزەل: ئامرازی دارینە بۆ شت لەسەر نان بەکاردێ.
- هەرزان: ئەرزان: دژی گرانی.
- هەرزە: ١-بێوەفا: ٢-هەرزەکار.
- هەرزەیی: گەنج.
- هەرزۆقینەوە: زیت بوونەوە لەروو راوەستان.
- هەرنەبێ: هەرنەبی: هەر نەبێت.
- هەرس: فرمێسك: ئەسرین.
- هەراسان: هەرەسان: هراسك.
- هەرستاندن: هەڵساندن.
- هەرشەم: ١-هێرش: ئێرش: ٢-ناوی گوندێکە.
- هەرشین: هەرستن: رووخان.
- هەرفتن: هەرفین: رووخاندن.
- هەرفین: هەرفتن: هەرشین: هەرستن.
- هەرك: قوڕ: هەرگ: هەرگاو: خۆڵ و ئاوی تێکەڵاو.
- هەرکەو: ١-قۆڕایی بەرد کە ئاوی زستانی لێ رادەوەستی: ٢- ناوی کوڕانە.
- هەرکێندەر: هەرکوێ.
- هەرکوێنە: هەرکوێیەکی.
- هەرگا: هەروەختەك: هەرکاتێ.
- هەرگەلە: کەران: کۆی کەر.
- هەرگەل: رەوەکەر.
- هەرگیز: هیچ: قەت: هەر: هیچ کاتێ- نە ئێتر.
- هەرگۆت: پیاهەڵدان: مەتح.
- هەرمارین: هەڵماڵین: واڵاکردن.
- هەرمان: ١-کار: ٢-نەمر.
- هەڕمان: رووخان: هەڕمین: وێران بوون.
- هەرمۆ: هەرمی: هەرمێ: هەمرۆ.
- هەڕمێن: برەو.
- هەڕمە: دەچمە: ئەچم بۆ.
- هەرمێ: هەرمۆ: ئەرمووت: ئەمرود.
جۆری زۆرە: ١-سورکە هەرمێ:
٢- سێوە هەرمێ:
٣-ناسکە هەرمێ: ٤- هەرمییە جۆخین:
٥-هەرمێ چاوەرەشکە: ٦-هەرمێ سپیگرەیی.
- هەرنەبی: هەرنەبێ.
- هەرەوەز: هەرەوەرز: هەرەووز: زبارە: دەستەوا: دەسەوا: کاری دەستەجەمعی.
- هەروا: هەروەها: هەرئەوها.
- هەرمیشك: جۆرە ناسکەنانێکە دوای برژاندن رۆنی بەسەردا دەکەن.
- هەروشە: کیروشك: کەروێشك: هەروشا: کەوریشك.
- هەرۆنی: هەڕڕۆ:.
- هەروەك: هەروەکو: هەروەکی.
- هەرووك: رقەبەری: رك بەرکی.
- هەڕو گیڤ: هەڕەشە: گەف.
- هەروهەر: هەمموودەم: هەمیشە: تم و تم:.





- هەرێ: ١-بەڵێ: ٢-پەیمان: ٣-ئەرێ: ئایا: ٤-وەڵام: ٥- ئەحمەق: ٦-هەر: ٧-ڕاکە.
- هەرێ مای: هەرماوە: هەرمایە.
- هەرێز: هەریس.
- هەڕی: بچی: بچێ.
- هەرێ دان: بەڵێن دان.
- هەرێم: ناوچە: هەرەم: دەڤەر: مەلوەند: مەڵبەند: مَحال.
- هەرێنی: بەڵێن.
- هەڕی: بچیت: بڕۆیت.
- هەریی: قوڕ.
- هەڕیی: گێل: ئەحمەق.
- هەریسە: هەریشە.
- هەرزالە: ئامرازی تەون کردنە.
- هەرین: ١- پان کردنەوە:
٢- ئەستێرە: هەستێرە.
- هەڕین: بڕۆین: بچین.
- هەز: ١-وشك: ٢-حەز.
- هەزارپا: هەزارپێ: مارەزیو.
- هەزار بەهازار: زۆربڵند.
- هەزبێلە: جاترە: ناوی گێلکە.
- هەزار رەنگ: ١-زۆر رەنگ: رەنگاوڕەنگ:
٢-بیژی: زۆل.
- هەزاربێشە: سندووقی بەردەست جێی ئەسباب.
- هەزوا: سەبر.
- هەزبێ: هەزبی: هەزویە.
- هەزیا: حەزیا.
- هەژ: ١-حەز: ٢-چلی لێکراوە.
- هەژار خانە: فەقیر خانە: جێهەژاران: جێگای نەداران.
- هەژار: دەست تەنگ: دەست کورت: نەبوون: نەدار.
کەساس: گەدایی: چارەڕەش: لارەمل: کزۆك: ناهومێد.
- هەژدییا: هەژدیها: ماری گەورە.
- هەژڤاندن: ترسان: بزدیان.
- هەژڤین: ترس: بزد.
- هەژگ: گردڵ: چڵی بەگەڵاوە: گەرەشك.
رێوی بە کونێ نەدەچوو هەژگیشی بە کلکی وەکردبوو.
- هەزارمێرد: ١- ناوی ئەشکەوتێکە لە ناوچەی سلێمانی.
٢-ناوی دێیەکە لە نزیك ئەم ئەشکەوتە.
٣-ناوی هەزارمێرد لەوەوە هاتووە دەڵێن ئەم ئەشکەوتە ناوەوەی زۆر گەورەیە و ئاویشی تیایە رۆژێك مانگایەکی بەکەل لەگەڵ دوو کەڵە گادەچنە ناو ئەم ئەشکەوتەوە ماوەیەکی زۆر لەو ئەشکەوتەوە دەمێننەوە کە دێنەدەرەوە دەڵێن هەزار مانگا بووە جا ئەو ناوەی بەسەردا براوە بووە ئەشکەوتی هەزار مێرد.
- هەزار پێ: کشە: هەزارپا: مارەزیو: دووسەرە: زیڤ: زیو: شەمار: زیفە: زیوی: گەرگەدەن زیندەوەرێکە پێی زۆرە.
- هەژمەت: حەژمەت: داخ و خەفەت.

- هەژێن: هەژێنەر.
- هەژیر: ١-هەنجیر: ٢-فەقیر.
- هەژین: هەژان.
- هەست.

هەستەكانی مرۆڤ: مرۆڤ (٥) جۆرهەستی هەیە:
١-چاو: بۆدیتن: ٢-لووت: بۆ بۆن كردن:
٣-دەست: بۆ دەست لێدان: ٤-گوێ: بۆ بیستن:
٥-زمان: بۆ تامكردن.

- هەسار: حەسار: دیواری حەوشە.
- هەس: هەیە.
- هەسارە: ئەستێرە.
- هەسارەناس: ئەستێرەناس: فەلەكی.
- هەسان: سوون: سوونە: بەردی سوین: بــەردێكی لاكێــشە پــانی ٦ســم و درێــژی (١٥-٢٠)سم بۆ سوینی داس بەكار دێت.
- هەسەر: هەستر: هێستر: ئێستر.
- هەستان: هەڵسان: بڵند بوون.
- هەستە: هەڵسە: بڵندبە: ١- رابە: ئەلس: فـیری: هورزە ٢-خەرج: باج.
- هەستەم: ئەستەم: ناخۆش.
- هەستدار: بەهەست:
لەسەر هەست.
- هەست و خوست: جووڵانەوە.
- هەستون: ئەستون: ئەسـتوندەك: سـتوندەك: لـە دوو بەش پێكدێت:
١-سەربسوون: ٢-بن سوون:
دەدرێتە بەر چادر.
- هەستی: هەڵسی.
- هەستیۆك: جۆرێكە لەهەرمێ.
- هەسروە: خەسو.
- هەسكۆ: هەسكوێ: ئەسكو: چەحجەلی گەورە.
- هەسن: ئاسن.
- هەسنی: ئاسنی.
- هەسوو: میوە: مێوە.
- هەسەر: هەستر: ئێستر.
- هەسوون: سوان.
- هەسووهۆل:خەست و خۆل.
- هەسێرە: ئەستێرە.
- هرسێل: هەسۆیك: چالاو: گۆم: ئەستێر: ئەستێل.
- هەش: خم: خوم.
- هەشارگە: حەشارگە.
- هەشپشی: ئەسپی: سپی.
- هەشتالوو: خۆخ: قۆخ.
- هەشتاو: ١-بەعەجەلە: بەپەلە: ٢- خێرا.
- هەشتر: حوشتر: وشتر.
- هەشین: شین.
- هەشیناتی: سەوزە: سەوزی.
- هەفاو: دەوریە: حەس حەس.
- هەفتـــە: حەفتـــە: هەفتـــە: حـــەوت رۆژ:
حەفتە:١-لەهەینی بۆ هەینی:
٢-لەمرۆوە تاكو حەوت رۆژی تر.
- هەمسار: هەوسار.
- هەقار: ئاقار: عاقار: چۆڵ و دەشت.
- هەفسی: مۆلگە.





- هەڤ: هاو: هەم.
- هەڤا: شەریك: هەڤای: برابەش.
- هەڤاڤ: دانیشتوانی لێوار.
- هەڤال: برادەر.
- هەڤالجەو: هەڤالجێوك: جمك: جمكە: هەڤالزا.
- هەڤاڵدار: لاگیر.
- هەڤان: فێلباز.
- هەڤایی: شەراكەت.
- هەڤەر: بزنی رەش و سپی.
- هەڤەرە: رۆژ: رۆ: رۆج.
- هەڤبەهرە: هەڤپا.
- هەڤ پیشە: هاوپیشە: حەریف.
- هەڤت: هەفت: حەفت: حەوت.
- هەڤتۆنە: وەكو: وەكی: مینا.
- هەڤجار: بەردەقانی: قۆچەقانی.
- هەڤجڤان: كۆمەڵ.
- هەڤدا: تال: داو.
- هەڤدان: یەك گرتوو: هەڤدل: یەك گرتن.
- هەڤراز: هاوراز.
- هەڤرە: هاورێ: هاورا.
- هەڤرەنگ: هاورەنگ.
- هەڤرینگ: برینگ.
- هەڤرات: هەڤری.
- هەڤریشم: هاوریشم: ئاوریشم: حەریر.
- هەڤشی: مێگەلی بەرخ.
- هەڤكویف: ئاوقوف: ئاوقەران: هاوتا.
- هەڤگەل: پشتیوان: یارمەتی دەر.
- هەڤل: هێز: توانا.
- هەڤۆك: رستە.
- هەڤی: مانگ: ماه.
- هەڤیر: هەویر: خەمیر: ئارد و ئاوی شێلدراو.
- هەڤین: ئەڤین: ئەوین: خۆشەویستی.
- هەڤێن: خەمیرە.
- هەڤە: پەلكە هێلكە.
- هەكە: ئەگەر: گەر.
- هەكۆ: ناوی كوڕانە.
- هەگەر: ئەگەر: گەر.
- هەل: فروسەت: هەلكە: دەرفەت: كەیس.
- هەلا: جارێ: هێشتا.
- هەلات: ١-دەركەوت: رۆژهەلات:
٢-بەزی.
- هەلاتن: ١- دەركەوتنی مانگ:
٢-دەركەوتنی رۆژ:
٣-بەزین و غاردان: ٤-هەویر ترشان.
- هەلاق: حەلاق: سەرتاش: دەلاق: دەلاك.
- هەلپێچان: تەنگاوكردن: تەنگـەتاوكردن: تـەنگ پێ هەڵچنین.
- هەلاج: پەڕەكەر.
- هەلاجی: پەڕەكەری.
- هەلاژان: نوستن: خەوتن: خەفتن.
- هەلاكەوە: هەلاكۆ: برۆلای.
- هەلالـــە: ١-بـــانگ: ٢-گولێكـــە پـــەڕەكانی گەورە و رەنگاوڕەنگە لاسك نەرمـە، بـێ دڕكـە بۆنی نییە بۆ جوانییە.

